**DİYANET İŞLERİ BAŞKANLIĞI YAYINLARI : 1280** / وَشَانێنْ سَرُۆكَاتِيَا كَارْ و بَارِێنْ اُوْلِى
**KAYNAK ESERLER : 147** / بَرْهَمِێنْ چَاڤْكَانِى

**GENEL KOORDİNATÖR** / قُوْرْدِنَاتُوْرێ گِشْتى
PROF. DR. MEHMET EMİN ÖZAFŞAR / ا.دَ. محَمد اَمين اوْزاڤشار

**YAYIN YÖNETMENİ** / رێڤَبَرێ وَشَانِێ
DR. YÜKSEL SALMAN / دَ. يَوكسل سَالمان

**KOORDİNASYON** / قُوْرْدِنَاسْيُوْنْ
YILDIRAY KAPLAN / يلدَراى قاپلان

**HAZIRLAYAN** / ئَامَادَكَار
HÜSEYİN GÜNDÜZ / مِ. حسين گوندز

**TERCÜME** / وَرْگِێرْ
HÜSEYİN GÜNDÜZ / مِ. حسين گوندز
MEHMET SEYHAN / مِ. محمد سيحان

**SON OKUMA** / خَوِنْدِنْ و لێزيڤِرينْ
M. ARİF GÜNDÜZ / مِ. عارَفَ گوندز
M. SELİM YILDIZ / مِ. محمد سليم يلدظ
M. SEYFEDDÎN TUNC / مِ. سيف الدين تونج
M. REMZİ KÜÇÜK / مِ. رمزى كچوك

ISBN 978-975-19-6628-5
2016-34-Y-0003-1280
SERTİFİKA NO: 12930 / ژِمَارَا بَاوَرْنَامِێ

ESER İNCELEME KOMİSYON KARARI: 20.01.2015/20 / بِرْيَارَا كُوْمِسْيُوْنَا هُورْكُوْلِينَا بَرْهَمِێ

1.BASKI / چَاپَا يَكَێ

2016 / ٢٠١٦

**BASKI** / چَاپْخَانَه
İLERİ HABER AJANSI TAN. İLT. MAT. YAY. TKN. HİZ. A.Ş.
0212 454 33 33

**GRAFİK - TASARIM** / گرَافِيكْ و رُوپَلْسَازِى
MÜCELLA TEKİN / موجلى تكين
EMRE YILDIZ / امره يلدظ



**İLETİŞİM** / پێوَنْدِى
DİNİ YAYINLAR GENEL MÜDÜRLÜĞÜ / رێڤَبَرِيَا گشْتى يَا كَارْ و بَارێنْ اُوْلى
BASILI YAYINLAR DAİRE BAŞKANLIĞI / سَرُۆكێ دَائِيرَيَا وَشَانِێنْ چَاپَمَنِيێ
TEL.: (0 312) 295 72 93 • FAKS: (0 312) 284 72 88
E-POSTA: DINIYAYINLAR@DIYANET.GOV.TR

• KUR'AN-I KERİM KÜRTÇE MEALİ •

# القرآن الكريم

مَئالێ

# قُرْآنَا پِيرُۆزْ

سَرْ زِمَانِێ كُورْدِى




سَرُۆكَاتِيَا كَارْ و بَارِێنْ اُۆلِى

# ١. سُورَه یِیَ فَاتِحیَ

سُورَه‌یِیَ فَاتِحَیِیَ، لِمَکّیَ نَازِلْبُویَه. حَفْتْ ئَایَتِنْ.

اَڤْ سُورَه ژِ بَرْ کُو سُورَه‌یِیَ قُرْئَانِیَ یِیَ یَکَمَه و قُرْئَانَا پِیرُوْزْ پِیَ تِیَ دَسْتْپِیْکِرِنْ ژِیَ رَه «الفَاتِحَه» یَعْنِی دَسْتْپِیْکْ تِیَ گُوْتِنْ. هَرْوِهَا، ژِ بِلِی ڤِی نَاڤِی هِنَكْ نَاڤِیْنْ وِی یِیْنْ دِنْ ژِی هَنَه کُو اَڤِنْ: أُمُّ الْکِتَابْ (مَاکَا کِتِیبِیَ)، شِفَا (دَرْمَانْ)، أَسَاسُ القُرْئَانْ (بِنْگَهَا قُرْئَانِیَ)، کَنْزْ (خَزِینَه) و الحَمْدَه.

## اَعُوذُ بِاللّٰه مِنَ الشَّیْطَانِ الرَّجِیمْ

اَزْ ژِ بَرْ نَقَنْجِیَا شَیْطَانِیَ قَوِتِی خَوه دَاڤِیْژِمْ بَرْ پَنَاهَا خُدَایِیَ بِلِنْدْ، دَا کُو نَهِیْلَه زِرَارِیَ بِدَه دِینْ و دِنْیَا مِنْ و نَهِیْلَه کُو اَوْ مِنْ ژِ اَرْكُ و وَظِیفَیَا مِنْ ڤَگَرِینَه، کَیْسِیَ نَدِیِیَ کُو اَوْ لِسَرْ فِکْرُ و رَامَانِیْنْ مِنْ بِبَه دَسْتْهِلَاتْ.

## بِسْمِ اللّٰه الرَّحْمٰنِ الرَّحِیم

١. بِنَاڤِیَ خُدَایِیَ کُو رَحْمٰنَ رَحِیمَ.

٢. حَمْدْ (پَسْنُ و سِپَاسِی) ژِ خُدِیَ رَه بَه کُو اَوْ پَرْوَرْدَگَارِیَ عَالَمِیَ یَه.

٣. اَوِیَ کُو رَحْمٰنَ، رَحِیمَه.

٤. اَوِیَ کُوخَودِیِیَ رُوْژَا حَسَابْدِیتِنْ و جِزَادَانِیَ یَه.

٥. (خُدِیَ یُوْ) اَمْ هَرْ ژِ تَه رَه عِبَادَتْ دِکِنْ و هَرْ ژِ تَه ئَارِیکَارِیِیَ دِخوَازِنْ.

٦. رِیَا رَاسْتُ و دُرِسْتْ نِیشَانِی مَه بِدَه و لِسَرِیَ رَاسْتَرِیَ بِکَه.

٧. رِيَا وَانْ كَسێنْ كُو تَه قَنْجِی و دِلْشَادِی دَايَه وَانْ؛ نَه اَو ێنْ كُوغَزَبْ لِوَانْ بُويَه و نَه اَوێ كُو رِيَا حَقْ وِنْدَا كِرِنَه.[1]

---

١ خُدێ، كِتێبَا خَوه يَا پيرُوّزْ بِبَسْمَلێ دَسْتْپێكِرِيَه. بِڤِی ئَاوَايِی رێ نِيشَانِی بَنْدَيێنْ خَوه دَايَه كُو اَوْ ژِی كَارێنْ خَوه پِێ ڤَكِنْ و دَسْتْ پِێ بِكِنْ. دِ حَدِيسَا شَرِيفْ دَه هَاتِيَه رَاگِهَانْدِنْ كُو:چِه قَاسْ كَارَكِی خَودِی رُومَتْ هَبَه و بِنَاڤێ خُدێ (بِبَسْمَلێ) نَیێ دَسْتْپێكِرِنْ، اَوْ بێ بَرَكَتَه. نَاخُو مَعْنَا بَسْمَلێ دِبَه اَڤْ؛ اَزْ، بِنَاڤێ خُدێ اَوێ كُو رَحْمنَ، رَحِيمَه دَسْتْ بِكَارێ خَوه دِكِمْ. اَزْ، بِفَرْمَانْ، ئَارِيكَارِی و قُدْرَتَا خُدێ و بِرِظَايَا وِی ڤِی كَارِی دِكِمْ؛ نَه ژِ بُوّ دَاخَوازَا نَفْسَا خَوه. اَڤْ قُدْرَتَا كُو پِێ اَڤْ كَارْ هَاتِيَه كِرِنْ ژِ خُدێ يَه. هَكَه وِی، هێزْ و ئَارِيكَارِی نَدَابُويَا مِنْ، مِنْ دێ هِيچْ نِكَارِيبُويَا تِشْتَكِی بِكِمْ. اَزْ، خَوه ژِ ڤێ يَكَا كُوكَارێ مِنْ، بِنَاڤێ مِنْ بَه دُورْ دِگْرِمْ؛ اَزْ تَنێ بِنَاڤێ خُدێ دَسْتْ پِێ دِكِمْ. لَوْرَا مِنْ هێزْ و ئَارِيكَارِيَا خَوه هَمُو ژِ وِی گِرْتِيَه.

**حَمْدْ:** وَصْفَا رِنْدْ، سَنَايَا پِرْ، سِپَاسِيَا كَامِلْ و سَالِخێنْ بَاشْ بَسْ خَاصێ خُدێ نَه. لَوْرَا هَمُو رِنْدِی لِێ ڤَدِگَرَه. هَرْ سَنَا و پَسْنَا رِنْدْ ژِ خُدێ تَنێ رَه يَه. لَوْرَا يێ كُو تَڤَكێ عَالَمێ لِهَڤْ رَادِگْرَه و هَمُويَانْ پَرْوَرْدَه و خَودِی دِكَه هَرْ اَوَه. ژِ بُوّ رِێنِيشَانْدَانَا وِی حَمْدْ ژِێ رَه بَه و ژِ بُوّ هَمُو نِعْمَتێنْ وِی يێنْ خُيَايِی و نَهێنِی شُكِرْ ژِێ رَه بَه!

**رَحْمنْ:** يێ كُو هَمُو نِعْمَتَانْ دِدَه، بێ سِنُوّرْ و بێ دَاوِينْ قَنْجِيێ لِبَنْدَه و مَخْلُوقێنْ خَوه دِكَه. اَڤْ وَصْفێ شِيرِينْ خَاصێ بِخُدێ ڤَه يَه و قَتْ ژِێ جُدَا نَابَه.

**رَحِيمْ:** يێ كُو وَصْفێ رَحْمَتێ ژِێ رَه سَابِتَه.

**يَوم الدِينْ:** يَومْ، رُوّژَا دِينْ، مَعْنَا وێ يَا فَرْهَنْگِی؛ حَسَابَه، جَزَايَه، ئَانْگُوّ خَلَاتْ و جَلَاتَه. ژِ رُوّژَا دِينْ مَبَسْتْ؛ رُوّژَا قِيَامَتێ يَه كُو خُدێ دێ هَمُو بَنْدَه و مَخْلُوقێنْ خَوه، لِگُوّرِی كِرِنْ و كَارێنْ وَانْ جَزَا بِكَه. هَكَه كِرْيَارێنْ وَانْ قَنْجِی بِنْ دێ خَلَاتْ و پَادَاشێ بِدَه وَانْ و هَكَه كِرْيَارێنْ وَانْ خَرَابِی بِنْ -ژِ بِلِی يێنْ كُو لِوَانْ بِبُوّرَه و تُوبَا وَانْ قَبُولْ بِكَه- دێ وَانْ جَزَا و سَزَا بِكَه. پێڤَا دِينْ دِ حَدِيسَا شَرِيفْ دَه ژِی بِمَعْنَا حَسَابێ بِكَارْ هَاتِيَه. پێخَمْبَرێ خُدێ وُسَا فَرْمَانْ كِرِيَه: «الكَيِّسُ مَنْ دَانَ نَفْسَهُ» ئَاقِلْمَنْدْ اَوْ كَسَه كُوحَسَابێ نَفْسَا خَوه بِدَه دِينێ؛ وێ بِكێشێ حَسَابێ.

**اَوێنْ كُو تَه نِعْمَتْ لِوَانْ كِرِيَه:** پێخَمْبَرْ، شَهِيدْ، يێنْ رَاسْتْ و صَالِحْ. نِعْمَتَا مَزِنْ ئَا كُوخُدێ لِوَانْ كِرِيَه؛ اَوَا كُو اَوْ ژِ رێشَاشِيێ مُحَافَظَه كِرِنَه.

**اَوْ كَسێنْ كُوغَزَبْ لِوَانْ بُويَه:** اَوْ كَسێنْ كُو حَقِّيێ نَاسْ دِكِنْ لِێ قَبُولْ نَاكِنْ.

**اَوْ كَسێنْ كُو ژِ رێ دَرْكَتِينَه:** يێنْ كُو رێكَا حَقْ هِيچْ نَاسْ نَكِرِنَه، ژِ لَوْ كَتِنَه رێكَا چَوتْ و شَاشْ.

# ٢. سُورَه يِىَ بَقَرَه

سُورَه يىَ بَقَرَه، لِمَدينِىَ نَازِلْ بُويَه، دُو صَدْ و هَشْتِىَ و شَشْ ئَايَتِنْ. دِ قُرْئَانِىَ دَه سُورَيِىَ هَرى درِيْژْ بَقَرَيَه هَرْ وَكى يىَ هَرى كُرْتْ ژِى كَوْسَرَه.

نَاڤَرُوْكَا سُورَه يى

سُورَه يىَ بَقَرَه، ژِ پِيْشْگُوْتِنَكْ و سِىَ مِژَارَانْ و دَاوِينَيَكِى پِيْكْ تِىَ. پِيْشْگُوْتِنْ، بيسْتْ ئَايَتَه؛ مِرُوْڤَانْ لِسىَ بَشَانْ پَارْڤَه دِكَه: مُتَّقِى، كَافِرْ و مُنَافِقْ.

دِپِيْنْجْ ئَايَتِيْنْ پِيْشِينْ دَه بَحْسَا مُتَّقِيَانْ، دِ دُو ئَايَتِيْنْ لِپَىْ وَانْ دَه بَحْسَا كَافِرَانْ و دِ سِيْزْدَه ئَايَتِيْنْ لِپَىْ وَانْ دَه ژِى بَحْسَا مُنَافِقَانْ تِىَ كِرِنْ.

اَڤْ سُورَه، دِ نَاڤَا خَوه دَه پِرَانِيَا حُكْمِيْنْ اِسْلَامِىَ؛ عَقيدَه، عِبَادَتْ، دَانْ و سِتَانْدنَانْ، اَخْلَاقْ، زَوَاجْ، ژِنْبَرْدَانِىَ ڤَدِحَوينَه. سُورَه، بَحْسَا دَسْتْپِيْكَا خُلْقَانْدنِىَ و قِصَيَا بَاڤِىَ مِرُوْڤَانْ ئَادَمْ دِكَه.

سُورَه يىَ بَقَرَه، بِپِرَانِى لِسَرْ ئَالِيىَ دَادْوَرِى (حُقُوقِى) رَادِوَسْتَه. كِيْشَيَا حُقُوقِى و رِسْتَيِى چَارَسَرْ دِكَه.

سُورَه، پِشْتْ رَه بَحْسَا اَهْلى كِتِيْبَانْ دِكَه ،ڤِيْجَا مُسلْمَانَانْ لِهَمْبَرى اَخْلاقِيْنْ وَانْ يِيْنْ نَبَاشْ هِشْيَارْ دِكَه. پَاشِىَ بَحْسَا قِصَيَا چِيْلَكِىَ دِكَه كُو دِنَاڤْ جِهُويَانْ دَه زِلاَمَكْ هَاتِبُو كُشْتِنْ و قِصَاسِىَ وى نَه دِيَارْ بُو. ڤِيْجَا وَانْ اَڤْ رَوْشْ ژِ نَبى مُوسَا رَه عَرْزْ كِرِنْ دَا كُو كُوژَرِىَ وى ژِ وَانْ رَه اَشْكَرَه بِكَه. خُدِىَ، ژِىَ رَه وَحى كِرْ كُو ژِ وَانْ رَه بِبِيْژِه؛ بِلا چِيْلَكَكِىَ سَرْژِىَ بِكِنْ و پَارْچَيَكْ ژِگُوْشْتِىَ وِىَ دِ لَاشِىَ كُشْتِى بِدِنْ ، ڤِيْجَا بِدَسْتُورَا خُدِىَ كُشْتِى دِىَ سَاغْ بِبَه و اَوِىَ كُوژَرِىَ خَوه دِيَارْ بِكَه.

سُورَه، بِدُوْرْفَرَهِى بَحْسَا حُكْمِىَ رُوْژِيىَ، حَجِىَ، عُمْرِىَ، جِيهَادِىَ، كَارْ و بَارِيْنْ مَالْبَاتِى و حَرَامْبُونَا مَهرْكِرِنَا ژِنِيْنْ مُشْرِكْ دِكَه.

سُورَه، پِشْتْ رَه بَحْسَا حَرَامْبُونَا رِبَايِىَ (سَلَفِىَ) دِكِىَ. سُورَه، پَاشِىَ گَازِى مُسلْمَانَانْ دِكَه كُو اَوْ تُوْبَه بِكِنْ، ژِخُدِىَ لاڤَلاڤِىَ بِكِنْ و لِهَمْبَرى كَافِرْ و حَقْڤَشِيْرَانْ اَرِيكَارِيىَ ژِىَ بِخَوازِنْ. چَاوَا كُو سُورَه، بِوَصْفِيْنْ بَاوَرْمَنْدَانْ دَسْتْ پِىَ دِكَه هَرْوِهَا بِدُعَايَا مُؤْمِنَانْ ژِى دَاوى دِبَه. يَعْنِى سَرِىَ سُورَه و دَاوِيَا وِى بِهَڤْ رَه ئَاهَنگْسَازْ و پِيْوَنْدِى دَارِنْ!

**بِنَاڤِیَ خُدَایِیَ کُو رَحْمَنَ رَحِیمَ**

١. اَلِیف، لَامْ، مِیمْ.[١]

٢. اَڤَا اَوْ کِتێبَه، تِیَ دَه گُومَانْ تُونَه (کُواَوْ نَه ژِ جَمْ خُدێ یَه)، (اَوْ) ژِ یێنْ مُتَّقِی (یێنْ خَوه دِ پَارێزِنْ) رَه رێهْبَرَه.

٣. (مُتَّقِی،) اَوێنْ کُو بِغَیْبێ (یَا نَه لِبَرْچَاڤْ) بَاوَرِیێ تِینِنْ و بِئَاوَایێ پێدِڤِی نِمێژْ دِکِنْ و ژِ رِزْقِیێ کُو مَه دَایَه وَانْ (دِ رِیَا خُدێ دَه) خَرْجْ دِکِنْ.

٤. (مُتَّقِی،) اَوێنْ کُو بِکِتێبَا ژِ تَه رَه و بِکِتێبێنْ کُو ژِ پێخَمْبَرێنْ بَرِیَا تَه رَه هَاتِنَه شَانْدِنْ بَاوَرِی تِینِنْ و بِئَاخْرَتِیێ ژِی اَوْ ژِدِلْ یَقِینْ دِکِنْ.

٥. هَا اَوْ، ژِئَالِیێ خُدَایێ خَوه ڤَه لِسَرْ زَانِینْ و رِیێکَه رَاسْتِنْ و هَا اَوْ، یێنْ کُو بِگِهِشْتِنَا دَاخْوازَا خَوه سَرْکَفْتِی و سَرفِرَازِنْ.[٢]

---

١ ددَسْتپێکَا هِنْ سُورَێێنْ قرئَانِیێ دَه هِنْ حَرْفێنْ کُو ژِ وَانْ رَه حُرُوفُ الْمُقَطَّعَه حَرْفێنْ کِتَه کِتَایِی تِیێ گُوتِنْ هَنَه. اَڤْ حَرْفْ بِنَاڤِیێ خَوه تێنَه خَونْدِنْ و دَاوِیَا وَانْ سَاکِنِنْ؛ بێ سَر، بێ ژێرْ و بێ بَرِنْ.

ا) اَڤْ حَرْفْ، دِسَرِی دَه تێنْ، مُخَاطَبِی(بَرْپێڤِی) هِشْیَارْ دِکِنْ دَا کُو بَالَا وِی بِکِشِینِنْ سَرْ وَصْفِیێ قُرْئَانِیێ.

ب) اَڤْ حَرْفْ، اِعْجَازَا قُرْئَانِیێ نِیشَانْ دِدِنْ و لِهَمْبَرِی بَرْپێڤَانْ دَلِیلَانْ تِینِنْ، بَالِیێ دِکِشِینِنْ سَرْ حُکْمُ و قَانُونێنْ کُو دِ نَاڤْ سُورَه یِی دَه تێنْ.

ج) اَڤْ حَرْفْ، نِیشَانْ دِدِنْ کُو قُرْئَانَا پِیرُوزْ ژِجِنْسێ ڤَانْ حَرْفَانْ پێکْ هَاتِیَه و اَوْ حَرْفْ دِ نَاڤْ دژبَرْ و مُخَاطَبێنْ وِیێ دَه و دِ نَاڤْ مُشْرِکێنْ مَکێ دَه ژِی هَبُونْ. قُرْئَانْ، ژِ وَانْ رَه نَه جَارِکێ، پِرْ جَارَانْ دِبێژَه: "دَه هُونْ ژِی کِتێبَکَه وَکِی وِێ، دَهْ سُورَه یێنْ مِینَا سُورَه یێنْ وِێ ئَانْ ژِی سُورَه یَکِی بِینِنْ." لِێبَلِیێ ڤِیێ بَانْگِیێ اَوْ بێ چَارَه هِشْتِنْ و وَانْ نِکَارِیبُو بَرْسِڤَا وِیێ بِدِنْ و تێکْ چُونْ.

د) قُرْئَانْ نِیشَانْ دِدَه کُو پَرْوَرْدَهِی بِڤَانْ حَرْفَانْ دَسْتْ پێ دِکَه و دِیێ وِسَا بَردَوَامْ بَه.

٢ خُدِیێ، دِ دَسْتپێکَا ڤِی سُورَیِی دَه اِنْسَانْ لِسَرْ سێ صِنْفَانْ بَشْ کِرِیَه: مُؤْمِنْ ، کَافِرْ و مُنَافِقْ. اَڤْ بَشْکِرنَکَه رَاسْتْ و شَرْعِیَه . دِ هَرْ پێنْج ئَایَتێنْ اَوِلْ دَه سَالِخێنْ مُؤْمِنَانْ دَایَه، دِ ئَایَتَا شَشْ و هَفْتِیێ دَه بَحْسَا کَافِرَانْ کِرِیَه و ژِ ئَایَتَا هَشتَانْ هَیَانِی ئَایَتَا بِیسْتُ و یَکِیێ سَالِخێ مُنَافِقَانْ دَایَه.

٦. بێگُمَانْ اَوێنْ كَافِرْ بُونَه (كُو اِنْكَارِى ژِخَو رَه كِرِنَه پِيشْ و رِێبَازْ)، چه تُو وَانْ (بِعَذَابِىٰ خُدِىٰ) بِطِرْسِينِى و چه تُو نَه طِرْسِينِى ژِ وَانْ رَه وَكْ هَڤَه؛ اَوْ اِيمَانِىٰ نَايِنِنْ.

٧. (بِسَدَمَا كُو لِسَرْ كُفْرِىٰ بِرِكِنْ) خُدِىٰ سَرْ دِلْ و گُوهێنْ وَانْ مُوَرْ كِرِيَه، لِسَرْ چَاڤێنْ وَانْ پَرْدَكِرِيَه و ژِ بُو وَانْ عَذَابَكِى مَزِنْ هَيَه.

٨. ژِمرُوَڤَانْ هِنْ دِبێژِن: "مَه بِخُدِىٰ و بِرُوَژَا ئَاخْرَتِىٰ بَاوَرِى ئَانِيَه". رَوْشْ اَڤَه؛ وَانْ بَاوَرِى نَئَانِيَه.

٩. ژِوَانْ وَيَه كُو اَوْ خُدِىٰ و يێنْ كُو بَاوَرِى ئَانِينَه دخَاپِينِنْ. حَالْ اَڤَه؛ اَوْ خَوه دِخَاپِينِنْ و تێنَاگِهِژِنْ ژِى.

١٠. د دِلێنْ وَانْ دَه نَخَوشِى (يَا نِيفَاقِىٰ) هَيَه، ڤێجَا خُدِىٰ ژِى نَخَوشِيَا وَانْ زێدَه كِرْ. ژِ بَرْ كُو دَرَوَانْ دِكِنْ ژِ بُو وَانْ عَذَابَكِى دِژْوَارْ هَيَه.

١١. دَمَا ژِ وَانْ رَه تِىٰ گُوتِن: "لِسَرْ عَرْدِىٰ فَسَادِيِىٰ نَكِنْ"! دِبێژِنْ: "اَمْ بَسْ مِرُوَڤێنْ چَاكْسَازْ و ڤَنْجِيخَوازِنْ."

١٢. ئَاگَاهْدَارْ بِنْ، بِرَاسْتِى مِفْسِدْ (خَرَابْكَرْ)اَوْ بِخَونَه لِىٰ بَلِىٰ اَوْ تِىٰ نَاگِهِيژِنْ.

١٣. دَمَا ژِوَانْ رَه تِىٰ گُوتِن: "چَاوَا كُو خَلْكِىٰ (بَاورمَنْد يێنْ لِدُوَرَا پێخَمْبَر) اِيمَانْ ئَانِينَه هُونْ ژِى اِيمَانِىٰ بِينِنْ" . دِبێژِن: "اَرِىٰ، كَا چَاوَا ئَاقِلْ سِڤِكَانْ اِيمَانْ ئَانِيِيَه مَا اَمِىٰ ژِى اِيمَانِىٰ بِينِنْ؟" نَخێرْ؛ بِرَاسْتِى ئَاقِلْ سِڤِكْ هَرْ اَوْ بِخَونَه، لِىٰ بَلِىٰ اَوْ نِزَانِنْ.

١٤. گَاڤَا لَقَايِى بَاوَرْمَنْدَانْ دِبِنْ، دِبێژِن: "مَه ژِى بَاوَرِى ئَانِيَه." لێبَلِىٰ گَاڤَا اَوْ بِشَيْطَانێنْ خَوه رَه بِتَنِىٰ دِمِينِنْ، دِبێژِن: "بِرَاسْتِى اَمْ بِوَرَنَه؛ بَسْ اَمْ طِنَازێنْ خَوه بِوَانْ دِكِنْ".

١٥. بِرَاسْتِى خُدِىٰ بِعَذَابِىٰ خَوه طِنَازێنْ وَانْ لِوَانْ ڤَدگَرِينَه و دِسَرْخَوڤَچُونَا وَانْ دَه مُهْلَتِىٰ دِدَه وَانْ كُو هَرْ تِىٰ دَه حَيرْمَايِى دِمِينِنْ.

**١٦.** هَا اَڤْ، اَوێنْ كُو دِ بَدێلَا هِيدَايَتِێ دَه رێشَاشِى كِرِينَه، ڤێجَا ڤِێ كِرِينُ و فِرُۆتِنَا وَانْ كَارْ نَه ئَانِيَه و اَوْ بِسَرْ رێكَا رَاسْتْ ڤَه ژِى نَبُونَه.

**١٧.** رَوْشَا وَانْ (مُنَافِقَانْ) عَيْنِى وِكِى رَوْشَا وَانْ كَسَانَه كُو (دِشَڤَا طَارِى دَه) ئَاگِرَكِى ڤێدِخِنْ. ڤێجَا دَمَا ئَاگِرْ ڤێكَتْ و رُۆنَاهِى دَا هَاوِيردُۆرَا وَانْ؛ ژِ نِشْكَاڤَه خُدِێ رُۆنَاهِيَا وَانْ بِرْ و اَوْ دِطَارِيتِيَكِێ دَه هِشْتِنْ كُو اِێدِى اَوْ نَابِينِنْ.[1]

**١٨.** اَوْ (مُنَافِقْ) كَرِنْ، لالِنْ، كُۆرِنْ، ڤێجَا (پِشتِى كُو حَقِى نَاسْ كِرِنْ ژِى ژِ پُوچِيَا خَوه) اَوْ ڤَنَاگَرِنْ.

**١٩.** يَانْ ژِى حَالِێ وَانْ مِينَا حَالِێ وَانْ كَسَانَه كُو اَوْ رَاسْتِى طَاڤَبَارَانَكِێ بِێنْ كُو تِێ دَه طَارِيتِى، گُرْمَه گُرمْ و بِرُوسْكْ هَنَه.اَوْ ژِبَرْ گُرْمِينِيَا بِرُوسْكَانْ، ژِ طِرْسَا مِرِنِێ تِلِيێنْ خَوه دِخِنْ گُوَهِێنْ خَوه. خُدِێ (بِزَانِينَا خَوه) دُۆرْ لِكَافِرَانْ گِرتِيَه.

**٢٠.** دِڤِێ نَاڤِێ دَه، هِندِكْ دِمِينَه كُو بِرُوسْكْ (رُۆنَاهِيَا) چَاڤێنْ وَانْ بِسْتِينَه. چه گَاڤَا دُۆرَا وَانْ رُۆنَاهِى كِرْ، اَوْ هِنَكى دِمَشِنْ و چه گَاڤَا لِوَانْ طَارِى دِبَه رَادِوَسْتِنْ. اَگَرْ خُدِێ بِخوسْتَا، مُحَقَقْ دِێ چَاڤێنْ وَانْ كُۆرْ و گُوَهِێنْ وَانْ كَرْ بِكِرَانَا. بێگُومَانْ خُدِێ لِسَرْ هَرْ تِشْتِى قَادِره.

**٢١.** گَلى مِرُۆڤَان! هُونْ ژِ بُۆ وِى خُدَايِێ كُو هُونْ و يێنْ بَرِيَا وَه خُلِقَانْدِنَه عِبَادَتِێ بِكِنْ، دَا كُو هُونْ (ژِعَذَابِێ خُدِێ) خَوه بِپَارێزِنْ.

**٢٢.** اَوْ خُدَايِێ كُو عَرْدْ ژِ بُۆ وَه رَاخِسْتِيَه كِرِيَه دُۆشَكْ، اَسْمَانْ ژِى كِرِيَه ئَاڤَاهِى و ژِ بُۆ وَه ژِعَوْرَانْ ئَاڤْ دَاخِسْتِيَه سَرْ عَرْدِێ. بِوِێ ئَاڤِێ ژِى، ژِ بُۆ وَه تَخْلِيتێنْ فِێكِيَانْ ژِعَرْدِێ

---

١ رَوْشَا مُنَافِقَانْ ژِى هَرْ وِسَايَه؛ وَانْ ژِبَاوَرِيَا نَه ژِدِلْ دِ دِنِيَايِێ دَه سُودْ ژِێ وَرْگِرتِنْ و بوِێ بَاوَرِيِێ نَفْسَا خَوه، مَالِێ خَوه خِسْتِنْ اِێمَنَاهِيِێ. لِێ بَلِێ دَمَا ژِنِشكَاڤَه مِرِنِێ هِجُوم دَا سَرْ وَانْ، ڤێجَا اَوْ بَاوَرِيَا كُو نَه ژِدِلْ بُو لِسَرْ وَانْ بُو طَارِسْتَانْ؛ طَارِتِيَا تِرْبِێ، طَارِتِيَا نِفَاقْ و كُفرِێ.اَوْ اِێمنَاهِى ژِى، ژِ طِرْسَا عَذَابِێ خُدِێ بُو طِرْسُ و دَرْدُ و كُۆڤَانْ.

دَرْخِسْتيَه. نَاخَو، ژِخُدِىٚ رَه هَڤْپِشْكَانْ چِىٚمَكِنْ دِگَلْ كُو هُونْ دِزَانِنْ (هَڤپِشْكَ ژِىٚ رَه تُنِنْ ژِى).

**٢٣.** (گَلِى مِرُوٚڤَان!) اَگَرْ كُو هُونْ دَرْبَارِى يَا كُو مَه ژِ بُوٚ عَڤْدِىٚ خَوه شَانْدِيَه گُومَانْدَارْ بِنْ، ڤِىٚجَا؛ اَگَرْ بَرَا هُونْ رَاسْتْ دِبِىٚژِن: دَه هُونْ ژِى سُورَه يَكِى مِينَا وِىٚ بِينِنْ و ژِ بِلِى خُدِىٚ بَانْگِى پِشْتَڤَانِيٚنْ خَوه ژِى بِكِنْ (دَا كُو ژِ وَه رَه بِبِنْ پِشْتَكْ و ئَارِيكَارْ).

**٢٤.** اَگَرْ وَه اَڤْ نَكِرْ –ژِ خَوه هُونْ نِكَارِنْ بِكِنْ ژِى- نَاخَو، خَوه ژِوِى ئَاگِرِىٚ كُو ئَارْدُويِىٚنْ وِى اِنْسَانْ و كَڤِرِنْ بِپَارِىٚزِنْ كُو اَوْ ژِ بُوٚ كَافِرَانْ هَاتِيَه ئَامَادَكِرِنْ.

**٢٥.** مِزْگِينِىٚ بِدَه وَانِيٚنْ كُو بَاوَرِى ئَانِينْ و كَارِيٚنْ قَنْجْ كِرِنَه كُو بِرَاسْتِى ژِ بُوٚ وَانْ بِهِشْتِيٚنْ وِسَا هَنَه كُو دِبِنِىٚ وَانْ رَه رُوٚبَارْ دِهَرِكِنْ. چه گَاڤَا مِيٚويَكَه وَانْ بِهِشْتَانْ ژِ بُوٚ وَانْ تِىٚ پِيٚشْكِيٚشْكِرِنْ، دِبِيٚژِن: ”اَڤْ ژِ وَانْ مِيٚويَانِنْ كُو بَرِى نِهَا مَه خَوارِبُو.“ هَرْ چه كُو بِشَكْلِىٚ خَوه مِينَا هَڤِنْ ژِى، لِيٚبَلِىٚ دِطَعْمُ و خَوشِيَا خَوه دَه جُدَا نَه. ژِ بُوٚ وَانْ لِبِهِشْتِىٚ هَڤْسَرِيٚنْ پَاكْ و پَاڤِژْ هَنَه و اَوِىٚ حَتَا بِحَتَايِىٚ تِىٚ دَه بِنْ.[1]

**٢٦.** بِيٚگُمَانْ خُدِىٚ ژِخَوه رَه كِيَاسِيِىٚ نَابِينَه كُو مَسَلَيَا حَقِيِىٚ بِپِيٚشُويكِىٚ و بِتِشْتَكِى هِىٚ ژِ وِىٚ پِچُوكتِرْ ژِى اَشكَرَه بِكَه. هَرْچِى يِيٚنْ كُو بَاوَرِى ئَانِينَه، ژِخَوه دِزَانِنْ كُو اَڤْ مِينَاكْدَايِنْ حَقَه، ژِ جَمْ خُدَايِىٚ وَانَه. هَچِى يِيٚنْ كَافِرِنْ، اَوْ دِبِيٚژِنْ: ”مَا خُدِىٚ بِڤِىٚ مِينَاكْدَانِىٚ چه قَصْدْ دِكَه؟“ (خُدِىٚ،) بِڤِىٚ مِينَاكْدَانِىٚ گَلَكْ اِنْسَانَانْ ژِ رِىٚ دَرْدِخَه و گَلَكَانْ ژِى تِينَه سَرْ رِيَا رَاسْتْ و ژِ فَاسِقَانْ پِىٚ ڤَه تُو كَسِى پِىٚ ژِ رِىٚ دَرْنَاخَه.

---

١ خُدِىٚ جَنَّتْ بِرُوٚبَارَانْ وَصفْ كِرِيَه. لِيٚبَلِىٚ كَا اَوْ رُوٚبَارْ ژِ چه نَه دِ ڤِرْ دَه اَشْكَرَا نَكِرِيَه. خُدِىٚ اَوْ ژِ سُورَهيِىٚ مُحَمَّدْ دِ ئَايَتَا ١٥ىٚ دَه بَيَانْ كِرِيَه؛ «...دِ نَاڤْ دَه چِمِيٚنْ ژِ ئَاڤِىٚ هَنَه كُو خَرَابْ نَابَه، تِىٚ دَه چِمِيٚنْ ژِ شِيرْ هَنَه كُو طَعْمَا وِى نَايِىٚ گُهَارْتِنْ، تِىٚ دَه چِمِيٚنْ ژِ شَرَابَانْ هَنَه كُو ژِ يِيٚنْ ڤَدخُونْ رَه لَزِيزَه، تِىٚ دَه چِمِيٚنْ ژِ هِنْگڤِىٚ حَلَانْدِى يِيٚنْ صَفَانْدِى هَنَه و تِىٚ دَه ژِ بُو وَانْ هَرْ تَخْلِيتْ فِيٚكِى هَنَه و ژِ جَمْ خُدَايِىٚ وَانْ ژِ بُو وَانْ لِيٚبُورِينَكْ هَيَه..»

**٢٧.** اَوْ (فَاسِقْ) يِێنْ كُو پِشْتِى سُۆزَا ڤَبرِى بِخُدِێ رَه دَانَه سُۆزَا خَوه دِشكِينِنْ و يَا كُو خُدِێ بِگِهَانْدِنَا وِێ فرمَانْ كِرِيَه اَوْ وِێ دِبرِنْ و لِسَرْ رُويِێ عَرْدِێ فَسَادِيِێ دِكِنْ. هَا اَوْ، يِێنْ كُو خَسَارْ كِرِنَه.[1]

**٢٨.** (گَلِى كَافِرَانْ!) هُونْ چَاوَا خُدِێ اِنْكَارْ دِكِنْ؟! حَالْ اَڤَه كُو هُونْ بَرِێ مِرِى بُونْ، ڤِێجَا خُدِێ هُونْ سَاغْ كِرِنْ، پَاشِێ دِێ وَه بِمِرِينَه، پَاشِێ دِيسَا (رُۆژا قِيَامَتِێ) دِێ وَه سَاغْ بِكَه، پِشْتِى ڤِێ هُونِێ بِبَالِێ ڤَه ڤَگَرِنْ (و حَسَابِێ خَوه بِدِنِێ).

**٢٩.** اَوْ خُدَايِێ كُو چِه تِشتِێ لِعَرْدِێ هَيَه تَڤْ ژِ بُۆ وَه ئَافِرَاندِنَه، پَاشِێ (بِئَاوَايَكِى خَاصِێ خَوه) لِئَاسِيمَانَانْ ڤَگَرِيَا؛ اَوْ كِرَه هَفْتْ طَبَقْ (و سَرَرَاسْتْ كِرْ) و اَوْ بِهَرْ تِشْتِى زَانَا يَه.

**٣٠.** وِێ دَمَا خُدَايِێ تَه ژِمَلَائِيكَتَانْ رَه گُوْتْ: بِرَاسْتِى اَزِێ لِسَرْ عَرْدِێ خَلِيفَيَكِى بِخُلِقِينِمْ؛ (مَلَائِيكَتَانْ) گُوْتْ: "مَا تُو يِێ مَخْلُوقِێنْ كُو لِعَرْدِێ فَسَادِيِێ بِكِنْ و خُوِينِێ بِرِێژِنْ بِخُلِقِينِى؟" حَالْ اَڤَه كُو اَمْ حَمْدِێ تَه دِكِنْ و تَه پَاكْ دِدِێرِنْ. (خُدِێ) گُوْتْ: "بِرَاسْتِى يَا كُو هُونْ پِێ نِزَانِنْ اَزْ دِزَانِم."[2]

**٣١.** (خُدِێ) تَڤَكِێ نَاڤِێنْ تِشْتَانْ بِئَادَمْ دَا هِينْكِرِنْ. پَاشِێ اَوْ(تِشْتْ) نِيشَانِى مَلَائِيكَتَانْ دَانْ و ژِ وَانْ رَه گُوْتْ: "اَگَرْ بَرَا هُونْ رَاسْتْ دِبِێژِن؛ دَه نَاڤِێنْ ڤَانْ تِشتَانْ ژِمِنْ رَه بِبِێژِنْ."

---

١ خُدِێ بِڤِێ ئَايَتِێ بَرِێ مَه دِدَه بِبَال تِێكِلِيِێنْ مۆرِڤَاتِيِێ ڤَه. اَڤْ تِێكِلِى ژِ عَائِلِێ دَسْتْ پِێ دِكَه، پَاشِێ فِرَهْ دِبَه دَا كُو خَودِى و خِزِم تِێكَڤِنْ بِنْ ، دِيسَا فِرَهْ دِبَه دَا كُو تَڤَكِێ بَاوَرْمَنْدَانْ تِێكَڤِنْ بِنْ، دِيسَا فِرَهْ دِبَه دَا كُو تَڤَكِێ عالَمِێ تِێكَڤِێ بِنْ. هَا اَڤْ اَوْ بِرَاتِيَا اِنسَانِيَتِێ يَه خُدِێ بَرِێ مَه دِدَه بَال ڤَه دَا كُو اَمْ رَحْمِێ لِهَڤ بِكِنْ و بَرِێ هَڤْ بِدِنْ رِێكَا رَاسْتْ و خِلَاسِيِێ. اَڤْ نَه تَنِێ وَظِيفَكِى اِنسَانِى يَه؛ بَلْكِى وَظِيفَيَكِى اِيمَانِى و اِسْلَامِى يَه ، يِێ كُو نَكَه بِێ اَمرِيَا خُدِێ دِكَه و پِێ گُونَهكَارْ دِبَه.

٢ بِرَاسْتِى اَڤَا كُو دِ ئَايَتِێ دَه دَارِبَاسْ بُويَه كُو «اِنْسَانْ خَلِيفَه يَه»، مَعْنَى وِێ نَه اَڤَه كُو؛اَوْ خَلِيفِێ خُدِێ يَه؛ بَلْكِى خَلِيفَتِيَا اِنسَانِى ژِ بُۆ اِنسِێنَه. چَاوَه كُو خُدِێ گُوْتِى: »پِشْتْرَه مَه، لِدُوڤ وَانْ، وَه لِسَرْ عَرْدِێ كِرَه خَلِيفَه (شُونگِر)يِێنْ وَانْ، دَا كُو اَمْ بِنِێرِن؛ كَا هُونِێ چَاوَا تَڤبِگَرِنْ. يونُس: «١٤خَلِيفَتِيَا دِزَمِينِێ دَه؛ لِگُۆرِ مَكَانْ و زَمَانِيَه، خَلِيفَه لِسَرْ عَرْدِێ دَم بِدَم، نِفشْ بِنِفشْ دِكَڤِنْ شُونَا هَڤْ و دُو.

**٣٢.** گُوتِن: (خُدَايێ مه!) اَمْ، تَه ژِهَمُو كِيَاسِيَانْ پَاكْ دِدێرِنْ، ژِ تِشتێ تَه بِمَه دَابَه زَانِينْ پێ ڤَه تُو زَانِينَكَه مَه نِينَه. بِرَاسْتِي هَرْ تُويِي يێ زَانَا يێ كَاربِنَجِهْ.

**٣٣.** (خُدێ) گُوتْ: "هَێ ئَادَم! دَه بِنَاڤێنْ ڤَانْ تِشْتَانْ مَلائِيكَتَانْ ئَاگَاهْدَارْ بِكَه." ڤێجَا چِه گَاڤَا ئَادَمْ بِنَاڤێنْ وَانْ اَوْ ئَاگَاهْدَارْ كِرِنْ، خُدێ گُوتْ: "مَا ڤَێ مِنْ ژِ وَه رَه نَگُوتبُو كُو اَزْ بِغَيْبَا عَرْدُ و ئَاسِيَانَانْ دِزَانِمْ و اَزْ بِتِشْتێ كُو هُونْ اَشكَرَه دِكِنْ و يێنْ كُو هُونْ ڤَدِشێرِنْ ژِی دِزَانِمْ؟"

**٣٤.** وێ دَمێ مَه ژِمَلائِيكَتَانْ رَه گُوتْ: «ژِئَادَم رَه هَرِنْ سِجُودێ.»ژِبِلِی اِبلِيسْ هَمُو ژِێ رَه چُونَه سِجُودێ. وِی خَوه ژِێ دَا پَاشْ، وِی خَوه مَزِنْ دِێرَا و (ژِبَرْ ڤێ يَكێ)اَوْ بُو ژِكَافِرَانْ.

**٣٥.** مَه گُوتْ: هَێ ئَادَمْ! تُو و هَڤْسَرَا خَوه لِبِهِشْتێ بِجِهْ بِبِنْ. ژِ چِه جِهێ وَه بِڤێ بِێ مِنَتْ و بِنۆشِيجَانِي ژِێ بِخُونْ و خَوه نێزِی ڤێ دَارێ نَكِنْ، ڤێجَا (اَگَرْ هُونْ نێزِی وێ بِبِنْ) هُونێ بِبِنْ ژِ ظَالِمَانْ.

**٣٦.** ڤێجَا شَيْطِێنْ اَوْ (ژِجَنَتێ) شَمِطَانْدِنْ؛ اِيْدِی ژِنَاڤْ خَوشِيێنْ كُو اَوْ تێ دَه بُونْ دَرَانْدِنْ. مَه گُوتْ: "دَه دَاكَڤِنْ ژِ وِرْ كُو هِنْ ژِوَه ژِهِنَكَانْ رَه دِژمِنْ بِنْ و حَتَا هُونْ سَاغْ بِنْ، لِسَرْ عَرْدِێ ژِ بُۆ وَه نِشْتَجِهْبُونْ و پێخَوشْبُونْ هَيَه.

**٣٧.** پَاشێ ئَادَم ژِخُدَايێ خَوه هِنْ پَيڤْ وَرْگِرتِنْ (بِوَانْ پَيْڤَانْ بِبَالْ خُدێ ڤَه تُوبَه كِرْ). ڤێجَا خُدێ ژِی تُوبَا وِی قَبُولْ كِرْ. بِرَاسْتِي خُدێ زێدَه تُوبَپَژێرْ و دِلۆڤَانَه.[1]

**٣٨.** مَه (ژِوَانْ رَه) گُوتْ: "دَه هُونْ تَڤْ ژِبِهِشْتێ دَاكَڤِنْ! اَگَرْ ژِجَمْ مِنْ هِدَايَتَكْ ژِوَه رَه بێ؛ اِيجَارْ كِی ژِوَه بِدَه پێ هِدَايَتَا مِنْ، ژِوَانْ رَه تُو طِرسْ تُنَه و اَوێ خَمْگِينْ ژِی نَبِنْ.

---

١ اَوْ پَيڤێنْ كُو ادَم و حَوَّا ژِخُدێ ورگِرتِنْ و بِوَانْ تُوبَه كِرِنْ اَڤْ اَيَتَا پِيرُوزَه: "(ئَادَمْ و حَوَّا) گُوتِن: خُدَايێ مَه! مَه نَحَقِی لِخُو كِرْ، اَگَرْ تُو لِمَه نَبُورِی و رَحْمێ لِمَه نَكِی، تَقَزْ اَمێ بِبِنْ ژِيێنْ خَسِرِی." (اَعْرَاف:٢٣)

٣٩. هَچِی اَوِیٚنْ کَافِربُوِیینْ و ئَایَتِیٚنْ مَه دَرَوْ دَرخِستِنْ، اَوْ خَلْکِیٚ اِیٚگِرِنْ؛ اَوِیٚ حَتَا بِحَتَایِیٚ تِیٚ دَه بِنْ.

٤٠. گَلی زَارُوٚیِیٚنْ اِیسْرَائِیلْ !اَوْ قَنْجِیَا مِنْ لِوَه کِری بِیٚنِنْ بیرَا خَوه. اَوْ پَیْمَانَا وَه دَایَه مِنْ بِجِهْ بِینِنْ، اَزِیٚ ژِی پَیْمَانَا کُو مِنْ دَایه وَه بِجِهْ بِینِم و بَسْ ژِمِنْ بِطِرْسِنْ.

٤١. بِکِتیٚبَا مِنْ ئَانِیَه خوَارِیٚ بَاوَرِیِیٚ بِینِنْ کُو اَوْ رَاسْتَدَرِیٚخَا کِتِیبِیٚنْ بَرْ دَسْتِیٚ وَه یَه (کُو اِنْجِیلْ و تَوْرَاتِنْ) و نَبِنْ اِنکَارکَرِیٚنْ پِیٚشی بِڤِیٚ قُرْئَانِیٚ. ئَایَتِیٚنْ مِنْ بِاَرْزَانی نَفرُوٚشِنْ و هَرْ ژِ(عَذَابِیٚ)مِنْ خَوه بِپَارِیٚزِنْ.

٤٢. حَقِیِیٚ تَڤْلی نَحَقِیِیٚ نَکِنْ و حَقِیِیٚ ڤَنَشِیٚرِنْ دِگَل کُو هُونْ دِزَانِنْ حَقَه.

٤٣. بِبَرْدَوَامی نِمیٚژْ بِکِنْ، زَکَاتَا مَالِیٚ خَوه بِدِنْ و بِنِمیٚژْکَرَانْ رَه نِمیٚژْ بِکِنْ.

٤٤. اَرِیٚ مَا هُونْ شِیرَتَا قَنْجِیِیٚ لِخَلْکِیٚ دِکِنْ و هُونْ خَوه ژِبِیرْ دِکِنْ، دِگَل کُو هُونْ کِتِیبِیٚ (تَوْرَاتِیٚ) ژِی دِخُوِینِنْ. مَا ڤَیْ هُونْ ئَاقِلْ نَاگِرِن؟

٤٥. بِبِیٚهِنْفَرَهی و بِنِمیٚژِیٚ پِشْتَا خَوه قَاهِیم بِکِنْ. بِرَاسْتِی ژِی فَرْمَانِیٚن خُدِیٚ ژِ خُدِیٚطِرْسَانْ پِیٚ ڤَه لِسَرْ هَرْ کَسی گِرَانْ تِیٚ.

٤٦. (ژِخُدِیٚطِرْسْ)اَوِیٚنْ کُو یَقِینْ بَاوَرْ دِکِنْ کُو اَوِیٚ بِگَهِیژِنْ خُدَایِیٚ خَوه و بِرَاسْتِی اَوِیٚ لِیٚ ڤَگَرِنْ (و حَسَابِیٚ خوَه بِدِنِیٚ).

٤٧. گَلی زَارُوٚیِیٚنْ اِیسْرَائِیلْ!اَوْ قَنْجِیَا مِنْ لِوَه کِرِبُو بِیٚنِنْ بیرَا خَوه و بِرَاسْتِی ژِی مِنْ قَدْرِیٚ وَه دِسَرْ یِیٚ عَالَمِیٚ رَه چِیٚتِرْ گِرتِبُو.[1]

١ دِڤِیٚ ئَایَتِیٚ دَه مَقسَدْ ژِ "عَالَمِیٚ" اِنسَانِنْ، نَه کُو تَڤَکِیٚ مَخلُوقَانَه. مَعْنَا ئَایَتِیٚ "مَه قَدْرِیٚ وَه دِسَرْ اِنسَانِیٚنْ دَمَا وَه رَه گِرتِبُو. سُورَیِیٚ مَائدَه ئَایَتَا -٢٠-یٚ؛ "وِیٚ دَمِیٚ مُوسَا ژِگَلِیٚ خَوه رَه گُوٚتْ: گَلی مِلَتِیٚ مِنْ! قَنجِیَا خُدِیٚ لِوَه کِری بِینِنْ بیرَا خَوه؛ چَاخَا پِیٚخَمبَرْ ژِ (نَاڤ) وَه رَاکِرِنْ و هُونْ کِرِنْ حُکمْدَارْ و یَاکُو نَه دَابُو تُو کَسی دَابُو وَه" ڤِیٚ حَقیقَتِیٚ تکَزْ دِکَه.

**٤٨.** ژِ رُۆژَكَه وِسَا بِطِرْسِنْ كُو دِ وِىٚ رُۆژِىٚ دَه كَسْ فَيْدِىٚ نَادَه كَسى، مَهْدَريَا (شَفَاعتَا) تُو كَسِى نَايِىٚ قَبُولْ كِرِنْ، ژِ تُو كَسِى فِدْيَه نَايِىٚ وَرْگِرتِنْ و ئَاريكَاريَا وَانْ نَايِىٚ كِرِنْ.

**٤٩.** بِيْنِنْ بِيرَا خَوه؛ وِىٚ گَاڤَا مَه هُونْ ژِ فِرْعَوْنُ و بَرَكَا وِى رِزگَارْ كِرِنْ كُو وَانْ هُونْ لِعَذَابِىٚ هَرِى دِژْوَارْ دِچِيْژَانْدِنْ؛ كُرِيْنْ وَه دِكُوشْتِنْ، كَچِيْنْ وَه (ژِ بُوْ خِزْمَتِىٚ) سَاغْ دِهِشْتِنْ. بِرَاسْتِى دِڤِىٚ (رَوْشَا وَه) دَه، ژِ طَرَفْ خُدَايِىٚ وَڤَه ژِ بُوْ وَه اِمْتِيحَانَكَه مَزِنْ بُو.

**٥٠.** هَرْ وِسَا بِيْنِنْ بِيرَا خَوه؛ گَاڤَا مَه ژِ بُوْ وَه دَرْيَا كِرَه دُو شَقْ؛ ڤِيْجَا مَه هُونْ رِزگَارْكِرِنْ و مَه بَرَكَا فِرعَوْنْ خَنِقَانْدْ و وَه لِوَانْ تَمَاشَه دِكِرْ.[1]

**٥١.** هَرْ وِسَا، وَخْتَا مَه پَيْمَانَا چِلْ شَڤِى دَا مُوسَا و وَه دِيَىْ وِى رَه گُوْلِكْ كِرَه إِلٰهْ (وَه ژِىٚ رَه عِبَادَتْ كِرْ) و بِڤِى ئَاوَايِى وَه لِخَوه ظُلِمْ كِرْ.

**٥٢.** پِشْتِى ڤِىٚ مَه هُونْ عَفُوكِرِنْ دَا كُو هُونْ شُكْرِىٚ خُدَايِىٚ خَوه بِكِنْ.

**٥٣.** بِيْنِنْ بِيرَا خَوه؛ وِىٚ گَاڤَا مَه كِتِيْبْ و فُرْقَانْ (يَا كُو حَقْ ژِ بَاطِلِى جُدَا دِكَه) دَا مُوسَا ژِ بُوْ كُو هُونْ بِيْنَه سَرْ رِيَا رَاسْت.

**٥٤.** بِيْنَه بِيرَا خَو؛ وِىٚ دَمَا مُوسَا ژِگَلِىٚ خَوه رَه گُوتْ: "هَىْ گَلِىٚ مِنْ! بِرَاسْتِى بِسَدَمَا كُو وَه گُوْلِكْ ژِخَو رَه إِلٰهْ كِرتْ وَه لِخَوه ظُلِمْ كِرْ، ڤِيْجَا بِبَالْ خُدَايِىٚ خُو ڤَه تُوْبَه بِكِنْ؛ نَفْسَا خَوه بِشْكِيْنِنْ. اَڤْ، لِنِكْ خَالِقِىٚ وَه ژِ بُوْ وَه چِيْتِرَه." ڤِيْجَا (پِشتِي وَه نَفْسَا خَوه شِكَانْدْ و تُوْبَه كِرْ) خُدِىٚ ژِى تُوْبَا وَه قَبُولْ كِرْ. بِيْگُومَانْ خُدِىٚ زِيْدَه تُوْبَه پَژِيْرَه، دِلْوَڤَانَه.

**٥٥.** وِىٚ دَمِىٚ وَه گُوتْ: "هَىْ مُوسَا! حَيَا كُو اَمْ بِچَاڤِيْنْ خَوه خُدِىٚ اَشكَرَه نَبِينِنْ اَمْ بَاوَرِيِىٚ بِتَه نَايِينِنْ." ڤِيْجَا ژِ نِشْكَا ڤَه بِرُوسْكِىٚ لِوَه دَا و وَه بِبِيْهِشَانَه لِىٚ تَمَاشَه دِكِرْ.

---

١ خُدِىٚ تَعَالٰى ژِ سُورَيِىٚ شُعَرَا دِ ئَايَتَا ٦٣يِىٚ دَه شَقْبُونَا دَرْيَايِىٚ بِڤِى ئَاوَايِى زَلَالْ كِريَه: بَرَامْبَرِى ڤِىٚ دَه مَه پَيَامْ دَا مُوسٰى، مَه ژِىٚ رَه گُوتْ: گُوْپَالِىٚ خَوه لِبَحْرِىٚ بِخَه. (چه دَمَا گُوْپَالِىٚ خَوه لِبَحْرِىٚ دَا) دِجهْ دَه بَحْرْ بُو دُو شَقْ، هَرْ شَقَكى ئَاڤِىٚ بُو وَكى چِيَاككى مَزِنْ. و ژِ سُورَيِىٚ طَاهَا دِ ئَايَتَا ٧٧يِىٚ دَه «صُوْنْدْبَه، مَه پَيْخَامْ دَا مُوسٰى كُو بَنْدَيِىٚ مِنْ (اِيْنْ اِسْرَائِيلِى) بِشَڤْ (ژِ مِسْرِىٚ) دَرْخَه، ڤِيْجَه دِ دَرْيَايِيْدَه ژِ بُوْ وَانْ رِيْيَكَه زُهَا بِگْرَه..

**٥٦.** پِشتِى مِرِنَا وَه، مَه هُونْ سَاغْ كِرِنْ دَا كُو هُونْ سِپَاسِيَا خُدِىَ بِكِنْ.

**٥٧.** مَه عَوْرْ لِسَرْ وَه كِرِنْ سِى و سِيوَانْ، مَه گَزُوَ و گُوَشْتِىَ سُوسِكِىَ ژِ وَرَه دَاخِسْتْ و (مَه ژِ وَرَه گُوَتْ": (دَه رِزْقِىَ پَاكْ و خَوشْ اِىَ كُو مَه دَايِى وَه بِخُونْ." بِرَاسْتِى وَانْ لِمَه ظُلِمْ نَكِرِيَه، لِىَ بَلِىَ وَانْ هَرْ لِخُو ظُلِمْ كِرِيَه.

**٥٨.** (گَلِى اِيسْرَائِيلِيَانْ!) بِيْنِنْ بِيرَا خَوه وِىَ دَمَا مَه ژِ وَرَه گُوَتْ: هَرِنْ ڤِى بَاژَارِى (قُدْسِىَ)، ڤِيْجَا يَا كُو هُونْ بِڤِيْنْ هُونْ چَاوَا دِخَوازِنْ بِنُوَشِيجَانِى بِخُونْ و بِسَرْنِزِمِى (ژِخُدَايِىَ خَوه رَه شِكَانْدِى) دِدَرِى رَه تِيْكَڤِنِىَ و بِبِيْژِن: (خُدَايِىَ مَه)، لِگُونَهِيْنْ مَه بِبُورَه. اَمِىَ ژِى لِگُونَهِيْنْ وَه بِبُورِنْ و اَمِىَ (خِيْرِيْنْ) قَنْجِيكَارِيْنْ رَاسْتُ و دُورِسْتْ زِيْدَه بِكِنْ.[1]

**٥٩.** لِيْبَلِىَ اَوِيْنْ كُو ظَالِمْ بُونْ، وَانْ گُوَتِنَا كُو ژِوَانْ رَه هَاتِبُو گُوَتِنْ بِيَكَه دِنْ گُوهَارْتِنْ. ڤِيْجَا مَه ژِى بِسَدَمَا نَقَنْجِيَا كُو دِكِرِنْ، لِسَرْ يِيْنْ كُو ظُلِمْ كِرِنْ ژِئَاسِيمَانَانْ عَذَابَكْ دَاخِسْتْ.

**٦٠.** بِيْنِنْ بِيرَا خَوه؛ وِىَ دَمَا مُوسَا ژِ بُوَ گَلِىَ خَوه ئَاڤْ خَوسْتْ. مَه ژِى ژِىَ رَه گُوَتْ: "گُوَپَالِىَ خَوه لِكَڤِرْ بِدَه"! (پِشتِى مُوسَا گُوَپَالِىَ خَوه لِكَڤِرْ دَا) دِجِهْ دَه ژِ وِى كَڤِرِى دُوَازْدَهْ چَاڤِيِيْنْ ئَاڤِىَ دَرْبُونْ. هَرْ نِفْشِى جِهِىَ ئَاڤْڤَخُوارِنَا خَوه نَاسْ دِكِرْ. (مَه ژِوَانْ رَه گُوَتْ): "ژِ رِزْڤِىَ كُو خُدِىَ (دَايه وَه) بِخُونْ، ڤَخُونْ و لِعَرْدِىَ فَسَادِيِىَ مَكِنْ."

**٦١.** بِيْنِنْ بِيرَا خَوه؛ دَمَا وَه گُوَتْ: "اَىْ مُوسَا! ڤِيمَا مَه بِخَوارِنَكَه تِنِىَ نَايِىَ، ژِخُدَايِىَ خَوه تِشْتِيْنْ كُو عَرْدْ وَانْ هِيْشِينْ دِكَه بِخَوازَه؛ شُوَڤِلِيْنْ وِىَ، خِيَارِيْنْ وِىَ، سِيرِيْنْ وِىَ، نِيسْكِيْنْ وِىَ، پِيڤَازِيْنْ وِىَ ژِمَه رَه دَرِينَه." مُوسَا ژِوَانْ رَه گُوَتْ: "مَا هُونْ يِيْنْ بَاشْ

---

١ خُدِىَ تَعَالِى، دِگَلَكْ ئَايَتَانْ دَه بَحْسَا اِحْسَانِىَ كِرِيَه و اَمْ پِىَ فَرمَانبَرْ كِرِنَه. گَلَكْ جَارَانْ پَسِنْ و مَدْحِىَ مُوحْسِنَانْ دَايَه و بَحْسَا وِىَ خَلاتَا كُو دِىَ بِدَه مُوحْسِنَانْ كِرِيَه. مُحْسِنْ، اسمُ فَاعِلَ، مَصْدَرِىَ وِىَ اِحْسَانَه . مَرَڤْ دِكُوردِى دَه دِكَارَه مُوحْسِنِى وَهَا اِفَادَه بِكَه: قَنجِيكَارِيْنْ رَاسْتْ و دُرُوسْت. دِ حَدِيسَا شَرِيفْ دَه وَهَا هَاتِيَه رَاڤَكِرِنْ؛ "اِحْسَانْ اَوَه كُو هَرْ وكِى خُدِىَ تَه بِبِينِى تُو عِبَادَتِىَ وِى بِكِى.." وِىَ دَمِىَ مَعنَا مُوحْسِنِى؛اَوِىَ كُو دَمَا كَارْ و بَارَكِى بِكَه يَانْ عِبَادَتَكِى بِكَه اَوْ بِتَكُوزِى و بِيْكِيمَاسِى دِكَه. هَرْ وكِى كُو خُدِىَ لِپِيْشْبَرِى وِى يه و لِسَرِىَ زِيْرَڤَانَه كَارِىَ خَوه دِكَه.

بِيِيْنْ كِيْمْ دِگُهَرِينِنْ؟! نَاخُو، دَاكَڤِنْ هَرِنْ بَاژِيْرْ. مُحَقَقْ تِشتِيْنْ كُو هُونْ دِخوازِنْ، ژِوَه رَه لِىٰ هَنَه.» مُوْرَا بَلَنْگَازِى و رِسْواتِيِىٰ لِوَانْ هَاتَه خِسْتِنْ و رَاسْتِى غَزَبَا خُدِىٰ هَاتِنْ. اَڤَا هَاتِيَه سَرِىٰ وَانْ ژِبَرْ كُو ئَايَتِيْنْ خُدِىٰ مَانْدَلَه كِرِنْ و بِستَمْكَارِى پِيْخَمْبَرْ دِكُوشْتِنْ. اَڤْ ژِى، ژِبَرْ كُو بِىٰ اَمْرِيَا خُدِىٰ دِكِرِنْ و ژِحَدِىٰ خوه دَرْدِكَتِنْ.

**٦٢.** بِيْگُمَانْ يِيْنْ كُو بَاوَرِى ئَانِينْ و يِيْنْ بُونَه جِهُو، يِيْنْ فِلَهْ و يِيْنْ صَابِئِنْ، ڤِيْجَا ژِوَانْ كِى بَاوَرِيِىٰ بِخُدِىٰ و رُوْژَا ئَاخِرَتِىٰ بِينَه و كَارِىٰ قَنْجْ بِكَه، ژِ بُوْ وَانْ لِنِكْ خُدَايِىٰ وَانْ خَلاتْ هَيَه و لِسَرْ وَانْ طِرسْ نِينَه و اَوْ غَمْگِينْ ژِى نَابِنْ.[١]

**٦٣.** بِيْنِنْ بِيرَا خَوه، دَمَا مَه سُوْزَكَه سَاغْلَم ژِوَه وِرْگِرتْ و مَه (چِيَايِىٰ) طُورْ دِسَرْ وَرَه بِلِندْ كِرْ، (مَه ژِوَه رَه گُوْتْ:) "يَا كُو مَه دَايه وَه زَخِمْ بِگِرِنْ و تِشتِيْنْ تِىٰ دَه دِبِيرْ بِينِنْ (و پِىٰ عَمَلْ بِكِنْ) دَا كُو هُونْ خَوه (ژِعَذَابِىٰ خُدِىٰ ) بِپَارِيْزِنْ.

**٦٤.** پِشتِى ڤِىٰ (پِيْمَانِىٰ)، هُونْ لِسَرْ سُوْزَا خَوه نَه سَكِنِينْ. اَگَرْ نَه ژِكَرَمْ و مَرْحَمَتَا خُدِىٰ بَايَا، تَقَزْ هُونْ دِبُونْ ژِى يِيْنْ كُو خَسَارْ كِرِنَه.

**٦٥.** بِرَاسْتِى هُونْ دِزَانِنْ كَا مَه چِه ئَانِيَه سَرِىٰ يِيْنْ كُو دِ رُوْژَا شَمِيِىٰ دَه (بِگِرْتِنَا مَاسِيَانْ) زِيْدَگَاڤِى كِرِنْ. مَه ژِوَانْ رَه گُوْتْ: بِبِنْ مَيْمُونِيْنْ رَزِيلْ و رِسْوَا.

**٦٦.** ڤِيْجَا مَه اَڤْ جَزَادَانْ ژِ بُوْ وَانِيْنْ دِ وِىٰ دَمِىٰ دَه و ژِ بُوْ يِيْنْ كُو دِىٰ پِشتِى وَانْ بِيْنْ رَه كِرَه پَاشْڤَدَانْ و ژِ بُوْ مُتَقِيَانْ ژِى خِسْتَه شِيرَتْ.

---

١ بِچِيْكِرِنْا ئَادَم رَه بَاوَرِيكَه فِترِى نَازِل بُو، اَوَا كُو اِنسَانْ لِسَرِىٰ هَاتِيه اَفِرَاندِنْ. پَاشِىٰ خُدِىٰ دِينْ شِيَاندِنْ كُو پِيرَوِيْنْ هِنكَانْ ژِوَانْ لِسَرْ عَرْدِىٰ هَنَه، مِينَا يَهُودِى، فِلَهْ و سَابِئِيَانْ. ڤِيْجَا خُدِىٰ دِخوازَه كُو تَڤْكِىٰ ڤَانْ دِينَانْ ژِسَرْ عَرْدِىٰ صَافِى بِكَه و اَهلِىٰ وَانْ دِ رِيسَالَتَا مُحَمَّدْ دَه كُوْم بِكَه. لَوْرَا رِسَالَتَا پِيْخَمبَرْ ژِ بُوْ تَصْفِيه كِرِنَا تَڤْكِىٰ دِينَانَه. نَاخُو مَعنَا ئَايَتِىٰ وَهَايَه : اَوِيْنْ كُو دِبِيْژِنْ مَه بَاوَرِى ئَانِيِيَه، يِيْنْ جِهُو، يِيْنْ فِلَهْ و يِيْنْ سَابِئِى؛ ڤِيْجَا كُو دَڤ ژِبَاوَرِيَا خَوه بَردِنْ و بِبَاوَرِيكَه نُو بَاوَرْ بِكِنْ و رِسَالَتَا مُحَمَّدْ(س) قَبُول بِكِنْ...اَوْ غَمْگِينْ نَابِنْ. ئَايَتَا ٨٥انْ ژِسُورَيِىٰ ئَال عِمرَانْ «كِى ژِبِلِى اِسْلَامِىٰ دِينَكِى دِنْ بِخُوازَه اَوْ قَتْ ژِىٰ نَايِىٰ قَبُولْ كِرِنْ... خَسِرِينَ» ڤِىٰ رَامَانِىٰ تَكَزْ دِكَه.

٦٧. بِێنَه بیرَا خَوه؛ وِیَ دَمَا مُوسَا ژِگَلِیَ خَوه رَه گُوٚتْ: "بێگُمَانْ خُدِیَ لِوَه فَرمَانْ دِکَه کُو هُونْ چێلَیَکی سَرْژێکِنْ." گُوٚتِن: "مَا تُو طِنَازَانْ بِمَه دِکی؟" (مُوسَا) گُوٚتْ: "اَزْ خَوه بِخُدِیَ دِپَارێزِمْ کُو اَزْ ژِنَزَانێنْ طِنَازْکَرْ بِمْ."

٦٨. گُوٚتِن: "کَا ژِ بُوٚ مَه ژِخُدَایِیَ خَوه بِخَوازَه؛ ژِمَه رَه سَالُوٚخْ بِدَه کَا اَوْ چه چێلَکَه". گُوٚتْ: "خُدِیَ دِبێژَه:اَوْ نَه پیرَه نَه ژِی جِوَانَه، دِنَاڤْبَرَا ڤَانْ هَردُویَانْ دَه یَه." ڤێجَا یَا کُو لِوَه هَاتِیَه فَرمَانْ کِرِنْ پێكْ بینِنْ.

٦٩. گُوٚتِن: "کَا ژِ بُوٚ مَه ژِخُدَایِیَ خَوه بِخَوازَه؛ بِلَا ژِ مَه رَه اَشکَرَه بِکَه کَا رَنْگِیَ وِیَ چِی یَه؟" گُوٚتْ: "خُدِیَ دِبێژَه:اَوْ رَنگْزَرَه، زَرکی صَافِی یَه، تَمَاشَڤَانِیَ خَوه دِلخَوشْ دِکَه."

٧٠. گُوٚتِن: "ژِخُدَایِیَ خَوه بِخَوازَه، بلا اَشْکَرَه بِکَه؛ کَا اَوْ چِی یَه ! بِرَاسْتِی اَوْ چێلَكْ ژِمَه رَه تَڤْلِیهَڤْ هَاتْ، خُدَا حَزْ بِکَه مُحَقَّقْ اَمِیَ بِسَرْ رِیَا رَاسْتْ ڤَه بِبِنْ."

٧١. مُوسَا گُوٚتْ: "خُدِیَ دِبێژَه:اَوْ نَه چێلَیَکه هینْکِری یَه کُو جُوٚتْ بِکَه و اَوْ زَڤیَانْ ژِی اَڤْ نَادَه، بِیَ کێمَاسی یَه ، رَنگِیَ دِنْ تِیَ دَه تُونِنْ." گُوٚتِن: "هَا نِهَا تَه رَاسْتْ گُوٚتْ." اِیْدِی (پِشْتِ بِدَسْتْ خِسْتِنْ)اَوْ سَرْژێکِرِنْ و هِنْدِكْ مَابُو کُو سَرْ ژِیَ نَکِنْ.

٧٢. دِبیرْ بینِنْ؛ دَمَا وَه مرُوٚڤَكْ کُوشتْ و دَرْ حَقِی وِی دَه وَه خِرَجِرْ دِکِرْ (و وَه اَوْ دَاڤێتْ سِتُویِیَ هَڤْ). حَالْ اَڤَه ؛ خُدِیَ یَا هُونْ ڤَدِشێرِنْ دَرْتِینَه رَاسْتِیَ.

٧٣. مَه ژِوَانْ رَه گُوٚتْ: "هِنْ ژِگُوٚشْتِیَ وِیَ (چێلَکَا سَرْژێکِری) لِیِیَ کُوشْتِی بِدِنْ (دِیَ سَاغْ بِبَه و ژِوَه رَه دِیَ بێژَه: کَا کِیَ اَوْ کُوشتِیَه). هَا بِڤِی اَوَایی خُدِیَ مِریَانْ سَاغْ دِکَه و نیشَانێنْ خَوه ژِوَه رَه بَرچَاڤ دِکَه دَا کُو هُونْ ئَاقِلْ بِگرِنْ.[1]

٧٤. پَاشِیَ (پِشْتِی ڤَانْ رُودَانَانْ) دِیسَا دِلِیَ وَه حِشْكْ بُو؛ ڤێجَا اَوْ مِینَا کَڤرَه، بَلْکی ژِیَ

١ دِڤِیَ ئَایَتِیَ دَه حِکمَتَکه مَزِنْ و دَرْسَکه عَجێبْ هَیَه. خُدِیَ لِوَانْ فَرمَانْ دِکَه کُو دَوَارکِیَ سَرژێکِنْ و پَرچَیَكْ ژِگُوٚشْتِیَ وِیَ لِیِیَ مِرِی بِخِنْ دَا کُو سَاغْ بِبَه و نَاڤِیَ قَاتِلی بِبێژَه. خُدِیَ دِکَارِبُو بِیَ لێدَانْ ژِی وِی سَاغْ بِکَه، لِیَ بَلِیَ؛ دِیَ بِگُوٚتَانَا اَوْ نَه مِربُو؛ اَوْ ژِدِلْ چُوبُو، بِسَرْ خَوه ڤَه هَاتْ. ڤێجَا خُدِیَ خَوسْتْ

ژِى هِشكْترَه. بێگُمَانْ هِنْ ژِكَفِرَانْ هَنَه كُو ژوَانْ رُوٚبَارْ دَردِكَڤِنْ و بِرَاسْتِى هِنْ ژوَانْ هَنَه كُو دِبِنْ دُو شَقْ، ڤِێجَا ئَاڤْ ژوَانْ تِىٚ دَرْ و هِنَكْ ژوَانْ هَنَه كُو ژِترْسَا خُدِىٚ ژِهَڤ پَرْچَه دِبِنْ، تِێنْ خوارِىٚ. هَلبَتْ خُدِىٚ ژِيَا كُو هُونْ دِكَنْ نَه بێخَبَرَه.

**٧٥.** مَا هُونْ، هِێڤِى دِكَنْ كُو اَوِىٚ بوَه بَاوَرِيِىٚ بينِنْ؟ بِرَاسْتِى كُوٚمَكْ ژ وَانْ هَبُو كُو لِگُوٚتِنَا خُدِىٚ گُوهْدَارِى دِكِرْ و پِشْتِى كُو رَاسْتِيَا وِىٚ هِينْ دِبُونْ وَانْ بِزَانَبُونْ اَوْ دِگُوهَرَانْدْ.

**٧٦.** دَمَا جِهُو رَاسْتِى بَاوِرْمَنْدَانْ دِهَاتِنْ، دِگُوٚتِنْ: "مَه بَاوَرِى ئَانِيَه" و دَمَا اَوْ خوه بِخُو دِمَانْ، دِگُوٚتِنْ: "مَا يَا كُو خُدِىٚ (ژِسَالِخێنْ مُحَمَّدْ يێنْ دِ تَوْرَاتِىٚ دَه) هُونْ پِىٚ سَرْوَخْتْ كِرِنْ، هُونِىٚ ژِ وَانْ رَه بِبێژِنْ دَا كُو وِىٚ لِهَمْبَرِى وَه، لِجَم خُدَايِىٚ وَه بِكَنَه دَلِيلْ؟ مَا هُونْ ئَاقِلْ نَاكِرِنْ؟!"

**٧٧.** ڤَىْ اَوْ نِزَانِنْ كُو بێگُمَانْ خُدِىٚ، بِيَا كُو اَوْ ڤَدِشێرِنْ و بِيَا كُو اَشْكَرَه ژِى دِكَنْ دِزَانَه؟

**٧٨.** هِنَكْ ژِ وَانْ (جِهُويَانْ) أُمِّى نَه؛ ژِبِلِى حَزِيێنْ پُوچْ تِشْتَكِى ژِكِتێبِىٚ نِزَانِنْ، اَوْ هَرْ لِدُوڤْ گُومَانِىٚ نَه.[1]

**٧٩.** اِيدِى وَاخْ لِوَانْ كَسَانْ بَه كُو كِتێبِىٚ بِدَسْتێنْ خَوه دِنِڤِيسِنْ، پَاشِىٚ دَا كُو بِنِرْخَكِى اَرْزَانْ بِفِرُوٚشِنْ، دِبێژِنْ: "اَڤْ ژِجَمْ خُدِىٚ نَازِلْ بُويَه!" ايجَارْ وَاخْ لِحَالِىٚ وَانْ بَه، ژِبَرْ يَا كُو دَسْتێنْ وَانْ نِڤِيسَانْدِيَه! وَاخْ لِوَانْ بَه ژِبَرْ يَا كُو پِىٚ ڤَزَنْجْ كِرِنَه!

**٨٠.** (جِهُويَانْ) گُوٚتْ: "ژِچَندْ رُوٚژێنْ بِژِمَارْ (هِنْدِكْ) پِىٚ ڤَه ئَاگِرْ بِمَه نَاكَڤَه."بِبێژَه: "مَا

---

كُو بِلِێدَانَا پَرْچَيَكْ گُوٚشتِىٚ مِرِى مَرَڤِى مِرِى سَاغْ بِكَه دَا كُو دَرسَكِىٚ بِدَه مَادَّه پَرَسْتَانْ دَا ڤَنَه ئَاقِلْ بِگرِنْ و بَاوَرِى بينِنْ.

[1] اَمَانِيِّ: اَڤْ پَيڤْ، مُفَسِّرَانْ بِچَنْدْ وَاتَيَانْ مَعْنَه كِرِنَه. لِێبَلِىٚ هَرْ وَكِى مُفَسِّرِىٚ نَاڤْدَارْ شَنْقِيتِى گُوتِيَه: بِمَعنَا خَوزِى يێنْ كُو اَوْ حَزْ ژِىٚ دِكِنْ. ژِ سُورَهِيِىٚ بَقَرَه ئَايَتَا ١١١ ىٚ « (يێنْ اَهْلِى كِتَابْ) گُوٚتِنْ: «ژِ بِلِى كَسێنْ كُو جِهُو يَانْ ژِى فِلَه بِنْ تُو كَسْ دِىٚ نَچِه بِهِشْتِىٚ. اَڤْ گُوتِنَا هَانِىٚ خَوزِى (و حَزِى)ــيێنْ وَانَه. (ژِ وَانْ رَه) بِبێژَه: «اَگَرْ بِرَاسْتِى هُونْ رَاسْت دِبێژِنْ دَه كَا دَلِيلَا خَوه بينِنْ..» ڤِىٚ مَعْنَيِىٚ تَكَزْ دِكَه.

قَىْ وَه لِسَرْ ڤِىَ يَكِىَ ژِخُدِىَ سُوْزَكْ وِرْگَرْتِيَه، ڤِيْجَا خُدِىَ ژِسُوْزَا خَوه ڤَنَاگَرَه، بَلْكِى دَرْحَقِى خُدِىَ دَه يَا هُونْ نِزَانِنْ هُونْ دِبِيْژِنْ؟"[١]

٨١. نَخِيْر؛ چه كَسِىَ كُو گُنَهَكِى بِكَه و گُنَهِيْنْ وى دُوْرْ لِىَ بِپِيْچَه، هَا اَوْ كَسْ خَلكِىَ دُوْژَهِىَ يَه ، حَتَا حَتَايِىَ اَوِىَ تِىَ دَه بَه.

٨٢. هَرْچِى يِيْنْ كُو بَاوَرِى ئَانِينْ و كَارِيْنْ قَنْجْ كِرِنْ، اَوْ اَهْلِىَ بَهِشْتِىَ نَه، حَتَا حَتَايِىَ اَوِىَ تِىَ دَه بِنْ.

٨٣. وِىَ دَمِىَ مَه ژِ زَارُوْيِيْنْ اِسْرَائِيلْ پَيْمَانْ وَرگِرتْ كُو "هُونِىَ ژِخُدِىَ پِىَ ڤَه ژِ تُو كَسِى رَه عِبَادَتِىَ نَكِنْ و هُونِىَ هَرْ لِدِىَ و بَاڤِيْنْ خَوه، خِزْمِيْنْ خَوه، سِيْوِى و بَلَنْگَازَانْ قَنْجِيِىَ بِكِنْ و ژِ مِرُوْڤَانْ رَه قَنْجِيِىَ بِبِيْژِنْ، بِئَاوَايِىَ پِيْدِڤِى نِمِيْژْ بِكِنْ و زَكَاتِىَ بِدِنْ" پَاشِىَ؛ ژِبِلِى چَنْدْ كَسَانْ وَه پِشْتَا خَوه دَا پَيْمَانِىَ و ژِخَو هُونْ هَرْ پَيْمَانْشكِيْنِنْ.

٨٤. (گَلِى زَارُوْيِيْنْ اِسْرَائِيلْ!) بِيْنِنْ بِيرَا خَوه؛ وِىَ دَمَا مَه پَيْمَانَا مِكُومْ ژِوَه وِرْگَرْتِى كُو "خِوِينَا هَڤْ نَه رِيْژِنْ و هَڤْ ژِجِهْ و وَارِيْنْ هَڤْ دَرْنَخِن"، پَاشِىَ وَه اَڤْ قَبُولْ كِرْ و هُونْ بِخَوه ژِى شَاهِدِنْ."

٨٥. پَاشِىَ هُونْ؛ اَڤِيْنْ هَا (پِشتِى ڤِىَ سُوْزَا وَه دَايِى، وَه سُوْزَا خَوه نَبرَه سَرِى؛) هُونْ هَڤْ دِكُژِنْ و هِنْ ژِوَه يِيْنْ دِنْ ژِمَالْ و وَارِيْنْ وَانْ دَرتِينِنْ -دِگَل كُو دَرَانِينَا وَانْ ژِ مَالْ و وَارِيْنْ وَانْ لِوَه حَرَامْ بُو ژِى- كُو بِگُنَهْكَارِى و نَحَقِى هُونْ (و هَڤْبَنْدِيْنْ خَوه) لِهَمْبَرْ وَانْ پِشْتْگِرِيَا هَڤْ دِكِنْ. اَگَرْ بِاَسِيرِى بِبَالْ وَڤَه هَاتِنْ ژِى، هُونْ (ژِ بُوْ رِزْگَارْكِرِنَا وَانْ) دِبَرْ وَانْ دَه گَرَوِىَ (فِدْيِىَ) دِدِنْ (دَا كُو هُونْ فَرمَانَا تَوْرَاتِىَ بِجِهْ بِينِنْ). اَرِىَ مَا ڤِيْجَا هُونْ اِيمَانِىَ بِهِنَكِى ژِكِتِيْبِىَ تِينِنْ و هِنَكِى ژِى مَانْدَلَه دِكِنْ. اِيْدِى ژِوَه جَزَايِىَ

١ زَانَايِيْنْ جِهُويَانْ ژِخَلكِىَ خَوه رَه دِگُوْتِنْ: اِيمَانِىَ بِمُحَمَّدْ نَه بِيْنِنْ. لَوْرَا اَگَرْ اَمْ اِيمَانِىَ پِىَ نَه بِيْنِنْ ژِى، اَمْ ژِحَفْتْ رُوْژانْ پَانْ ژِ چِلْ رُوْژِى پِىَ ڤَه دِ اِيْگِرْ دَه نَامِينِنْ و بِڤِى ئَاوَايِى خَوه دِخَاپَانْدِنْ.

كَسێنْ كُو وِسَا بِكِنْ، دِژِيَانَا ڤِێ جيهَانێ دَه هَرْ رِسْوَاتِي يه و رُۆژَا قِيَامَتێ ژِى بِبَالْ عَذَابێ هَرِى دِژْوارْ ڤَه هُونێ بێنْ ڤَگَرَانْدِنْ. خُدێ ژِيَا كُو هُونْ دِكِنْ ڤَتْ نَه بێخَبَرَه.

٨٦. اَڤێنْ هَا، يێنْ كُو لِشُونَا ئَاخْرَتێ ژِيَانَا دِنْيَايێ كِرِينَه، اِيْدِى لِسَرْ وَانْ عَذَابْ سِڤِكْ نَابَه و ئَارِيكَارِيَا وَانْ ژِى نَايێ كِرِنْ.[١]

٨٧. صُۆندْ بَه؛ مَه كِتێبْ دَايَه مُوسَا! مَه پِشْتِى وِى پێخَمْبَرْ لِدُوهَڤْ شَانْدِنْ. مَه مُعْجِيزَه دَانْ عِيسَايێ كُرێ مَرْيَمێ و مَه بِرِيَا جَانێ پَاكْ (جِبْرِيل) ژِى پِشْتْگِرِيَا وِى كِرْ. اَرێ مَا اَڤْ چِه حَالَه؛ چِه دَمَا پێخَمْبَرَكْ ژوَه رَه بێ كُو نَه لِگُۆرِى دِلێ وَه بَه، هُونْ خوه مَزِنْ دِكِنْ؛ ڤێجَا هِنَكَانْ ژِوَانْ هُونْ اِنكَارْ دِكِنْ و هِنَكَانْ ژِى دِكُژِنْ.

٨٨. (جِهُويَانْ ژِتنَازْ ڤَه) گُۆتِن: "دِلێ مَه كَالاَنْكِرِيَه (اَمْ تێ نَاگِهِنْ)."نَا! بَلْكِى ژِبَرْ كُفْرَا وَانْ خُدێ لَعْنَتْ لِوَانْ بَارَانْدِيَه و كێمْ ژِوَانْ بَاوَرِيێ تِينِنْ.

٨٩. چِه دَمَا ژِوَانْ رَه ژِجَمْ خُدێ كِتێبَكْ (قُرْئَانْ) هَاتْ كُو رَاسْتَدَرێخَا كِتێبَا بَرْ دَسْتێ وَانْ بُو و بَرێ ژِى وَانْ لِهَمْبَرِى كَافِرَانْ ئَارِيكَارِى (بِقُرْئَانێ) دِخوسْتِنْ (دَا كُو بِسَرْكَڤِنْ)، ڤێجَا؛ چِه دَمَا اَوْ كِتێبَا كُو وَانْ پێ دِزَانِى (و نَاسْ دِكِرِنْ) ژِوَانْ رَه هَاتْ،اَوْ اِنْكَارْ كِرِنْ. اِيْدِى لَعْنَتَا خُدێ لِوَانْ كَافِرَانْ بَه![٢]

٩٠. و چِه تِشْتَكِى پِيسَه يَا كُو خوه پێ فِرُۆتِنَه؛ ژِچَاڤْنَبَارِى اَوْ وَحْيَا كُو خُدێ ژِكَرَمَا خوه،

١ اَڤْ ئَايَتێنْ پِيرُۆزْ رَوْشَا جِهُويَانْ ئَا عَجِيْبْ و خَتَرْنَاكْ دِدَه نِيشَانْ. بَرِى اِسْلامِيتێ لِمَدِينێ سێ قَبِيلَه جِهُو هَبُونْ؛ قُورَيزِى، قَينُوقَاع و نَضرْ بُونْ. هَرْ يَكِى ژِڤَانْ، دِگَل هَڤَالْبَنْدێنْ خوه يێ مُشْرِكْ كُوَاوْ ژِى خَزْرَجْ و اَوْسْ بُونْ بِيێنْ دِنْ رَه شَرْدِكِرِنْ؛ هَڤدُو دِكُوژتِينْ و ژِوِلاتێ هَڤْ دَرِدخِسْتِنْ. دَمَا يَكْ بَاسِيرى دِهَاتَه بَرْ دَسْتێ وَانْ، ڤێجَا اَوْ دِهَمْبَرِى فِدْيێ دَه ئَازَادْ دِكِرِنْ. دَمَا ژِوَانْ رَه دِهَاتَه گُۆتِنْ اَڤْ چِى يَه؟ هُونْ هَڤْ دِكُوژِنْ، ژِوِلاتێ هَڤْ دَرْدِخِنْ و پَاشێ فِدْيه دِدِنْ و ئَازَادْ دِكِنْ. دِبێژِن: مَا اَمْ چِه بِكِنْ، اَمْرێ خُدێ اَڤَه.

٢ دِوێ دَمَا كُو پێخَمْبَرێ مَه (س) هَاتِيَه شَانْدِنْ دَه لِعَرَبسْتَانێ، نَخَاسِم لِدُۆرهێلا مَدِينێ گَلَكْ جِهُو هَبُونْ. وَانْ ژِ عَرَبَانْ رَه دِگُۆت؛ دِنێزِيكْ دَه پێخَمبَرَكْ دێ وَرَه شَانْدِن. لێ وَانْ هێڤِى دِكِرْ كُو دێ ژِجِهُويَانْ بێ شَانْدِنْ. ڤێجَا دَمَا دِيتِنْ كُو ژِعَرَبَانْ هَاتَه شَانْدِنْ ژِچَاڤْنَبَارِى ايمَانْ پێ نَه ئَانِينْ. ژِبَرْ ڤِێ يَكێ، قُرْئَانْ دِڤِێ دَابَاشِێ دَه بِبِيرْ تِينَه كُو وَانْ پِرْ ئَايَتێنْ تورَاتێ گُوهَرَانْدِنْ و سۆزَا كُو بِخُدێ رَه دَابُونْ، نَه ئَانِينَه جِه.

ژِ بَنْدَيێنْ خَوه ژِ يِێ كُو دِڤِێ رَه هِنَارتِى اِنكَارْ دِكِنْ. ڤِێجَا وَانْ غَزَبْ لِسَرْ غَزَبِێ حَقْ كِرْ و مُحَقَّقْ ژِڤَانْ كَافِرَانْ رَه عَذَابَكِى رِسْوَاكَرْ هَيَه.

٩١. دَمَا ژِوَانْ رَه تِێ گُوتِنْ: "بِيَا كُو خُدِێ نَازِلْ كِرِيَه بَاوَرى بِينِنْ." دِبِێژِنْ: "اَمْ بِيَا كُو ژِمَه رَه هَاتِيَه شَانْدِنْ بَاوَرى تِينِنْ."اَوْ ژِبِلِى وِێ، يێنْ دِنْ مَانْدَلَه دِكِنْ. حَالْ اَڤَه كُو قُرْئَانْ حَقَه، اَوْ رَاسْتَدَرِێخَا يَا بِوَانْ رَه يَه. بِبێژَه: اَگَرْ هُونْ بَرَا (بِتَوْرَاتِێ) بَاوِرْمَنْدْ بُونْ، نَاخُو چِمَا وَه بَرى نِهَا پێخَمْبَرێنْ خُدِێ دِكُشْتِنْ؟!

٩٢. (گَلِى جِهُويَان!) صُوِنْدْ بَه، مُوسَا بِمُعْجِيزَيێنْ اَشكَرَه ژِوَه رَه هَاتْ. پَاشى، دِ پِشتِى وِى (مُوسَا) رَه وَه گُوِلِكْ (ژِخَورَه إِلٰهْ) گِرتْ و بِڤِى ئَاوَايى وَه نَحَقِى لِخَوه كِرْ.[1]

٩٣. بِينِنْ بِيرَا خَوه، وَخْتَا مَه سُوِزْ ژِوَه وِرْگِرتْ و مَه چِيَايێ طُورْ بِسَرْ وَه دَه رَاكِرْ؛ (مَه گُوتْ) يَا مَه دَايَه وَه بِخُورْتِى بِگِرِنْ و گُوهْ بِدِنِێ. گُوتِن: ""مَه گُوتِنَا تَه قَبُولْ كِرْ و مَه بِجِدِّى گِرتْ." رَوْشْ اَڤَه؛ بِسَدَم كُفْرَا وَانْ دِلِێ وَانْ بِحَزْكِرِنْا گُوِلكِێ هَاتِبُو ئَاڤْدَانْ (حَزْكِرِنْا گُوِلكِێ دِدِلِێ وَانْ دَه هَاتِبُو بِجِهْكِرِنْ). (ژِوَانْ رَه) بِبێژَه: اَگَرْ بِرَاسْتِى هُونْ بَاوِرمَنْدِنْ ڤِێجَا اَڤَا كُو بَاوَرِيَا وَه لِوَه فَرْمَانْ دِكَه چِقَاسْ خَرَابَه![2]

---

١ دِ ڤِێ ئَايَتِێ دَه مُعْجِزَه نَه هَاتِنَه بَيَانْكِرِنْ كَا چِنَه. لِێ بَلِێ دِ جِهْنَه دى دَه تَفْصِيلا وَانْ هَاتِيَه كِرِنْ. مِينَاكْ: ژِ سُورَيێ اَعْرَاف ئَايَتَا ١٣٣ ێ « ڤِێجَا مَه ژِى بَارَانَكَه دِژْوَارْ، كُلِى، سِپِهْ، بَقْ و خُوينْ بِسَرْ وَانْ دَه ئَانِينْ كُو اَڤْ نِيشَانێنْ پِرْ تَخْلِيتِنْ. اِێدِى دِيسَا ژِى وَانْ خَوه مَزِنْ دِێرَانْ (و وَانْ بَاوَرى نَئَانى) و اَوْ هَرْ مِلَّتَكِى گُنَهْكَارْ بُونْ.» و ژِ سُورَيێ اَعْرَاف ئَايَتَا ١٠٧-١٠٨-ێ» ڤِێجَا مُوسَا دَارِێ خُوَه ئَاڤِێتْ، دِ وِێ دَمِێ دَه دَارِێ وِى اَشْكَرَا بُو زَهَايَكِى مَارَانْ. دَسْتِێ خُوَه ژِى (ژِ پَاخِلا خُوَه) دَرْخِسْتْ، ژِ نِشْكَاڤَه اَوْ ژِى ژِ تَمَاشَهكَرَانْ رَه سِپِى و نُورَانِى بُو. « و ژِ سُورَيێ شُعَرَا ئَايَتَا ٦٣ێ « بَرَانْبَرى ڤِێ مَه پِيَامْ دَا مُوسَا، مَه ژِێرَه گُوتْ: گُوپَالِێ خُوَه لِبَحْرِێ بِخَه! (چِه دَمَا گُوپَالِێ خُوَه لِێ دَا) دِ جِه دَه بُو دُو شَقْ هَرْ شَقَكِى ئَاڤِێ بُو وَكِى چِيَاكَكِى مَزِنْ.»

٢ دِ ئَايَتِێ دَه (سَمِعْنَا وَ عَصَيْنَا) دَربَاسْ بُو. مَه ژِى اَوْ وِسَا مَعْنَى كِرْ "مَه گُوتِنَا تَه قَبُولْ كِرْ و مَه بِجِدِّى گِرتْ". ژِبَرْ چِه؟ يَكْ: سِيَاقْ و سِبَاقَا آيَتِێ دِخَوازَه كُو وِسَا بِێ وَاتَه كِرِنْ. دِدُوِ: پێڤَا (عَصَيْنَا) بِوَاتَيَا گِرتِنْ ژِى تِێ بِكَارْئَانِينْ (تَاجُ العَرُوسْ و فَرْهَنگێنْ دِنْ). سِسِێ: ئَايَتَا ٦٣ێ ژِسُورَيێ بَقَرَه. چَارْ: ئَايَتَا ٤٦-ێ ژِسُورَيێ "نِسَاءْ: " "قِسْمَكْ ژِجِهُويَانْ بێژَيَانْ تَحْرِيفْ دِكِنْ (وَاتَيَا وَانْ دِگُوَهَرِينِنْ)، دِبِێژِن: سَمِعْنَا وَ

**٩٤.** (ژِ وَانْ رَه) بِبێژَه: ”اَگَرْ ئَاخْرَتْ (بِهِشْتْ) لِجَمْ خُدِیٚ ژِ بُوٚ وَه تَنِیٚ بَه؛ نَه ژِ بُوٚ مِرُوٚڤێنْ دِنْ بَه، نَاخَو دَه مِرنِیٚ بِخَوازِنْ اَگَرْ بَرَا هُونْ رَاسْتْ دِبێژِنْ.“

**٩٥.** بِرَاسْتِی ژِبَرْ گُونَهێنْ کُو بَرِیٚ بِدَسْتِیٚ خَوه کِرِنْ اَوِیٚ قَه مِرنِیٚ نَخَوازِنْ. خُدِیٚ بِظَالِمَانْ دِزَانَه.

**٩٦.** صُوٚندْ بَه؛ تُو (هَیْ مُحَمَّد) دِیٚ بِزَانِی کُو جِهُو ژِهَرْ کَسِی و ژِوَانێنْ کُو (ژِخُدِیٚ رَه) شَرِیکَانْ چێدِکِنْ ژِی لِسَرْ ژِیَانَا ڤِیٚ دِنْیَایِیٚ بێهتِرْ بِرژْدِنْ. هَرْ یَکْ ژِ وَانْ (جِهُویَانْ) دِخَوازَه کُو هَزَارْ سَالِی بِژِی. رَوْشْ اَڤَه؛ ژِیَانَا (هَزَارْ سَالِی) تُو کَسِی ژِعَذَابِیٚ خُدِیٚ دُورْ نَاکَه. خُدِیٚ، بِکَارێنْ کُو اَوْ دِکِنْ بِینَرَه.

**٩٧.** (یَا مُحَمَّد!) بِبێژَه: چِه کَسِیٚ کُو دِژمِنِیٚ جِبْرِیلْ بَه، ڤێجَا بِرَاسْتِی جِبْرِیلْ بِدَسْتُورَا خُدِیٚ قُرْئَانْ نَازِلِی سَرْ دِلِیٚ تَه کِرِیَه کُو اَوْ رَاسْتدَرِێخَا کِتێبێنْ بَرِیَا خَوه یَه و ژِ بُوٚ بَاوَرْمَنْدَانْ رِێبَرْ و مِزْگِینَه.

**٩٨.** کِی دِژْمِنِیٚ خُدِیٚ، مَلَائِیکَتْ و پێخَمْبَرێنْ وِی بَه و دِژمِنِیٚ جِبْرِیلْ و مِیکَالْ بَه، بێگُمَانْ خُدِیٚ ژِی دِژْمِنِیٚ کَافِرَانَه.

**٩٩.** بِرَاسْتِی مَه ئَایَتێنْ اَشْکَرَاکَرْ ژِ بُوٚ تَه هِنَارْتِنْ و ژِ یێنْ فَاسِقْ پِیٚ ڤَه تُو کَسْ وَانْ اِنْکَارْ نَاکَه.

**١٠٠.** اَرِیٚ هَرْ جَارَکَه کُو وَانْ پَیْمَانَکْ دَانْ، هِنَکْ ژِوَانْ وِیٚ پَیْمَانِیٚ دِسَرْ گُوَهِیٚ خَوه رَه دَاڤێژِنْ، بَلْکِی پِرِێنْ وَانْ بَاوَرِی نَایِینِنْ.

**١٠١.** چِه دَمَا ژِجَمْ خُدِیٚ پێخَمبَرَکْ ژِ وَانْ رَه هَاتِیَه کُو رَاسْتدَرِێخَا کِتێبَا لِبَرْ دَسْتِیٚ وَانْ بُو

---

عَصَیْنَا، «وَاسْمَعْ غَیْرَ مُسْمَعٍ وَرَاعِنَا..»اَڤْ آیَتْ دِدَه فێرْکِرِنْ کُو ”عَصَیْنَا، غَیْرَ مُسْمَعٍ و رَاعِنَا“ ژِوَانْ پێڤێنْ کُو بِدُو وَاتَیێنْ کُو دِژِی هَڤْنْ تێنَه وَاتَبَرْکِرِنْ.

(کُو اَوْ ژِنكْ خُدِىٚ يَه )؛ کوّمَكْ ژِيِيْنْ اَهْلِى کِتَابْ، هَرْ وکِى کُو نزَانِبِنْ، کِتِيِّبَا خُدِىٚ دَاڤِيّتِنْ پِشْتْ گُوَهِىٚ خَوه و دَڤْ ژِىٚ بَرِددَانْ.[١]

١٠٢. وَانْ (جِهُويَانْ) دَرْبَارِىٚ حُوکِمْدَارِيَا سُلَيْمَانْ دَه دَانَه دُوڤْ يَا کُو شَيْطَانْ دِبُونْ پَيْرَوِىٚ وِىٚ. رَوْش اَڤَه؛ سُلَيْمَانْ کَافِرْ نَبُوبُو، لِىٚ بَلِىٚ شَيْطَانْ کَافِرْ بُوبُون؛ خَلْكْ فِيّرِى سِيّرْبَازِيِىٚ دِکِرِنْ و دَانَه دُوڤْ يَا کُو لِبَابِلِىٚ لِسَرْ دُو مِلْيَاکَتَان؛ هَارُوتْ و مَارُوتْ دَه هَاتِبُو خَوارِىٚ. حَالْ اَڤَه کُو هَرْدُويَانْ (هَارُوتْ و مَارُوتْ) کَسْ فِيّرِى سِيّرْبَازِيِىٚ نَدِکِرِنْ حَيَانِى نَگُوّتَا: ”اَمْ بِخَوه اِمْتِيحَانِنْ؛“ اِيّدِى (بِفِيّرْبُونَا سِيّرِىٚ) هُونْ کَافِرْ نَبِنْ“. ڤِيّجَا ژِهَرْدُيَانْ يَا کُو پِىٚ ژِنْ و مِيّرْ ژِ هَڤْ ڤَدِڤَتَانْدِنْ فِيّرْ دِبُونْ.اَوْ سِيّرْبَازْ اَگَرْ کُو نَه بِدَسْتُورَا خُدِىٚ (و تَقدِيرَا وِى) بَه نِکَارِنْ بِتُو ئَاوَايِى زَرَارِىٚ بِدِنْ خَلْکِىٚ. اَوْ، يَا کُو زِيَانِىٚ دِدَه وَانْ و بِکِيّرِى وَانْ نَايِىٚ فِيّرْ دِبُونْ. بِرَاسْتِى وَانْ دِزَانِبُو کَسِىٚ کُو اَوْ بِکِرَا، دِ ئَاخْرَتِىٚ دَه ژِىٚ رَه تُو پَارْ تُونَه يَه. يَا کُو خَوه پِىٚ فِرُوّتِنَه چِڤَاسْ پِيسَه! اَگَرْ کُو زَانِبُونَا (اَوِىٚ خَوه فِيّرِى سِيّرِىٚ نَکِرِبَانَا)!

١٠٣. اَگَرْ وَانْ (جِهُويَانْ) اِيمَانْ بِئَانِيَا و (ژِسِحْرِىٚ) خَوه پَارَاسْتِبُونَا اَوِىٚ ژِ نِكْ خُدِىٚ ڤَه بِپَادَاشَا هَرِى بَاشْ بِهَاتَانَا پَادَاشْکِرِنْ. اَگَرْ کُو زَانِبُونَا (دِىٚ خَوه ژِ فِيّرْکِرِنَا سِيّرِىٚ دُورْ بِگِرْتَانَا).

---

١ بِڤَاسِى کُو ژِڤَانْ ئَايَتِيْنْ پِيرُوّزْ تِىٚ زَانِينْ، جِهُو دِنَاڤَا خَوه دَه چَارْ بَشِنْ.
يَکَمْ: اَوِيّنْ کُو بَاوَرِيِىٚ بِتورَاتِىٚ تِينِنْ و حُکمِيّنْ وِىٚ تَتبِيڤْ دِکِنْ.اَوْ پِرْ هِنْدِکِنْ.
دُويَمْ: اَوِيّنْ کُو لِسَرْ عَهْدْ و سُوّزَا خَوه نَمَانَه و نَڤَنْجِى کِرِنَه، مَبَسْتْ ژِئَايَتِىٚ ژِى اَوْنْ.
سِيّيَمْ: اَوِيّنْ کُو نَزَانِنْ و نِزَانِنْ کَا چِه دِکِنْ.
چَارَمْ: اَوِيّنْ کُو زَنْدِيڤِنْ، وکِى کُو بِتَوْرَاتِىٚ عَمَلْ دِکِنْ خَوه نِيشَانْ دِدِنْ، لِىٚ بِعَکْسَا وِىٚ دِکِنْ. يَعْنِى، دِلِىٚ وَانْ و دَڤِىٚ وَانْ يَكْ تِشْتِى نَابِيّژَه.

**١٠٤.** گَلی بَاوِرْمَنْدَانْ! (ژِ پێغَمْبَرْرَه) نَبێژِنْ رَاعِنَا؛ بِبێژِنْ: اُنْظُرْنَا، بِگُوٚتِنَا خُدِیٚ بِکِنْ، تَفَرْ ژِ بُوٚ کَافِرَانْ عَذَابَکی دِژْوارْ هَیَه.[١]

**١٠٥.** نَه اَوْ کَافِرێنْ خُدَانْکِتێبْ و نَه ژی یێنْ مُشْرِكْ،اَوْ نَاخَوازِنْ کُو هیچْ قَنْجیَكْ ژِ جَمْ خُدَایِیٚ وَه بِسَرْ وَه دَه بِیٚ. خُدِیٚ کِیٚ بِڤِیٚ ژِ دِلوٚڤَانِیَا خَوه رَه تَرْخَانْ دِکَه. بِرَاسْتِی خُدِیٚ خَودِیِیٚ قَنْجِیَا مَزِنَه.

**١٠٦.** اَمْ تُو ئَایَتِیٚ حَیَانی کُو اَمْ یَکَه ژِ وِیٚ چێتِرْ یَانْ ژی یَکَه مِینَا وِیٚ نَیینِنْ، اَمْ حُکْمِیٚ وِیٚ ئَایَتِیٚ ژِ رَوَاجِیٚ رَانَاکِنْ و اَمْ وِیٚ نَادِنَه ژِبیرْکِرِنْ. مَا تُو نِزَانی کُو بِرَاسْتِی خُدِیٚ لِسَرْ هَرْ تِشْتی قَادِرَه.[٢]

**١٠٧.** مَا تُو نِزَانی کُو (حُکْمُ و ایدَارَیَا) عَرْدْ و ئَاسِیمَانَانْ هَرْ ژِ خُدِیٚ رَه یه. ژِ خُدِیٚ پێ ڤَه ژِ بُوٚ وَه نَه دُوٚسْت و پِشْتَڤَانْ نَه ژی ئَارِیکَارَكْ هَیَه.

**١٠٨.** یَانْ ژی، کَا چَاوَا بَرِیَا وَه پِرْسْ ژِ مُوسَا دِهَاتَه کِرِنْ، مَا هُونْ ژی دِخَوازِنْ ژِ پێغَمْبَرِیٚ خَوه پِرسَانْ بِکِنْ؟ چِه کَسِیٚ ایمَانِیٚ بِدَه بِکُفْرِیٚ، بِرَاسْتِی وِی رِیٚکَا رَاسْتْ وِنْدَا کِرِیَه.[٣]

---

١ دَمَا پێغَمْبَرْ (س) وَعْظَكْ لِصَحَابیێنْ خَوه دِکِرْ، ژِیٚ رَه دِگُوٚتِن: «رَاعِنَا»یَعْنی خَوه لِمَه بِگِرَه. لِیٚ بَلِیٚ اَڤْ کَلِیمَیَا «رَاعِنَا»دِزمَانِیٚ جِهُویَانْ دَه بِمَعنَیَکه کِرێتْ بِکَارْ دِهَاتْ. گَاڤَا کُو جِهُویَانْ اَڤْ گُوٚتِنَا مُسلْمَانَانْ بِهِیسْتِنْ وَانْ ژی
بـ "رَاعِنَا" یَا کُو بویٚ وَاتِیٚ بُو بِپێغَمْبَرِیٚ مَه رَه دِپێڤِینْ. ژِ بَرْ ڤِیٚ یَکِیٚ خُدِیٚ کَلِیمَیَا»رَاعِنَا»لِبَاوِرْمَنْدَانْ قَدَخَه کِرْ و ژِ وَانْ رَه گُوٚتْ: دِشُونَا 'رَاعِنَا' دَه هُونْ «اُنْظُرْنَا»یَا کُو بِمَعْنَی لِزْ مَکه؛ لِهێڤِیَا مَه بِسَکِنَه، بِکَارْ بینِنْ. بِڤِیٚ یَکِیٚ جِهُو ژی دِیٚ نِکَارِبِنْ لِهَمْبَرْ پێغَمْبَرْ ڤِیٚ پێڤِیٚ بِکَارْبینِنْ.

٢ نَسِخْ، دِفَرْهَنگِیٚ دَه بِمَعْنَا رَاکِرِنْ و ژێبِرِنْ تِیٚ. عَرَبْ دِبێژِنْ:"نَسَخَت الشمسُ الظِلَّ" "تَاڤِیٚ سی رَاکِرْ و بِرْ." هَرْ وَهَا بِمَعنَا ڤَگُوٚهَاستِنَا ژِ جِهَکی بِبَالْ جِهَکی دِیتِرْ ڤَه یَه. وِكْ نُومُونَه:»نَسَخْتُ الکتَابَ»مِنْ ژِ کِتێبَکی تِشتێنْ تِیٚ دَه ڤَگُوٚهَاسْتِنْ کِتێبَکَه دِنْ. نَسخْ، دِنَاڤْلێکَا شَرْعی دَه رَاکِرِنَا حُکْمَکی شَرْعی ژِ رَواجِیٚ یَه یَانْ گُوٚهَرَانْدِنَا حُکمَکی بِیَکی دِنَه. بِکُرْتی مِرُوٚڤ دِکَارَه وَهَا بِبێژَه: "رَاکِرِنَا حُکْمَکی شَرْعی بِدَلِیلَکَه شَرْعی یَه."

٣ دِ ڤِیٚ ئَایَتِیٚ دَه نَه هَاتِیَه گُوٚتِنْ کَا جِهُویَانْ ژِ مُوسَا چِه خَوسْتِنَه. ژِ سُورَەیِیٚ نِیسَا ئَایَتَا ١٥٣یٚ تِشْتَا جِهُویَانْ ژِ مُوسَا خُوَەسْتِیَه ژِ مَه رَه وِهَا اَشْکَرَا دِکَه. مِینَاكْ: «(یَا مُحَمَّدْ!) اَهلی کِتێبْ ژِ تَه دِخَوازِنْ کُو

وَه (وَلِیِیٚ ژِنَانْ) تُو گُنَهْ نِینَه کُو هُونْ دَسْتُورَا وَانْ بِدِنْ کُو اَوْ لِگُوٚرِی عَادَتِیٚ کَارِیٚ خَوه بِکِنْ (دَا بێنَه خَوسْتِنْ و بِزَوِجِنْ). خُدِیٚ ژِ کَارِیٚ کُو هُونْ دِکِنْ ئَاگَاهْدَارَه.

**٢٣٥.** دَرْ حَقِیٚ زَوَاجَا ژِنێنْ ژِنَبی دَه تُو گُنَهْ لِسَرْ وَه تُنَه کُو هُونْ (بَرِیَا عِدَّیِیٚ وَانْ تَمَامْ بِبَه) دَاخَوازَا خَوه دِ بَرْ وَانْ رَه بَاڤێژِنْ، یَانْ ژِی دِ دِلِیٚ خَوه دَه بِهێلِنْ. خُدِیٚ دِزَانی کُو هُونیٚ ژِ وَانْ رَه بِبێژِنْ (کُو دِلِیٚ وَه لِسَرْ وَانَه)، لێبَلِیٚ ژِ بِلی کُو ژِ وَانْ رَه گُوٚتِنَکَه بِأُسُولْ بِبێژِنْ، سُوٚزَا هَڤْدِیتِنَکَه بِدِزِی نَدِنْ وَانْ. حَتَا کُو عِدَّتِیٚ وَانْ تَمَامْ نَبَه وَانْ مَهرْ نَکِنْ. بِزَانِنْ کُو بێگُمَانْ خُدِیٚ بِیَا دِ دِلێنْ وَه دَه دِزَانَه. نَاخُو؛ ژِیٚ بِطِرْسِنْ و ئَاگَاهْدَارْ بِنْ کُو بێگُمَانْ خُدِیٚ گُنَهْژێبِرَه، بَرْبِهێرَه.

**٢٣٦.** اَگَرْ (پِشْتِی کُو وَه اَوْ مَهرْ کِرِنْ) هِینْ کُو وَه دَسْتْ نَدَابَه وَانْ یَانْ ژِی وَه مَهْرَا وَانْ دِیَارْ نَکِربَه، هُونْ ژِنَانْ بَرِدِنْ، لِسَرْ وَه نَه پێوِیسْتَه کُو هُونْ مَهْرِیٚ بِدِنْ وَانْ. دِ ڤِیٚ رَوْشیٚ دَه (بِتِشْتَکی ژِ مَالِیٚ خَوه) وَانْ دِلخَوشْ بِکِنْ. بِلا کَسِیٚ دَسْتْفرَه (دَوْلَمَندْ) لِگُوٚرِی حَالِیٚ خَوه و کَسِیٚ دَسْتَنْگْ (ایٚ خِیزَانْ) ژِی لِگُوٚرِی حَالِیٚ خَوه، دَاینَکَه لِگُوٚرِی عُرْفْ وعَادَتِی بِدَه وَانْ. اَڤْ قَنْجِیَا بِرِنْدِی دِ سِتُوِیٚ مِرُوٚڤێنْ قَنجْ دَه دَیْنَکی مِسُوٚگَرَه.

**٢٣٧.** اَگَرْ بَرِیَا کُو هُونْ بِچِنَه نِڤینَا وَانْ هُونْ وَانْ بَرِدِنْ و بِرَاسْتِی ژِی وَه مَهْرَا وَانْ دِیَارْ کِربَه، وِیٚ چَاخیٚ هُونِیٚ نِیڤِیٚ مَهْرَا دِیَارْکِری بِدِنْ وَانْ. لێبَلِیٚ اَگَرْ ژِنْ لِمَهْرَا خَوه بِبُوٚرَه، یَانْ ژِی اَوْ مێرِیٚ کُو پێمَانَا مَهْرِیٚ دِ دَسْتْ وی دَه یَه لِیٚ بِبُوٚرَه (کُو تَڤَاهِیَا مَهْرِیٚ بِدَه ژِنیٚ) اَوْ تِشْتَکی دِنَه. اَگَرْ هُونْ لِیٚ بِبُوٚرِنْ، اَوْ بێهْتِرْ نێزِی تَقْوَایِیٚ یَه. (گَلی مُومِنَانْ!) دِ نَاڤْبَرَا خَوه دَه قَنْجِیکَارِیِیٚ ژِ بِیرْ مَکِنْ! بێگُمَانْ خُدِیٚ بِیَا کُو هُونْ دِکِنْ بِینَرَه.

**٢٣٨.** لِسرْ کِرِنَا نمێژَانْ و لِسرْ نِمێژَا نَاڤِینْ (نِمێژَا عَصْرِیٚ) مِقَاته بِنْ، بِگُهْدَارِی و بِتِرْسْ ژِ خُدِیٚ رَه رَابِنْ نِمێژِیٚ.

**٢٣٩.** اَگَرْ هُونْ بِطِرْسِنْ، ڤێجَه پِیَا یَانْ ژِی سُوارْ نِمێژْ بِکِنْ. دَمَا هُونْ (ژِ طِرْسِیٚ) اَوْلَه بُونْ، هَرْ وَکی کُو خُدِیٚ یَا کُو بَرِیٚ وَه نَدِزَانی بِوَه دَایه زَانِینْ، وِسَا ژِیٚ رَه نِمێژْ بِکِنْ.

**٢٤٠.** ژ وَه، اَوْ مێرێنْ كُو بِمِرِنْ و لِدُوڤْ خَوه ژِنَبییَانْ بِهێلِنْ، بِلا وَصِیَتْ بِكِنْ كُو حَتَا صَالَكِىَ اَوْ ژِنێنْ وَانْ دِ مَالێنْ وَانْ دَه بِكَارِنْ ژِیَانَا خَوه بِدُوٚمِینِنْ. اِیْدِی اَگَرْ اَوْ بِخَوه ژ مَالا مێرِىَ خَوه دَرْكَڤِنْ، هِنْگِىَ ژ بَرْ وَانْ تِشْتێنْ كُو اَوْ بِرِنْدِی ژ بُوٚ خَوه بِكِنْ تُو گُنَهْ ژ وَه رَه نِینَه. خُدِىَ سَرْدَسْتَه، كَارْبِنَجِهَه.

**٢٤١.** ژ بُوٚ ژِنێنْ كُو هَاتِنَه بَرِدَانْ، حَقِىَ وَانَه كُو بِرِنْدِی (بِجِلُ و بَرْگَانْ، خُوارِنُ و پێخَوارِنِىَ) بِێنْ هَاڤِلْدَارْكِرِنْ. اَڤْ یَكْ وَظِیفه یَه لِسَرْ وَانێنْ كُو هَایْ ژ فِرمَانُ و قَدَخِیێنْ خُدِىَ هَنَه.

**٢٤٢.** بِڤِی ئَاوَایِی خُدِىَ ئَایَتێنْ خَوه ژ وَه رَه اَشْكَرَه دِكَه دَا كُو هُونْ بِفِكِرِنْ و تێبِگِهێژِنْ.

**٢٤٣.** كَا ژ مِنْ رَه بێژَه: مَا اَوێنْ كُو ژ طِرْسَا مِرِنِىَ ژ وَلاتێنْ خَوه دَرْكَتِنْ دِگَلْ كُو هَژْمَارَا وَانْ بِهَزَارَانْ بُو، تَه نَدِیتِنْ؟ خُدِىَ ژ وَانْ رَه گُوٚتْ: "بِمِرِنْ" (اَوْ ژِی مِرِنْ)، پِشْتْرَه اَوْ سَاغْ كِرِنْ. بێگُمَانْ خُدِىَ لِسَرْ مِرُوٚڤَانْ خَودِی كَرَمَه. لێبَلِىَ پِرَانِیَا مِرُوٚڤَانْ ڤِىَ نَاشێكِرِینِنْ.[١]

**٢٤٤.** دِ رِیَا خُدِىَ دَه شَرْ بِكِنْ و بِزَانِنْ كُو بِرَاسْتِی خُدِىَ بِهِیزَرَه، زَانَا یَه.

**٢٤٥.** مَا كِی یَه اَوِىَ كُو دَیْنَكِی رِندْ بِدَه خُدِىَ (لِسَرْ فَقِیرُ و هَژَارَانْ قَنْجِیىَ بِكَه)، دَا كُو خُدَا ژِی وِی دَیْنِی قَاتْ بِقَاتْ زێدَتِرْ لِىَ ڤَگَرِینَه؟ اَوِىَ كُو كێمْ و زێدَه دِكَه خُدِىَ یَه و هُونِىَ هَرْ بِبَالْ وِی ڤَه ڤَگَرِنْ.

**٢٤٦.** مَا پِشْتِی مُوسَی تَه گِرَگِرێنْ اِسْرَائِیلِیَانْ نَدِیتِنْ كُو چه كِرِنْ؟! دَمَا وَانْ ژ پێخَمْبَرَكِی

---

١ اَڤْ كَسێنْ كُو ئَایَتَا پِیرُوٚزْ بَحْسَا وَانْ كِری جِڤَاتَكَه اِسْرَائِیلِیَانَه كُو حُكمْدَارِىَ وَانْ گَازِیَا جِیهَادِىَ لِوَانْ كِربُو. اَوْ ژ طِرْسَا كُو یِىَ دِ شَرْ دَه بِێنْ كُشْتِنْ، رَڤِیبُونْ. ڤێجَه خُدِىَ اَوْ هَشْتْ رُوٚژَانْ مِرِی هِشْتِنْ. پِشْتْ رَه بِقَبُولْبُونَا دُعَایَا پێخَمْبَرِىَ وَانْ، خُدِىَ اَوْ دِیسَا سَاغْ كِرِنْ و اَوْ حَتَا دَمَكِىَ لِژِیَانِىَ مَانْ. اِبنُ كَسِیرْ گُوٚتِیَه: عِبرَتَكْ دِ ڤِىَ رُودَانِىَ دَه هَیَه كُو تَدْبِیرْ نِكَارَه ژ بُوٚ قَدَرِىَ بِبَه ئَاسْتَنگْ و كُو نَه بِبَالْ خُدِىَ ڤَه بَه، ژ بَرْ خُدِىَ تُو سِتَارْ تُنَه یَه كُو مِرُوٚڤْ خَوه بِدَه بَرِىَ.

خَوه رَه گُوٚتِنْ: ”ژ مَه رَه حُكِمْدَارَكی بِشینَه (بلا بیَه مَزِنِیٚ مَه) دَا كُو اَمْ دِ رِیَا خُدِیٚ دَه شَرْ بِكِنْ.“ ژ وَانْ رَه گُوٚتْ: ”(اَزْ دِطِرْسِمْ كُو) اَگَرْ شَرْ لِسَرْ وَه فَرظْ بیَه كُو هُونِیٚ شَرْ نَكِن!“ گُوٚتِنْ: ”مَا كُو اَمْ ژ وَلاتِیٚ خَوه هَاتِنَه دَرَانینْ و ژ زَارُوٚكێنْ خَوه هَاتِنَه دُورْكِرِنْ، مَا چه لِمَه قَومیَه كُو اَمِیٚ دِ رِیَا خُدِیٚ دَه شَرْ نَكِنْ؟“ لِێبَلِیٚ چه دَمَا شَرْ لِسَرْ وَانْ هَاتَه فَرْزْكِرِنْ، ژ كێمْ كَسَانْ پِیٚ ڤَه، یێنْ دِنْ پِشتَا خَوه دَانَه وَانْ و ڤَگَرِیَانْ. خُدِیٚ بِستَمْكَارَانْ دِزَانَه.[1]

٢٤٧. پێخَمْبَرِیٚ وَانْ ژ وَانْ رَه گُوٚتْ: ”بێگُمَانْ خُدِیٚ طَالُوتْ وَكی حُكِمْدَارْ ژ وَه رَه شَانْدِیَه.“ گُوٚتِنْ: دِگَلْ كُو اَمْ بِیْهْتِرْ لایِقِیٚ حُكِمْدَارِیِیٚ نَه و دِگَلْ كُو ژ ئَالِیِیٚ مَالْ و زَنْگینِیِیٚ ڤَه تُو دَرْفَتێنْ فِرَه ژی ژ بُوٚ وی نَهَاتیَه دَایینْ، دِیٚ چَاوَا اَوْ لِسَرْ مَه بیَه حُكِمْدَارْ؟! پێخَمْبَرِیٚ وَانْ گُوٚتْ: ”بێگُمَانْ خُدِیٚ اَوْ لِسَرْ وَه بِژَارْتیَه و خُدِیٚ زَانینَكَه زێدَه و گَوْدَیَكی مَزِنْ دَایِیٚ. خُدِیٚ كِیٚ بِڤِیٚ فَرمَانْدَارِیَا خَوه دِدَه وِی. خُدِیٚ بِقَنْجیَا خَوه بَرْفِرَهه، زَانَا یَه.“[2]

٢٤٨. پێخَمْبَرِیٚ وَانْ ژ وَانْ رَه گُوٚتْ: ”بێگُمَانْ نیشَانَا حُكِمْدَارِیَا وی اَوَه كُو سِنْدُوٚقْ (یَا كُو تُورَاتْ تِیٚ دَه یَه) دِیٚ ژ وَه رَه بِیٚ. ژ جَمْ خُدَایِیٚ وَه، ژ بُوٚ وَه دِلْخُوٚشی و بَرْمَاهِیَكَه هِێژَا ژ بِنَمَالَا مُوسَا و هَارُونْ تِیٚ دَه نَه، فِریشْتَه وِیٚ هِلْدِگرِنْ. بێگُمَانْ دِ ڤِیٚ دَه، ژ بُوٚ وَه نیشَانْ هَنَه، اَگَرْ بِرَاسْتِی هُونْ خَودَانْبَاوَرْ بِنْ.

٢٤٩. چه دَمَا طَالُوتْ لَشْكَرْ ژ بُوٚ جیهَادِیٚ بَشْ بَشْ كِرِنْ؛ (ژ وَانْ رَه) گُوٚتْ: ”بِرَاسْتِی خُدِیٚ دِیٚ وَه بِچَمَكی بِجَرِبینَه. اِێدِی كی ژ وِی چَمی ڤَخُو، اَوْ نَه هَڤَالِیٚ مِنَه، كی

---

١ بنَاڤِیٚ «عَمَالِیقَه» مِلَتَكْ لِنَاڤْبَرَا مِسرْ و فِلِسْتِنِیٚ دِژِیَا و وَانْ اِیٚریشْ ئَانی سَرْ اِسرَائیلِیَانْ، اَوْ پَرِیشَانْ كِرِنْ و ژ وَلاتێنْ وَانْ كِرِنْ دَرْ. نَاڤِیٚ مَزِنِیٚ عمَالِیقَه جَالوتْ بُو. پێخَمبَرِیٚ وَانْ، بنَاڤِیٚ ”طَالُوتْ“ زِلامَكْ ژ نَاڤْ خَلْكِیٚ بِژَارتْ و اَوْ كِرَه سَرْدَارِیٚ وَانْ. اِیٚدی وَانْ اَڤْ یَكْ رَخْنَه كِرْ. اَڤْ ئَایَتێنْ كُو بێنْ بِكُرْتی ڤِیٚ قِسَیِیٚ رَاڤه دِكِنْ.

٢ طَالُوتْ، نَه ژ مَالبَاتَكَه نَاڤْدَارْ بُو، مِرُوٚڤَكی رِیٚنْجبَرْ و دَبَاخْكَارْ بُو. لِێبَلِیٚ ژ ئَالِیِیٚ زَانینْ، بَدَوْبُونْ و رَوِشْتْ ڤَه ژ اِسْرَائیلِیَانْ تَڤَانْ زَانَاتِرْ، اَخْلاقْ خَوشْتِرْ و بَدَوْتِرْ بُو.

ژِێ قَنَخُو بِرَاسْتِی اَوْ هَڤَالێ مِنَه. لِێبَلێ کَسێ مِسْتَکێ ژِێ ڤَخُو اَوْ خَمْ نَاکَه.» ڤێجَه ژِ وَانْ، ژِ بِلِی کێمْ کَسَانْ، تَڤْکَانْ ژِ وِی چَمِی اَڤْ ڤَخْوارْ. چه دَمَا طَالُوتْ و یێنْ کُو پێ رَه بَاوَرِی ئَانِیبُونْ ژِ چَمْ دَربَاسْ بُونْ، پِرَانِیَا وَانْ گُۆتِنْ: «اِیرُۆ لِهَمْبَرِی جَالوتْ و لَشْکَرێنْ وِی تُو هێزَا مَه تُنَه یَه.» اَوێنْ کُو بَاوَرْ دکرِنْ کُو اَوێ هَرِنْ بَرْ دَسْتێ خُدێ ژِ هَڤْ رَه گُۆتِنْ: «گَلَکْ جَارَانْ جِڤَاتێنْ هِنْدِکْ بِدَسْتُورَا خُدێ زُۆرَا جِڤَاتێنْ پِرْ بِرِنَه و خُدێ دِگَلْ سَبرکێشَانَه.»[١]

**٢٥٠.** چه دَمَا لِقَادَا شَرْ دَرکَتِنْ پێشْبَرِی جَالوتْ و لَشکَرێنْ وِی، گُۆتِنْ: «خُدَایێ مَه! صَبْرێ لِسَرْ مَه بِرِژِینَه، لِنگێنْ مَه مِکُومْ بِکَه و لِهَمْبَرِی گَلێ کَافِرْ ئَارِیکَارِیَا مَه بِکَه.»

**٢٥١.** اِێدِی بِدَسْتُورَا خُدێ اَوْ شِکَانْدِنْ. دَاوُدْ، جَالوتْ کُشت. خُدێ حُکمْدَارِی و حِکْمَتْ دَا دَاوُدْ و ژِ عِلْمێنْ کُو (خُدێ ) دِخوستْ پێ دَانْ زَانِینْ. اَگَرْ خُدێ بِهِنْ مِرُۆڤَانْ (شَرێ) هِنْ مِرُۆڤَا نَدَانَه پَاشْ، هَلبَتْ دِێ پَرگَالا سَرْ عَرْدِێ خَرَاب بِبُوِیَا. لِێبَلێ خُدێ ژِ بُۆ تَمَامێ عالَمێ خُودِیێ کَرَمَا پِرَه.

**٢٥٢.** (یَا مُحَمَّدْ!) اَوْ ئَایَتێنْ خُدێ نَه، اَمْ وَانْ بِحَقِی ژِ تَه رَه دِبێژِنْ. بێگُمَانْ تُو ژِ پێخَمْبَرَانِی.

---

١ صَبرْ: مَعْنَا وێ ئَا فَرْهَنْگِی؛ نَاڤِێ گِیَایَکی پِرْ تَحْلَه. د اصْطِلاحَا دِینِی دَه؛ خُورَاگِرْتِنَا لِسَرْ عِبَادَتَانْ، لِسَرْ نَکِرِنَا گُنَهَانْ و خُورَاگِرتِنَا لِهَمْبَرْ کَارَسَاتْ و تَنگزَارِیَانَه. بِسَدَمَا کُو خُورَاگِرتِنْ گَلَکی زَحْمَتْ و تَحْلَه، ژِێ رَه صَبرْ گُۆتِنَه. لَورَا یێ کُو صَبْرێ دِکێشێ تَحْلِیێ دِڤُرْپِێنێ. ڤێجَه ژِ بَرْ کُو صَبرْ، د تێکُۆشِینَا لِهَمْبَرْ کُفرْ و ظُلْمێ دَه پێدِڤِی یَه، ژِ بُۆ سَرْکَفتِنْ و گِهشْتِنَا اَرْمَانْجێ پِرْ گِرِینْگه. خُدێ د قُرئَانَا پِیرُۆزْ دَهنێزِیکی ٩٠ (نُوتْ) ئَایَتِی دَه بَحْسَا صَبرێ کِرِیَه، پَسْنێ صَبرکێشَانْ دَایه و بِصَبْرێ اَمرێ مَه کِرِیه.

سَبرْ سێ بَشَه:

ا) لِسَرْ کِرِنَا عِبَادَتِی ژِ بُۆ خُدێ دِڤێ مِرُۆڤْ صَبْرێ بِکێشه دَا کُو کَارِبَه ژِ هَمُو رَخَانْ ڤَه و بَئَاوَایَکی بێقُسُورْ تَاعَتێ رَبِّێ خَوه ژِ سِتُۆیێ خَوه بِکَه.

ب) لِهَمْبَرێ وَانْ کَارْ و بَارێنْ کُو خُدێ اَوْ حَرَامْکِرِنَه، دَا کُو کَارِبَه نَفْسَا خَوه -یَا چِلَکْ و یَا کُو بِنَقَنْجِیێ اَمرْ دِکَه- ژِ وَانْ ڤَکێشه و هَڤْسَارێ وێ بِخَه دَسْتێ خَوه و ژِ دَسْتْ خَوه هِیچْ بَرْنَدَه.

ج) لِهَمْبَرْ قَدَرْ و قَزَایْنْ خُدێ نَه، اَوێنْ کُو جَانْسُوْژْ و خَمْنَاکِنْ.

**٢٥٣.** اَوْ پێخَمْبَرێنْ كُو بَحْسَا وَانْ هَاتِيَه كِرِنْ، مَه هِنَكْ ژِ وَانْ دِ سَرْ هِنَكَانْ رَه گِرتِنَه؛ هِنْ ژِ وَانْ خُدِىٚ بوَانْ رَه پَيڤِيَه و دَرَجێينْ هِنَكَانْ ژِى بِلِندْ كِرِنَه. مَه نِيشَانێنْ اَشْكَرَه ژِى دَانَه عِيسَايِىٚ كُرِىٚ مَرْيَمِىٚ و مَه اَوْ بجَانِىٚ پَاكْ (وَحْيِىٚ) دَايَه دَسْتَكْكِرِنْ. اَگَرْ خُدِىٚ بِخَوسْتَا، اَوێنْ كُو پِشْتِى دَلِيلێنْ اَشْكَرَه ژِ وَانْ رَه هَاتِنْ، دِىٚ پِشْتِى پێخَمْبَرَانْ شَرِىٚ هَڤْ نَكِرِبُوِيَا. لِێبَلِىٚ اَوْ بِهَڤْ كَتِنْ؛ ڤێجَه هِنَكْ ژِ وَانْ اِيمَانْ ئَانِينْ و هِنَكْ ژِ وَانْ ژِى كَافِرْ بُونْ. اَگَرْ خُدِىٚ بِخَوسْتَا هَلبَتْ وَانْ شَرِىٚ هَڤْ نَدِكِرْ. لِێبَلِىٚ خُدِىٚ هَرْ چِه بِڤِىٚ (وِىٚ) دِكَه.

**٢٥٤.** هَىْ گَلِى يێنْ بَاوَرِى ئَانِينَه! بَرِيَا رُوٚژَكْ (كُو رُوٚژَا قِيامَتِىٚ يَه) بِسَرْ وَه دَه بِىٚ ژِ وِى رِزْقِىٚ كُو مَه دَايه وَه (دِ رِيَا خُدِىٚ دَه) خَرْجْ بِكِنْ كُو دِ وِىٚ رُوٚژِىٚ دَه نَه بَازَارْ، نَه دُوٚسْتَانِى و نَه ژِى مَهْدَرِى هَيَه. يێنْ كَافِرْ (اَوێنْ كُو زَكَاتَا مَالِىٚ خَوه دَرْنَائێخِنْ)، اَوْ سِتَمْكَارْ بِخَوه نَه.

**٢٥٥.** اَللَّهْ(خُدَا)؛ ژِ وِى پِىٚ ڤَه تُو اِلٰهْ تُنِنْ، هَرْ سَاخَه، هَرْ رَاگِرِىٚ هَيِينِىٚ يَه. نَه خَوْ وِى دِگْرَه نَه ژِى هێنژِينْ. هَرْ ژِىٚ رَه يَه يَا لِئَاسِيمَانَانْ و يَا لِعَرْدِىٚ. ژِ بِلِى يِىٚ كُو وِى دَسْتُورْ دَابه اَوْ كِى يَه (كُو بِىٚ دَسْتُورَا وِى) لِجَمْ وِى مَهْدَرِيِىٚ بِكَه؟ (خُدِىٚ) كِرْيَارێنْ كُو مِرُوٚڤْ دِكِنْ و يێنْ كِرِنَه پِىٚ دِزَانَه. ژِ يَا كُو وِى خَوسْتِى پِىٚ ڤَه كَسْ تِشْتَكِى ژِ زَانِينَا وِى نِزَانَه. كُرْسِيِىٚ وِى عَردُ و ئَاسِمَانْ دِ (بِنْ)خَو دَه گِرْتِنَه. پَارَاسْتِنَا وَانْ پِىٚ گِرَانْ نَايِىٚ و هَرْ اَوَه يِىٚ رَاسَرْ اِىٚ مَزِنْ.

**٢٥٦.** دِ (تێخِسْتِنَا) دِينْ دَه كُوٚتَكِى تُنَه! بِرَاسْتِى سَرْوَخْتِى ژِ رێشَاشِيِىٚ هَاتِيَه ڤَقَتَانْدِنْ. نَاخُو؛ چِه كَسِىٚ طَاغُوتِى اِنْكَارْ بِكَه و بِخُدِىٚ بَاوَرِيِىٚ بِينَه، تَقَزْ وِى خَوه بِقُلْپَا سَاخْلَمْ (و ئَاسِىٚ) گِرتِيَه كُو قَتَانْدِنْ ژِىٚ رَه تُنَه. خُدِىٚ بِهِيزَرَه، زَانَا يَه.[١]

---

١ اَڤْ ئَايَتَا پِيرُوٚزْ بِنْگَهَكَه گِرِينْگ ژِ مَه رَه اَشْكَرَه دِكَه. دِ نَاڤْ خَلكِىٚ -مُسلْمَانْ و نَمُسلْمَان- دَه بَاوَرِيكَ غَلَتْ هَيَه. لِگُوٚرِى فِكْرُ و رَامَانَا وَانْ اِسلامْ بَاوَرِيَا خَوه بِدَارِىٚ زُوٚرِىٚ بِخَلْكِى دِدَه قَبُلْكِرِنْ. غَلَتِيێنْ كُو لِسَرْ نَاڤِىٚ اِسْلامِىٚ بِدَسْتِيێنْ هِنْ مُسِلْمَانێنْ نَزَانْ خُيَا دِبَه، اَڤْ ژِى دِبه ئَارِيكَارِى ژِ بُوٚ وَانْ. يا كُو اَوْ دِ فِكرِنْ

**٢٥٧.** خُدێ، دُۆسْتُ و ئَاریکَارێ وَانێنْ کُو بَاوَری ئَانینَه؛ وَانْ ژِ طَاریتیێنْ کُفرێ دَرْدِخینَه بَالْ رُۆنَاهِیَا ایمَانِێ ڤَه. اَوێنْ کُو کَافِرنْ، دُۆستێنْ وَانْ ژی طَاغُوتَه؛ اَوْ وَانْ ژِ رُۆنَاهِیێ دَرْدِخینَه بَالْ تَارِیتِیَانْ ڤَه. هَا اَوْ خَلْکێ اِیگِرنْ، اَوْ حَتَا بِحَتَایِیێ تێ دَه نَه.[1]

**٢٥٨.** مَا تُو لِێ نَافِکرێ؛ اَوێ کُو بِاِبْرَاهِیمْ رَه دَرْحَقی خُدَایێ وِی دَه نیقَاشْ دِکرْ، ژِ بَرْ کُو خُدێ مِلْکْ (و فَرْمَانْدَاری) دَابُویێ (اَوْ دِ سَرْ خَوه ڤَه چُوبُو). دَمَا اِبْرَاهِیمْ ژێ رَه گُۆتْ: ”خُدَایێ مِنْ، اَوێ کُو سَاغْ دِکَه و دِمرینَه“. وی ژی گُوتْ: ”اَزْ ژی سَاغْ دِکِمْ و دِمرِینِمْ (ڤِیْجَه دُ مرُۆڤْ ئَانینْ؛ یَکْ سَاغْ هِشْتْ یَکْ ژی کُشتْ).اِبْرَاهِیمْ گُوتْ: ”بێگُمَانْ خُدێ رُۆژێ ژِ رُۆژهِلاتْ ڤَه تینَه رُۆژَاڤَا، دَه هَێدێ تُو ژی ژِ رُۆژْئَاڤَا بینَه رُۆژهِلاتْ“. اێدی یێ کَافِرْ (ژِ بَرْ ڤِێ گُوتِنِێ بێ دَلیلْ و) بَهتِی مَا. خُدێ قَوْمێ سِتَمْکَارْ رَاسْتَرێ نَاکَه.

**٢٥٩.** (مَا تُو لِوی ژی نَافِکرێ؛) اَوێ کُو دِ بَرْ بَاژَارَکی رَه دَربَاسْ بُو کُو بَانِێ وی بِسَرْ دِیوَارێنْ وی دَه هَرِفیبُونْ و گُوتْ: ”گَلُۆ خُدێ دێ چَاوَا پِشْتِی مِرنِێ وَانْ سَاغْ بکَه؟!“ خُدێ اَوْ مِرَاندْ، پِشْتِی صَدْ صَالِی دیسَا اَو سَاغْ کِرْ و ژێ رَه گُوتْ: ”تُو چه قَاسی مَایی؟“ گُوتْ: ”اَزْ رُۆژَکێ یَانْ ژی هِنَکْ ژِ رُۆژێ مَامَه.“ خُدێ ژێ رَه گُوتْ: ”نَه وِسَا یَه؛ تُو سَدْ سَالِی مَایی.“ دَه کَا لِخوَارِنُ و ڤَخوَارِنَا خوه بِنێرَه؛ هِێ ژی خَرَابْ نَبُویَه. دَه کَا لِکَرِێ خَوه ژی بِنێرَه (کُو اَوْ تَنێ هَسْتِی مَایَه). ژِ بُۆ اَمْ تَه ژِ مرُۆڤَانْ رَه

و دبێژنْ نَه رَاسْتَه. لَوْرَا؛ ئَایَتْ بَاشْکَرَه و زَلالْ دبێژَه ”د تێخسْتنَا دینْ دَه کُوتَکی تُنَه“، نَاخُو یَا اَوْ دبێژنْ اِفْتیرَایَه. لَوْرَا رَاسْتِی؛ ایمَانُ و حَقیقَتْ ژِ رێشَاشِیێ و کُفْرێ هَاتیَه کفشْکرن. کَی بخوهازه بلا بَاوَری بینَه و کی ژی نَخوازه بلا کَافرْ بِمینَه. لِێبَلێ غَلَتیکه دنْ ژی هَیَه؛ دبێژنْ: مُسلمَانْ نه لازمه حُکْمێنْ اِسْلامێ بجهْ بینَه، هَرْ کَسْ بکِیفَا خوه یَه، لَوْرَا؛”د دینْ دَهکُوتَکی تُنَه“. اَڤْ بَاوَریکه شَاشَه، مَرِڤێ کُو بِبێژه اَزْ مُسلمَانِمْ لازمه لِگُوری قُوتَا خوه، اَمْرُ و نَهیێنْ اِسْلامێ تَڤکَانْ بینَه جهْ.

[1] دِ ئَایَتِێ دَه بێژَیَا: ”طَاغُوت“ دَرْبَاسْ بُو کُو اَوْ هَمْ شَیْطَانَه، هَمْ پُوتَه، هَمْ خرَابی یَه، هَمْ نَفْسَا اِنْسیێنَه، هَمْ ئَارَزُویێنْ نَچِێ نَه، هَمْ ژی اَوَه کُو بِنزَانی مِرُۆڤْ بیَا یَکی بکَه کُو اَوْ دژی حُکْمێنْ خُدێ بَه، چَنْدی کُو لِسَرْ نَاڤِێ دِینْ بَه ژی.

بِکِنْ عِبرَتْ، مَه سَدْ سَالِی تُو لِڤِرْ مِرِی هِشْتْ و مَه دِیسَا تُو سَاغْ کِرِیَه. دَه کَا ڤێکَا لِهَسْتیانْ بِنێرَه چَاوَا اَمْ وَانْ تِینِنْ سَرْ هَڤْ و گُوْشتْ لِوَانْ دِکِنْ.“ چه دَمَا حَقْ ژِێ ڤه خُیا بُو، گُوْتْ: ”اَزْ بِیَقِینِی دِزَانِمْ کُو بِێ شِكْ خُدِێ لِسَرْ هَرْ تِشْتِی قَادِرَه.

**٢٦٠.** وِێ دَمَا اِبْرَاهِیمْ ژِ خُدَایِێ خَوه رَه گُوْت: خُدَایِێ مِنْ، کَا تُو چَاوَا مِریَانْ سَاغْ دِکی نِیشَانِی مِنْ بِدَه، خُدِێ گُوْتْ: ”مَا تُو بَاوَرْ نَاکِی (کُو اَزْ دِکَارِمْ مِریَانْ سَاغْ بِکِم)؟“ گُوْتْ: ”بَلِێ! اَزْ بَاوَرْ دِکِمْ. لِێبَلِێ ژِ بُوْ کُو دِلِێ مِنْ بِتَمَامِی ئَارَامْ ببَه (مِنْ خَوسْتْ ببِینِمْ!).“ (خُدِێ) گُوْتْ: ”نَاخُو چَارْ بَالِنْدَیَانْ بِگِرَه، وَانْ بِینَه جَمْ خَوه، پَاشِێ (وَانْ سَرْژِێکَه، پَارْچِه بِکَه)، هَرْ پَارْچِیَکی ژِ وَانْ دَیْنَه سَرِێ چِیَاکِی، پِشْترَه وَانْ گَازِی جَمْ خَوه بِکَه، اَوِێ بِلَزْ بِێنَه جَمْ تَه. بِزَانِبَه کُو خُدِێ بِرَاسْتِی عَزِیزَه، حَکِیمَه.[1]

**٢٦١.** مِینَاکَا وَانێنْ کُو مَالێنْ خَوه دِ رِیَا خُدِێ دَا خَرْجْ دِکِنْ وَکی مِینَاکَا لِبَكْ تُوْڤَه کُو حَفْتْ سِمْبِلْ ژِێ هِێشِینْ دِبِنْ، دِ هَرْ سِمْبِلَکی دَه ژِی سَدْ لِبْ هَنَه. خُدِێ ژِ بُوْ کَسێنْ کُو بِڤِێ، قَاتْ بِقَاتْ زێدَه دِدَه وَانْ. خُدِێ (بِکَرَمَا خَوه) بَرْفَرَهَه، زَانَا یَه.

**٢٦٢.** اَوێنْ کُو مَالێنْ خَوه دِ رِیَا خُدِێ دَه دِدِنْ و پِشْتِی دَاینِێ ژِی مِنَتِێ نَکِنْ و اَزِیتِێ نَدِنْ (یێنْ مَالْ دَانِێ)؛ ژِ بُوْ وَانْ (رُوْژَا قِیامَتِێ) لِجَمْ خُدَایِێ وَانْ خَلاتْ هَیَه، ژِ بُوْ وَانْ تِرسْ نِینَه و اَوْ غَمْگِینْ ژِی نَابِنْ.

**٢٦٣.** گُوْتِنَکَه خَوشْ و لێبُوْرِینْ، ژِ دَاینَا خێرَکَه کُو لِدُوڤْ وِێ اێشَانْدِنْ هَبَه چێترَه. خُدِێ دَوْلَمَنْدَه، بَرِبهێرَه.

١ اِبْرَاهِیمْ (ع.س.) مَرَاقْ کِرْ کَا چَاوَا خُدِێ مِریَانْ سَاغْ بِکَه. ڤێجَه ژِ خُدَایِێ خَوه خُوستْ کُو نِیشَانی وِی بِدَه. چَاوَا کُو دِ ئَایَتَا پِیرُوْزْ دَه بِهُورِیَه، خُدِێ بِنمُونَیَکه مَادِی بَرْسِڤَا وِی دَا. لێبَلِێ ئَاوَایِێ سَاغْکِرِنِێ نِیشَانی وِی نَدَا. اَڤْ نمُونِیێنْ کُو ژِ پِیخَمْبَرَانْ رَه هَاتِنَه ژِ بُوْ وَانْ مُوجِیزه نَه. یَا گِرِینْگ اَڤَه کُو مَه ژِ دِلْ بَاوَرِی هَبَه کُو خُدِێ مِسُوْگَرْ دِێ هَمُو خُدَانْ رُوحَانْ ڤَژِینَه -نَمَازِه- دِێ اِنسِێنْ سَاغْ بِکَه و بِکِشِینَه بَرْ حَسَابِێ.

**٢٦٤.** هَىْ گَلِى يێنْ بَاوَرى ئَانينَه! خێرَا صَدَقَيێنْ خوه بِمِنَّتْ و اِیْشَانْدِنىَ پُوچْ مَكِنْ. وَكى يىَ كُو مَالىَ خَوه برِيَاكَارى دِدَه، لِىَ دِ رَاسْتِيىَ دَه بِخُدىَ و رُوْژَا ئَاخرَتىَ بَاوَرى نَايينْ. ڤێجَه مينَاكَا وى دِشبَه مينَاكَا تَحْتَكى كُو لِسَرىَ هِنَكْ ئَاخْ هَبَه، اِيْدى بَارَانَكه گُرْ لِىَ ببَارَه (ئَاخىَ ژ سَرىَ ببَه)، وىَ رُوتْ و هِلو بِهێلَه. (اَڤێنْ وِسَا) كَارێنْ كُو كِرنْ نِكَارِنْ تِشْتَكى ژِىَ بِدَسْتْ بِخِنْ. خُدىَ كَافِرَانْ رَاسْتَرىَ نَاكَه.

**٢٦٥.** مينَاكَا يێنْ كُو مَالێنْ خَوه ژ بُوْ رِزَايَا خُدىَ و ژ رِزَا دِلىَ خَوه دِدِنْ وَكى مينَاكَا بُوْسْتَانَكيَه كُو لِسَرىَ گِرَكى به، بَارَانَكه گُرْ لِىَ ببَارَه و اَوْ بَرىَ (فێكيِىَ) خَوه دُو قَاتْ بِدَه. اَگَرْ بَارَانَكه پِرْ لِىَ نَبىَ ژِى خُنَاڤَكْ لِىَ وَرَه تێرىَ دِكَه. خُدىَ بِكَارێنْ كُو هُونْ دِكِنْ بينَرَه.

**٢٦٦.** اَرىَ مَا يَكْ ژ وَه دِخَوازَه كُو بَاخْچَيَكى وى ژ دَارْخُرمَه و مێوَانْ هَبَه، تىَ دَه رُوبَارْ بِكێشِنْ و ژ هَرْ جَلَبێنْ مێوَيَانْ تىَ دَه هَبِنْ، (ژِ ئَاليكى ڤَه ژِى) كَاليتى وى لاوَازْ بكَه، ژ ئَاليىَ دِنْ ڤَه ژِى زَارُوْكێنْ وى يێنْ ژَارْ هَبِن؛ ڤێجَه بَاهُوْزَكْ رَابَه كُو تىَ دَه ئَاگِرْ هَبَه، اِيجَارْ (بُوْستَانىَ وى) بِشَوْطينَه! هَرْ وِهَا خُدىَ ئَايَتێنْ خوه ژ وَه رَه اَشْكَرَه دِكَه دَا كُو هُونْ بِفِكرِنْ (و ژ وَانْ دَرْسُ و عِبْرَتىَ بِگِرنْ).[1]

**٢٦٧.** هَىْ گَلِى يێنْ بَاوَرى ئَانينَه! ژ پَاكىَ تِشْتىَ كُو وَه بِدَسْتْ خِسْتيَه و ژ يَا كُو مَه ژ وَه رَه ژ عَرْدىَ دَرَانيَه اِنفَاقْ بِكِنْ. ژ بُوْ خێرىَ بَرىَ خَوه نَدِنْ يىَ بێخێرْ؛ اَوىَ كُو اَگَرْ نَه ژ شَرْمَا به هُونْ بِخَوه وَرْنَاگِرنْ. بزَانِنْ، بِرَاسْتى خُدىَ دَوْلَمَنْدَه، هێژَاىىَ پَسنْدَاييِنىَ يَه.

**٢٦٨.** شَيْطَانْ بِخزَانيىَ وَه دِطِرْسينَه و بێئَمْرِيىَ (لِهَمْبَرى خُدَا) لوَه فَرْمَانْ دِكَه. خُدىَ ژِى ژ نِكْ خَوه سُوْزَا لِێبُوْرينْ و زێدَدَانىَ دِدَه وَه. خُدىَ (بِقَنْجيَا خَوه) بَرْفرَهَه، زَانَا يَه.

---

١ وَكى كُو ئَايَتَا پيرُوْزْ بَئَاوَايَكى شێرينْ و بَدَوْ رَاڤه كِرْ، مَالىَ دِنْيَاىىَ، مَقَامْ، جهْ و رُومَتْ مينَا بُوْستَانَكى يَه، نَه دِيارَه كَا كَنْگىَ دىَ ژِ دَسْتْ مِرُوْڤى بِچه. پێويسْتَه مِرُوْڤْ ڤىَ يَكىَ هيچْ ژ بيرَا نَكه!

**٢٦٩.** خُدێ، کێ بِڤێ حِکْمَتێ دِدَه وی و ژِ کێ رَه حِکمَتْ وَرَه دَاینْ، بِرَاسْتی خێرَکَه پِرْ ژێ رَه هَاتیَه دَاینْ. ژِ هِشْمَنْدَانْ پێ ڤَه تُو کَسْ ژێ شیرَتێ وَرنَاگِرَه.[١]

**٢٧٠.** چه خَرْجْکِرنَا کُو هُونْ خَرْجْ بِکِنْ ئَانْ چه نَزْرَا کُو هُونْ بِجِهْ بینِنْ مُحَقق خُدێ پێ دِزَانَه. ژِ بُوّ سِتَمْکَارَانْ تُو ئَاریکَارْ تُنِنْ.

**٢٧١.** اَگَرْ هُونْ سَدَقَیێنْ خَوه اَشْکَرَه بِدِنْ، اَوْ چِقَاسْ رِنْدَه و اَگَرْ هُونْ ڤَشێرِنْ و بِدِزی بِدِنْ خِزَانَانْ اَوْ ژِ وَه رَه هینْ چێتِرَه. (بِڤی کَارێ رِندْ) خُدێ گُنَهێنْ وَه دِێ بِبَخْشینَه و خُدێ ژِ کَارێنْ کُو هُونْ دِکِنْ ئَاگَاهْدَارَه.

**٢٧٢.** (اَی پێخَمبَر!) هیدَایَتْکِرنَا وَانْ نَه لِسَرْ تَه یَه؛ لێ بِلێ خُدێ، کێ بِڤێ وی هیدَایَتْ دِکَه. هُونْ چه خێرێ بِدِنْ، اَوْ ژِ بُوّ وَه یَه (هُونِێ فَیْدَا وێ بِبینِنْ) و هُونْ چه خێرێ بِدِنْ بِلا بَسْ ژِ بُوّ خُدَا بِه. هُونْ بِقَسْتَا خێرێ چه بِدِنْ (خَلاتَا وێ) بێکێماسی دِێ بِگِهیژَه وَه و لِوَه خَدرْ قَتْ نَاییێ کِرِنْ.[٢]

**٢٧٣.** بِلا هِنَكْ ژِ صَدَقَیێنْ وَه ژِ بُوّ وَانْ خِزَانَانْ بِنْ کُو خَو دَانَه رِیَا خُدێ و نِکَارِنْ (ژِ بُوّ بَازِرْگَانییێ) لِسَرْ عَرْدێ بِگَرِنْ. یێ کُو بِرَوْشَا وَانْ نِزَانَه، ژِ بَرْ پَاکْدێرِیَا وَانْ (کُو ژِ کَسی تِشْتَکی نَاخوَازِنْ) دِبێژِه ڤَێ اَوْ دَوْلَمَنْدِنْ. تُو وَانْ بِرُودێمیێ وَانْ نَاسْ دِکی کُو اَوْ حَوْجَه نَه. نَه پِرْ، نَه هِندِكْ خوَسْتَکییێ ژِ مِرُوّڤَانْ نَاکِنْ. هُونْ دِ رِیَا خُدێ دَه چه خَرْجْ بِکِنْ، ڤێجه بێگُمَانْ خُدێ پێ دِزَانَه.

١ حِکْمَتْ، اَوْ خَبَارِدَانْ یانْ ژی اَو خَبَاتَا دِ جِهێ خَوه دَه کُو نَه کێمْ بَه نَه ژی زێدَه. وَسفَكْ ژِ یێ خُدێ حَکیمَه. کَلامێ وی ژی مُحْکَمَه، ژِ هَرْ کێماسی و زێدَییێ بِلِنْدْ و دُورَه. مَبَسْتْ بییێن کُو پێشینْ ژِ بُوّ وَانْ حِکْمَتْ هَاتیَه دَایینْ پێخَمْبَرِنْ، لَوْرَا اَوْ نَه ژِ کِیسێ خَوه خَبَرْ دِدِنْ بَلْکی اَوْ بوَحْیَکَه ژِ جَمْ خُدێ خَبَرْ دِدِنْ. دُوڤْ رَه ژی اَو عَالِمێنْ کُو بِعِلْمێ خَوه عَمَلْ دِکِنْ، لَوْرَا اَوْ ژی ژِ قُرئَانْ و سُّنَتێ خَبَرْ دِدِنْ.

٢ ژِ بُوّ اَمْ رِندْ مَعْنَیا ڤێ ئَایَتَا پیرُوّزْ فَیمْ بِکِنْ هێژَا یَه کُو اَمْ سَبَبێ نِزُولاوێ فێرْ بِبِنْ. لِگُوّری کُو ژِ سَعیدێ کُرێ جُبیرْ هَاتیَه رَاگِهَانْدِنْ، مُسلْمَانَانْ سَدَقَه دِدَانْ زِمِّیانْ ژی. چه گَاڤَا فَقیرێنْ مسلمَانَانْ زێدَه بُونْ، ڤێجَه پێخَمْبَرێ خُدێ (س) ژِ وَانْ رَه گُوّتْ: "سَدَقَیێنْ خَوه تِنێ بِدِنْ بِرَاییێنْ خوه یێنْ مُسلْمَانْ. دِ ڤێ مِژَارێ دَه اَڤْ ئَایَتْ "هیدَئَایَتَا وَانْ نَه لِسَرْ تَه یَه" نَازِلْ بُو. ڤێجَه ئَایَتێ بِڤی ئَاوَایی سَدَقَه ژِ بُوّ فَقیرێنْ نَه مُسلْمَانْ ژی حَلالْ کِرْ.

**٢٧٤.** اَوێنْ کُو مَالێنْ خَوه بِشَڤْ و رُۆژ، بِدِزِی و اَشْکَرَه دِدِنْ، ژِ بُۆ وَانْ لِجَمْ خُدَایِێ وَانْ خَلاتَا وَانْ هَیَه و لِسَرْ وَانْ تِه تِرْسْ تُنَه و اَوْ غَمْگِینْ ژِی نَابِنْ.

**٢٧٥.** اَوێنْ کُو رِبَایِێ (سَلَفِێ) دِخُونْ، عَیْنِی مِینَا وَانێنْ کُو ژِ لێدَانَا شَیْطێنْ دِینْ بُوبِنْ (بِکَارُ و بَارِێ سَلَفِێ ڤَه) رَادِبِنْ. اَڤْ حَالِێ وَانْ ژِ بَرْ وِێ سَدَمِێ یَه کُو دِبێژِنْ: کِرِینُ و فِرُۆتِنْ مِینَا سَلَفِێ یَه. رَوْشْ اَڤَه؛ خُدِێ کِرِینْ و فِرُۆتِنْ حَلالْ کِرِیَه و سَلَف ژِی حَرَامْ کِرِیَه. نَاخُو؛ اَوْ کَسِێ ژِ جَمْ خُدَایِێ وِی شِیرَتَکْ ژِێ رَه وَرَه و اَوْ ژِی دَڤْ ژِێ بَرْدَه، ڤێجَه اَوْ سَلَفَا کُو بَرِێ (فێرْبُونَا حُکْمِێ حَرَامْبُونِێ) وَرْکِرِتِیَه ژِێ رَه یَه و کَارِێ وِی سپَارِیی خُدِێ یَه. چِه کَسِێ (پِشْتِی فێرْبُونَا حُکْمِێ وِێ) دِیسَا لِسَلَفِێ ڤَگَرَه، هَا اَوْ اَهْلِێ اِیگِرِنْ، حَتَا بِحَتَایِێ اَوِێ تِێ دَه بِنْ.

**٢٧٦.** خُدِێ سَلَفِێ هَلاکْ دِکَه و سَدَقَیَانْ ژِی زێدَه دِکَه. خُدِێ ژِ تَڤَکِێ نَانکُۆرْ اِێ گُنَهکَارْ حَزْ نَاکَه.

**٢٧٧.** بێگُمَانْ اَوێنْ کُو بَاوَرِی ئَانِینْ و کَارێنْ رِندْ کِرِنْ، بِئَاوَایِێ پێدِڤِی نِمێژْ کِرِنْ و زَکَاتْ دَانَه، ژِ بُۆ وَانْ لِنِکْ پَرْوَرْدَگَارِێ وَانْ خَلاتَا وَانْ هَیَه، طِرْسْ لِسَرْ وَانْ تُنَه و اَوْ غَمْگِینْ ژِی نَابِنْ.

**٢٧٨.** هَیْ گَلِی یێنْ بَاوَرِی ئَانِینَه! اَگَرْ بِرَاسْتِی هُونْ خَودَانْبَاوَرِنْ ژِ خُدِێ بِطِرْسِنْ و دَڤْ ژِ وِێ سَلَفَا (لِبَالْ خَلْکِێ) مَایَه بَرْدِنْ.

**٢٧٩.** اِیْدِی اَگَرْ هُونْ دَڤْ ژِ سَلَفِێ بَرْنَدِنْ، بِزَانِنْ کُو ژِ ئَالِیِێ خُدِێ و پێخَمْبَرِێ وِی ڤَه لِهَمْبَرِی وَه شَرَکِی دِژْوَارْ هَیَه. اَگَرْ هُونْ پُۆشْمَانْ بِبِنْ؛ ژِێ ڤَگَرِنْ، ڤێجَه سَرْمِیَانِێ وَه هَرْ ژِ وَه رَه یَه؛ نَه هُونْ زِلْمِێ بِکَنْ و بِلا لِوَه ژِی زِلِمْ نَیِێ کِرِنْ.

**٢٨٠.** اَگَرْ (دَینْدَارْ) دَسْتْتَنگْ بَه، حَتَا دَستْفرَهِیَکِێ بِلا مُهلَتْ لِێ بِێ دَایِنْ. اَگَرْ کُو هُونْ لَسَرِێ تَسَدُقْ بِکَنْ (لِهَنَکِی یَانْ لِتَڤَکِ بِبُورِنْ) (اَڤْ) ژِ بُۆ وَه چێتِرَه. اَگَرْ هُونْ زَانَابِنْ (هُونِێ لِێ بِبُورِنْ).

**٢٨١.** خوه ژِ (رِسْوَابُونَا) رُوٚژَكَه وِسَا بِپَارِيٚزِنْ كُو هُونىٚ تِىٚ دَه بِبَالْ خُدىٚ ڤَه ڤَگَرِنْ. پَاشىٚ هَرْ كَسْ ژِ بُوٚ كَارُ و كِرْيَارِيٚنْ كُو كِرِيَه دِىٚ حَسَابْ دِگَلْ بىٚ كِرِنْ و زُلِمْ لِوَانْ نَايىٚ كِرِنْ.

**٢٨٢.** هَىْ گَلى يِيٚنْ بَاوَرى ئَانِينْ! دَمَا وَه تِشْتَكْ حَتَا دَمَكَه نَاڤلِيٚكِرى بِدَينْ دَا هَڤْ، اِيٚدى وىٚ بِنِڤِيسِنْ. بِلا نِڤِيسَارَكْ (كَاتِبَكْ) بِعَدَالَتى دِ نَاڤْبَرَا وَه دَه بِنِڤِيسَه و بِلا وَكى كُو خُدىٚ پىٚ دَايه زَانِينْ خَوه ژِ نِڤِيسَانْدِنىٚ نَدَه پَاشْ و بِلَا (هَرْ تِشْتِى وَكى كُو هَيَه) بِنِڤِيسَه.

بِلا دَينْدَارْ ژِى دَيْنِىٚ خَوه بِبِيٚژِه و بِدَه نِڤِيسَانْدِنْ و بِلَا (دَرْ بَارِىٚ دَيْنِىٚ خَوه دَه) ژِ خُدَايىٚ كُو پَرُورْدَگَارِىٚ وى يَه بِطِرْسَه و بِلا تِشْتَكى ژِىٚ كِيٚمْ نَكَه. اِيٚدى اَگَرْ دَينْدَارْ ئَاقِلْسِڤِكْ به، يانْ لاوَازْ به، يانْ ژِى اَوْ بِخَوه نِكَارِبه بِدَه نِڤِيسَانْدِنْ، بِلا وَلِيىٚ وى (اَوىٚ ژِىٚ بَرْپِرْسْ) بِعَدَالَتى بِدَه نِڤِيسِينْ!

ژِ نَاڤْ خَوه دُ زِلامَانْ بِكِنْ شَاهِدْ. اَگَرْ دُو زِلامْ پَيْدَا نَبِنْ بِلا زِلامَكْ و دُ ژِنْ شَاهِدْ بِنْ ژِ يِيٚنْ كُو هُونْ ژِ وَانْ رَازى، اَگَرْ يَكْ ژِ وَانْ ژِ بِيرْ بِكَه دَا كُو يا دِنْ دِ بِيرَا وىٚ بِينَه.

دَمَا شَاهِدْ (ژِ بُوٚ شَاهِدِيىٚ) هَاتِنْ گَازِيكِرِنْ بِلا خَوه نَدِنْ پَاشْ. ژِ نِڤِيسَانْدِنَا دَينْ -چه بِچُوكْ به چه مَزِنْ- بِلا سِسْتْ نَبِنْ، حَيَانى بِدَمَا وَانْ ئَا دِيارْكِرى ژِى بِنِڤِيسِنْ. هَا اَڤْ رَنگْ لِجَمْ خُدىٚ بِعَدَالَترَه و ژِ بُوٚ شَاهِدِيىٚ خُرْتِرَه و ژِ بُوٚ كُو هُونْ نَكَڤِنْ گُمَانِىٚ سَاغْلَمْتِرَه.

لِيٚبَلِىٚ اَگَرْ بَازَارَا وَه دَسْتْ بِدَسْتْ بَه كُو هُونْ دِ نَاڤْبَرَا خَوه دَه بِدِنْ و بِسْتِينِنْ، هِنْگىٚ تُو گُنَهْ لِسَرْ وَه نِينَه كُو هُونْ وىٚ نَنِڤِيسِنْ.

دَمَا وَه بِهَڤْ رَه كِرِينْ و فِرُوٚتَانْ كِرْ ژِى شَاهِدَانْ بِگِرِنْ بِلا زَرَارَا تِه نِڤِيسَارِى و تِه شَاهِدِى نَبِىٚ كِرِنْ. اَگَرْ هُونْ زَرَارِىٚ بِدِنْ يَكى ژِ وَانْ، بِزَانِنْ كُو اَڤْ ژِ وَه رَه ژِى خَرَابى يَه. حُكْمُ و فَرْمَانِيٚنْ خُدِىٚ بِپَارِيٚزِنْ. خُدِىٚ بِوَه دِدَه هِينْكِرِنْ و خُدِىٚ بِهَرْ تِشْتِى زَانَا يَه.[١]

---

١ لِگُوٚرِى ظَاهِرِىٚ ڤِىٚ ئَايَتىٚ نِڤِيسَانْدِنَا دَيْنْ وَاجِبَه. لَوْرَا دَمَا فَرْمَانْ ژِ جَمْ خُدىٚ بىٚ وَاجِبيَتىٚ اِفَادَه دِكَه. لِيٚبَلِىٚ دِ ئَايَتَا ٢٨٣ىٚ يَا دِپِىٚ ڤِىٚ دَه: «..اَگَرْ هُونْ رِيٚوى بِنْ و وَه تِشْتَكْ دَينْ كِرْ و وَه كَاتِبَكْ ژِى نَدِيتْ (كُو

**٢٨٣.** اَگَرْ هُونْ رِيْوى بِنْ و وَه تِشْتَكْ دَينْ كِرْ و وَه كَاتِبَكْ ژِى نَديتْ (كُو بِنِڤيسَه، وىٚ چَاخِىٚ) گَرَوَكِىٚ دِ شُونَا وِى دَه رَادَسْتِى خُودِيىٚ دَينْ بِكِنْ. اِيْدى اَگَرْ هُونْ لِهَڤْ اَوْلَه بِنْ (گَرَوْ نَه پِيْويسْتَه). ڤِيْجَه بِلَا اَوىٚ كُو اِيْمِنى يىٚ هَاتِيَه كِرِنْ سِپَارَيَا لِجَمْ خَوه بِدَه (خَودِيىٚ وِىٚ) و بِلَا ژْ خُدَايِىٚ كُو پَرْوَرْدَگَارىٚ وِى يَه بِطِرْسَه(كُو خِيانَتِىٚ نَكَه). شَاهِدِيىٚ ڤَنَشيْرِنْ. كِى كُو شَاهِدِيىٚ ڤَشيْرَه، بِلا بِزَانَه كُو دِلِىٚ وِى گُنَهْكَارَه. خُدِىٚ بِكَارِىٚ كُو هُونْ دِكِنْ زَانَا يَه.

**٢٨٤.** چِه تِشْتيْنْ لِعَرْدُ و ئَاسِيمَانَانْ هَنَه هَرْ يِيْنْ خُدِىٚ نَه. اَگَرْ هُونْ ئَا دِ دِلِىٚ خَوه دَه اَشْكَرَه بِكِنْ، يانْ ژِى هُونْ وِىٚ ڤَشيْرِنْ، خُدِىٚ دِىٚ وَه ژِىٚ بَرپِرْسْ بِكَرَه. ڤِيْجَه خُدِىٚ كِىٚ بِڤِىٚ لِوى دِبُوْرَه و كِىٚ ژِى بِڤِىٚ دِدَه عَذَابِىٚ. خُدِىٚ لِسَرْ هَرْ تِشْتِى قَادِرَه.

**٢٨٥.** پِيْخَمْبِرْ بِوَحْيَا كُو ژْ جَمْ خُدَايِىٚ وِى ژِىٚ رَه هَاتِيَه بَاوَرى ئَانِيَه. تَڤَكِىٚ مُؤْمِنَانْ ژِى بِخُدِىٚ و بِفَرِيشْتَيِيْنْ وِى و بِكِتيْبِيْنْ وِى و بِپِيْخَمْبَرِيْنْ وِى بَاوَرى ئَانِينَه. (مُؤْمِنْ دِبيْژِنْ (: اَمْ جُدَاهِيىٚ نَائيْخِنَه نَاڤْبَرَا تُو يَكى ژْ پِيْخَمْبَرِيْنْ وِى (كُو اَمْ بِهِنَكَانْ بَاوَرى بينِنْ و هِنَكَانْ ژِى اِنْكَارْ بِكِنْ). گُوتِنْ: (خُدَايِىٚ مَه!) مَه فَرمَانَا تَه بِهيسْتْ و اَمْ ژْ تَه رَه بَرِدَسْتْ بُونْ. خُدَايِىٚ مَه! اَمْ لِيْبُوْرينَا گُنَهيْنْ خَوه ژْ تَه دِخَوازِنْ و ڤَگَرْ هَرْ بِبَالْ تَه ڤَه يَه.

**٢٨٦.** خُدِىٚ هَرْ كَسى بَسْ لِگُوْرى هِيْزَا وِى، وِى بِنْبَارْ دِكَه، خِيْرَا كُو بِدَسْتْ خِسْتِيَه هَرْ ژِىٚ رَه يَه و گُنَهيْنْ كُو بِدَسْتْ خَوه ڤَه ئَانِينَه ژِى هَرْ دِ سْتُويِىٚ وِى دَه نَه. خُدَايِىٚ مَه! اَگَرْ اَمْ (فَرمَانيْنْ تَه) ژْ بِيرْ بِكِنْ ئَانْ ژِى اَمْ (قَدَخَيِيْنْ تَه) بِبِيْحَمْدِى بِكَارْ بينِنْ، لِمَه نَگْرَه. خُدَايِىٚ مَه! هَرْ وَكى تَه بَارِىٚ گِرَانْ لِيِيْنْ بَرِيَا مَه كِرِيَه وِسَا لِمه بَارْ نَكَه.

---

بِنِڤيسَه، وىٚ چَاخِىٚ) گَرَوَكِىٚ دِ شُونَا وِى دَه رَادَسْتِى خَودِيىٚ دَينْ بِكِنْ « خُدِىٚ اِيشَارَتِى بَالْ اِرْشَادِىٚ ڤَه كِرِيَه؛ نَه بِبَالْ وَاجِبْ ڤَه. ژْ بُوْ چِه وِهَا؟ لَوْرَا؛ گَرَوْ دِ شُونَا نِڤيسَانْدِنَا دَينْ دَه يَه دَمَا كُو كَاتِبْ تُنَبَه. گَرَوْ ژِى اِجْمَاعًا نَه وَاجِبَه. چِمَا نَه وَاجِبَه؟ لَوْرَا خُدِىٚ بِعَيْنِى ئَايَتِىٚ «اِيْدى اَگَرْ هُونْ لِهَڤْ اَوْلَه بِنْ (گَرَوْ نَه پِيْويستَه)» نَه وَاجِبْ بُونَا گَرَوىٚ بَيَانْ كِرِيَه. يَعْنِى دَمَا هُونْ لِهَڤْ اَوْلَه بِنْ گَرَوىٚ نَه دِيْنِنْ. نَاخَوه؛ فِعْلَ فَرْمَانِى «فَلْيَكْتُبُوا» لِگُوْرِى مُحَقِقَانْ نَه وَجِبِيَه؛ بَلْكِى اِرْشَادِى يَه.

خُدَايێ مه! بَارِێ کُو اَمْ قَتْ نِکَارِبنْ هِلْگِرنْ ژِی لِمه بَارْ نَکَه. لِکێماسییێنْ مه ببُوره، مه ژِ گُنَهَانْ پَاقِژْ بِکَه و دِلْوِّقَانِیَا خَوه لِمَه بِکَه. خُودِیێ مه هَرْ تُو یِی، اِیْدِی مه لِهَمْبَرْ گَلِیێنْ کَافِرْ سَرْدَسْتْ بِکه.

## ٣. سُورَه یێ ئَالِی عِمْرَانْ

سُورَیێ ئَالِی عِمْرَانْ، لِمَدینێ نَازِلْ بُویَه. ٢٠٠ (دُو سَدْ) ئَایَته.

سُورَه، نَاڤێ خَوه ژِ ئَایَتَا ٣٤-٣٧'انْ گِرْتِیَه کُو دِ وَانْ دَه بَحْسَا مَالْبَاتَا عِمْرَانْ هَاتیه کِرِنْ.

نَاڤَرُوّکَا سُورَیی

سُورِیێ ئَالِی عِمْرَانْ سُورَیَکْ ژِ یێنْ درێژَه کُو لِمَدینێ نَازِلْ بُویَه. اَڤْ سُورَیێ پیرُوّزْ بَحْسَا دُ بِنْگَهێنْ گِرِینْگ اِیْنْ دِینێ اِسْلامێ دکَه.

بِنْگَهَا یَکَمْ؛ بَحْسَا رُکنێ بَاوَرِیێ دکَه و دِ بَارَا یَکیتیا خُدێ، دِ بَارَا پێخَمْبَرِیێ و رَاستْگُوّتنَا قُرئَانَا پیرُوّزْ دَه دَلِیلێنْ قَتْعِی تینَه. رَددَا گُمَانْ و شُبهِیانْ دکَه وێنْ کُو خُویْکِتێبْ دِ بَارَا اِسلامْ، قُرئَانْ و مُحَمَّدْ (س) دَه تینِنْ رُوّژَڤێ. چَاوَا سُوریێ بَقَرَه حَقیقَتَا جِهُویانْ، لِیسْتِكْ و نِیتێنْ وَانْ یێنْ سِنْسِی دَرَانِیبُو حُوّلِێ، یِنِی وِسَا سُوریێ ئَالِی عِمْرَانْ ژِی رَاسْتیا فِلَهَانْ (خِریستیانَانْ) دَرْدخَه مِیدَانێ کُو اَو دِ بَارَا مَسیحْ (عیسَا) دَه پِرْ تیکُوّشیانَه؛اِدِّعَا کِرِنَه کُو اَو خُدَایَه و بَاوَری بپێخَمْبَریا مُحَمَّدْ نَئَانینَه و قُرئَانْ مَانْدَلْ کِرِنْ.

بِنْگَهَا دُویمْ؛ بَحْسَا قَانُونْ و هِنْ حُکْمێنْ شَرِیعَتێ دکَه. بتَایبَتِی بَحْسَا فَرزْبُونَا حَجێ و جیهَادێ دکَه و بَحْسَا حَرَامیا کَارێ رِبَایێ و حُکْمێ یێنْ کُو لِزَکَاتێ دمِینِنْ ئَاسێ و وێ نَادِنْ، دکَه.

سُورَه، هِنَکِی بِکَتَکتْ بَحْسَا مُنَافِقَانْ و هَلْوَسْتَا وَانْ ا لِهَمْبَری مُومنَان دکَه.

سُورَه، پَاشێ بَحْسَا تَفَکُرێ یا دِ خُلقِیتَا عَرْدْ و ئَاسِیمَانْ دَه کِرِی کُو دِ وَانْ دَه گَلَكْ هُوّستِیی، ئَاهَنْگسَازِی و رَازْ هَنَه کُو قُدْرَتْ، یَکیتِی و هیینَا ئَافِرِینَرێ خُودَانحِکْمَتْ نِیشَانِی بیرْبِرْ و هِشْمَندَانْ ددِنْ.

---

**بِنَاڤێ خُدَایێ کُو رَحْمَنَ رَحِیمَ**

١. اَلِف، لام، مِیمْ!

٢. خُدىَ يَه، (يىَ كُو) ژ وِى پىَ ڤَه تُو مَعْبُودىَ بِحَقى تُنِنْ، اَوىَ كُو هَرْ سَاغَه، لِهَڤْرَاگرِىَ هَيينِىَ يَه.

٣. خُدىَ بِحَقى ژ تَه رَه كِتيِبْ هِنَارتْ كُو اَوْ رَاسْتْدَرِيْخا كِتيِبيِنْ بَرِيَا خَوه يَه و تَوْرَاتْ و اِنْجيلْ ژى هِنَارْتِنْ.

٤. كُو اَوْ (تَورَاتْ و اِنْجيلْ) بَرىَ ژ بُوْ مرُوْڤَانْ دَليلْ و رُوْنَاهِى بُونْ. خُدِىَ فُرقَانْ (كِتيِبَا جُدَاكَرْ يا كُو حَقْ و بَاطِلى ژ هَڤْ دِقَتِينَه) ژى هِنَارتْ. بيِگُمَانْ اَويِنْ كُو ئَايَتيِنْ خُدِىَ اِنْكَارْ دِكِنْ؛ ژ وَانْ رَه عَذَابَكى دِژْوَارْ هَيَه. خُدِىَ سَرْدَسْتَه، تُولْڤَكَرَه.

٥. بيِگُمَانْ نَه لِئَاسيِمَانَانْ نَه ژى لِعَرْدِىَ تِشْتَكْ ژ بَرْ خُدِىَ ڤَشَارْتى نينَه.

٦. خُدِىَ يَه، يىَ كُو دِ مَالْزَارُوْكَانْ دَه چَاوَا بِخَوازَه وِسَا دِرُوفْ دِدَه وَه. ژ وِى خُدَايىَ عَزِيزْ اِىَ حَكيمْ پىَ ڤَه تُو مَعْبُودِىَ بِرَاسْتى تُنِنْ.

٧. اَوَه يىَ كُو كِتيِبْ ژ تَه رَه هِنَارتْ، هِنْ ژ ئَايَتيِنْ وِىَ هَنَه كُو مُحْكَمِنْ كُو اَوْ بِنْگَهَا كِتيِبىَ نَه و ييِنْ دِنْ ژى مُتَشَابِهِنْ. ڤِيجَه هَرْچى كَسِىَ كُو دِ دِلِىَ وَانْ دَه ژ رَاسْتِيِىَ اَڤْرِيْبُونْ هَيَه، ژ بُوْ دَرْخِسْتِنَا فِتْنِىَ و دَا كُو تَأويِلَا ئَايَتَانْ (ژ جَمْ خَوه ڤَه) لِىَ بِينِنْ، دِكَڤِنْ پَىْ ئَايَتيِنْ مُتَشَابِهْ دَه. حَالْ اَڤَه كُو ژ خُدِىَ پىَ ڤَه تُو كَسْ تَأويِلَا وَانْ نِزَانَه. اَويِنْ كُو پِسْپُوْرِنْ و دِ زَانينِىَ دَه كُوْكْ بَرْدَانَه دِبيِژِنْ: "مَه بَاوَرى بِتَڤَكِىَ وِىَ (مُحكَمْ و مُتَشَابِهِىَ ژ ڤُرئَانِىَ) ئَانى. گِشتْ ژ جَمْ خُدَايىَ مَه نَه." تَنِىَ ييِنْ خَودَانْ ئَاقِلْ ژ ڤِىَ دَرْسْ دِگرِنْ.

٨. (اَويِنْ زَانَا و پِسْپُوْرْ وِهَا دُعَا دِكِنْ:) خُدَايىَ مَه! پِشْتى كُو تَه اَمْ ئَانينْ سَرْ رِيَا رَاسْتْ دِلِىَ مَه ژىَ ڤَنَگرِينَه. ژ جَمْ خَوه رَحْمِىَ لِمَه بِكَه. اَمْ بَاوَرِنْ كُو يىَ پِرْ دَايَنْدَه و بَخْشَنْدَه هَرْ تُو يى.

٩. خُدَايىَ مَه! تُو يى، يىَ كُو مرُوْڤَانْ دِ رُوْژَكَه وِسَا دَه لِهَڤْ كُوْمْ دِكَه كُو دَرْ حَقِىَ وِىَ رُوْژِىَ دَه ڤَتْ گُمَانْ تُنَه يَه. بِرَاسْتى خُدِىَ هِيچْ جِڤَانْ شَاشْ نَاكَه و ژ سُوْزَا خَوه دَانَاگرَه.

١٠. بِێگُمَانْ اَوِێنْ کُو کَافِرِنْ، مَالْ و زَارُوکِێنْ وَانْ لِجَمْ خُدِێ تُو فَیْدِێ نَادِنْ وَانْ. اَو بِخَوه ئَاردُوِیِێ ئَاگِرِێ جَهْنَمِێ نَه.

١١. (رِیَا وَانْ) وَکِی رِیَا اَهْلِێ فِرْعَوْنُ و کَسِێنْ بَرِیَا وَانَه. وَانْ، بِئَایَتِێنْ مَه بَاوَرِی نَئَانِینْ، ڤِێجِهخُدِێ ژِی، ژِبَرْ گُنَهِێنْ وَانْ، اَوْ هِنْگَافْتِنْ (و هَلاكْ كِرِنْ). خُدِێ، خُودَانِێ عَذَابِێ پِرْ دِژْوَارَه.

١٢. ژِکَافِرَانْ رَه بِبِێژَه: دِ دَمَکَه نِێزِیكْ دَه هُونِێ بِێنْ شِکَانْدِنْ و هُونِێ بِبَالْ دُوْژَهِێ ڤَه بِێنْ ئَاژُوْتِنْ. چه پِیسَجِهَه اَوْ دَرْ![1]

١٣. بِێگُمَانْ ژِ بُوْ وَه،دِ دُ کُومِێنْ کُو اَوْ (رُوْژَا جَنْگَا بَدْرِێ) هَاتِنْ هَمْبَرِی هَڤْ دَه عِبْرَتَکَه گِرِینْگ هَیَه؛ کُومَکِێ، دِ رِیَا خُدِێ دَه شَرْ دِکِرْ و یَادِنْ ژِی کَافِرْ بُونْ کُو بِدِیتِنَاچَاڤَانْ بَاوَرْمَنْدْ دُو قَاتِی خَوه دِ دِیتِنْ. خُدِێ کِێ بِڤِێ بِئَارِیکَارِیَاخُو پِشْتْگِرِیَا وِی دِکَه. هَلْبَتْ دِ ڤِێ دَه ژِخَودِی اَقْلانْ رَه عِبرَتَكْ هَیَه.

١٤. حَزْکِرِنَا دِلْبِژِێنَان؛ ژِنْ و زَارُوكْ، مَالْدَارِیَا پِرْ ئَا ژِ زِێرْ و زِیڤْ، هَسْپِێنْ دِرُوڤْکِرِی، تَرْشْ(دَڤه، دَوَارْ و پَزْ) و چَانْدِنِی دِچَاڤِێ مِرُوْڤَانْ دَه هَاتِنَه خَمِلانْدِنْ. هَا اَڤْ، کِێفبُوْرَانْدِنَا ژِیَانَا ڤِێ دِنْیَایِێ یَه و دُومَاهِیکَا سِپَحِی لِجَمْ خُدِێ یَه.

١٥. بِبِێژَه: مَا اَزْ یَکَه ژِڤَانْ چِێتِرْ ژِ وَه رَه نَبِێژِمْ؟ ژِ بُوْ یِێنْ تَقْوَادَارْ رَه، لِجَمْ خُدَایْێ وَانْ،

---

[1] دَمَاپِێخَمْبَرِێ خُدِێ، لِبَدْرِێ قُرَیْشِی تِێکْبِرِنْ و ڤَگَرِیَا مَدِینِێ، جِهُوکُومْکِرِنْ و ژِوَانْ رَه گُوْتْ: گَلِی جِڤَاتَاجِهُوِیَانْ! هِینْ بَلایکَه مِینَا بَلاَیَا کُوخُدِێ ئَانِی سَرِێ قُرِیْشِیانْ نَهئَانِی سَرِێ وَه، مُسلْمَانْ بِبِنْ. بِرَاسْتِی ژِی هُونْ دِزَانِنْ کُوَازْ بِپِیخَمْبَرِی هَاتِمَه شَانْدِنْ. جِهُوِیَانْ گُوْتْ: هَیْ مُحَمَّدْ! بِلا نَفْسَاتَه،تَه نَخَاپِینَه کُو تَه ژِقُرِیْشِیَانْ چَندْ کَسِێنْ نَزَانْ کُشْتِنَه کُو ژِ بُوْ جَنْگِێ تُو زَانِینَا وَانْ تُنَه بُو. ڤِێجَهبِخَوهبَاوَرْ نَبه کُوتُوِیِێ کَارِبِی مَه ژِی تِێكْ بِبِی. اَمْ بِخُدِێ صُوْندْ دِخُونْ؛ اَگَرْ تُو شَرِێ مَه بِکِی، تُو یِێ بِمَه بِزَانِی کَااَمْ چه مِێرْخَاسِنْ و تُو یِێ زَانِبِی کُو هُونْ رَاسْتِی تُو کَسِێ مِینَا مَه نَهَاتِنْ. ڤِێجَه دِڤِێ مِژَارِێ دَه اَڤْ ئَایَتَا پِیرُوْزْ نَازِلْ بُو.

هَمْ ژِی اَڤْ ئَایَتَا پِیرُوْزْ، مِزگِینْ دِدَا جَنَابِێ پِیخَمْبَرْ (س) کُو مُشْرِكْ و جِهُو دِێ لِهَمْبَرِی مُسلْمَانَانْ تِێكْ بِچِنْ. بِرَاسْتِی اَڤْ مُعْجِیزَیَا قُرْئَانَا حَکِیمْ پِێكْ هَاتِیَه. هَمْ مُشْرِكْ هَمْ ژِی جِهُو لِهَمْبَرِی مُسِلْمَانَانْ شِکَسْتِنْ.

بِهِشْتێنْ کُو دِنَاڤْ وَانْ رَه چَمْ دِهَرِکِنْ هَنَه کُو اَوێ حَتَابِحَتَايێ تێدَه بِنْ و ژِ وَانْ رَه دِنَاڤْ دَه هَڤسَرێنْ پَاكْ و تَمِيزْ و قَايلْبُونَا خُدێ هَيَه. خُدێ بِبَنْدێنْ خوه ئَاگَاهْدَارَه.

١٦. (بَنْدێنْ خُدێ اێنْ مُتَقِی) اَوێنْ کُو دِبێژِنْ: خُدَايێ مَه! بێگُمَانْ مَه بَاوَرِی ئَانِی، ڤێجَه لِگُنَهێنْ مَه بِبُوَرَه و مَه ژِعَذَابێ اێگِرْ بِپَارێزه..

١٧. اَوێنْ کُو صَبرْکێشِنْ، رَاسْتُ و دُرستِنْ، بِئَاوَايێ پێدِڤِی عِبَادَتْکَرِنْ، (بِمَالێ خَوه دِ رێکَا خُدێ دَه) بَخْشَنْدَه نَه و دِوَخْتێ سَحَرێدَه لِبُوَرِينَا گُنَهێنْ خَوه دِخَوازِنْ.

١٨. خُدێ شَاهْدَيِی دَا؛ بێگُمَان ژِبلِی وِی تُو مَعبُودْ نِينِنْ. مَلَائِيکَتْ و زَانَانْ ژِی بِڤێ يَکێ شَاهْدَيِی دِدِنْ کُو اَوْ بِعَدَالَتێ حُکِمْ دِکَه. ژِوِی خُدَايێ عَزِيزْ اێ حَکِيمْ پێڤَه تِه مَعبُودێ بِحَقِی تُنِنْ.[١]

١٩. بِرَاسْتِی لِجَمْ خُدێ دِينێ حَقْ(ومَقبُولْ) بَسْ اِسْلامَه. اَوێنْ کُو کِتێبْ ژِ وَانْ رَه هَاتِيَه، پِشْتِی کُو(دَرْبَارِی اِسْلامێ دَه) زَانِينْ ژِ وَانْ رَه هَاتْ، ژِ چَاڤْنَبَارِيَا خَوه کَتِنْ اِخْتِيلافێ. کَسێ بِئَايَتێنْ خُدێ بَاوَرِی نَاينَه، ڤێجَه بێگُمَانْ خُدێ حَسَابْدِيتِنَا وِی پِرْ بِلَزَه.

٢٠. اَگَرْ (اَوْ دَرْبَارێ دِينْ دَه) بِتَه رَه خِرَجِرێ بِکِنْ، ژِوَانْ رَه بِبێژَه: مِنْ، دِگَلْ يێنْ کُو دَانَه پَێ مِنْ، ژِخُدێ رَه خَو بَرِدَسْتْ کِرْ. ژِ يێنْ خَودِيکِتێبْ و يێنْ نَخَونْدَه (مُشْرِکَانْ) رَه بِبێژَه: اَرێ مَا هُونْ ژِ خُدێ رَه بَردَسْتْ بُونْ؟ ڤێجَه؛ اَگَرْ وَانْ خَوه بَرِدَسْتْکِرْ، ژِ خَوه اَوْ کَتِنَه سَرْ رێکَا رَاسْتْ. نَا؛ اَگَرْ اَو پِشْتَاخُو بِدِنْ (بَاوَرِيێ)، ڤێجَه(وَظِيفَا) تَه تَنێ رَاگِهَانْدِنَه. خُدێ بِبَندێنْ خَوه بِينِرَه.

---

[١] دَمَا پێخَمْبَرێ خُدێ لِمَدِينێ بِتَامِی بِجِهْ بُو، ژِفلَهێنْ شَامێ دُ کَسێ زَانَا قَسْدَا وِی کِرِنْ. وَانْ، پێخَمْبَرْ بِسَالِخْ و وَسْفێنْ وِی نَاسْکِرِنْ، ژێ رَه گُوتِنْ: تُومُحَمَّدِی؟ پێخَمْبَرْ گُوتْ: بَلِێ. گُوتِنْ: تُواَحْمَدِی؟ گُوتْ: بَلِێ. گُوتِنْ: اَمێ شَهْدَبُونَکێ ژِ تَه بِپِرسِنْ، اَگَرْ تُو وِێ ژِ مَه رَه بِبێژِی اَمێ بَاوَرِيێ بِتَه بِينِنْ. پێخَمْبَرێ خُدێ ژِ وَانْ رَه گُوتْ: کَرَمْکِنْ، بِپِرْسِنْ. گُوتِنْ: دِکِتێبَا خُدێ دَه شَهْدَيِی يَا هَرِی مَزِنْ چِيَه؟ ڤێجَه وَكْ بَرْسِڤَا پِرسَا هَرْ دِيانْ پێخَمْبَرْ اَڤْ ئَايَتَا پِيرُوَزْ خُونْدْ "خُدێ شَاهْدَيِی دَا کُو بێگُمَانْ ژِبلِی وِی تُومَعْبُودێ حَقْ تُنِنْ.. ."

٢١. بێگُمَانْ اَوێنْ كُو ئَايَتێنْ خُدێ مَانْدَلَه دِكِنْ و بنَحَقِى پێخَمْبَرْ و يێنْ كُو دَاخَوازَا قَنْجِيێ دِكِنْ دِكُژِنْ، ڤێجَه مِزگِينَا عَذَابَكى جَانْسُوْژْ بدَه وَانْ!

٢٢. هَا اَوْ، اَوْ كَسِنْ كُو كِرنێنْ وَانْ هَمْ لِدِنْيَايِێ هَمْ ژِى لِئَاخْرَتِێ پُوچْ بُونَه و ژوَانْ رَه تِه پِشتَڤَانْ و ئَاريكَارْ ژِى نِينْنْ.

٢٣. (رَسُولێ مِن!(مَا تُو لوَانْ كَسێنْ كُو پَارَكْ ژِكتێبێ ژِ وَانْ رَه هَاتِيَه دَاينْ، نَانێرى؟! اَوْ بِبَالْ كِتێبَا خُدێ ڤَه تێنَه گَازيكِرنْ دَا كُو دِنَاڤْبَرَا وَانْ دَه حُكِمْ بكَه، پِشتْرَه بِرَكْ ژوَانْ بَرِێ خَوه ڤَدِگِرينِنْ و ژێ بێزِێ دِكِنْ.

٢٤. اَڤْ هَلْوَسْتَا وَانْ ژبَرْ ڤِێ يَه؛ لَوْرَا دِبێژِنْ: "ژِ چَندْ رُوْژێنْ بژمَارْ پێڤَه اگِرْ بمَه نَاكَڤَه" و اَوْ تِشْتَا وَانْ دِ دِينِێ خُودَه(ژكِيسى خَوه) زێدَه كِرنْ اَوْ ژِ رِێ خِسْتِنْ.

٢٥. ڤێجَه دَمَا اَمْ، ژِ بُوْ رُوْژَا كُو گُمَانْ تێدَه تُنَه وَانْ لِهَڤْ بِجڤِينِنْ و ژهَرْ كَسى رَه تِشْتَا كُو قَزَنْجْ كِريَه بتَمَامِى(بێكێمَاسى) بێته دَاينْ، مَا گَلُوْ رَوْشَا وَانْ دِێ چَاوَا بَه؟!

٢٦. بِبێژَه: خُدێيُوْ! تُويى خَودِيێ خُودَانِيێ. تُو كِێ بِڤِێ مِلكْ دِدِيى و كِێ بِڤِێ مِلكْ ژێ دِسْتِينِى. تُو كِێ بِڤِێ عَزِيزْ دِكى، كِێ ژِى بِڤِێ پَرِيشَانْ دِكى. خێرْ و بێرْ هَرْ دِدَسْتِێ تَه دَه يَه. بێگُمَانْ تُو لِسَرْ هَرْ تِشْتِى قَادِرى.

٢٧. تُوشَڤِێ دِخى(نَاڤَا) رُوْژِێ، رُوْژِێ ژِى دِخى(نَاڤَا) شَڤِێ، تُو يِێ سَاغْ ژِ يِێ مِرى دَردِخِى و يِێ مِرى ژِى ژِ يِێ سَاغْ دَردِخِى و تُوكِێ بِڤِێ بێحَسَابْ رِزقْ دِدِيێ.[1]

٢٨. بِلا بَاوَرْمَندْ ژبِلى بَاوَرْمَنْدَانْ؛ كَافِرَانْ ژخَورَه نَكِنْ دُوْسْتُ و پِشْتَڤَانْ! كى ڤِێ بِكَه، ڤێجَه تِشْتَكى وِى بِخُدێ رَه تُنَه(پێوَنْدِيا وى بِخُدێرَه نَامِينَه). لِێبَلِێ كُوهُونْ

[1] اَڤْ ئَايَتَا پيرُوْزْ دِدَه نِيشَانْ كُو دَمَا شَڤْ كِنْ دِبَه رُوْژْ ژِى درێژْ دبَه و دَمَا رُوْژْ كِنْ دِبَه شَڤْ دِرێژْ دبَه. اَڤْ ژِى دَلِيلْ وبَلَگه يَه لِسَرْ قُدرَتَا خُدێ تَعَالَه. "تُويێ سَاغْ ژِيێ مِرى دَردِخى و تُو يِێ مِرى ژِيِێ سَاغْ دَردِخى " يعْنى: چَانْدنيێ ژِ لِبِێ دَردِخه، لِبِێ ژچَانْدِنيێ دَرْدِخه، خُرْمِيێ ژسِيسِكێ دَرْدِخَه، سِيسِكێ ژخُرمِيێ دَردِخَه، هێكێ ژمِريشْكێ دَردِخه، مِرِيشْكێ ژهێكێ دَردِخه. بگُوْتنَكه دِنْ؛ ژێنْ كَافِرْ مُومِنَانْ وژێ مُومِنْ ژِى كَافِرَانْ دَردِخى.

خُوژِخَرَابِيَا وَانْ بِپَارِێزِنْ اَوْ نَه تِێدَه يَه(هُونْ دِكَارِنْ دِدَمَا تِرسِێدَه تَقِيێ بِكِنْ). خُدِێ وَه ژِ(عَذَابِێ) خوه دِدَه طِرْسَاندِنْ و ڤَگَرْ بَسْ بِبَالْ خُدِێ ڤه يَه.[1]

**٢٩.** بِبێژَه: اَگَرْ هُونْ ئَا دِدِلِێ خودَه ڤَشێرِنْ يَانْ ژِی هُونْ وِێ اَشْكَرَه بِكِنْ هَرْخُدِێ پِێ دِزَانَه و اَوْ بِيَا لِئَاسِيمَانَانْ و بِيَا دِعَرْدِێدَه ژِی دِزَانَه. خُدِێ لِسَرْهَرْتِشْتِی كَارَايَه.

**٣٠.** وِێ رُوْژِێ هَرْكَسْ قَنْجِيَا كُو كِرِی (پَادَاشَا وِێ) لِپِێشْبَرِی خُوحَازِرْ دِبِينَه و ژِنَقَنْجِيێ يَا كُو كِرِی ژِی دِخَوازه كُو دِنَاڤْبَرَا وِی و وِێدَه مَسَافَيكه دُورْ هَبَه. خُدِێ، وَه ژِهَاتِنَا لِهَمْبَرِی خوه دِطِرْسِينَه. خُدِێ ژِ بُوْ عَقدِێنْ خوه پِرْ بِشَفْقَتَه.

**٣١.** بِبێژَه: اَگَرْ هُونْ بِرَاسْتِی ژِخُدِێ حَزْدِكِنْ، نَاخُو بِدِنْ پَیْ مِنْ؛ خُدِێ دِێ ژِوَه حَزْبِكَه و لِگُنَهِێنْ وَه وِێ بِبُوْرَه. خُدِێ هَرْگُنَهْبَخْشَه، دِلُوْڤَانَه.

**٣٢.** بِبێژَه: بِگُوْتِنَاخُدِێ و پِێخَمْبَرِێ وِی بِكِنْ. ڤِێجَه اَگَرْ اَوْ بَرِێ خوه ژِێ ڤَگَرِينِنْ، اِێدِی بِێگُمَانْ خُدِێ ژِكَافِرَانْ حَزْنَاكَه.

**٣٣.** بِێگُمَانْ خُدِێ ئَادَمْ و نُوحْ و مَالْبَاتَا اِبْرَاهِيمْ و مَالْبَاتَا عِمْرَانْ دِسَرْ عَالَمِێ (اٰ دَمَا وَانْ) رَه گِرتِيَه.

**٣٤.** اَڤْ نَسْلَكَه؛ هِنَكْ ژِ وَانْ ژِ هِنَكَانِنْ. خُدِێ ژِی بِهِيزَرَه، زَانَايَه.

**٣٥.** بِينَه بِيرَا خوه؛ وِێ دَمَا ژِنَا عِمْرَانْ گُوْتْ: خُدَايِێ مِنْ! مِنْ ئَا كُو دِ زِكِێ خو دَه، تَنِێ ژِ بُوْعِبَادَتِێ تَه و (خِزْمَتَا) مَالَا تَه نَزِرْكِرْ، ڤِێجَه ژِمِنْ قَبُولْ بِكَه. بِێگُمَانْ يِێ بِهِيزَرْ اِێ زَانَا هَرْ تُو يِی.

---

١ اَڤْ ئَايَتَاپِيرُوْزْ حُكْمَكِی ڤَبرِی يِێ اِسْلامِيتِێ رَاڤه دِكَه كُو بَاوَرْمَنْدْ هِيچْ نِكَارِنْ كَافِرَانْ ژِ بُوْخُو بِكِنْ دُوْسْتْ و نَشِێنْ ژِوَانْ حَزْبِكِنْ. لِێبَلِێ كُوژِوَانْ بِطِرْسِنْ اَڤْ رَوْشْ جُدَايَه. دِنَاڤَاخَلْكِێدَه اَڤْ يَكْ بِ"تَقِيێ" مَشهُورَه. اَگَرْ مُسِلْمَانْ بِطِرْسِنْ كُوكَافِرْ دِێ زَرَارِێ بِدِنْ وَانْ وِێ چَاخِێ ژِوَانْرَه رُخْسَتْ هَيَه كُوبِسَرِێ زِمِێنْ-نَه ژِدِلْ- ژِوَانْ رَه بِبِێژِنْ،اَمْ ژِوَه حَزْدِكِنْ. لُوْرَامِرُوْڤْ دِكَارَه بِڤِی ئَاوَايِی خُوژِنَقَنْجِيَاكَافِرَانْ بِپَارِێزه وبَلاوَانْ ژِخُوڤَكَه

**٣٦.** چه دَمَا وِىٚ حَمْلا خَوه دَانى، گُوٚتْ: خُدَايِىٚ مِنْ! مِنْ حَمْلا خَوه كَچْ دَانى-خُدِىٚ بِيْهْتِرْ دزَانَه كَاچه دَانيَه- و كُرْ نَه وَكى كَچِيْيَه، مِنْ نَاڤِىٚ وِىٚ مَرِيَمْ دَانى. اَزْ وِىٚ و زُرِيتَا وِىٚ بِتَه ژِشَيْطَانِىٚ قَوتِى دپَارِيْزِم.

**٣٧.** ڤِيْجَهخُدَايِىٚ وِىٚ، بِقَبُولَكَه رِندْ (نَزْرَا وِىٚ) ژِىٚ قَبُولْ كِرْ؛ اَوْ سِپَهى رَاكِرْ و رِندْ پَرْوَرْدَه كِرْ. زَكَرِيَا ژِى لِىٚ خُودِيتِى كِرْ. چه وَختَا زَكَرِيَا ژِ بُوٚ سَرْ لِيْدَانِىٚ چُوبَه عِبَادَتْگَهَا وِىٚ، فِيْكى و خَوارِنْ لِجَمْ دِدِيتِنْ. زَكَرِيَا گُوٚتْ: "هَىْ مَرِيَم! اَڤْ ژِتَه رَه ژِكُو تِىٚ؟»وِىٚ ژِى (ژِىٚ رَه وِهَا) گُوٚتْ: اَو ژِجَمْ خُدِىٚ يَه، بِرَاسْتِى خُدِىٚ كِىٚ بِڤِىٚ بِىٚ ژِمَارْ رِزقْ دِدِيىٚ.

**٣٨.** لِوِىٚ دَرِىٚ زَكَرِيَا گَازِى خُدَايِىٚ خَوه كِرْ: خُدَايِىٚ مِن! ژِ جَمْ خَوه زُرِيَتَكَه پَاكْ بِدَه مِنْ. بِيْگُمَانْ تُو، دُعَا قَبُولْ دِكى.

**٣٩.** ڤِيْجَه دِ هَمَانْ دَمَا كُو زَكَرِيَا دِ عِبَادَتْگَهَا خَوه دَه نِميْژْ دِكِرْ، مَلائِيكَتَانْ لِىٚ گَازى كِرْ؛ گُوٚتِنْ: بِيْگُمَانْ خُدِىٚ (بِنَاڤِىٚ) يَحْيَا مِزْگِينِيَا (كُرَكى) دِدَه تَه، تَصْدِيقَا پِيْڤَا خُدَا دِكَه (كُو عِيسَا پِيْخَمْبَرَه)، سَرْوَرَه، ژِ بُوٚ عَبْدِينِيِىٚ خَورَاگِرَه و پِيْخَمْبَرِكى ژِ صَالِحَانَه.

**٤٠.** زَكَرِيَا گُوٚتْ: خُدَايِىٚ مِنْ! چَاوَا دِىٚ كُرْ ژِ مِنْ رَه چِيْبَه. بِرَاسْتِى ژِى اَزْكَالَميْرْ بُومَه و ژِنَا مِنْ ژِى نَزَايُوٚكَه (زَارُوٚكْ ژِىٚ رَه چِيْنَابِنْ). خُدِىٚ (ژِىٚ رَه) گُوٚتْ: اَوْ وِسَانَه؛ يَا كُو خُدِىٚ بِخوازَه دِىٚ بِكَه.

**٤١.** زَكَرِيَا گُوٚتْ: خُدَايِىٚ مِنْ! نِيشَانَكِىٚ بِدَه مِنْ. (خُدِىٚ ژِىٚ رَه) گُوٚتْ: نِيشَانَا تَه اَوَه كُو ژِ اِيشَارَتِىٚ پِىٚ ڤَه حَتَا سِىٚ رُوٚژَانْ تُو دِىٚ بِمرُوٚڤَانْ رَه نِكَارِبَه بِپِيڤَه. خُدَايِىٚ خَوه پِرْ بِبِيرْ بِينَه و صِبَهْ و اِيْڤَارَانْ وِى پَاكْ بِدِيْرَه.

**٤٢.** وِىٚ دَمِىٚ مَلائِيكَتَانْ گُوٚتْ: اَىْ مَرْيَمْ! خُدِىٚ (ژِ نَاڤَا ژِنِيْنْ عالَمِىٚ) تُو بِژَارْتِى؛ تُو پَاكْ و پَاڤِژْ كِرِى و دِ سَرْ هَمُو ژِنِيْنْ جِيهَانِىٚ رَه تُو گِرْتِى.

**٤٣.** هَىْ مَرْيَمْ! تَنِىٚ ژِ خُدَايِىٚ خَوه رَه عِبَادَتِىٚ بِكَه؛ هَرَ سَجْدِىٚ و دِگَلْ نِميْژكَرَانْ نِميْژْ بِكَه.

٤٤. (يا مُحَمَّدْ!( اَڤْ ژِ خَبَرێنْ نَپَنْدِی نَه کُو ب(رِیَا) پَێخَامِێ (وَحْيِێ) اَمْ وَانْ ژِ تَه رَه رَادِگِهِینِنْ و وِێ چَاخَا وَانْ قَلَمێنْ خوه دَاڤێتِنْ كَا خَودِکِرنَا مَرْيَمِێ دِێ پِشْكَا كِێ ژِ وَانْ بِكَڤه تُو نَه لِجَمْ وَانْ بُويِی و دَمَا وَانْ (ژِ بُۆ ڤِێ مَسَلِێ) خِرَجِرْ دِکِرِنْ ژِی تُو نَه لِجَمْ وَانْ بُويِی.[1]

٤٥. وِێ دَمَا مَلائِيکَتَانْ گُۆتْ: هَێ مَرِيمْ! خُدِێ مِزگِينِيَا كُرَكِی بِگُۆتِنَکَه ژِ جَمْ خَوه (بِگُۆتِنَا "چِێبِبَه!") دِدَه تَه. نَاڤِێ وِی مَسِيحَه؛ عِيسَايِێ كُرِێ مَرْيمَه. لِدِنْيَا و لِاَخْرَتِێ (مِرُۆڤَکِی) رُومَتْدَارَه و ژِ يێنْ نێزِی خُدِێ نَه..

٤٦. عِيسَا، دِ دَرْگُوشِێ دَه و دِ نَاڤْسَرَتِيِێ دَه ژِی بِمِرُۆڤَانْ رَه دِێ بِپِيڤَه و اَوْ ژِ صَالِحَانَه..[2]

٤٧. مَرْيَمِێ گُۆتْ: خُدَايِێ مِنْ! دِێ چَاوَا زَارُۆكْ ژِ مِنْ رَه چِێبَه دِگَلْ كُو تُو كَسِی دَسْتْ نَدَايَه مِنْ؟ خُدِێ ژِێ رَه گُۆتْ: وِسَا يَه، يا خُدِێ بِڤِێ دَئَافِرِينَه. دَمَا حُكِمْ لِكَارَكِی بِكَه بِتَنِێ ژِێ رَه دِبێژه "چِێبِبَه!" اَوْ ژِی چِێدِبَه.

٤٨. (مَلائِيکَتَانْ دَرْبَارِی عِيسَا دَه وِهَا بَرْدَوامْ كِرِنْ): خُدِێ، دِێ وِی فێرِی نِڤِيسَانْدِنِێ، حِکْمَتِێ، تَوْرَاتْ و اِنْجِيلِێ بِكَه.

٤٩. (خُدِێ، دِێ وِی) ژِ بُۆ اِسْرَائِيلِيَانْ بِپێخَمْبَرِی بِشِينَه (و اَوِێ ژِ وَانْ رَه وِهَا بِبێژَه:) مِنْ

---

١ هَاتِيَه رَاگِهَانْدِنْ كُو دَمَا خُوسْتِنْ قُرْعَه بِكِنْ كَا ژِ وَانْ كِی دِێ ببه بَرْپِرْسِێ پَرُوَرْدَهِيَا مَرْيَمِێ. اَوێنْ قَلَمێنْ خَوه يێنْ كُو پێ تَوْرَاتْ دِنڤِيسِينْ بَاڤێژِنْ چَمْ، ڤێجه قَلَمَا كِێ دَرْكَتَا سَرْ رُويِێ ئَاڤِێ، اَوْ يێ بِبُويَا كَفِيلِێ وِێ. پِشْتِی كُو قَلَمێنْ خوه ئَاڤێتِنْ چَمْ، قَلَمَا نَبِی زَكَريا (ا.س.) لِسَرْ ئَاڤِێ سَكِنِی و اَوْ بُو كَفِيلِێ مَرْيَمِێ.

٢ دِ ڤِێ دَرِێ دَه اَوْ خَبَرْدَانَا كُو عِيسٰی پێخَمْبَرْ دِ دَرْگُوشِێ (لانْدِکِێ) دَه پِيڤِيَه اَشْكَرَا نَكرِيَه. لێبَلِێ ژِ سُورَه‌يِێ مَرْيَمْ دِ ئَايَتَا ٢٩-٣٣انْ دَه اَوْ پێڤَا كُو عِيسٰی پێخَمْبَرْ كِريَه وِهَا بَيَانْ كِريَه «مَرْيَمِێ زَارُوكْ دَسْتْنِيشَانْ كِرْ (گُۆ: ژِ وِی بِپِرْسِنْ بِلا اَوْ بوه‌رَه خَبَرْ بِدَه). گُۆتِنْ: اَمِێ بِزَارُوكَکِی دَرْگُوشِێ رَه چَاوَا بِپِيڤِنْ؟ زَارُۆكْ (عِيسٰی) وِهَا گُوتْ: اَزْ بَنْدِيِێ خُدِێ مَه، خُدِێ كِتێبْ (اِنْجِيلْ) دَايَه مِنْ و اَزْ كِرمَه پێخَمْبَرْ. اَزْ لِكُو دِبِمْ بِلا بِبِمْ، خُدِێ اَزْ پِيرُۆزْ گِرَانْدِمَه و حَتَا كُو اَزْ لِژِيَانِێ بِمْ فَرْمَانْ لِمِنْ كِرِيَه كُو نِمێژْ بِكَمْ و زَكَاتِێ بِدِمْ. (خُدِێ لِمِنْ فَرْمَانْ كِرِيَه) كُو لِدَايِكَا خَوه قَنْجِيِێ بِكَمْ و اَزْ نَكِرمَه خَوه‌مَزِنْدێرَكِی گُنَهْكَارْ. رُۆژَا كُو اَزْ بُومْ، رُۆژَا كُو اَزْ بِمِرِمْ و رُۆژَا كُو پِشْتِی مِرِنِێ اَزْ بێمَه ڤَژَانْدِنْ، سِلاڤْ هَرْ لِمِنْ بَه«.

ژِ جَمْ خُدَایێ وَه ژِ بُوّ وَه مُعْجِیزَیَكْ ئَانیَه؛ اَزْ ژِ بُوّ وَه ژِ حَرِیێ شَكْلِیێ تَیْرَانْ چێدِكِمْ پَاشێ اَزْ پِفْ دِكِمێ، ڤێجَه بِدَسْتُورَا خُدێ اَوْ دِبه تَیْرْ. دِیسَا بِدَسْتُورَا خُدێ اَزْ كُوّرُ و كُوّتِییَانْ خَوشْ دِكِمْ و مِرِیَانْ ژِی سَاغْ دِكِم. اَزْ، تِشْتێ كُو هُونْ لِمَالێنْ خَوه دِخُونْ و هِلتِینِنْ (پێ دِزَانِمْ و اَزێ) ژِ وَه رَه ژِێ خَبَرْ بِدِمْ. بِرَاسْتِی دِ ڤِێ رَوْشێ دَه ژِ بُوّ وَه عِبْرَتْ هَنَه. اَگَرْ هُونْ بَرَا بَاوَرمَنْدْ بِنْ (هُونێ ژِێ دَرسْ بِگِرِنْ).

٥٠. (عِیسَا گُوّتْ: اَزْ هَاتِمَه) ژِ بُوّ كُو اَزْ تَوْرَاتَا لِبَرْ دَسْتِێ خَوه رَاسْتْ بِدێرِمْ، هِنْ تِشْتێنْ كُو ژِ وَه رَه حَرَامْ بُوبُونْ ژِ وَه رَه حَلالْ بِكِمْ و مِنْ ژِ نِكْ خُدَایێ وَه مُعْجِیزه ژِ بُوّ وَه ئَانِینَه. نَاخُو ژِ (عَذَابێ) خُدێ بِطِرْسِنْ و بِگُوّتِنَا مِنْ بِكِنْ.

٥١. بێگُمَانْ خُدێ رَبِّێ مِنْ و رَبِّێ وَه یَه، نَاخَوه ژِێ رَه عِبَادَتێ بِكِنْ. هَا اَڤْ رێكَا رَاسْتَه.

٥٢. چِه دَمَا عِیسَا حِزِرْ كِرْ كُو اَوْ بَاوَرِیێ پێ نَایینِنْ، گُوّتْ: كِی دِ رێكَا خُدێ دَه پِشْتَڤَانُ و ئَارِیكَارێ مِنَه؟ حَوَارِیَانْ گُوّتْ: اَمِنْ ئَارِیكَارێنْ (دِینێ) خُدێ، مَه بَاوَرِی بِخُدێ ئَانِیَه و تُو ژِی شَاهِدْ به كُو بِرَاسْتِی اَمْ مُسِلْمَانِنْ.

٥٣. (حَوَارِیَانْ گُوّتْ:) خُدَایێ مَه! مَه بَاوَرِی بِیَا كُو تَه هِنَارْتِی ئَانِیَه و مَه دَا پَیْ پێخَمْبَرێ تَه، ڤێجَه مَه ژِ شَاهِدَانْ بِنِڤِیسَه.

٥٤. (جِهُویانْ بِدِزِی) دَكْ و دُوّلابْ (لِسَرْ عِیسَا پێخَمْبَر) گَرَانْدِنْ (دَا وِی بِكُژِنْ). خُدێ ژِی دَكْ و دُوّلابْ لِسَرْ وَانْ گَرَانْدْ. خُدێ چێتِرْ دَكْ و دُوّلابَانْ دِگَرِینَه.[1]

٥٥. وێ دَمێ خُدێ گُوّتْ: هَیْ عِیسَا! بێگُمَانْ اَزێ تَه بِتَمَامِی ژِ عَرْدێ بِگِرِمْ و رَاكِمْ جَمْ خَوه. اَزێ تَه ژِ یێنْ كَافِرْ بِپَارێزِمْ. اَوێنْ كُو دَانَه پَیْ تَه، حَتَا رُوّژَا قِیَامَتێ اَزێ وَانْ

---

١ جِهُویانْ بِدِزِی كَمِینْ لِبَرْ عِیسَا ڤَدَانْ و كُشتِنَا وِی سِپَارتِنْ مِرُوّڤَكِی. خُدێ ژِی كَمِینَا وَانْ پُوچْ دَرخِسْتْ، یَكِی كُو دِشِبِیَا عِیسَا كُشتِنْ و ژِ وَانْ وَیه كُو بِرَاسْتِی وَانْ عِیسَا كُشْتِیَه. حَالْ اَڤَه كُو خُدێ عِیسَا رَاكِرِیَه ئَاسِیمَانَانْ.

بِسَرْ يێنْ كَافِرْ بِخِمْ. پِشْتْرَه، ڤَگَرَا وَه بِبَالْ مِنْ ڤَه يَه، اَزِىَٔ دِنَاڤْبَرَا وَه دَه؛ دِ بَارَا يَا كُو هُونْ بِهَڤْ كَتِنْ دَه حُكِمْ بِكِمْ.

**٥٦.** ڤێجَه هَچِى يێنْ كَافِرِنْ، لِدِنْيَا و لِئَاخْرَتِىَٔ اَزِىَٔ عَذَابَكِى دِژْوَارْ بِدِمْ وَانْ و تِه ئَارِيكَارێنْ وَانْ ژِى دِىَٔ نَبِنْ.

**٥٧.** هَچِى يێنْ كُو بَاوَرِى ئَانِينْ و كَارێنْ قَنجْ كِرِنَه، خَلاتَا وَانْ دِىَٔ بێكِيمَاسِى ژِ وَانْ رَه بِىَٔ دَايِنْ. خُدِىَٔ ژِ ظَالِمَانْ حَزْ نَاكَه.

**٥٨.** (يا مُحَمَّدْ!) اَڤْ (ڤِصَيَا عِيسَا و دِيَا وِى) كُو اَمْ ژِ تَه رَه دِخُونِنْ، ژِ وَانْ نِيشَانِ(ێنْ رَاسْتْدَرێخِنْ) و بِيرْ ئَانِينێنْ (ڤُرْئَانَا) ئَايَتْمِكُومِنْ.

**٥٩.** بێگُمَانْ لِجَمْ خُدِىَٔ، رَوْشَا عِيسَا وَكِى رَوْشَا ئَادَمَه. خُدِىَٔ اَوْ (ئَادَمْ)ژِ ئَاخِىَٔ ئَافِرَانْدْ، پِشتْرَه ژِىَٔ رَه گُوتْ: "چێبِبَه!" ڤێجَه اَو ژِى چێبُو.

**٦٠.** اَڤْ (گُوتِنَا دِ بَارَا عِيسَا پێخَمْبَرْ دَه) حَقَه، ژِ جَمْ خُدَايِىَٔ تَه يَه. نَاخَوه تُو نَبه ژِ يێنْ كُو كَتِنَه گُمَانِىَٔ.

**٦١.** (يا مُحَمَّدْ!) پِشْتِى ڤِىَٔ زَانِينَا كُو ژِ تَه رَه هَاتِيَه، كِى دِ بَارَا وِىَٔ (مِژَارَا عِيسَا) دَه بِتَه رَه نِيقَاشِىَٔ بِكَه (ژِ وَانْ رَه) بِبێژَه: دَه وَرِنْ، اَمْ گَازِى زَارُوكێنْ خَوه و زَارُوكێنْ وَه، گَازِى ژِنێنْ خَوه و ژِنێنْ وَه و گَازِى خَوه و وَه بِكِنْ؛ پِشترَه اَمْ بِهَڤْ رَه نِفِرَانْ بِكِنْ و لَعْنَتَا خُدِىَٔ لِدَرَوِينَانْ بِبَارِينِنْ.

**٦٢.** بێگُمَانْ اَڤَا هَا مِسُوگَرْ ڤِصَيَكَه رَاستَقِينَه يَه. ژِ خُدِىَٔ پِىَٔ ڤَه تُو إِلٰهْ تُنِنْ. بێگُمَانْ خُدِىَٔ، هَرْ اَوَه يِىَٔ سَرْدَسْتْ يِىَٔ كَارْبِنَجِهْ.

**٦٣.** اَگَرْ دِيسَا بَرِىَٔ خَوه ژِ اِيمَانِىَٔ بِگَهرِينِنْ، بێگُمَانْ خُدَا زَانَايِىَٔ بِمِفْسِدَانَه.

**٦٤.** بِبێژَه: هَىَٔ گَلِى خَلْكێنْ خَوێكِتێبْ! وَرِنْ بێژَيَكِىَٔ ڤَبُولْ بِكِنْ كُو اَمْ و هُونْ تِىَٔ دَه

**١٣٢.** چه تِشْتێنْ لِعَرْدْ و ئَاسِیمَانَانْ هَنَه، اَوْ تَڤْ یێنْ خُدِیٚ نَه.(ژِ بُوٚ کَارْ و عَمَلِیٚ بَندَییێنْ خَوه) بِوَکِیلِی خُدِیٚ بَسَه.

**١٣٣.** گَلِی مِرُوٚڤَانْ!اَگَرْ خُدِیٚ بِخَوهازَه، دِیٚ وَه ژِ حُوٚلِیٚ رَاکَه و هِنَکێنْ دِنْ بِینَه شُونَا وَه. بێگُمَانْ خُدِیٚ لِسَرْ ڤِیٚ یَکِیٚ قَادِرَه.

**١٣٤.** کِی خَلاتَا دِنْیَایِیٚ بِخَوهازَه (بِلا بِزَانَه کُو) خَلاتَا دِنْیَا و ئَاخْرَتِیٚ هَرْدُو لِجَمْ خُدِیٚ نَه. خُدِیٚ بِهِیزَرَه، بِینَرَه.

**١٣٥.** گَلِی یێنْ کُو بَاوَرِی ئَانِینَه! بِدَادْپَرْوَرِییٚ رَابِنْ و ژِ بُوٚ خُدِیٚ شَاهدَییِیٚ بِدِنْ، چَنْدِینْ اَوْ لِدِژِی وَه بِخَوه، لِدِژِی دِیٚ و بَاڤێنْ وَه و خِزمێنْ وَه بَه ژِی.اَگَرْ اَوْ (مَافْدَارْ و مَافْژێگِرْ) دَوْلَمَندْ انْ خِزَانْ بِنْ، ڤێجَه خُدِیٚ ژِ هَرْدُویَانْ پێشْدَترَه(ژِ وَه). نَدنْ پَیْ اَرزُوییێنْ خَوه و ژِ عَدَالَتِیٚ شَاشْ نَبنْ.اَگَرْ هُونْ زِمَانِیٚ خَوه لِشَاهِدِییٚ خَوارْ بِکِنْ (رَاسْتِییٚ بِگُوهَرِینِنْ)، یَانْ ژِی بَرِیٚ خَوه ژِ شَاهِدِییٚ ڤَگَرِینِنْ (رَاسْتِییٚ ڤَشێرِنْ)، بێگُمَانْ ژِ یَا کُو هُونْ دِکِنْ خُدِیٚ ئَاگَاهْدَارَه.

**١٣٦.** گَلِی یێنْ کُو بَاوَرِی ئَانِینَه! لِسَرْ بَاوَرِیَا بِخُدِیٚ و پێخَمْبَرِیٚ وِی، لِسَرْ بَاوَرِیَا بِکِتێبَا کُو ژِ پێخَمْبَرِیٚ خَوه رَه شَانْدِیَه و بِوَانْ کِتێبێنْ کُو بَرِیٚ شَانْدِنَه بَردَوامْ بِنْ. چه کَسیٚ بِخُدِیٚ، مَلائیکَتێنْ وِی، کِتێبێنْ وِی، پێخَمْبَرێنْ وِی و رُوٚژَا دَاوِییٚ (قِیَامَتِیٚ) بَاوَرِییٚ نَئِینَه (کَافِرْ بِبَه) ڤێجَه بِرَاسْتِی اَوْ بِشَاشِیَکَه شَاشْ ژِ رِیٚ کَتِیَه.

**١٣٧.** بێگُمَانْ اَوێنْ کُو پێشِی اِیمَانْ ئَانِینْ پَاشِیٚ کَافِرْ بُونَه، پِشْترَه دِیسَا اِیمَانْ ئَانِینَه پَاشِیٚ دِیسَا کَافِرْ بُونَه، پِشْترَه کُفْرَا خَوه زێدَه کِرِنَه؛ خُدِیٚ نَه لِگُونَهێنْ وَانْ دِبُوٚرَه نَه ژِی لِسَرْ رِیَا رَاسْتْ وَانْ رَاسْتَرِیٚ دِکَه.

**١٣٨.** (یَا مُحَمَّدْ!) مِزگِینِیٚ بِدَه مُنَافِقَانْ کُو بِرَاسْتِی ژِ وَانْ رَه عَزَابَکِی دِژْوارْ هَیَه!

١٣٩. اَوێنْ كُو ژِ دِێڤْلا بَاوَرْمَنْدَانْ ڤَه كَافِرَانْ ژِ خَو رَه دِكِنْ خَودِی و ئَارِيكَارْ. اَرێ، مَا گَلُو اَوْ عِزَّتێ و رُومَتێ ژِ وَانْ هِێڤِی دِكِنْ؟! بێگُمَانْ رُومَتْ و سَرْفِرَازِی هَرْ ژِ خُدێ رَه يَه.

١٤٠. (گَلِی مُومِنَانْ!) دِ كِتێبێ دَه ژِ وَه رَه هَاتِيَه شَانْدِنْ؛ دَمَا وَه سَحْ كِرْ كُو ئَايَتێنْ خُدێ تێنْ مَانْدَلَكِرِنْ، يَانْ ژِی بوَانْ تِنَازْ تێ كِرِنْ، هِنْگێ دِگَلْ وَانْ (كَافِرَانْ و مُنَافِقَانْ) رُونَنِنْ، حَتَا كُو اَوْ خَوه نُوْقِی پِيڤَكَه دِنْ نَكِنْ.(دَمَا هُونْ جِڤَاتێ تَركْ نَكِنْ) هُونێ ژِی بِبِنْ وَكِی وَانْ. بێگُمَانْ خُدێ دێ تَمَامێ كَافِرْ و مُنَافِقَانْ دِ جَهْنَمێ دَه لِهَڤْ كُوْمْ بِكَه.[1]

١٤١. اَوێنْ كُو چَاڤْنێريَا نَرِنْدِيێ ژِ بُوّ وَه دِكِنْ؛ ڤێجهاَگَرْ ژِ جَمْ خُدێ فَتْحَكْ (سَرْكَفْتِنْ و غَنِيمَه) بِبَه نَصِيبێ وَه (ژِ وَه رَه) دِبێژِنْ: مَا اَمْ ژِی نَه دِگَلْ وَه بُونْ (دَه كَا پَارَا مَه ژِی بِدِنْ مَه)؟اَگَرْ سَرْكَفْتِنْ بِبَه نَصِيبێ كَافِرَانْ (ڤێ جَارێ ژِ وَانْ رَه) دِبێژِنْ: اَرێ مَا مَه هُونْ تێكَنبِرِنْ (ڤێجَه مَه دَسْتْ دَانِی سَرْ وَه) و مَه ژِ بَاوَرْمَنْدَانْ هُونْ پَارَاسْتِنْ؟ اِيْدِی خُدێ دێ رُوْژَا قِيَامَتێ دِ نَاڤْبَرَا وَه و وَانْ دَه حُكِمْ بِكَه. خُدێ لِهَمْبَرْ بَاوَرْمَنْدَانْ تُو رِيكێ نَادَه كَافِرَانْ.

١٤٢. بێگُمَانْ مُنَافِق حَولْ دِدِنْ كُو خُدێ بِخَاپِينِنْ. حَالْ اَڤَه كُو خُدێ خَاپَانْدِنَا وَانْ (بِعَذَابێ خَوه) دێ لِوَانْ ڤَگَرْينَه. دَمَا (بِمُومِنَانْ رَه) رَادِبِنَه نِمێژێ، بِكَاسُولِی و سِسْتِی رَادِبِنْ، لِپێشْبَرِی مِرُوْڤَانْ رِيَاكَارِی دِكِنْ و اَوْ پِرْ هِنْدِكْ ذِكْرێ خُدێ دِكِنْ.

١٤٣. اَوْ (مُنَافِقْ) دِ نَاڤْبَرَا كُفرْ و اِيمَانێ دَه دِچِنْ و تێنْ؛ نَه ژِ وَانْ (كَافِرَانْ) نَه ژِی ژِ ڤَانْ (مُومِنَانْ) تێنْ حَسێبێ. خُدێ، كێ ژِ رێ بِخَه ڤێجَه تُو ژِ بُوّ وِی رَاسْتِی چَارَسَرِيَكێ نَايێ.

---

١ چه تێكلِيێنْ نَاڤْ نَتَوَيی بِنْ، چه تێكِلِيێنْ فَرْدِی بِنْ، دِڤێ بَاوَرْمَنْدْ لِجَمْ بَاوَرْمَنْدَانْ جهێ خَوه بگرِنْ و دِ ڤێ دهَڤْرَبُونێ دَه لِهێزْ، رُومَتْ و عِزَتێ بگرِنْ. مِلَّتێ كُو ژِ بُوّ خُرتْ بِبَه هَاوَارَا خَوه بگَهِينَه كَافِرَانْ اَوْ هَرْ دێ قَلسْ بِبَه و فَرِدێنْ كُو مُرَاجَعَتِی وَانْ بِكَنْ، كَسَايَتِيَا خَوه ژِ دَسْتْ دِدِنْ. هَكَه بِهَڤْرَبُونَا مُسلْمَانْ و كَافِرَانْ بِبَه مَجْبُورِی، گَاڤَا كَافِرْ دِ عَلَيْهِێ دِينْ دَه بِپێڤِنْ بلا بَاوَرْمَنْدْ ژِ مَجْلِسَا وَانْ دَرْكَڤَه و وَانْ شَرْمَزَارْ بِكَه.

**١٤٤.** گَلی يێنْ کُو بَاوَرى ئَانِينَه! دِ شُونَا بَاوَرْمَنْدَانْ دَه كَافِرَانْ ژِ خَوه رَه نَكِنْ دُۆسْتُ و پِشْتَڤَانْ. مَا هُونْ دِخوازِنْ کُو لِدِژْبَرِی خَوه دَلِيلَكَه اَشْكَرَا بِدِنْ خُدِێ (دَا کُو ژِ بُۆ وِێ جَزَا بِدَه وَه)؟!

**١٤٥.** بێگُمَانْ مُنَافِقْ، دِ جَهْنَمِێ دَه دِ قَاتَا هَرِی ژێرْ دَه نَه، اِیْدِی تُو دِێ ژِ وَانْ رَه قَتْ ئَارِيكَارَكِی ژِی نَبِينِی.[1]

**١٤٦.** لێبَلِێ اَوێنْ کُو پۆشْمَانْ بُونَه، خَوه سَرَرَاستْ كِرِنَه، خَوه ژِ دِلْ بِخُدَا ڤَه گِرْتِنَه و تَنِێ ژِ خُدِێ رَه عِبَادَتێنْ خَوه كِرِنَه، ڤێجَه هَا اَوْ (رُۆژَا قِيَامَتِێ) دِگَلْ بَاوَرْمَنْدَانِنْ و پَاشِێ خُدِێ دِێ خَلاتَكَه مَزِنْ بِدَه بَاوَرْمَنْدَانْ.

**١٤٧.** (گَلی مِرُۆڤَانْ!)اَگَرْ هُونْ بَاوَرِيێ بِينِنْ و شِكْرِێ خُدِێ بِكِنْ، خُدِێ دِێ چِمَا وَه بِدَه عَذَابِێ! خُدِێ شُكِرْدَارَه، زَانَا يه.

**١٤٨.** خُدِێ ژَاشْكَرَاكِرِنَا گۆتِنَا نَبَاشْ حَزْ نَاكَه، لێبَلِێ كَسِێ کُو نَحَقِی لِێ بُوبَه اَوْ جُودَا يَه. خُدِێ بِهِيزَرَه، زَانَا يَه.

**١٤٩.** (گَلی مِرُۆڤَانْ!) اَگَرْ هُونْ قَنْجِيكِێ اَشْكَرَا بِكِنْ اَنْ هُونْ وِێ بِدِزِی بِكِنْ، يَانْ ژِی لِنَقَنْجِيَا (کُو لِوَه هَاتِيَه كِرِنْ) بِبۆرِنْ، ڤێجَه بێگُمَانْ خُدَا تێبِهُورَه، خَودَانْشِيَانَه.

**١٥٠.** بێگُمَانْ اَوێنْ کُو خُدِێ و پێخَمْبَرێنْ وِی مَانْدَلَ دِكِنْ و دِخَوازِنْ کُو جُودَاهِيێ بِخِنْ نَاڤْبَرَا وِی و پێخَمْبَرێنْ وِی و دِبێژِنْ: اَمْ بَاوَرِيێ بِهِنَكْ (ژ پێخَمبَرَانْ) تِينِنْ و اَمْ هِنَكَانْ ژِی مَانْدَلَ دِكِنْ و اَوْ دِخَوازِنْ کُو دِ نَاڤَا اِسلامْ و كُفْرِێ دَه رِيكَه دِنْ بِگِرِنْ...

---

١ دِ هَرْ چَاخِێ دَه لِكێلَكَا مُومِنێنْ حَقِيقِی هِنْ كَسێنْ کُو ژِ بُۆ بَرْژَوَنْدِيێنْ خَوه يَانْ ژِی ژِ بُۆ خَلاسِيَا خَوه هَنَه -چَنْدَانْ زَاهِرِی بَه ژِی- کُو خَوه مُومِنْ دَانَه نِيشَانْدَانْ. ژِ وَانْ رَه مُنَافِق تِێ گۆتِنْ. چَنْدِی لِدِنْيَايِێ نَبَه ژِی لِێ خُدِێ لِئَاخْرَتِێ دِێ رُوپُوشَا وَانْ ژِ بَرْ رُويِێ وَانْ رَاكَه و ژِ بَرْ کُو اَوْ كَافِرێنْ نَمَرْدِنْ دِێ وَانْ بِخَه قَاتَا جَهْنَمِێ يَا هَرِی ژێرِينْ دَه و دِ حَقِێ وَانْ دَه تُو شَفَاعَتِێ ژِی قَبُولْ نَاكَه.

**١٥١.** هَا اَوْ كَافِرْ بِخَوه نَه. مَه، ژِ بُوٚ كَافِرَانْ عَزَابَكِى رِسْوَاكَرْ ئَامَادَه كِرِيَه.

**١٥٢.** اَوِيٚنْ كُو بَاوَرِى بِخُدِىٚ و پِيٚخَمْبَرِيٚنْ وِى ئَانِينْ و جُودَاهِى نَخِسْتِنْ نَاڤَا يَكِى ژِ وَانْ؛ اَڤِيٚنْ هَا خُدِىٚ دِىٚ پَاشِىٚ خَلاتَا وَانْ بِدَه وَانْ. خُدِىٚ گُنَهْبَخْشَه، دِلُوٚڤَانَه.

**١٥٣.** (يَا مُحَمَّدْ!) اَهْلِى كِتِيٚبْ ژِ تَه دِخَوازِنْ كُو تُو ژِ ئَاسِيمَانَانْ كِتِيٚبَكِىٚ ژِ وَانْ رَه دَاخِى خَوارِىٚ. بِيٚگُمَانْ وَانْ ژِ مُوسَا تِشْتَكِى هِىٚ ژِ ڤِىٚ مَزِنْتِرْ خُوَسْتِبُونْ. ڤِيٚجَه گُوٚتِنْ: «خُدِىٚ اَشْكَرَا نِيشَانِى مَه بِدَه.»ڤِيٚجَه بِسَدَمَا ظِلْمَا وَانْ دِ جِهْ دَه بِرُوسْكِىٚ اَوْ هِنْگَافْتِنْ. دُوڤْرَه پِشْتِى كُو دَلِيلِيٚنْ اَشْكَرَا ژِ وَانْ رَه هَاتِنْ، گُوٚلِكْ ژِ خَوه رَه كِرِنْ اِلٰهْ. اِيٚدِى اَمْ دَرْ حَقِىٚ وِىٚ دَه لِوَانْ بُوٚرِينْ و مَه سَلاحِيَتَكَه اَشْكَرَا دَا مُوسَا.

**١٥٤.** مَه (چِيَايِىٚ) طُورْ دِ سَرْ وَانْ رَه رَاكِرْ دَا كُو پِيمَانَا خَوه بِجِهْ بِينِنْ و مَه لِوَانْ فَرْمَانْ كِرْ كُو دِ دَرْگَهْ رَه سَرتَوانْدِى و خُوَشكَانْدِى تِيٚكَڤِنْ بَاژِيٚرْ. مَه لِوَانْ فَرْمَانْ كِرْ كُو دِ رُوٚژَا شَمِيِىٚ دَه (بِنِيٚچِيرْكِرِنَا مَاصِيَانْ) زِيٚدَگَاڤِيِىٚ نَكِنْ (و نَدِنْ سَرْ بِرِيَارَا خُدِىٚ) و مَه ژِ وَانْ پِيٚمَانَكَه ئَاصِىٚ سِتَانْدْ.[1]

**١٥٥.** ڤِيٚجَه ژِ بَرْ كُو سُوٚزَا خَوه شِكَانْدِنْ و ئَايَتِيٚنْ خُدِىٚ اِنْكَارْ كِرِنْ و بِظِلْمِى پِيٚخَمْبَرْ كُشْتِنْ و ژِ بَرْ كُو دِگُوٚتِنْ: دِلِىٚ مَه تِژِيَه. (نَخِيٚرْ) ، بَلْكِى ژِ بَرْ كُفْرَا وَانْ، خُدِىٚ مُوٚهرْ لِسَرْ دِلِىٚ وَانْ دَايَه، ڤِيٚجَه هِنْدِكْ ژِ وَانْ بَاوَرِى تِينِنْ.

**١٥٦.** دِيسَا بِسَبَبْ اِنْكَارَا وَانْ (يَا دَرْ حَقِىٚ عِيسَا دَه) و ژِ بَرْ بِيٚبَخْتِيَكَه مَزِنْ كُو ئَاڤِيٚتِنْ سِتُويِىٚ مَرْيَمِىٚ.

**١٥٧.** هَمْ ژِى بِسَدَمَا كُو دِگُوٚتِنْ: «بِيٚگُمَانْ مَه پِيٚخَمْبَرِىٚ خُدِىٚ، عِيسَايِىٚ كُورِىٚ مَرْيَمِىٚ

---

١ دِ ڤِىٚ ئَايَتِىٚ دَه خُدِىٚ فَرْمَانْ دِكَه كُو «دِ رُوٚژَا شَمِيِىٚ دَه زِيٚدَهگَاڤِيِىٚ نَكِنْ». دِ ڤِىٚ ئَايَتِىٚ بَيَانْ نَبُويَه كَا فَرْمَانَا خُدِىٚ بِجِهْ ئَانِينَه ئَانْ نَا؟ لِىٚ بَلِىٚ دِ جِهِيٚنْ دِنْ دَه بَيَانْ كِرِيَه كُو فَرْمَانَا خُدِىٚ بِجه نَئَانِينَه. مِينَاكْ: «بِرَاسْتِى هُونْ دِزَانِنْ اَوْ يِنْ كُو دِ رُوٚژَا شَمِيِىٚ دَه دَسْتَدرِيٚژِى كِرِنْ كَا مَه چه بِسَرِىٚ وَانْ ئَانِيَه».بَقَرَه:٦٥ « و ژِ وِى گُنْدِىٚ كُو لِبَرْ كَرْسَخَا چَمْ بُو بِپِرْسَه؛ دَمَا وَانْ دِ رُوٚژَا شَمِيِىٚ دَه زِيٚدَهگَاڤ دِكِرِنْ..».اِعْرَافْ:١٦٣

مَسيحْ كُوشْتْ.»حَالْ اَڤَه كُو وَانْ اَوْ نَكُشْتِيَه، نَه ژِى وَانْ اَوْ لِچَارْمِخِىٚ دَايَه. لێبَلِىٚ ژِ وَانْ رَه هَاتْ شِبَانْدِنْ. بێگُمَانْ اَوێنْ كُو كَتِنَه اِخْتِلافِىٚ، دَرْ بَارِىٚ (كُشْتِنَا) وِى دَه بِگُومَانِنْ. ژِ گُومَانِىٚ پێشْتِرْ قَتْ زَانِينَا وَانْ بِتِشْتَكى نِينَه و بِرَاسْتِى ژِى وَانْ اَوْ نَكُشْتِيَه.

١٥٨. نَخێرْ، وَانْ عِيسَا نَكُشْتِيَه، بَلْكِى خُدِىٚ اَوْ هِلْدَايَه جَمْ خَوه. خُدِىٚ سَرْدَسْتَه، كَارْبِنَجِهَه.

١٥٩. ژِ يێنْ اَهْلِى كِتێبْ (فِلَّه و جِهُو) تُو كَسْ نِينَه كُو بَرِى مِرنَا خَوه بَاوَرِيێ پِىٚ (بِعِيسَا) نَئِينَه و رُوْژَا قِيَامَتِىٚ دِىٚ لِسَرْ وَانْ ژِى بِبَه شَاهِدْ.[1]

١٦٠. بِسَدَمَا ظِلْمَا كُو جِهُويَانْ كِرِبُو و بِسَدَمَا كُو وَانْ پِرْ كَسْ ژِ رِيَا خُدِىٚ ڤَگَرْانْدِبُونْ، مَه هِنْ نِعْمَتێنْ پَاكْ اێنْ كُو (پێشى) ژِ وَانْ رَه هَاتِبُونْ حَلالْكِرِنْ، لِوَانْ حَرَامْ كِرِنْ.

١٦١. دِيسَا بِسَدَمَا كُو سَلَفْ (رِبَا) دِخوارِنْ، دِگَلْ كُو (دِ تَورَاتِىٚ دَه) ژِى مَنْعَا وَانْ ژِىٚ هَاتِبُو كِرِنْ و بِسَدَمَا كُو مَالێنْ مِرُوْڤَانْ بِنَه رَوَايِى و سِتَمْكَارِى دِخوارِنْ (تِشْتێنْ كُو ژِ بُوْ وَانْ حَلالْ بُونْ لِسَرْ وَانْ هَاتَه حَرَامْكِرِنْ). مَه، ژِ بُوْ كَافِرَانْ عَزَابَكِى بِژَانْ ئَامَادَه كِرِيَه.

١٦٢. لێبَلِىٚ ژِ وَانْ، اَوێنْ كُو دِ زَانِينِىٚ دَه كُوْكْ بَردَانَه و يێنْ بَاوَرْمَنْدْ، بِيَا كُو ژِ تَه رَه هَاتِيَه شَانْدِنْ و بِيَا كُو ژِ پێخَمْبَرێنْ بَرِيَا تَه رَه ژِى هَاتِيَه شَانْدِنْ بَاوَرِيێ تِينِنْ و اَوێنْ كُو نِمێژِىٚ دِكِنْ، زَكَاتِىٚ دِدِنْ و بَاوَرِيێ بِخُدِىٚ و رُوْژَا ئَاخْرَتِىٚ تِينِنْ، هَا اَمِىٚ پَاشِىٚ خَلاتَكَه مَزِنْ بِدِنْ وَانْ.

١٦٣. بێگُمَانْ چَاوا مَه پێخَامْ (وَحِى) ژِ نُوحْ و پێخَمْبَرێنْ پِشْتِى وِى رَه شَانْدْ، هَرْ وِهَا مَه پێخَامْ ژِ تَه رَه ژِى شَانْدْ. مَه پێخَامْ ژِ اِبْرَاهِيمْ، اِسْمَاعِيلْ، اِسْحَاقْ، يعْقُوبْ و نَڤِيَانْ

[1] واتَيَا ئَايَتِىٚ: جِهُو و فِلَّه دَمَا بِكَڤِنْ بَرْ مِرنِىٚ، وِىٚ چَاخِىٚ فَامْ دِكِنْ كُو عِيسَا نَه كُورِىٚ خُدِىٚ يَه؛ لێبَلِىٚ اَوْ بَنْدِيێ خُدِىٚ و قَاصِدِىٚ وِى يَه. لِسَرْ ڤِىٚ يَكِىٚ بَاوَرِيێ تِينِنْ، لِىٚ بَاوَرِيَا وَانْ وِىٚ دَمِىٚ تِه مُوفَايِىٚ نَادَه وَانْ.

(اِیْنْ یعْقُوبْ) و مَه پَیخَامْ ژِ عِیسَا، اَیوبْ، یونُسْ، هَارُونْ و سُولَیْمَانْ رَه ژِی شَانْدْ. مَه زَبُورْ ژِی دَایَه دَاوِدْ.

١٦٤. (مَه، قَاسِدْ شَانْدِنْ؛) هِنْ ژِ قَاسِدَانْ مَه بَحْسَا وَانْ بَرِیَا ڤێگَا ژِ تَه رَه کِرِیَه و هِنْ قَاسِدْ ژِی مَه بَحْسَا وَانْ ژِ تَه رَه نَکِرِیَه. بێگُمَانْ خُدِێ بِمُوسَا رَه خَبَرْ دَایَه.

١٦٥. اَوْ پێخَمْبَرێنْ مِزگِینبَرْ و هِشیَارکَرْ بُونْ دَا کُو پِشْتِی پێخَمْبَرَانْ، لِهَمْبَرِی خُدِێ، ژِ مِرُوڤَانْ رَه تُو بَهَانَه چێنَبَه! خُدِێ سَرْدَسْتَه، کَارْبِنَجهَه.

١٦٦. لِێبَلِێ، خُدِێ لِسَرْ یَا کُو ژِ بُوْ تَه هِنَارْتِیَه شَاهِدِیێ دِدَه، خُدِێ اَوْ بِزَانِینَا خَوه هِنَارْتِیَه. مَلائیکَتْ ژِی ژِ ڤێ رَه شَاهِدِیێ دِدِنْ. بِشَاهِدِی خُدِێ بَسِی تَه یَه.

١٦٧. بێگُمَانْ اَوێنْ کُو کَافِرْ بُونَه و (خَلْکِێ) ژِ رِیَا خُدِێ ڤَدِگَرِینِنْ، بِرَاسْتِی اَوْ دِ رێشَاشِیَکَه دُورْ و کُورْ دَه نَه.

١٦٨. بێگُمَانْ اَوێنْ کَافِرْ بُونَه و (بِبَرْدَوامِیَا لِسَرْ کُفْرِێ) ظِلمْ کِرِنَه، خُدِێ هِیچْ لِوَانْ نَابُوْرَه و تُو رِێیێ بِبَرْ وَانْ نَاخَه...

١٦٩. ژِ بِلِی رِیَا دُوْژَهِێ (جَهْنَمِێ) کُو اَوْ دِێ حَتَا بِحَتَایِێ تِێ دَه بِنْ. اَڤْ کَارْ لِبَرْ خُدِێ پِرْ هێسَانَه.

١٧٠. گَلِی مِرُوڤَانْ! بێگُمَانْ پێخَمْبَرْ ژِ نِکْ خُدَایِێ وَه رَاسْتِی ژِ وَه رَه ئَانِیَه. نَاخُو بَاوَرِیێ پِێ بِینِنْ کُو اَوْ ژِ بُوْ وَه چێتِرَه. اَگَرْ هُونْ اِنْکَارْ بِکِنْ، تَقَزْ چه تِشْتێنْ لِعَرْدْ و ئَاسِیمَانَانْ هَنَه، تَڤْ یێنْ خُدِێ نَه. خُدِێ عَلِیمَه، حَکِیمَه.

١٧١. گَلِی یێنْ اَهْلِی کِتێبْ! خَوه لِدِینِێ خَوه بێئَنْدَازْ بَرْنَدِنْ و ژِ رَاسْتِیێ پِێ ڤَه لِسَرْ نَاڤِێ خُدِێ تِشْتَکِی دِنْ نَبێژِنْ. بێگُمَانْ مَسِیحْ؛ عِیسَایِێ کُورِێ مَرْیَمِێ بَسْ پێخَمْبَرِێ خُدِێ و (مِسُوْگَرْبُونَا) گُوْتِنَا وِی یَه کُو بِبَالْ مَرْیَمِێ ڤَه هَاتِیَه گُوْتِنْ (ئَانْگُوْ؛ خُدِێ گُوْتِیَه: «چِێبَه!»اَوْ ژِی چِێبُو) و (عِیسَا) خُدَانْجَانَکِی (خُدَانْرُوحَکِی)ژِ جَمْ وِی یَه. نَاخَوه

بَاوَرِيىَ بِخُدِىَ و بِقَاصِدِيْنْ وِى بِينِنْ و نَبِيْژِنْ: «خُدَا سِسِىَ نَه.»خَوه ژِ ڤِىَ گۆتِنِىَ بِدِنْ پَاشْ كُو اَڤْ دَانَپَاشِى ژِ بُوّ وَه چِيْترَه. بِيْگُمَانْ خُدَا بَسْ خُدَايَكى بِتَنِىَ يَه، اَوْ ژِ يَا كُو زَارُوّكْ ژِىَ رَه هَبِنْ پَاكْ و دُورَه. چِه تِشْتِىَ لِعَرْدْ و ئَاسِيمَانَانْ هَيَه هَرْ مِلْكِىَ وِى يَه، خُدِىَ (دِ مِلْكِىَ خَوه دَه) ژِ رِيْڤَبِرِى و لِهَڤْرَاگِرِى ڤَه كَافِى يَه.

١٧٢. نَه مَسِيحْ (عِيسَايِىَ كُورِىَ مَرْيَمِىَ) و نَه ژِى فِرِيشْتَيِيْنْ نِيْزِيكِى خُدِىَ، تُو جَارِى ژِ پَرَسْتِنَا بُوّ خُدِىَ دِلْسَارْ نَبُونَه. چِه كَسِىَ ژِ عِبَادَتِىَ خُدِىَ دِلْسَارْ بِبَه و خَوه مَزِنْ بِدِيْرَه (ژِىَ رَه عِبَادَتِىَ نَكَه)، پَاشِىَ خُدِىَ دِىَ وَانْ هَمُويَانْ بِبَالْ خَوه ڤَه كُوّمْ بِكَه.

١٧٣. هَرْچِى اَوِيْنْ كُو بَاوَرِى ئَانِينْ و كَارِيْنْ قَنْجْ كِرِنَه، ڤِيْجَه (خُدِىَ) دِىَ خَلاتَا وَانْ بِىَ كِيمَاسِى بِدَه وَانْ و ژِ كَرَمَا خَوه دِىَ ژِ وَانْ رَه زِيْدَه بِكَه. هَرْچِى اَوِيْنْ كُو بَرِىَ خَوه ژِ عِبَادَتِىَ وِى ڤَگَرْانْدِنْ و (بِعِبَادَتْ نَكِرِنِىَ) خَوه مَزِنْ دِيْرَانَه، (خُدِىَ) دِىَ عَذَابَكى دِژْوَارْ بِدَه وَانْ و اَوِىَ ژِ بِلِى خُدِىَ ژِ بُوّ خَوه تُو دُوّسْتْ و ئَارِيكَارَكِى ژِى نَبِينِنْ.

١٧٤. گَلِى مِرُوّڤَانْ! بِيْگُمَانْ ژِ جَمْ خُدَايِىَ وَه، ژِ وَه رَه دَلِيلَكَه اَشْكَرَا هَاتِيَه و مَه ژِ وَه رَه رُوّنَاهِيَكَه زَلالْ ئَانِيَه خَوارِىَ.

١٧٥. هَرْ چِى اَوِيْنْ كُو بَاوَرِى بِخُدِىَ ئَانِينْ و خَوه بِـ(دِينِىَ) وِى گِرْتِنَه، ڤِيْجَه (خُدِىَ) دِىَ وَانْ بِخَه نَاڤَا خَوشْدَايِنْ و مَرْحَمَتَكَه كُو ژِ جَمْ وِى يَه و اَوِىَ وَانْ بَرْ بِرِيَكَه رَاسْتْ و دُورِسْتْ ڤَه سَرْوَخْتْ بِكَه.

١٧٦. (يَا مُحَمَّدْ! ژِ تَه (دِ بَارَا بِيْوِيْرْتَانْ دَه) چَارَسَرِيِىَ دِپِرْسِنْ. بِبِيْژَه: خُدِىَ دِ بَارَا كَلالِىَ دَه (مِيرَاتَيَا كَسِىَ كُو بَاڤْ و زَارُوّكِيْنْ وِى تُونَه بِنْ) چَارَسَرِيِىَ بَيَانْ دِكَه؛ اَگَرْ يَكى بِيْزَارُوّكْ بِمِرَه و خُوشْكَكَه وِى هَبَه؛ نِيڤِىَ مِيرَاتِيِىَ ژِ وِىَ رَه يَه. اَگَرْ خُوشْكْ بِمِرَه و ژِ وِىَ تُو زَارُوّكْ تُونَه بِنْ، بِرَايِىَ وِىَ ژِى دِبَه مِيرَاتخَورِىَ وِىَ. اَگَرْ ژِ بِرَا دُو خُوشْكْ بِمِينِنْ، ژِ مِيرَاتِيِىَ ژِ سِسِيْيَانْ دِدُو يَا وَانَه. اَگَرْ مِيرَاتْخُوَرْ هَمْ مِيْرْ هَبِنْ هَمْ ژِى ژِنْ،

پَارَا مِیٚرْ بِقَاسی دُو پَارِیٚنْ ژِنِیٚ یَه. ژِ بُوٚ هُونْ شَاشْ نَبِنْ خُدِیٚ ژِ وَه رَه (حُکْمِیٚنْ دِینِیٚ وَه) اَشْکَرَا دِکَه. خُدِیٚ بِهَرْ تِشْتِی زَانَا یَه.

## ٥. سُورَه یِیٚ مَائِدَه

سُورَه یِیٚ مَائِیدِیٚ ژِ ئَایَتَا سِیٚیَمْ پِیٚ ڤَه تَڤْ لِمَدِینِیٚ دِ سَالا شَشَمْ ئَا هِجری دَه نَازِلْ بُویَه. اَوْ ١٢٠ (سَدْ و بِیستْ) ئَایَتَه. ئَایَتَا «ایرُوٚ، مِنْ دِینِیٚ وَه ژِ وَه رَه کَامِلْ کِرْ»لِمَدِینَیِیٚ، رُوٚژَا اِینِیٚ، اِیٚڤَارَا عَرَفِیٚ دِ حَجَا خَاتِرْخَوسْتِنِیٚ دَه نَازِلْ بُویَه.

مَائِدَه بِدَاخَوازَا «سِفْرَه»یَه. دِ هَیَامَا عِیسَا دَه حَوارِی/هَڤَالِیٚنْ وِی ژِیٚ خَوسْتِبُونْ کُو لِبَرْ خُدَایِیٚ خَوه بِگَرَه و ژِیٚ بِخَوهازَه کُو سِفْرَیَکِیٚ ژِ ئَاسِیمَانی ژِ وَانْ رَه دَاخَه خَوارِیٚ. ژِ بَرْ کُو سُورَتِی دِ ئَایَتَا ١١٢امْ و ١١٤امْ دَه بَحْسَا ڤِیٚ سِفْرَیِیٚ کِرِیَه اَڤْ نَاڤِیٚ «سِفْرَه»یِیٚ «المَائِدَه»لِیٚ هَاتِیَه دَانِینْ.

بِنَاڤِیٚ خُدَایِیٚ کُو رَحْمَنَ رَحِیم

١. گَلِی بَاوَرْمَنْدَانْ! سُوٚزْ و پَیْمَانِیٚنْ خَوه بِجِهْ بِینِنْ. ژِ بِلِی یِیٚنْ (لِسَرْ حَرَامِیَا وَانْ) ژِ وَه رَه بِیٚنْ خَوندِنْ و ژِ بِلِی یِیٚنْ کُو وَه دِ اِحْرَامَانْ دَه نیٚچِیرْ کِرِنَه، (خَوارِنَا گُوٚشْتِیٚ) تَرْشَانْ (دَڤَه، دَوَارْ و پَزَانْ) ژِ بُوٚ وَه هَاتِیَه حَلاٰلْکِرِنْ. بیٚگُمَانْ خُدِیٚ، تِشْتِیٚ بِڤِیٚ بِرْیَارِیٚ پِیٚ دِدَه.

٢. گَلِی بَاوَرْمَنْدَانْ! نَدِنْ سَرْ نِیشَانِیٚنْ دِینِیٚ خُدِیٚ و رُومَتَا مَهَا حَرَامْکِرِی یَا بِرُومَتْ، حَیْوَانِیٚنْ ژِ بُوٚ قُورْبَانِیٚ و تَرْشِیٚنْ سِتُورِسْتِکِرِی (کُو دِیَارِی نَه ژِ بُوٚ کَعْبِیٚ) و کَسِیٚنْ کُو ژِ بُوٚ دَاخَوازْکِرِنَا بَرْژَوَنْدِیکَه بَازِرْگَانی و رِزَایَا خُدَایِیٚ خَوه سَرْدَانَا مَالا پِیرُوٚزْ دِکِنْ، لِهَمْبَرْ وَانْ بیٚرِیٚزِییٚ مَکِنْ. ڤیٚجَه دَمَا هُونْ ژِ اِحْرَامَانْ دَرْکَتِنْ بِسَرْبَسْتِی نیٚچِیرِیٚ بِکِنْ. بِلا کِینَا وَه، یَا ژِ قَوْمَکِی بِسَدَمَا رِیٚکَا کَعْبِیٚ لِوَه گِرْتِبُونْ، وَه نَئَاژُوٚ سَرْ زِیٚدَگَاڤِییٚ! لِسَرْ قَنْجِی و تَقْوَایِیٚ ئَارِیکَارِیَا هَڤْ بِکِنْ و لِسَرْ گُنَهْکَارِی و زِیٚدَگَاڤِییٚ ئَارِیکَارِیَا هَڤْ مَکِنْ. هَای ژِ (اَمْرُ و نَهْیِیٚ) خُدِیٚ هَبِنْ، بیٚگُمَانْ جَزَاکِرِنَا خُدِیٚ پِرْ دِژْوارَه.

٣. (گَلی بَاوَرْمَنْدَانْ!) خَوارِنَا گُوشْتێ (حَیْوَانَا) مِرَارْبُویی و خُوینْ، گُوشْتێ بَرَازْ و حَیْوَانَا کُو نَه لِسَرْ نَاڤێ خُدێ هَاتِبَه سَرْژێکِرِنْ، گُوشْتێ حَیْوَانَا فَتِسَانْدِی و یَا بِلێخِسْتِنێ هَاتِبَه کُشْتِنْ، یَا کُو ژِ ژۆرْ دَه وَرِبُویی و یَا کُو بِپۆشْلێکَتِنێ مِربَه، یَا کُو جِنَاوِرَانْ اَوْ خَوارِبَه -لێ یَا کُو بِسَاغِی وَه اَوْ سَرْژێکِربَه اَوْ جُودَا یَه- و یَا کُو لِبَرْ پُوتَانْ هَاتِبَه سَرْژێکِرِنْ، یَا کُو هُونْ بِزِلَانْ فَالَانْ ڤَدِکِنْ و لِنَصِیبێ خَوه بِگَرِنْ، (اَڤْ تَڤْ) لِسَرْ وَه هَاتِنَه حَرَامْکِرِنْ. اَڤێنْ هَا فِسْقَه(دَرکَتِنَا ژِ رێکَا خُدێ یَه). اِیرُۆ اَوێنْ کُو کَافِرِنْ، وَانْ هێڤِیَا خَوه ژِ (تُونَکِرِنَا) دِینێ وَه ڤُوتْ کِرِیَه. اِیْدِی ژِ وَانْ نَطِرْسِنْ؛ ژِ مِنْ بِطِرْسِنْ. اِیرُۆ، مِنْ دِینێ وَه ژِ بُۆ وَه کَمِلَانْدْ (تَکُوزْ کِرْ). مِنْ ڤَنْجِیَا خَوه لِسَرْ وَه تَمَامْ کِرْ و مِنْ ژِ وَه رَه بِاُوْلِیتی اِسلامْ پَژِرَانْدْ. ڤێجَه کِی کُو ژِ نَچَارِی؛ نَه بِگُنَهْکَارِی تُوشی بِرْچِیبُونَکَه ئَاوَرْتَه بِبَه و ژِ ڤَانێنْ مَه گُوتِی بِخَوه، ڤێجَه بێگُمَانْ خُدێ گُنَهْژێبِرَه، دِلُوڤَانَه.

٤. (یَا مُحَمَّدْ!) ژِ تَه پِرْسْ دِکِنْ؛ کَا چِه ژِ وَانْ رَه هَاتِیَه حَلالْکِرِنْ؟ بِبێژَه: چِه تِشْتێ کُو خَوشْ و پَاكْ بَه و نێچِیرَا حَیْوانێنْ جِربَانْدِی اَوێنْ خَودِی نَابْ و خَودِی کُلَابْ، بِشَرْطێ کُو ژِ وێ زَانِینَا خُدێ دَایِی وَه هُونْ وَانْ پَرْوَرْدَه بِکِنْ، (اَڤێنْ هَا) ژِ بُۆ وَه هَاتِنَه حَلالْکِرِنْ، ڤێجَه ژِ نێچِیرَا کُو وَانْ ژِ وَه رَه گِرتِبَه بِخُونْ. دَمَا وَه حَیْوانَا نێچِیرڤَانْ شَانْدْ نێچِیرێ؛ نَاڤێ خُدێ لِسَرێ بِینِنْ و خَوه بِسِینُۆرێ خُدێ بِپَارێزِنْ. بێگُمَانْ حَسَابْدِیتِنَا خُدێ پِرْ بِلَزَه.

٥. (گَلی بَاوَرْمَنْدَانْ!) اِیرُۆ، ژِ بُۆ وَه تِشْتێنْ خَوشْ و پَاكْ هَاتِنَه حَلَالْکِرِنْ. خَوارِنێنْ (دَستْکُوژِیێنْ) اَهْلِی کِتێبْانْ ژِ وَه رَه حَلالِنْ و خَوارِنێنْ وَه ژِی ژِ بُۆ وَانْ حَلالِنْ. زَوَاجَا بِپیرَکێنْ بَاوَرْمَنْدْ اِینْ بِنَامُوسْ و پیرَکێنْ بِنَامُوسْ اِینْ کُو بَریَا وَه، مَه کِتێبْ دَایَه وَانْ، ژِ وَه رَه حَلالِنْ؛ بِشَرْطێ کُو هُونْ مَهْرَا وَانْ بِدِنْ وَانْ، بِنَامُوسْ بِنْ، ژِ زِنَایێ دُورْ بِنْ و ژِ خَوه رَه بِدِزِی دُۆسْتکَانْ نَگِرِنْ. چِه کَسێ کُو اِیمَانێ (اَحْکَامێنْ اِسلامێ) اِنْکَارْ بِکَه، بێگُمَانْ کِرِنێنْ وِی پُوچْ دِبِنْ؛ اَوْ لِئَاخْرَتێ دِبَه ژِ یێنْ کُو خَسرِی نَه.

٦. گَلی یێنْ کُو بَاوَری ئَانینَه! دَمَا وَه خُوَسْتْ نمێژْ بِکِنْ، رُویێ خوه و دَسْتێنْ خوه دگَلْ هَرْدُو اَنیشْکَانْ بشُوْنْ، سَرێ خَوه مَسِحْ بکِنْ (ڤَمالِنْ)، هَرْدُو لِنگێنْ خَوه دِگَلْ گُوزَکَانْ بشُوْنْ. اَگَرْ هُونْ بجَنَابَتْ بِنْ ڤێجَه خَوه ژِ جَنَابَتِیێ پَاقژْ بکِنْ. اَگَرْ هُونْ نَخوشْ بِنْ، یَانْ رێوی بِنْ یَانْ یَكْ ژ وَه ژِ ئَاڤرێژێ وَرَه، یَانْ ژی هُونْ هِنگُوفْتْبِنْ ژِنَانْ و وَه دِ ڤَانْ حَالانْ دَه ئَاڤْ نَدیتبَه، وێ چَاخِیێ بئَاخَکه پَاقژْ تَیَمُّمێ بگِرِنْ؛ رُوییێ خَوه و دَسْتێنْ خَوه بئَاخِیێ مَسِحْ بِکِنْ. خُدێ نَاخوازَه ژ وَه رَه زَحْمَتِیێ دَرْخَه؛ لِێبَلِێ دخَوازَه وَه پَاقژْ بکَه و لِسَرْ وَه قَنْجِیَا خَوه تَمَامْ بکَه دَا کُو هُونْ وی بِشێکِرینِنْ.[1]

٧. (گَلی بَاوَرْمَنْدَانْ!) قَنْجِیَا خُدێ یَا لِسَرْ وَه و پَیمَانَا کُو ژ وَه وَرْگِرتِیَه بِبیرْ بینِنْ؛ دَمَا وَه گُوْتْ: «مَه (فَرْمَانَا تَه) بِهِیسْتْ و اَمْ ژِ پێکْئَانینا وێ رَه ئَامَادَه نَه». هَایْ ژِ (سِینُوْرِێ) خُدێ هَبِنْ. بێگُمَانْ خُدێ بِیَا دِ دِلانْ دَه دِزَانَه.

٨. گَلی یێنْ بَاوَری ئَانینَه! ژِ بُوْ خُدێ بحَقِیێ رَابِنْ و بِرَاسْتی شَهْدَهِیێ بِدِنْ. بِلا کِینَا وَه یَا لِهَمْبَری جِڤَاتَکِێ وَه نَه ئَاژُوْ بِێعَدَالَتِیێ. بعَدَالَتی تَڤْ بِگَرِنْ. اَڤْ تَڤگَرْ بێهتِرْ نێزیکی تَقْوَایێ یَه. ژِ خُدێ بِطِرْسِنْ. بێگُمَانْ خُدێ بِیَا کُو هُونْ دِکِنْ ئَاگَاهْدَارَه.

٩. خُدێ سُوْزْ دَایَه وَانێنْ کُو بَاوَری ئَانینْ و کَارێنْ قَنْجْ کِرِنَه کُو ژِ بُوْ وَانْ لِێبُوْرینْ و خَلاتَکه مَزِنْ هَیَه.

١٠. لِێبَلِێ اَوێنْ کُو کَافِرْ بُونَه و بِئَایَتێنْ مَه بَاوَری نَئَانینَه، هَا اَوْ خَلْکِێ دُوْژَهِێ نَه.

---

١ نمێژ، بقَسْدَا عِبَادَتِێ اَوَه کُو مرُوْڤْ بچَه بَرْ حِزُورَا خُدێ و بئَاوایَکی مُعَیَّنْ طَاعَتِێ وی بکَه. نمێژْ اَوَه کُو خُدِێ عَقْدِێ خوه قَبُولی حِزُورَا خوه دکَه. هَا ژِ بُوْ ڤِێ قَبُولِێ و اَشْکَرَکِرنَا عَقْدِیتِیێ هِنْ ئَامَادَهی لازمَه هَبَه. دِڤِێ عقْدِێ کُو لِحَزُورَا خُدێ رَاوَسْتَه لِهشِێ خوه بَه، زَاهِرْ و بَاتِنِێ وی پَاقژْ بَه. ڤێجَه دَسْمێژْ و سَرْشُوشْتِنْ ژِ پَاقژِیَا زَاهِری و بَاتِنی رَه نَاڤْگینْ و ئَامَادَهیکَه. هَکَه اَڤْ نَبَه یَانْ ژی مَعْزَرَتَكْ هَبَه، هِنْگی دِێ بئَاخِێ تَیَمُّمْ بگِرَه. چَنْدی تَیَمُّمْ پَاقژِیَا مَادِّی پێكْ نَیینَه ژی لِێ ژِ بُوْ حَازِرِیَا عِبَادَتِێ پێحسَا پَاقژِیێ ددَه. دِ ئَایَتِێ دَه: «یَانْ ژی وَه هِنگُوفْتبِنْ ژِنَانْ»دَرْبَاسْبُو کُو مَبَسْتْ ژِ وێ بقَسْتِی دَسْتْدَانَا ژِنَانَه. لِگُوْری هِنْ مُوفَسِّرَانْ مُونَاسَبَتَا جِنْسی یَه. مرُوْڤِێ کُو چُوبَه نِڤینَا ژِنَا خوه و اَڤْ بِدَسْتْ وی نَکَڤَه اَوْ کَارَه دِ شُونَا سَرْشُوشْتِنِێ دَه تَیَمُّمْ بگِرَه و نمێژَا خوه بکَه.

١١. گَلِى يێنْ كُو بَاوَرِى ئَانِينَه! قَنْجِيَا خُدِىَ يَا لِسَرْ خَوه بِبِيرْ بِينِنْ، دَمَا جِڤَاتَكِىَ قَسْدْ كِرْ كُو دَسْتێنْ خَوه (بِنَقَنْجِى) دِرِێژِى وَه بِكَه، خُدِىَ نَهِشْتْ دَسْتێنْ وَانْ بِگَهِيژه وَه. ژِ خُدِىَ بِطِرْسِنْ و بِلا يێنْ بَاوَرْمَنْدْ تَنِىَ خَوه بِسْپێرِنْ خُدِىَ.[١]

١٢. صُوِنْدْ بَه، خُدِىَ ژِ زَارُوێێنْ اِسْرَائِيلِيَانْ پَيْمَانَكه مِكُومْ وَرْگِرتْ و دُوِزْدَهْ نُونَرْ (تَمْسِيلكَارْ) ژِ وَانْ نَاڤْدَارْ كِرِنْ (دَا لِسَرْ نَاڤِىَ وَانْ پَيْمَانْ بِسْتِينِنْ). خُدِىَ ژِ وَانْ رَه گُوتْ: اَزْ بِوَه رَه مَه. اَگَرْ بِرَاسْتِى هُونْ نِمێژْ بِكِنْ، زَكَاتِىَ بِدِنْ، بَاوَرِيِىَ بِپێغَمْبَرێنْ مِنْ بِينِنْ، ئَارِيكَارِيَا وَانْ بِكِنْ و (بِبَخْشَانْدِنَا لِسَرْ فَقِيرَانْ) بِئَاوَايَكِى سِپَهِى دَينْ بِدِنْ خُدِىَ، صُوِنْدْ بَه؛ اَزِىَ گُونَهێنْ وَه عَفُو بِكِمْ و اَزِىَ وَه بِخِمْ بِهِشْتێنْ كُو دِ بنْ وَانْ رَه چَمْ دِهَرِكِنْ. اِيْدِى پِشْتِى ڤِىَ (پَيْمَانِىَ) كِى ژِ وَه كَافِرْ بِبَه، ڤێجه بێگُمَانْ اَوْ ژِ رێكَا رَاسْتْ شَاشْ بُويَه.

١٣. بِسَدَمَا پَيْمَانْشِكَانْدِنَا وَانْ مَه اَوْ ژِ رَحْمَا خَوه دُورْ كِرِنْ، مَه دِلِىَ وَانْ هِشْكْ و هُوِلَا كِرْ. اَوْ، پَيْڤَانْ ژِ جِهِىَ وَانْ دِگُهَرِينِنْ و وَانْ پَارَكَه (گِرِينْگْ) ژِ يَا كُو پِىَ هَاتِبُونْ فَرْمَانْكِرِنْ ژِ بِيرْ كِرِنْ. (يَا مُحَمَّدْ!) ژِ بِلِى كێمْ كَسَانْ پِىَ ڤَه، تُو دِىَ تِمْ ژِ وَانْ خِيَانَتِىَ بِبِينِى. دِيسَا ژِى، لِوَانْ بِبُوِرَه و گُوهِىَ خَوه نَدَه وَانْ. بێگُمَانْ خُدِىَ ژِ قَنْجِيكَارێنْ رَاسْتْ و دُورِسْتْ حَزْ دِكَه.[٢]

---

١ لِگُورِى رِيوايَتَكِىَ هَاتِيَه رَاگَهَانْدِنْ كُو مُشْرِكْ و مُنَافِقَانْ نَاڤْ لِزِلاَمَكِى چَكْدَارْ دَانْ كُو پێغَمْبَرْ بِكُوژَه. هَرْ چِڤَاسْ وِى قَسْدَا كُشْتِنَا پێغَمْبَرْ كِرْ ژِى لِىَ بِعِنَايَتْ و نِيگَاهَا خُدِىَ اَوْ نَگَهِشْتْ اَرْمَانْجَا خَوه. لِگُورِى رِيوايَتَكَه دِنْ ژِى، بَنِى نَدِرْ حَولْ دَانَه كُو كَڤرِىَ دَسْتَارْ بَاڤێژِنْ سَرْ سَرِىَ پێغَمْبَرِىَ خُدِىَ و بِخَايِنْتِى وِى و هَڤَالێنْ وِى بِكُوژِنْ. دِ ڤِرْ دَه دِگَلْ كُو قَسْدَا كُشْتِنَا پێغَمْبَرْ بِتَنِىَ كِرِنَه ژِى، لِبَلِىَ ژِ بَرْ كُوَاوْ وَكه جَانْ و ژِيَانَا هَمُو بَاوَرمَنْدَانَه، خُدِىَ گُوتِيَه: «دَمَا جِڤَاتَكِىَ قَسدْ كِرْ كُو دَسْتێنْ خَوه دِرِێژِى وَه بِكَ»كُو بِگِلْژِمَارِى اِيفَادَه كِرِيَه.

٢ تَوْرَاتْ، نُسْخَيَكه وِىَ بِتَنِىَ هَبُو. تُو كَسى اَوْ تَڤْ ژِ بَرْ ژِى نَكِربُو. دَمَا اِسْرَائِيلِى دِيلْ كَتِنْ دَسْتِىَ بَابِيلِيَانْ، اَوْ نُسْخَيَا تَورَاتِىَ وِندَا بُو. دَمَا اِسْرَائِيلِى، پِشْتِى كُو سَالْ و زَمَانْ تِىَ دَه بُوهُورِينْ -ژِ يَخْسِيرِيِىَ خِلاسْ بُونْ، هِنْ بَشێنْ تَوْرَاتِىَ يێنْ كُو لِبِيرَا وَانْ مَابُونْ ژِ نُو ڤَه نِڤِيسِينْ. دِ تَوْرَاتِىَ دَه يَاكُو اِيرُوِ مَوجُودَه،

١٤. مَه ژِ وَانێنْ کُو دِگۆتِنْ: «بِرَاسْتِی اَمْ ئَارِیکَارێ عِیسَا نَه «ژِی پَیْمَانْ وَرْگِرْتْ. لێبَلێ وَانْ ژِی پَارَکَه (گِرِینْگْ) ژِ شِیرَتێنْ کُو لِوَانْ هَاتِبُونْ کِرِنْ ژِ بِیرْ کِرِنْ. ژِ بَرْ ڤِێ یَکێ، حَتَا رُۆژَا قِیَامَتێ، مَه نَیَارْتِی و کِینْ خِسْتْ نَاڤْبَرَا وَانْ. پَاشێ خُدێ دێ وَانْ بِتِشْتێنْ کُو دِکِرِنْ ئَاگَاهْدَارْ بِکَه.[1]

١٥. گَلِی یێنْ اَهْلِی کِتِیبْ! پێخَمْبَرێ مَه هَاتِیَه نِکْ وَه دَا کُو ژِ وَه رَه گَلَکْ (حُکْمِ)یێنْ کُو وَه ژِ کِتِیبێ قَدِشَارتِنْ، اَشْکَرَا بِکَه و ژِ گَلَکَانْ ژِی دِبُورَه. بێگُمَانْ ژِ بُۆ وَه، ژِ جَمْ خُدێ رُۆنَاهِیَکْ و کِتِیبَکَه رُۆنْکَرْ هَاتِیَه.

١٦. خُدێ، کَسێ کُو لِرزَایَا وِی بِگَرَه بِوێ کِتِیبێ دِبَه رِیَا خَلاسِیێ، بِڤِینَا خَوه وَانْ ژِ تَارِیتِیَانْ دَرْدِخَه رُۆنَاهِیێ و رِیَا رَاسْتْ و دُورِسْتْ نِیشَانِی وَانْ دِدَه.

١٧. صُۆنْدْ بَه، اَوێنْ گۆتِنْ: «بِرَاسْتِی خُدێ مَسِیحێ کُرێ مَرْیَمێ یَه»اَوْ کَافِرْ بُونَه. (یَا مُحَمَّدْ! ژِ وَانْ رَه) بِبێژَه: اَگَرْ خُدێ بِخَوازَه، مَسِیحێ کُورێ مَرْیَمێ، دَایِکَا وِی و

---

اَوْ بَشێنْ کِیمِنْ و هِنْ ژِ پێخَمبَرِیَا مُوسَا نِڤِیسَایِی یَه. دِ ئَایَتێ دَه هَڤۆکَا: «اَوْ بێژَیَانْ ژِ جِهێ وَانْ دِگُوهَرِینِن»دَربَاسْ بُو. عَالِمَانْ اَوْ بِڤِی ئَاوَایِی رَاڤَه کِرِنَه: تَاْوِیلێنْ وِسَا لِێ ئَانِیبُونْ کُوتُو پێوَنْدِیَا وَانْ بِئَارْمَانْجَا نِزُولَا وێرَه تُونَه بُو. مَعْنیٰ کُو نَه مِرَادْ بُو ژِێ دَرْتَانِینْ وِیَاکُو خُدێ نَگۆتِبُو لِسَرْ نَاڤێ وِی بِڤِرْ و دَرَوْ دِگۆتِنْ.

١ فَلَّهێنْ پێشِینْ ژِی ژِ بَرْ اِشْکَنْجَه و تَاقِیبَا جِهُویَانْ ئَا بێ اِیمَانْ، ژِ هَڤْ بَلَاوَلَا ژِیَانَه. وَانْ ژِی اَوْ اِنْجِیلَا کُو خُدێ بِرێیَا وَحْیێ ژِ عِیسَا رَه شَانْدِیَه مُحَافَظَه نَکِرِنَه و وِنْدَا کِرِنَه. لێبَلێ دِ سَرێ سَدْسَالَا سِسیێ یَا مِیلَادِی دَه، دَمَا اِمْپَرَتُۆرێ رُۆمَایێ کُۆسْتَانْتِینْ فَلَّهتِی خِسْتِیَه دِلێ خَوه، ژِ نُو پِچَکِی فَلَّه رَحَتْ ژِیَانَه، دَسْتْ بِنِڤِیسِینَا پِرتُوکَا خُویَا پِیرُۆزْ کِرِنَه، دِ اَنْجَامَا ڤِێ پێنْگَاڤَا وَانْدَه بِسَدَانْ اِنْجِیلْ دَرْکَتِنَه رَاسْتێ. یَکْ نَه مِینَا یَکێ بُو و هَڤْ نَگِرتِنَه. ڤێجَه فَلَهێنْ کُوژْ رِێیَا عِیسَا دَرْکَتِنْ لِسَرْ پَیْمَانَا کُو دَانَه خُدێ نَمَانَه. بِڤِی ئَاوَایِی اِخْتِیلَافْ کَتِیَه نَاڤْ وَانْ و بِسَدْسَالَانْ کَتِنَه هَمْبَرێ هَڤْ و پَڤْ چُونَه. هَرْ گُرُوبَکْ ژِوَانْ تَکْفِیرَا گْرُوبَا دِنْ دِکَه و نَاهِێلَه کُو لِدێرَا وێ عِبَادَتێ خَوه بِکَه. بِرَاسْتِی اَمْ دِبِینِنْ کُو دَولَتێنْ رُۆژَاڤَایِی دِگَلْ کُو بِرَادِینێنْ هَڤِنْ ژِی، ژِ بُۆ قَلَانْدِنَا هَڤْ تَکْنُولُۆژِیَا چَکَانْ بِپێشْ ڤَه دِبِنْ؛ هِنکَانْ ژِوَانْ بُۆمْبَیَا نَاڤۆکِی (ئَاتُۆمِی) اِیجَادْ کِرِنَه، هِنَکَانْ ژِ وَانْ ژِی بُۆمْبَیَا هِیدْرُۆژَنِی اِیجَادْ کِرِنَه کُو ئَاقِلْ نِکَارَه تَخْرِیبَاتْ و رُوخِێنکَارِیَا ڤَانْ بُۆمْبَیَانْ تَسْوِیرْ بِکَه.

يێنْ كُو لِسَرْ رُويێ عَرْدِێ هَنَه ژِى تَڤَانْ هَلاكْ بِكَه. مَا اِيْدى كِى دِكَارَه لِهَمْبَرى وِى تَڤگَرَكِێ بِكَه؟ رێڤَبَرِيَا عَرْدْ و ئَاسِيمَانَانْ و يَا دِ نَاڤْبَرَا وَانْ دَه هَرْ ژِ خُدِێ رَه يَه. اَوْ چِه بِڤِێ دِئَافِرينَه و خُدِێ هَلْبَتْ لِسَرْ هَرْ تِشْتِى قَادِرَه.

١٨. جِهُو و فِلَهَانْ دِگۆتِنْ: اَمْ كُورێنْ خُدِێ و هَزكِرِيێنْ وِى نَه. (ژِ وَانْ رَه) بِبێژَه: نَاخَوه چِما بِسَبَبَا گُونَهێنْ وَه عَذَابْ دِدَه وَه؟ نَخێرْ، بَلْكى هُونْ ژِى بَشَرِنْ ژِ (وَانْ بَشَرِ) يێنْ كُو خُدِێ ئَافِرَانْدِنَه. كَسِێ كُو بِڤِێ وِى عَفُو دِكَه و كَسِێ بِڤِێ وِى دِدَه عَذَابِێ. خَودِيتِيَا عَرْدْ و ئَاسِيمَانَانْ و يَا دِ نَاڤْبَرَا وَانْ دَه هَيَه هَرْ ژِ خُدِێ رَه يَه. ڤَگَرَا دَاوِيێ ژِى هَرْ بِبَالْ وِى ڤَه يَه.

١٩. گَلِى يێنْ خَويْكِتێب! بێگُمَانْ پێخَمْبَرِێ مَه -دِنَاڤْبَرَكَه كُو (شَانْدِنَا) پێخَمْبَرَانْ ژِ هَڤْ ڤُوتْ بُوبُو- ژِ بُۆ وَه هَاتْ كُو رَاسْتِيَانْ ژِ بُۆ وَه اَشْكَرَا بِكَه، دَا كُو (لِقِيَامَتِێ) هُونْ نَبێژِنْ ژِ بُۆ مَه تُو مزگينبَرْ و تُو هِشْيَارْكَرْ نَهَاتِبُونْ. ڤێجَه بێگُمَانْ ژِ بُۆ وَه مِزْگينبَرَكْ و هِشْيَارْكَرَكْ هَاتْ. خُدِێ هَلْبَتْ لِسَرْ هَرْ تِشْتِى كَارَا يَه.

٢٠. وِێ دَمِێ مُوسَا ژِ گَلِێ خَوه رَه گۆتْ: گَلِى مِلَتِێ مِنْ! ڤَنْجِيَا خُدِێ لِوَه كِرى بِينِنْ بِيرَا خَوه؛ چَاخَا پێخَمْبَرْ ژِ (نَاڤ) وَه رَاكِرِنْ و هُونْ كِرِنْ حُكِمْدَارْ و يَا كُو ژِ عَالَمِێ نَدَابُو تُو كَسِى دَابُو وَه.

٢١. اَىْ گَلِێ مِنْ! هَرِنْ، تێكَڤِنْ ئَاخَا پيرُۆزْ (بَاژَارِێ ڤُودْسِێ)، اَوَا كُو خُدِێ (كِتِنَا وِێ) لِوَه فَرْمَانْ كِرِيَه و (ژِ طِرْسَا دِژْمِنْ) لِپَاشْ خَوه نَزِڤِرِنْ، نَاخَوه هُونِێ بِزِيَانْ (دَسْتَڤَالا) ڤَگَرْنْ.

٢٢. گۆتِنْ: اَىْ مُوسَا! بێگُمَانْ لِورْ ڤَومَكى زُۆرْدَارْ هَيَه، حَتَا كُو اَوْ ژِ وِێ دَرِێ دَرنَكَڤِنْ، اَمِێ نَچِنْ وِرْ. لِيْبَلِێ اَگَرْ اَوْ ژِ وِرْ دَركَڤِنْ تَڤَزْ اَمِێ تێكَڤِنْ وِرْ.

٢٣. دُو مێرێنْ ژِ خُدێطِرسْ اِيْنْ كُو خُدِێ ڤَنْجِى لِوَانْ كِرِيَه، گۆتِنْ: دِ دَرگَهْ رَه تێكَڤِنْ

سَرْ وَانْ (سِتَمْکَارَانْ)، دَمَا هُونْ دِ دَرْگَهْ رَه کَتِنِیَ، اِیْدِی هُونْ بِسَرْ کَتِنَه. نَاخَوه اَگَرْ بِرَاسْتِی هُونْ بَاوَرْمَنْدِنْ خَوه بِسْپێرِنْ خُدِیَ.[١]

**٢٤.** گۆتِنْ: اَیْ مُوسَا! حَتَا کُو اَوْ (سِتَمْکَارْ) لِوِی بَاژَارِی بِنْ، اَمِیَ قَتْ نَچِنِیَ. نَاخَوه دَه تُو و خُدَایِیَ خَوه هَرِنْ بِوَانْ رَه شَرْ بِکِنْ، بێگُمَانْ اَمِیَ لِڤِیَ دَرِیَ رُونِشْتِی بِنْ.

**٢٥.** مُوسَا گۆتْ: خُدَایِیَ مِنْ! اَزْ ژِ خَوه و بِرَایِیَ خَوه پِیَ ڤَه بِتُو کَسِی (دِنْ) نِکَارِمْ، اِیْدِی تُو مَه و جِڤَاتَا کُو ژِ رِیَ دَرْکَتِیَه، ژِ هَڤْ جُودَا بِکَه.

**٢٦.** خُدِیَ (ژِ مُوسَا رَه) گۆتْ: اِیْدِی بِرَاسْتِی اَوْ بَاژَارْ حَتَا چِلْ سَالِی لِوَانْ هَاتَه حَرَامْکِرِنْ. دِ جِهِیَ خَوه دَه اَوِیَ لِهَڤْ بِحَرْبِلِنْ. نَاخَوه تُو، ژِ بُو جِڤَاتَا ژِرِێدَرْکَتِی غَمْگِینْ مَبَه.

**٢٧.** (یَا مُحَمَّدْ!) ژِ وَانْ رَه خَبَرَا رَاسْتِینْ یَا هَرْدُو کُورِێنْ ئَادَمْ بِخُونَه؛ دَمَا هَرْدُیَانْ قُورْبَانِێنْ خَوه (ژِ خُدِیَ رَه) پِێشْکێشْ کِرِنْ، اِیجَارْ ژِ یَکِی ژِ وَانْ قُورْبَانْ هَاتَه قَبُولْکِرِنْ و ژِ یِیَ دِنْ ژِی نَهَاتَه قَبُولْکِرِنْ. (بِرَایِیَ کُو قُورْبَانَا وِی نَهَاتِبُو قَبُولْکِرِنْ ژِ چَاڤْنَبَارِی) گۆتْ: صُۆندْ بَه، اَزِیَ تَه بِکُوژِمْ. یِیَ دِنْ گۆتْ: بێگُمَانْ خُدِیَ، تَنِیَ ژِ تَقْوَادَارَانْ قَبُولْ دِکَه.

**٢٨.** صُۆندْ بَه؛ اَگَرْ تُو دَسْتِیَ خَوه دِرێژِی مِنْ بِکِی دَا کُو تُو مِنْ بِکُوژِی، اَزْ بِخَوه ژِ بُو کُشْتِنَا تَه قَتْ دَسْتێنْ خَوه دِرێژِی تَه نَاکِمْ. بێگُمَانْ اَزْ ژِ خُدَایِیَ عَالَمِیَ دِطِرْسِمْ.

١ اَڤْ ئَایَتْ گِشْ ژِ بَرْ کُو پِێوَنْدِیَا وَانْ بِزَارُۆیێنْ اِسْرَائِیلْ یێنْ چَاخِیَ مُوسَا رَه هَیَه «قَنْجِیێنْ کُو خُدِیَ ژِ جِیهَانِیَانْ نَدَانَه تُو کَسِی دَانَه وَانْ و ئَاخَا کُوژوَانْرَه هَاتِیَه مِسُۆگَرْکِرِنْ ژِی خَاسِیَ وِیَ چَاخِیَ یَه. تَمَامِیَ ئَایَتْ و حَدِیسَانْ دِدِنْ نِیشَانْ کُو مُحَمَّدْ (س) ژِ مِرُۆڤێنْ کُو بُۆرِینَه و یێنْ کُو هِیَ وَرِنْ رَه قَنْجِیکَه خُدِیَ یَه. مِسُۆگَرْکِرِنَا پَارْچَیَکِی عَرْدِیَ ژِ مِلَّتَکِی رَه بِوَلَاتِی بِشَرْتُ و مَرْجَه. دِڤِیَ اَوْ مِلَّتْ قَنْجِیکَارْ بَه و بِرَاسْتِی و دُورُوسْتِی دِ رِیَا خُدِیَ دَه هَرَه. وَانْ بِئَایَتَا ١٣انْ و یێنْ مِینَا وِیَ اَوْ وَسْفِیَ خَوه وِندَا کِرِنَه. ئَایَتَا سُورَتِیَ اَلْاَنْبِیَا یَا(٥انْ اَشکَرَه دِکَه کَا اَردَا پِیرُۆزْ دِیَ ژِ کِیَ رَه بِمِینَه: «صُۆندْ بَه، پِشْتِی تَوْرَاتِیَ مَه دِ زَبُورِیَ دَه ژِی نِڤِیسِیَه کُو هَمِنْ عِقدێنْ مِنْ اِیْنْ قَنْجِیکَارْ دِیَ بِبِنْ مِیرَاتْگِرێنْ عِرْدِیَ.»خَالَا کُو دِڤِیَ لِبَرْ چَاڤَانْ وَرَه گِرتِنْ ژِی اَڤَه.

٢٩. (بِبَرْدَوامِی گۆتْ:) بێگُمَانْ اَزْ دِخوازِمْ، تُو بِگُونَهِێ (كُشْتِنَا) مِنْ و بِگُونَهِێ خَوه (یِێ بَرِێ) ڤَگَرِی دَا كُو تُو بِبِی ژِ خَلْكِێ اِێگَرْ و اَڤَه جَزَایِێ ظَالِمَانْ.

٣٠. ڤێجَه نَفْسَا وِی كُشْتِنَا بِرَایِێ وِی پِێ خَوشْ كِرْ و بِرَایِێ خَوه كُوشْتْ، اِێدِی اَوْ بُو ژِ یێنْ كُو خِسَارْ كِرِنْ.

٣١. خُدِێ قِژِكَكْ شَانْدْ كُو وِێ بِنِكِلْ و لِنگێنْ خَوه ئَاخْ دِكُولا (و دِئَاڤێتْ سَرْ قِژِكَكَه مِرِی) دَا كُو نِیشَانِی وِی بِدَه كُو اَوْ دِێ تَرْمِێ (جَسَدِێ) بِرَایِێ خَوه چَاوَا ڤَشێرَه. (بِرَایِێ كُوژَرْ) گۆتْ: وَاخْ لِمِنْ بَه؛ مِنْ نَكَارِی اَزْ بِبِمْ وَكِی ڤِێ قِژِكَا هَانِێ كُو اَزْ جَنْدَكِێ بِرَایِێ خَوه ڤَشێرِمْ، اِێدِی اَوْ بُو ژِ پۆشْمَانبُویَانْ!

٣٢. هَا ژِ بَرْ ڤِێ رُودَانِێ یَه كُو مَه لِسَرْ زَارُۆیێنْ اِسْرَائِیلْ حُكِمْ دَانی؛ بێگُمَانْ كِی مِرُۆڤَكی بكُوژه بێیی كُو وِی یَكْ كُوژتِبَه یَانْ دِ عَرْدِێ دَه فَسَادِیَكْ كِرِبَه، هَرْ وَكی كُو وِی تَڤَكِێ مِرُۆڤَانْ كُشْتِبَه. چه كَسِێ ژِی كُو بِبَه سَبَبِێ خَلاسِیَا مِرُۆڤَكی، بێگُمَانْ هَرْ وَكی وِی مِرُۆڤْ تَڤْ خَلاَسْ كِرِبِنْ. بێگُمَانْ پێخَمْبَرێنْ مَه دَلِیلێنْ رُۆنْكَرْ ژِ بُۆ وَانْ ئَانِینَه، لِێبَلِێ پِشْتِی ڤِێ ژِی دِیسَا پِرِێ وَانْ لِسَرْ عَرْدِێ خُونرێژِنْ.

٣٣. بێگُمَانْ اَوێنْ كُو لِهَمْبَرْ خُدِێ و پێخَمْبَرِێ وِی شَرْ دِكِنْ و فَسَادِیِێ لِسَرْ عَرْدِێ دَرْدِخِنْ، بَسْ جَزَایِێ وَانْ اَوَه كُو بێنْ كُشْتِنْ ئَانْ لِچَارْمِخِێ بێنَه خِسْتِنْ انْ دَسْتْ و لِنْگێنْ وَانْ چِپَرَاسْتْ بێنَه ژێكِرِنْ یَانْ ژِ دَڤَرَا كُو لِێ نِشْتَجِهِنْ بێنَه سِرْگُونْكِرِنْ. هَا اَڤْ لِڤِێ دِنْیَایِێ ژِ بُۆ وَانْ رِسْوَایِی یَه و لِئَاخْرَتِێ ژِی ژِ بُۆ وَانْ عَذَابَكی مَزِنْ هَیَه.

٣٤. لِێبَلِێ اَوێنْ كُو بَرِی هُونْ وَانْ بِگِرِنْ تُۆبَه كِرِبِنْ (اَوْ جُودَا نَه)، ڤێجَه بِزَانِنْ بِرَاسْتِی ژِی خُدِێ گُنَهْژێبِرَه، دِلُۆڤَانَه.[١]

---

١ دِینِێ اِسْلاَمِێ «كُشْتِن»، لِهَمبَرِی مِرُۆڤَاتِیِێ سُوجْ ژِمَارْتِیَه و دَایَه زَانِینْ كُو كَسِێ بنَحَقِی مِرُۆڤَكی بكُوژه، هَوْڤَاسی سُوجِێ وِی مَزِنَه هَرْوَكی كُو وِی مِرُۆڤَاتی تَڤْ كُشْتِبَه! هَرْ وِهَا سُوجِێ كُو لِهَمْبَرِی كَسێنْ بێگُنَهْ و مَعْصُومْ وَرَه كِرِنْ،ئَارَامِی و اَسَایِشَا مِرُۆڤَانْ خِرَابْ بِكَه ژِی، سُوجَكی مَزِنْ دِبِینَه و لِهَمْبَرِی خُدِێ تَعَالَی

**٣٥.** هَی گَلی يێنْ کُو بَاوَرِی ئَانينَه! هَای ژِ فَرْمَانێنْ خُدێ هَبِنْ، لِوَسِيلَيَا (نَاڤگينَا) کُو وَه نێزی وِی بِکَه بِگَرِنْ و دِ رێکَا وِی دَه جِهَادێ بِکِنْ دَا کُو هُونْ (لِدنْيَا و ئَاخْرَتێ) سَرْفِرَازْ ببِنْ.

**٣٦.** بێگُمَانْ اَوێنْ کَافِرْ بُونَه، اَگَرْ چِقَاسْ تِشْتێنْ لِسَرْ عَرْدێ هَنَه و بِقَاسی وَانْ ژی يێنْ وَانْ بِنْ، ژِ بُوّ کُو بِکِنْ گِرَوا خَوه دِ بَرْ عَذَابێ رُوّژَا قِيَامَتێ دَه (دَا کُو ژێ رِزگَارْ ببِنْ)، دێ اَڤْ ژِ وَانْ نَيێ قَبُولْکِرِنْ؛ ژِ بُوّ وَانْ هَرْ عَزَابَکی بِژَانْ هَيَه.

**٣٧.** (اَوْ کَافِرْ) دِخَوازِنْ کُو ژِ ئَاگِرْ دَرْکَڤِنْ، لِێبَلِێ اَوْ دێ نِکَارِبِنْ ژێ دَرێنْ و ژِ وَانْ رَه عَزَابَکی سَرَاقَتِی و هَرْ لِکَارْ هَيَه.

**٣٨.** اَوْ مێرْ و ژِنێنْ دِزيکَرْ، ڤێجَه بِسَبَبْ کُو دِزِی کِرِنَه دَسْتێنْ وَانْ ژێ بِکِنْ. اَڤْ جَزَاکِرِنْ ژِ جَمْ خُدێ ڤَه بُوّ ڤَکِشَانْدِنێ يَه (دَا تُو کَسْ دِزِيێ نَکَه). خُدێ عَزِيزَه، حَکِيمَه.

**٣٩.** ڤێجَه کی پِشْتی (ڤێ) نَحقِيَا لِخُو کِرِی، پُوّشْمَانْ بِبَه و حَالْ و تَڤگَرێنْ خَوه رَاسْتْ بِکَه، بێگُمَانْ خُدێ دێ تُوّبَيَا وِی قَبُولْ بِکَه. بێگُمَانْ خُدێ گُنَهْژێبِرَه، دِلُوّڤَانَه.

**٤٠.** مَا تُو نِزَانِی (اَی پێخَمْبَرْ) کُو بێگُمَانْ سَلْطَنَتَا عَرْدْ و ئَاسِيمَانَانْ ژِ خُدێ رَه يَه؛ اَوْ کِێ بِڤِێ دِدَه عَذَابێ و کِێ ژی بِڤِێ لِێ دِبُوّرَه. خُدێ لِسَرْ هَرْ تِشْتِی قَادِرَه.

**٤١.** اَیْ قَاسِدْ! اَوێنْ کُو دِ کَافِرِيێ دَه بِهَڤْ رَه پێشبِرْکێ دِکِنْ، ژِ وَانێنْ کُو بِسَرێ زِمَانْ دِبێژِنْ: مَه بَاوَرِی ئَانِيَه - حَالْ اَڤَه دِلێ وَانْ بَاوَرِی نَئَانِيَه - و ژِ وَانێنْ کُو بُونَه جِهُو

---

و پَيخَمْبَرێ وِی وَكْ اِعْلانَا شَرْ دِنِرْخينَه و لِهَمْبَرِی چِتَه و تَالاَنْکَرَانْ جِزَانَه پِرْ گِرَانْ دَئَانِينَه. هَکَه چِتَيێنْ کُو سَرِی هِلْدَانَه و رَاهِشْتِنَه چِکَانْ، سُوجێ وَانْ کُشْتِنَا مرُوّڤَانْ تِنێ بَه، جِزَايێ وَانْ عِدَامَه. هَکَه هَمْ مِرُوّڤْ کُشْتِبِنْ، هَمْ ژِی خَلْكْ شَلانْدِبِنْ، جِزَايێ وَانْ هَمْ کُشْتِنَه، هَمْ ژِی دَاڵقَانْدِنَه. هَکَه خَلْكْ شَلانْدِبِنْ و طِرْسْ ژِی دَابِنْ وَانْ لِێ تُو کَسْ نَکُشْتِبِنْ، چَپْ و رَاسْتْ دَسْتَكْ و پِيکی وَانْ دێ وَرَه ژێکِرِنْ. هَکَه تِنێ خَلْكْ شَلانْدِبِنْ دێ بێنْ کُوّچبَرْکِرِنْ. هَکَه چِتَه بِخوه تَسْلِيمْ بِبَه و پُوّشْمَانْ بِبَه، جِزَا لِێ نَايێ خِسْتِنْ، لِێ مَجبُورَه کُو زَرَارْ دَابَه کِێ، تَزْمِينَاتَا وَانْ بدَه.

بِلا تَه غَمْگِینْ نَکِنْ. اَوْ یَا کُو دَرَوَه قَبُولْ دِکِنْ و گُوهِیَ خَوه دِدِنَه وانِیْنْ کُو (ژِ پۆزبِلِنْدِیَا خَوه) نَهَاتِنَه جَمْ تَه. اَوْ بێژَیَانْ ژِ جِهِیْنْ وَانْ دِگُوهَرِینِنْ. (ژِ هَڤَالِیْنْ خَوه رَه) دِبێژِنْ: اَگَرْ اَڤْ لِگۆرِی وَه بَه، ڤِیْجَه وِیَ ژِ خَوه رَه وَرگِرِنْ و اَگَرْ نَه لِگۆرِی وَه بَه خَوه ژِیَ بِپَارێزِنْ. چِه کَسِیَ کُو خُدِیَ، بَرْزَبُونِیَ ژِیَ رَه بِخَوازَه تُو دِیَ نِکَارِبِی لِهَمْبَرِی خُدِیَ تِشْتَکِی ژِیَ رَه بِکِی. اَڤِیْنْ هَا اَونْ کُو خُدِیَ نَخوسْتِیَه دِلِیَ وَانْ (ژِ کُفْرِیَ) پَاقِژْ بِکَه. ژِ وَانْ رَه لِدِنْیَایِیَ رِسُواتِی و لِئَاخْرَتِیَ ژِی عَزَابَکِی مَزِنْ هَیَه.[1]

٤٢. اَوْ پِرْ گُهْدَارِیَا دَروانْ دِکِنْ، پِرْ حَرَامْخُرِنْ. (یَا مُحَمَّدْ!) اَگَرْ اَوْ (ژِ بُو چَارَسَرْکِرِنَا گَنْگَشَیَکِیَ) بێنْ جَمْ تَه، تُو دِخَوازِی دِ نَاڤْبَرَا وَانْ دَه حُکِمْ بِکَه، یَانْ ژِی دَڤْ ژِ وَانْ بَرْدَه. اَگَرْ تُو دَڤْ ژِ وَانْ بَرِدِی ژِی اَوْ نَشِیْنْ تُو زَرَارِیَ بِدِنْ تَه. اَگَرْ تُو دِ نَاڤْبَرَا وَانْ دَه حُکِمْ بِکِی ڤِیْجَه بِعَدَالَتِی حُکِمْ بِکَه. بێگُمَانْ خُدِیَ ژِ مِرُۆڤِیْنْ عَادِلْ حَزْ دِکَه.

٤٣. چَاوَا اَوْ قَسْدَا تَه دِکِنْ دَا کُو تُو دِ نَاڤْبَرَا وَانْ دَه حُکِمْ بِکِی، حَالْ اَڤَه کُو تَوْرَاتْ لِجَمْ وَانْه و حُکْمِیَ خُدِیَ (کَا حُکْمِیَ زِنَاکَارِی چِیَه) تِیَ دَه یَه، پَاشِی پِشْتَا خَوه دِدِنَه حُکْمِیَ تَه دَایِی. اَڤِیْنْ هَا، نَه بَاوَرْمَنْدِنْ.

٤٤. بێگُمَانْ مَه تَوْرَاتْ نَازِلْ کِرِیَه کُو تِیَ دَه سَرْوَخْتِی و رُۆنَاهِی هَیَه. پێخَمْبَرێنْ کُو خَوه سِپَارتِبُونْ خُدِیَ، ژِ بُو جِهُوِیَانْ بِحُکْمِیَ تَوْرَاتِیَ حُکِمْ دِکِرِنْ. زَانَا و یێنْ اَهْلِیَ خُدِیَ ژِی، بِیَا کُو ژِ کِتێبَا خُدِیَ حِفِظْ کِرِبُونْ پِیَ حُکِمْ دِکِرِنْ و لِسَرْ (حَقْبُونَا) وِیَ شَاهِدْ بُونْ. (گَلِی جِهُوِیَانْ!) ژِ خَلْکِیَ نَطِرْسِنْ؛ ژِ مِنْ بِطِرْسِنْ. ئَایَتێنْ مِنْ بِنِرْخَکِی هِنْدِكْ نَفرُۆشِنْ. چِه کَسِیَ کُو بِیَا خُدِیَ نَازِلْ کِرِیَه حُکِمْ نَکَه ڤِیْجَه اَوْ هَرْ کَافِرْ بِخَونَه.

---

١ دگَلْ کُو شِیرَتْ و حُکْمِیَ ڤِیَ ئَایَتَا پیرُۆزْ گَلَمپَری یَه ژِی، لێبَلِیَ سَدَمَکَه دَاکَتِنَا وِیَ یَا نَمَازَیی هَیَه. لِمَدینَا مُنَوَّرْ لِنَاڤَا جِهُوِیَانْ رُودَانَکَه زِنَایِیَ قَومِی. جِهُوِیَانْ دِ نَاڤَا خُودَه لِسَرْ رُودَانِیَ مُنَاقَشَه کِرِنْ و هِنَانْ ژِوَانْ گُوتْ: هَرِنْ جَمْ مُحَمَّدْ (س) هَکَه اَوْژْ بلِی جزَایِیَ رَجْمِیَ جزَایَکی دِنْ بِدَه، دِ جِهْ دَه قَبُولْ بِکِنْ و لِجَمْ خُدِیَ اَوْژِوَه رَه دِیَ بِبَه دَلِیلْ و بَهَانَه. گَاڤَا هَاتِنْ جَمْ پێخَمْبَری دَرْحَالْ حُکِمْ نَدَا، اَوِد بِنْ زَخْتَکَه مَعْنَوی دَه هِشْتِنْ، حَتَا کُو بِوَانْ دَا اِعْتِیرَافْکِرِنْ کُو لِگۆرِی تَوْرَاتِیَ جزَایِیَ زِنَایِیَ رَجْمَه و بِڤِی ئَاوَایِیَ حَکِیمَانَه حِیلَیَا وَانْ پُوچْ کِرْ.

**٤٥.** مَه دِ تَورَاتێ دَه لِسَرْ اِسْرَائيلِيَانْ فَرْظْ كِرْ كُو تَقَزْ(جَزَايێ) جَانْ بِجَانَه، چَاڤْ بِچَاڤَه، پۆزْ بپۆزَه، گُوهْ بِگُوهَه، دِرَانْ بِدِرَانَه و دِ بِرِينَانْ دَه ژِى قِسَاسِيَتْ هَيَه. اِيْدِى كَسێ لِـ(قِصَاصِيَتێ) ببۆرَه ڤێجه اَوْ ژێ رَه كَفَارَتَه(هَمْ ژِ كُوژَرْ رَه هَمْ ژِ خَودَانْ مَافِى رَه ژِى كَفَارَتَه). چِهكَسێ كُو بِحُكْمێ خُدێ نَازِلْ كِرِيَه حُكِمْ نَكه، ڤێجه اَوْ هَرْ ظَالِمْ بِخَوه نَه.[1]

**٤٦.** مَه عِيسَايێ كُورێ مَرْيَمێ لِسَرْ شُوپَا پێخَمْبَرَانْ شَانْدْ كُو اَوْ تَوْرَاتَا لِبَرْ دَسْتێ خَوه رَاسْتْ دِدِيێرَه. مَه اِنْجِيلْ ژِى دَايێ كُو تێ دَه هِدَايَتْ و رُونَاهِى هَيَه و تَوْرَاتَا بَرِيَا خَوه رَاسْتْ دِدِيێرَه و ژِ تَقْوَادَارَانْ رَه ژِى رِيْبَرْ و شِيرَتَه.

**٤٧.** بِلا خُوَدِييێنْ اِنْجِيلێ (فِلَهْ) بِيَا كُو خُدێ تێ دَه ئَانِيَه (سَرْ وَانْ) حُكِمْ بِكِنْ. چِهكَسێ بِحُكْمێ كُو خُدێ نَازِلْ كِرِيَه حُكِمْ نَكَه، ڤێجَه اَوْ هَرْ فَاسِقْ بِخَوه نَه.

**٤٨.** (يَا مُحَمَّدْ)مَه كِتێبْ بِبَالْ تَه ڤَه بِحَقِى هِنَارتْ كُو اَوْ ژِ بُو كِتێبێنْ بَرِيَا خَوه رَاسْتْدِيێرَه و لِسَرْ وَانْ چَاڤدِيێرَه. اِيْدِى لِگۆرِى وَحْيَا كُو خُدێ ژِ بُو تَه هِنَارْتِيَه دِ نَاڤْبَرَا وَانْ دَه حُكِمْ بِكَه و لِشُونَا حَقِيَا كُو ژِ تَه رَه هَاتِيَه نَدَه دُوڤْ هَوَسێنْ وَانْ. مَه، ژِ بُو هَرْ يَكِى ژِ وَه شَرِيعَتْ و رِيْبَازَكْ دَانِيَه. اَگَرْ خُدێ بِخَوهسْتَا دێ هُونْ تَڤْ يَكْ اُمَتْ چێبِكِرَا. لِێبَلێ (مَه هُونْ كِرِنَه اُمَّتێنْ جُورْ بِجُورْ) دَا كُو وَه دَرْ حَقێ رِيْچْ و رِيْبَازَا كُو دَايِى دَه وَه بِجَرِبِينَه. نَاخَوه دِ قَنْجِيێ دَه پێشْبِرْكێ بِكِنْ. (گَلِى مِرُوڤَانْ!) ڤَگَرَا وَه هَمُويَانْ بِبَالْ خُدێ ڤَه يَه. اِيْدِى بِيَا كُو هُونْ تێ دَه بِهَڤْ كَتِنَه، اَوێ وَه ئَاگَاهْدَارْ بِكَه.[2]

---

١ دِ سێ هێلانْ دَه لِكَسێنْ كُو بِڤَانُونَا كُو خُدێ شَانْدِيَه حُكِمْ نَكِنْ، هَاتِيَه مِيزَانْدِنْ: ژِ بَرْ كُو مَعْنَيَا وێ اِنْكَارْ كِرِنَه ژِوَانْرَه»كَافِرْ»هَاتِيَه گۆتِنْ. ژِ بَرْ كُو حُكْمێ خُدێ عَدَالَتَه، دژِى وێ ژِى زُلْمَه، ژِوَانْرَه»زَالِمْ «هَاتِيَه گۆتِنْ. دِ ئَايَتَا ٤٧انْ دَه ژِ بَرْ كُو ژِ حُكْمێ خُدێ دَرْكَتِنَه ژِوَانْ رَه»فَاسِقْ»هَاتِيَه گۆتِنْ.

٢ اُمَّتْ و مِلَتێنْ كُو بِخُدێ بَاوَرِى ئَانِينَه و بُونَه اُمَتێنْ پێخَمْبَرَانْ دِ شُونَا كُوژْ بُو رَامَانێنْ جُودَا، سِيَاسَتْ و بَرژَوَندِيَانْ دَه بِهَڤْ بِكَڤِنْ، سَرێ هَڤْ بِخُونْ، بِلا دِ قَنْجِيَا كُو پێخَمْبَرَانْ ژِوَانْرَه رَاگِهَانْدِنَه دَه بِهَڤْ رَه پێشْبَازِيێ بِكِنْ؛ جِيهَانێ اِڤَا بِكِنْ، دِ هَدَفێنْ خێرێ دَه ئَارِى هَڤْ بِكِنْ.

٤٩. (یَا مُحَمَّدْ! تُو ژی دِ نَاڤبَرَا وَانْ دَە بِیَا کُو خُدێ هِنَارْتِیَە حُکِمْ بِکَە و نَدَە پَیْ هَوَسێنْ وَانْ. هَایْ ژ وَانْ هَبَە دَا اَوْ ژ هِنَکی وَحْیَا کُو خُدێ نَازِلْ کِرِیَە تَە ژێ نَدِنْ پَاشْ. اَگَرْ اَوْ بَرێ خَوە ژ (حُکْمێ) تَە بِگُوهَرِینِنْ، ڤێجَە بزَانَە کُو بێگُمَانْ خُدێ دِخوازَە بِسَدَمَا هِنْ گُنَهێنْ کُو کِرِنَە وَانْ جزَا بکَە. بێگُمَانْ پِرْ ژ مِرُوڤَانْ هَنَە کُو هَرْ ژ رِێ دَرْکَتِنَە.

٥٠. اَرێ مَا اَوْ حُکْمێ جَاهِلِیَتێ دِخوازِنْ؟ مَا ڤێ ژ بُو جِڤَاتَکَە کُو بَاشْ تێبِگِهێژَە حُکْمێ کێ ژ یێ خُدێ سِپَهێتِرَە؟!

٥١. هَیَ گَلی یێنْ بَاوَرِی ئَانِینَە! جِهُو و فِلَهَانْ ژ خَوە رَە نَکِنْ دُوْسْتُ و پِشْتَڤَانْ. اَوْ خَوە بِخوە ژ هَڤْ رَە دُوْسْتْ و پِشْتَکِنْ. کی ژ وَە، وَانْ ژ خَوە رَە بکَە دُوْسْتْ و ئَارِیکَارْ ڤێجَە بێگُمَانْ اَوْ ژی ژ وَانە. بێگُمَانْ خُدێ جِڤَاتَا سِتمکَارْ سَرْوَخْتْ نَاکَە.

٥٢. ڤێجَە تُو وَانْ کَسێنْ کُو دِ دِلێ وَانْ دَە نَخَوشینْ هَیَە دبِینی کُو لِهَڤَالْبَنْدیَا وَانِ(یْنْ جِهُو و فِلَە) لَزْ دِکِنْ. دِبێژِنْ (اَگَرْ مُسلْمَانْ تێکْ هَرِنْ، ڤێجَە) اَمْ دِطِرْسِنْ کُو کَارَسَاتَکَە مَزِنْ بِسَرْ مَە دَە بێ. ڤێجَە هێڤی هَیَە کُو خُدێ رِزْگَارِی یَانْ ژی سَرْکَفْتِنَکێ ژ جَمْ خَوە ژ بُو مُسلْمَانَانْ بینَە؛ اِیْدِی لِسَرْ یَا کُو وَانْ دِ دِلێ خَوە دَە ڤَشَارْتبُو دێ پوْشمَانْ بِبِنْ.

٥٣. اَوێنْ کُو بَاوَرِی ئَانِینْ دێ بِبێژِنْ: «مَا اَڤێ هَانِنْ، اَوێنْ کُو سُوْندێنْ ئَاسێ دِخوارِنْ کُو اَوْ بِتَڤَکی هێزَا خَوە بوَە رَە نَە؟» کِرِنێنْ وَانْ تَڤْ پُوچْ بُونَە و اَوْ بُونَە ژ یێنْ کُو زِیَانْ کِرِنَە.

٥٤. هَیْ گَلی یێنْ کُو بَاوَرِی ئَانِینَە! ژ وَە چِە کَسێ ژ دِینێ خَوە ڤَگَرە (بِلَا بزَانَە کُو) خُدێ، دێ جِڤَاتَکَە وِسَا (دِ شُونَا وَانْ دَە) بینَە کُو خُدێ ژ وَانْ حَزْ دِکَە اَوْ ژی ژ وی حَزْ دِکِنْ، دَرْ بَارێ مُومِنَانْ دَە شِکَسْتی و دِلْنَرْمِنْ و دَرْ بَارێ کَافِرَانْ دَە ژی خُرْتُ و دَسْتْهَلَاتِنْ، دِ رِیْکَا خُدێ دَە جِهَادێ دِکِنْ و ژ گَازِنْدێنْ گَازِنْدَکَرَانْ ژی نَاطِرْسِنْ. اَڤْ، پِرْ دَاینَا خُدێ یَە، اَوْ کێ بِڤێ دِدَە وِی. خُدێ (بِکَرَمَا خَوە) دَسْتْفِرَهَە، زَانَا یَە.

**٥٥.** بێگُمَانْ دُوْسْتْ و ئَارِیكَارِیٚ وَه تَنِیٚ خُدِیٚ یَه، پێخَمْبَرِیٚ وِی یَه و یێنْ كُو بَاوَرِی ئَانِینَه؛ اَوێنْ كُو بِبَرْدَوامِی نِمێژْ دِكِنْ، زَكَاتَا مَالِیٚ خوه دِدِنْ و اَوْ هَرْ (لِبَرْ فَرْمَانَا خُدِیٚ) خوه دِطَوِینِنْ.

**٥٦.** كِی كُو خُدِیٚ، پێخَمْبَرِیٚ وِی و یێنْ كُو بَاوَرِی ئَانِینَه ژِ خَوه رَه بِكَه دُوْسْتْ و ئَارِیكَارْ (اَوْ بَنْدَا خُدِیٚ نَه)؛ بِرَاسْتِی ژِی بَنْدَا خُدِیٚ هَرْ اَوْ بِخَوه نَه دَسْتْهِلاَتْدَارْ.

**٥٧.** هَیْ گَلِی یێنْ كُو بَاوَرِی ئَانِینَه! هُونْ، ژِ اَهْلِیٚ كِتێبێنْ بَرِیَا خَوه و ژِ وَانْ كَافِرێنْ كُو وَانْ دِینِیٚ وَه ژِ خَوه رَه كِرِنَه تِنَازْ و پێلِیسْتُوْكْ ژِ بُوْ خَوه نَكِنْ دُوْسْتُ و پِشْتَڤَانْ. ژِ خُدِیٚ بِطِرْسِنْ. اَگَرْ بِرَاسْتِی هُونْ بَاوَرْمَنْدِنْ (وَانْ ژِ خَورَه نَكِنْ دُوْسْتُ و پِشْتَڤَانْ).

**٥٨.** دَمَا هُونْ ژِ بُوْ نِمێژِیٚ بَانگْ دِدِنْ اَوْ تِنَازْ و یَارِییٚ خَوه پِیٚ دِكِنْ. اَڤَا كُو دِكِنْ، ژِ بَرْ كُو اَوْ بِخَوه جِڤَاتَكَه بێرْنَبِرْ و بێهِشِنْ.

**٥٩.** بِبێژَه: گَلِی یێنْ اَهْلِی كِتێبْ! ڤَیْ بِسَدَمَا كُو مَه بِخُدِیٚ، بِیَا كُو ژِ مَه رَه هَاتِیَه و بِیَا كُو ژِ اُمَتێنْ بَرِیٚ رَه هَاتِیَه هِنَارْتِنْ بَاوَرِی ئَانِیَه هُونْ ژِ مَه حَزْ نَاكِنْ؟ بِرَاسْتِی پِرِیٚ وَه ژِ رێكَا حَقْ دَرْكَتِنَه.

**٦٠.** (یَا مُحَمَّدْ!) بِبێژَه: اَرِیٚ، مَا اَزْ ژِ وَه رَه بِبێژِمْ كَا لِجَمْ خُدِیٚ ژِ ڤَانْ (فَاسِقَانْ) خَرَابْتِرْ و رِسْواتِرْ كِی یَه؟ اَوْ، یِیٚ كُو خُدِیٚ لَعْنَتْ لِیٚ كِرِیَه و یِیٚ كُو لِیٚ هێرْسْبُویَه؛ اَوێنْ كُو هِنْ ژِ وَانْ خِسْتِنَه مَیْمُونْ و بَرَازْ و اَوْ عِبادَتْكَرِیٚ تَاغُوتِی نَه. هَا اَوْ، پِیسْتِرِینْ خُدَانْ جِهِنْ و ژِ رێكَا رَاسْتْ رِیٚ وِنْدَاتِرِینْ كَسِنْ.

**٦١.** دَمَا اَوْ (مُنَافِقْ) تێنْ جَمْ وَه، دِبێژِنْ: مَه بَاوَرِی ئَانِیَه. حَالْ اَڤَه كُو اَوْ دِلْكَافِرْ هَاتِنَه جَمْ وَه و دِلْكَافِرْ ژِی ژِ جَمْ وَه دَرْكَتِنَه. خُدِیٚ بِیَا كُو وَانْ ڤَدِشَارْتْ بێهْتِرْ دِزَانَه.

**٦٢.** تُو پِرِیٚ وَانْ دِبِینِی كُو اَوْ دِ گُنَهْ، دِژْمِنَاهِی و حَرَامْخُوْرِییٚ دَه پێشبَازِییٚ دِكِنْ، بِرَاسْتِی یَا كُو اَوْ دِكِنْ چِڤَاسْ پِیسَه!

٦٣. دَه بِلا خُدێنَاسْ و هَاخَامێنْ وَانْ ژِ گۆتِنَا بِگُنَهْ و ژِ حَرَامْخُۆرِیێ اَوْ بِدَانَا پَاشْ! بِرَاسْتِی یَا کُو اَوْ دِکِنْ چِقَاسْ پیسَه!

٦٤. جِهُویَانْ گۆتْ: خُدێ دَسْتْگِرْتِیَه (جِکُوسَه) -دَسْتێنْ وَانْ شَحتْ بِبَه و ژِ بَرْ ڤێ گۆتِنَا وَانْ لَعْنَتْ لِوَانْ بِبَارَه - نَخێرْ، نَه وِسَانَه، بَلْکی دَسْتێنْ خُدێ (بِدَایِنَا خوه) ڤَکِرِیَه، اَوْ چَاوَا بِڤێ وِسَا دِدَه. (یَا مُحَمَّدْ!) صۆندْ بَه، یَا کُو ژِ جَمْ خُدَایێ تَه، ژِ تَه رَه هَاتِیَه هِنَارْتِنْ دێ کُفِرْ و چَاڤْسُۆرِیَا پِرَانِیَا وَانْ زێدَه بِکَه. مَه کِینْ و نَیَارتِیکَه وِسَا خِسْتِیَه نَاڤْ وَانْ کُو حَتَا رُۆژَا قِیَامَتێ بَرْدَوامَه. چه دَمَا وَانْ ژِ بُۆ جَنْگێ ئَاگِرَكْ ڤێخِسْتِبَه، خُدَا هَرْ اَوْ ئَاگِرْ ڤَمِرَانْدِیَه. اَوْ لِسَرْ عَرْدێ ژِ بُۆ تَڤْدَانِیێ دِبَزِنْ، خُدێ ژِی ژِ تَڤْدَانْکَرَانْ حَزْ نَاکَه.

٦٥. اَگَرْ یێنْ اَهْلِی کِتێبْ بَاوَرِی (بِمُحَمَّدْ) بِئَانِیَا و خَوه (ژِ کُفْرُ و نَقَنْجِیێ) بِپَارَاسْتِنَا، تَقَزْ مَه دِێ گُونَهێنْ وَانْ (یێنْ بُۆرِی) بِبَخْشَانْدَه و مِسُۆگَرْ مَه دِێ اَوْ بِخِسْتِنَا بِهِشْتێنْ تێرْخَوشِی.

٦٦. اَگَرْ وَانْ تَوْرَاتْ، اِنْجِیلْ و وَحْیَا کُو ژِ جَمْ خُدَایێ وَانْ ژِ وَانْ رَه هَاتِیَه شَانْدِنْ رَاگِرْتِبُویَا و بِکَارْ ئَانِیبُویَا، تَقَزْ وَانْ دێ ژِ رَاسَرِی خَوه و ژِ بِنْ خَوه ڤَه بِخوارِنَا (رِزِقْ ژِ بُۆ وَانْ دێ هێسَانْ بُویَا). ژِ وَانْ جِڤَاتَكْ هَیَه مُعْتَدِلِنْ (نَاڤْنْجِی نَه) و گَلَكْ ژِ وَانْ ژِی چه پیسَه یَا کُو دِکِنْ!

٦٧. اَیْ پێخَمْبَرْ! وَحْیَا کُو ژِ جَمْ خُدَایێ تَه ژِ تَه رَه هَاتِیَه شَانْدِنْ رَابِگِهِینَه. اَگَرْ تُو بِتَکُوزِی پێكْ نَیِینِی، ڤێجَه تَه پێخَامَا خُدَا رَانَگِهَانْدِیَه. خُدێ دێ تَه ژِ (نَقَنْجِیَا) مِرُۆڤَانْ بِپَارێزَه. بێگُمَانْ خُدێ جِڤَاتَا کَافِرْ سَرْوَخْتْ نَاکَه.

٦٨. بِبێژَه: گَلِی یێنْ خُوَیکِتێبْ! حَتَا کُو هُونْ بِرَاسْتِی و دُورِسْتِی تَوْرَاتێ، اِنْجِیلێ و یَا کُو ژِ جَمْ خُدَایێ وَه ژِ وَه رَه هَاتِیَه هِنَارْتِنْ (دِ ژِیَانێ دَه) بِکَارْ نَیِینِنْ، هُونْ نَه لِسَرْ تُو تِشْتِی نَه. صۆندْ بَه، قُرْئَانَا کُو ژِ جَمْ رَبِّێ تَه ژِ تَه رَه هَاتِیَه شَانْدِنْ دێ کُفْرُ و چَاڤْسُۆرِیَا پِرِێنْ وَانْ زێدَه بِکَه. نَاخوه تُو ژِ بُۆ وَانْ غَمْگینْ مَبَه.

٦٩. بێگُمَانْ يێنْ كُو بَاوَرى ئَانينَه و يێنْ بُونَه جهُو، يێنْ بُونَه فِلَهْ و يێنْ بُونَه سَابِئينْ، ڤێجَه ژِ وَانْ كِى بَاوَرِيێ بِخُدێ و رُۆژَا ئَاخْرَتِێ بينَه و كَارێ قَنْجْ بِكَه، ژِ بُۆ وَانْ لِنِكْ خُدَايێ وَانْ خَلاتْ هَيَه و لِسَرْ وَانْ طِرْسْ نينَه و اَوْ غَمْگينْ ژِى نَابِنْ.[1]

٧٠. بێگُمَانْ مَه ژِ زَارُۆكێنْ اِسْرَائيلْ پێمَانَا مِكُومْكِرِى وَرْگِرتْ و مَه ژِ وَانْ رَه قَاسِدْ شَانْدِنْ. چه دَمَا پێخَمْبَرَكْ يَا نَه بِدِلێ وَانْ ژِ بُۆ وَانْ دِئَانِى، هِنْ ژِ وَانْ (پێخَمْبَرَانْ) مَانْدَلَه دِكِرِنْ و هِنْ ژِ وَانْ ژِى دِكُشْتِنْ.

٧١. ژِ وَانْ وَه يَه كُو تُو بَلَا دێ بِسَرێ وَانْ دَه نَيێ، اِيْدِى اَوْ كَرْ و كُوْرْ بُونْ. پَاشى (تُۆبَه كِرِنْ) خُدێ تُۆبَيَا وَانْ قَبُولْ كِرْ، دُوڤرَه دِيسَا ژِ وَانْ پِرْ كَسْ كُوْرْ و كَرْ بُونْ. خُدێ بِيَا كُو اَوْ دِكِنْ آگَاهْدَارَه.

٧٢. صُۆندْ بَه، اَوێنْ گُۆتِنْ: خُدَا، مَسيحێ كُورێ مَرْيَمێ يَه، (اَوْ بِڤێ گُۆتِنَا خوه) كَافِرْ بُونَه. حَالْ اَڤَه كُو مَسيحْ ژِ وَانْ رَه گُۆتِبُو: گَلى زَارُۆيێنْ اِسْرَائيلْ! ژِ خُدێ رَه عِبَادَتێ بِكِنْ كُو اَوْ هَمْ خُدَايێ مِنْ هَمْ ژِى خُدَايێ وَه يَه. بِزَانِنْ كُو كِى ژِ خُدێ رَه هَڤْپَارَانْ چێكَه، تَڤَزْ خُدێ دێ جَنَّتێ لِوِى حَرَامْ بِكَه، اِيْدِى جِهێ وِى اگِرَه و ژِ سِتَمْكَارَانْ رَه تُو ئَارِيكَارْ ژِى تُونَه.

---

١ بِچێكِرنَا ئَادَمْ رَه بَاوَرِيكَه فِتْرِى نَازِلْ بُو اَوَا كُو اِنْسَانْ لِسَرێ هَاتِبُو ئَافِرَانْدِنْ. پَاشێ خُدێ دِينْ شَانْدِنْ. پێرَوێنْ هِنَكَانْ ژِ وَانْ لِسَرْ عَرْدێ هَنَه، مِينَا يَهُودِى، فِلَهْ و سَابِئيَانْ. ڤێجَه خُدێ دِخوازَه كُو تَڤَكێ اَهْلێ دِينَانْ ژِ سَرْ عَرْدێ سَافى بِكَه و دِ رِسَالَتَا مُحَمَّدْ دَه كُۆمْ بِكَه. لَوْرَا رِسَالَتَا پێخَمْبَرْ ژِ بُۆ تَسْفِيكِرنَا تَڤَكێ دِينَانَه. خُدێ دِخوازَه ژِ وَانْ رَه بێژَه؛ دَوْرَا وَه خَلاسْ بُو. ڤێجَه دِڤێ هُونْ بِرِيسَالَتَا مُحَمَّدْ اِيمَانێ بِينِنْ. نَاخُو مَعْنى ئَايَتێ وِهَا يَه: اَوێنْ كُو لِسَرْ بَاوَرِيَا فِتْرَتێ نَه، يێنْ جِهُو، يێنْ فِلَهْ و يێنْ سَابِئى، اَگَرْ كُو دَڤْ ژِ بَاوَرِيَا خوه يَا بَرێ بَرْدِنْ و بِبَاوَرِيكَه نُو و بِرِسَالَتَا مُحَمَّدْ (س) بَاوَرِى بِينِنْ، هَا هِنگى ژِ بُۆ وَانْ خَلاتْ هَيَه ... و اَوْ غَمْگينْ ژِى نَابِنْ.

كَسێ كُو بَاوَرِيێ بِپێخَمْبَرێ دَاوِى مُحَمَّدْ بِينَه، لِگُۆرِى هُۆىْ و مَرْجێنْ بَاوَرِيێ تَڤْبِگَرَه، دِينێ وِى يێ بَرێ چه دِبَه بِلا بِبَه، چه قَاسى گُنَهْ كِرِبِنْ بِلا كِرِبَه، لِجِيهَانْ و ئَاخْرَتێ تِشْتَكى كُوَاوْ ژێ سَاوْ بِگِرَه تُونَه يَه. لَوْرَا خُدێ دێ لِگُونَهێنْ وِى يێ بَرێ بِبُۆرَه.

دُو جَلَبْ ( بَاوَرْمَنْدْ و كَافِرْ ) هَاتِنْ هَمْبَرِی هَڤْ، (شَیطَانْ) بِسَرْ پَاشْپَهنیَا خَوه ڤَه زِڤِری و گُوتْ: بێگُمَانْ اَزْ ژِ وَه دُورِمْ، بێگُمَانْ یَا كُو اَزْ دِبینِمْ هُونْ نَابِینِنْ، بێگُمَانْ اَزْ ژِ خُدَیێ دِطِرْسِمْ، لَوْرَا خُدِیێ جَزَادِژْوارَه.

٤٩. وِیێ دَمِیێ مُنَافِقَانْ و اَوِیْنْ كُو دِ دِلِیێ وَانْ دَه نَخُوشی هَیَه (دَرْ بَارِیێ وَه دَه) دِگُوتِنْ: اَوِیْنْ هَا، دِینِیێ وَانْ اَوْ خَاپَانْدِنَه. چِه كَسِیێ كُو خَوه بِسْپێرَه خُدِیێ، ڤِیْجَه بێگُمَانْ خُدِیێ عَزِیزَه، حَكِیمَه.

٥٠. (رَسُولِیێ مِنْ!) خَوزِیَا دَمَا مَلائِیكَتْ رِحیێ یێنْ كُو كَافِرِنْ دِسْتِینِنْ و لِرُو و پِشْتَا وَانْ دِخِنْ و (ژِ وَانْ رَه دِبێژِنْ) دَه عَذَابِیێ دُوْژَهِیێ بِچێژِنْ، تَه بِدِیتَا!

٥١. هَا اَڤْ، بِسَدَمْ ئَاكُو دَسْتِیێ وَه كِرِیَه و بێگُمَانْ خُدِیێ لِبَنْدَیِیێ خَوه تُو ظُلْمِیێ نَاكَه.

٥٢. وانْ ژِی، وَكِی مَالبَاتَا فِرْعَونْ و یێنْ بَرِیَا وَانْ نِیشَانْ و ئَایَتێنْ خُدِیێ اِنْكَارْ كِرِنْ، ڤێجَه خُدِیێ بِسَبَبْ گُنَهێنْ وَانْ اَوْ هِنْگَافْتِنْ. بێگُمَانْ خُدِیێ خُودَانْهێزَه، ئَازَارْدِژْوَارَه.

٥٣. اَڤْ جَزَا ژِ بَرْ ڤِیێ یَه، لَوْرَا؛ حَتَا كُو قَوْمَكْ قَنْجِی و كَرَمَا كُو خُدِیێ بِوَانْ رَه كِرِی اَوْ بِخَوه نَه گُهَرِینِنْ بِرَاسْتِی ژِی خُدِیێ قَنْجِیَا لِسَرْ وَانْ نَاگُهَرِینَه. بێگُمَانْ خُدِیێ بِهِیزَرَه، زَانَا یَه.

٥٤. وَانْ ژِی وَكِی مَالْبَاتَا فِرْعَوْنْ و یێنْ بَرِیَا وَانْ، بِئَایَتێنْ خُدَایِیێ خَوه بَاوَرِی نَئَانِینْ. اِیْدِی مَه ژِی، ژِ بَرْ گُنَهێنْ وَانْ، اَوْ ژِی هَلَاكْ كِرِنْ و مَه مَالْبَاتَا فِرْعَونْ (دِ دَرْیَایِیێ دَه) خَنِقَانْدْ. بێگُمَانْ اَوْ هَمِی ظَالِمْ بُونْ.

٥٥. بێگُمَانْ لِجَمْ خُدِیێ جَانْدَارێنْ هَرِی خَرَابْ اَوِیْنْ كُو كَافِرِنْ، ڤێجَه اَوْ بَاوَرِییێ (بِخُدِیێ) نَایِینِنْ.

٥٦. (رَسُولێ مِنْ) اَوێنْ کُو تَه سُوزْ و پێیمَانْ ژِ وَانْ گِرْتبُو، پَاشێ دِ هَرْ جَارِێ دَه سُوزَا خوه دِشْکِینِنْ و اَوْ (ژِ اَنْجَامَا ڤِێ سُوزْشِکَانْدِنِێ) نَاطِرْسِنْ..

٥٧. اَگَرْ دِ جَنْگێ دَه تُو سَرْدَسْتِی وَانْ بِبِی، ڤێجَه دَرْبَکَه وِسَانْ لِوانْ بِخَه دَا کُو یێنْ دِ پَیْ وَانْ رَه ژِ ڤِێ دَرْبِێ دَرْسْ بِگرِنْ.

٥٨. چه دَمَا تُو ژِ خِیَانَتَا مِلَّتَکی (کُو تَه بِوَانْ رَه پَیْمَانْ دَانیَه) بِطِرْسی، لِسَرْ عدَالَتِێ وَانْ ئَاگَاهْدَارْ بِکَه؛ (ژِ وَانْ رَه بِبێژَه) پَیْمَانْ دِ نَاڤْبَرَا مه دَه نَمَا. بێگُمَانْ خُدِێ ژِ خَاینَانْ حَزْ نَاکَه.[1]

٥٩. بِلا اَوێنْ کَافِربُونَه گُمَانْ نَکِنْ کُو اَوْ ژِ عَذَابِێ خُدِێ خَلَاسْ بُونَه. بێگُمَانْ اَوْ نِکَارِنْ مَه نَاچَارْ بِهێلِنْ.

٦٠. (گَلی بَاوَرْمَنْدَانْ) هُونْ ژِی چِقَاسْ کُو ژِ وَه بِێ، ژِ هێزْ و هَسْپێنْ گرێدَایی لِهَمْبَرْ وَانْ (دِژْمنێنْ خَوه) خَوه ئَامَادَه بِکِنْ. کُو هُونْ بِوِێ دِژْمِنِێ خُدِێ و دِژْمِنِێ خَوه و هِنْ دِژْمِنێنْ دِنْ ژِی کُو هُونْ بِوَانْ نِزَانِنْ، لێبَلِێ خُدِێ بِوَانْ دِزَانَه، چَاڤْطِرْسَانْدِی بِکِنْ. چه تِشْتِێ کُو هُونْ دِ رِیَا خُدِێ دَه خَرْجْ بِکِنْ، (بێکێمَاسی) خێرَا وِێ دِێ ژِ وَه رَه بِێ دَاینْ و قَتْ نَحَقی لِوَه نَایِێ کِرِنْ.

٦١. اَگَرْ اَوْ (دِژْمِنْ) بَرْ بِئَاشْتِیێ ڤَه هَاتِنْ، ڤێجَه تُو ژِی بَرْ بِوِێ ڤَه هَرَه و خَوه بِسْپێرَه خُدِێ. بێگُمَانْ خُدِێ، هَرْ اَوَه یِێ بِهیزَرْ، یِێ زَانَا.

٦٢. اَگَرْ اَوْ (بِئَاشْتِیێ) بِخوازِنْ تَه بِخَاپِینِنْ، ڤێجَه بێگُمَانْ خُدِێ هَرْ بَسی تَه یَه. یِێ کُو بَئَارِیکَارِیَا خَوه و بِپِشْتَڤَانِیَا مُومِنَانْ تُو بِهێزْ کِری اَوَه.

---

١ دِ ئَایَتِێ دَه {عَلَی سَوَاءٍ} دَرْبَاس بُو.

٦٣. (خُدێ) حَزْكِرِنْ خِسْتْ نَاڤْبَرَا دِلێ وَانْ، اَگَرْ تَه چه تِشْتێ لِسَرْ عَرْدێ هَيَه، تَڤْ (دِ ڤێ رێيێ دَه) خَرْجْ بكِرَا ژى، تَه يێ نِكَارِيبُويَا دِلێنْ وَانْ بِگَهَانْدَا هَڤْ. لێبَلێ خُدێ اَوْ گِهَانْدِنَه هَڤْ. بێگُمَانْ خُدێ سَرْكَفْتى يَه، كَارْبِنَجهَه.[1]

٦٤. اَىْ پێخَمْبَرْ! خُدێ بَسى تَه و بَاوَرْمَنْدێنْ بِتَه رَه يَه.

٦٥. اَىْ پێخَمْبَرْ! لِهَمْبَرْ (كَافِرَانْ) نَاڤْ دِ بَاوَرْمَنْدَانْ بِدَه، وَانْ لِسَرْ شَرْ گَرْمْ بِكَه. اَگَرْ ژِ وَه بيسْتْ كَسێنْ سَبَاتْكَارْ هَبِنْ اَوێ زُوْرَا دُو سَدْ كَسێنْ (كَافِرْ) بِبِنْ، اَگَرْ ژ وَه سَدْ كَسْ هَبِنْ اَوێ زُوْرَا هَزَارْ كَسێ كَافِرْ بِبِنْ. لَوْرَا اَوْ بِرَاسْتِى قَومَكى تێنَگِهێژِنْ.

٦٦. ئَانِهَا، خُدێ بَارێ وَه سِڤِكْ كِرْ و دِزَانِبُو كُو دِ وَه دَه (لِهَمْبَرى شَرْ) قَلْسيَكْ هَيَه. نَاخوه، اَگَرْ ژِ وَه سَدْ كَسێنْ صَبِرْكێشْ هَبِنْ، اَوێ زُوْرَا دُو سَدْ كَسێنْ (كَافِرْ) بِبِنْ. اَگَرْ ژِ وَه هَزَارْ كَسْ هَبِنْ، اَوْ -بِدَسْتُورَا خُدێ- دێ زُوْرَا دُو هَزَارْ كَسێنْ (كَافِرْ) بِبِنْ. خُدێ تَڤْز دِگَلْ صَبِرْكێشَانَه.

٦٧. حَتَا كُو دِ قَادَا شَرْ دَه دَسْتْهِلاتِيێ بِدَسْتْ نَخَه، مَافێ تُو پێخَمْبَرَكى تُنَه يَه كُو (دِ شَرْ دَه) اَسيرَانْ بِگرَه. هُونْ پَرْتَالێ دِنْيَايێ دِڤێنْ و خُدێ ژى يَا پِشْتى وێ (عِزَّتَا دِينێ خَوه و بِسَرْكَتِنَا مُومِنَانْ) دِخوازَه. خُدێ عَزيزَه، حَكيمَه.

٦٨. اَگَرْ نَه ژِ فَرْمَانَا خُدێ يَا دَرْبَاسْبُويِى بُويَا بِسَدَمَا اَسيرْگِرْتِنَا وَه دێ عَذَابَكى مَزِنْ وَه بِهِنْگَافْتَا.

٦٩. اِيْدى ژ وێ غَنِيمَتَا كُو وَه بِدَسْتْ خِسْتِيَه بِحَلَالِى و پَاكى بِخُونْ. ژِ خُدێ بِطِرْسِنْ، بێگُمَانْ خُدێ گُنَهْڤَشێرَه، دِلُوڤَانَه.

---

[1] لِمَدينَا مُنَوَّرْ دِ نَقبَا فَامِلا اَوْسْ و خَزْرَجيَانْ دَه دِژْمِنَاهِيَكَه تُوژْ و بَرْبَرِيكَه تُونْدْ هَبُو. دِ نێڤْ وَانْ دَه شَرێنْ گِرَانْ قَومِيبُونْ و ژ گَرَه گِرێنْ وَانْ پِر اِنْسَانْ هَاتِبُونْ كُشْتِنْ. ژ دَمَكه دِرێژْ ڤَه لِپێ هَڤْ دِگِريَانْ دَا كُو ژِ هَڤْ تُوْلْ و حَيْفێ هِلِينِنْ. ڤێجه دَمَا خُدێ بِاسْلَامێ اَوْ بِرُومَتْ كِرِنْ، ژ دِلْ و جَانْ لِهَڤْ هَاتِنْ؛ كِينْ و دِژْمِنَاهِى ژِ دِلێ خَوه ئَاڤێتِنْ و مِينَا بِرَايێ ژِ دێ و بَاڤْ هَڤْدُو حَمِيزْ كِرِنْ.

٧٠. اَیْ پێخَمْبَرْ! اَسیرێنْ کُو دِ بِنْ دَسْتێ وَه دَه نَه ژِ وَانْ رَه بێژَه: اَگَرْ خُدێ بزَانَه کُو دِ دِلێنْ وَه دَه خێرْ هَیَه، وێ ژِ فِدْیَا کُو ژِ وَه هَاتِیَه گِرْتِنْ هێژْ چێترێ وێ بدَه وَه و وێ لِگُنَهێنْ وَه ببِهُورَه. خُدێ گُنَهْڤَشێرَه، دِلْوَڤَانَه.

٧١. (رَسُولێ مِنْ!) اَگَرْ اَوْ بِخَوازِنْ لِتَه خَایِنْتِیێ بِکِنْ (غَمْگینْ نَبَه، لَوْرَا) وَانْ بَرێ بِخُدێ رَه خَایِنْتِی کِرِبُو. (لِێبَلێ) خُدێ لِهَمْبَرِی وَانْ دَرْفَتْ و هێزْ دَا تَه (کُو لِبَدْرێ تَه زُوْرَا وَانْ بِرْ و تَه اَوْ دِیلْ گِرْتِنْ). خُدێ تَقَزْ (دِ کَارێ خَوه دَه) زَانَا یَه، خَودَانْحِکْمَتَه.

٧٢. بێگُمَانْ اَوێنْ کُو بَاوَری ئَانینْ و (ژِ بُوْ خُدێ ژِ وَلاتێ خَوه) هِجْرَتْ کِرِنْ و دِ رِیَا خُدێ دَه بمَالێ خَوه و جَانێ خَوه خَبَاتْ کِرِنْ و اَوێنْ کُو (مُهَاجِرْ) حَوانْدِنْ و ئَاریکَارِیَا وَانْ کِرِنْ، هَا اَوْ سَرْکَارْ و ئَاریکَارێنْ هَڤِنْ. هَرْچی اَوێنْ کُو بَاوَری ئَانینْ، لِێبَلێ هِجْرَتْ نَکرِنْ؛ حَتَا کُو اَوْ هِجْرَتْ نَکِنْ ژِ خَودِیتِیَا وَانْ تِشْتَکْ ژِ وَه رَه تُنَه. (دِگَلْ ڤێ ژی) اَگَرْ اَوْ دَرْ بَارێ دِینْ دَه ئَاریکَارِیێ ژِ وَه بِخَوازِنْ، بِشَرْطێ کُو نَه لِهَمْبَرْ مِلَّتَکی بَه کُو دِ نَاڤْبَرَا وَه و وَانْ دَه پێمَانْ هَیَه، هِنْگێ لِسَرْ وَه فَرْزَه کُو هُونْ ئَاریکَارِیَا وَانْ بِکِنْ. خُدێ بِکَارێ کُو هُونْ دِکِنْ بینَرَه.

٧٣. اَوێنْ کُو کَافِرِنْ هِنْ ژِ وَانْ ئَاریکَارێنْ هِنَانِنْ. اَگَرْ هُونْ وێ (ئَاریکَاری و دُوْسْتَانِیێ دِ نَاڤْ خَوه دَه) بِجِهْ نَئینِنْ ، دێ لِسَرْ عَرْدێ بَلا و فَسَادیکَه مَزِنْ دَرْکَڤَه حُوْلێ.

٧٤. اَوێنْ کُو بَاوَری ئَانینْ و (ژِ وارێ خَوه) هِجْرَتْ کِرِنْ و دِ رِیَا (دِینێ) خُدێ دَه جِهَادْ کِرِنْ و اَوێنْ کُو (مُهَاجِرْ) ڤَحَوَانْدِنْ و ئَاریکَارِیَا وَانْ کِرِنْ، هَا اَوْ بَاوَرْمَنْدێنْ رَاسْتَقینِنْ. ژِ بُوْ وَانْ لِێبُوْرینْ و رِزْقَکی فِرَهْ و خَوشْ هَیَه.

٧٥. اَوێنْ کُو پَاشێ بَاوَری ئَانینْ و هِجْرَتْ کِرِنْ و بوَه رَه جِهَادْ کِرِنْ، ڤێجَه هَا اَوْ ژی ژِ وَه نَه. اَوێنْ کُو خَودِی و اَقْرَبَا نَه، دِ کِتێبَا خُدێ دَه، اَوْ ژِ هَڤْ رَه پێشْدَترِنْ (کُو اَوْ دُوْسْتُ و ئَاریکَارێ هَڤْ بِنْ). بِرَاسْتِی ژی خُدێ بِهَرْ تِشْتِی ئَاگَاهْدَارَه.

# ٩. سُورَه يِىَٰ تَوْبَه

سُورَه‌يِىَٰ تَوْبَه‌١٢٩ (سَدْ و بِيسْتْ و نَهْ) ئَايَتَه. ئَايَتَا ١٢٨مْ و ١٢٩مْ لِمَكِّىَٰ و ئَايَتِيْنْ دِنْ ژِى لِمَدِينِيىَٰ نَازِلْ بُونَه.

سُورَه‌يِىَٰ تَوبَه نَاڤِىَٰ خَوه ژِ ئَايَتَا ١٠٤مْ گِرْتِيَه، لَوْرَا پِيْوَنْدِيَا وِىَٰ بِتُوْبِىَٰ رَه هَيَه كُو دِ زِمَانِىَٰ عَرَبِى دَه تَوْبَه بِمَعْنٰى پُوْشْمَانِى يَه. ژِ بِلِى تَوْبَه هِنَكْ نَاڤِيْنْ وِى يِيْنْ دِنْ ژِى هَنَه. نَاڤِىَٰ وِى يِىَٰ هَرِى مَشهُورْ بَرَائَتَه.

١. اَڤْ ژِ ئَالِيِىَٰ خُدِىَٰ و قَاصِدِىَٰ وِى ڤَه بِيَرِيبُونَكَه ژِ بُوْ وَانْ مُشْرِكِيْنْ كُو وَه بِوَانْ رَه پِيْمَانْ دَانِيَه.

٢. ڤِيْجَه چَارْ مَهَانْ (بِىَٰ طِرْسْ) دِ عَرْدِىَٰ دَه بِگَرِنْ. ئَاگَاهْدَارْ بِنْ، بِيْگُمَانْ هُونْ نِكَارِنْ خُدِىَٰ نَچَارْ بِهِيْلِنْ و بِيْگُمَانْ خُدِىَٰ رِسْوَاكَرِىَٰ كَافِرَانَه.

٣. اَڤْ ئَاگَاهْدَارِيَكَه ژِ خُدِىَٰ و قَاصِدِىَٰ وِى يَه دِ جَژْنَا مَزِنْ (جَژْنَا قُرْبَانِىَٰ) دَه، بِبَالْ تَڤَكِى خَلْكِىَٰ ڤَه كُو خُدِىَٰ و پِيْخَمْبَرِىَٰ وِى ژِ مُشْرِكَانْ (اَوِيْنْ كُو وَانْ پِيْمَانَا خَوه شِكَانْدْ) بِيْرِى نَه. اَگَرْ هُونْ تُوْبَه بِكِنْ ڤِيْجَه اَوْ ژِ وَه رَه چِيْتِرَه. (نَا) اَگَرْ هُونْ (ژِ اِيمَانْ و حَقِيىَٰ) بَرِىَٰ خَوه دَاگَرِينِنْ، بِزَانِنْ كُو هُونِىَٰ خُدِىَٰ بِيْچَارَه نَهِيْلِنْ. (رَسُولِىَٰ مِنْ!) مِزْگِينِيَا عَزَابَكِى دِژْوَارْ بِدَه وَانِيْنْ كُو كَافِرْ بُونَه!

٤. ژِ بِلِى وَانْ مُشْرِكِيْنْ كُو وَه بِوَانْ رَه پِيْمَانْ دَانِيَه، پَاشِىَٰ وَانْ ژِ پِيْمَانَا خَوه تِشْتَكْ كِيْمْ نَكِرْ و لِهَمْبَرِى وَه دِ سَرْ تُو كَسِى رَه نَهَاتِنْ، ڤِيْجَه پِيْمَانَا وَانْ بِهِيْلِنْ حَتَا وَقْتِىَٰ دِيَارْكِرِى. بِيْگُمَانْ خُدِىَٰ ژِ يِيْنْ كُو هَاىْ ژِ پِيْمَانَا خَوه دِمِينِنْ حَزْ دِكَه.

٥. ڤِيْجَه اَگَرْ مَهِيْنْ بِرُومَتْ دَرْبَاسْ بُونْ، اِيْدِى لِكُو دَرِىَٰ هُونْ رَاسْتِى وَانْ مُشْرِكَانْ بِيْنْ، وَانْ بِكُژِنْ، (بِدِيلِى) وَانْ بِگِرِنْ، هَرْ رِيِىَٰ لِبَرْ وَانْ بِگِرِنْ و لِهَمُو زِيْرَڤَانْگَهَانْ لِوَانْ

چَاڤْدِێرِیيێ بِکِنْ. ڤێجَه اَگَرْ وَانْ تُوبَه کِرْ، بِرَنْگِیێ پێدِڤِی نِمێژْ کِرْ و زَکَاتَا مَالِیێ خَوه دَانْ اِێدِی رِیَا وَانْ ڤَکِنْ. بێگُمَانْ خُدێ گُنَهْڤَشێرَه، دِلُوڤَانَه.

٦. اَگَرْ یَکی ژِ مُشْرِکَانْ خَوه ئَاڤێتَه بَخْتێ تَه (اَوْلَهی ژِ تَه خَوسْتْ)، ڤێجَه اَوْلَهیێ بِدێ دَا کُو گُوتِنَا خُدێ بِبِهیزَه، پِشْتْرَه وِی بِگَهینَه اَوْلَگَهَا (وَلَاتێ) وِی. اَڤْ (اَوْلَه دَاینْ) ژِ بَرْ کُو اَوْ مِلَّتَکی نَزَانِنْ.

٧. اَرێ مَا چَاوَا ژِ بُو مُشْرِکَانْ لِجَمْ خُدێ و پێخَمْبَرێ وِی دێ پێمَانْ هَبَه؟ ژِ بِلِی یێنْ کُو لِجَمْ مِزْگَفْتَا حَرَامێ وَه پێمَانْ دَایَه وَانْ (اَوْ جُدَا نَه)، ڤێجَه حَتَا اَوْ دَرْحَقێ وَه دَه رَاسْتْ بِنْ، هُونْ ژِی ژِ وَانْ رَه رَاسْتْ بِنْ. بێگُمَانْ خُدێ ژِ یێنْ کُو سُوزَا خَوه دِپَارێزِنْ حَزْ دِکَه.[1]

٨. اَرێ (مَا چَاوَا دێ ژِ بُو وَانْ لِجَمْ خُدێ پێمَانْ هَبَه)، اَگَرْ اَوْ بِسَرْ وَه بِکَڤِنْ، اَقْرَبَاتی و پێمَانێ بَرْچَاڤْ نَاگِرِنْ. اَوْ بِدَڤێ خَوه وَه رَازِی دِکِنْ و دِلێ وَانْ وَه نَاخَوازَه. بێگُمَانْ پِرێنْ وَانْ فَاسِقِنْ.

٩. وانْ، ئَایَتێنْ خُدێ بِبِهَایَکی هِنْدِكْ فِرُوتِنْ، ڤێجَه وَانْ رِیَا خُدێ لِبَرْ خَلْکێ گِرْتْ. بێگُمَانْ یَا کُو اَوْ دِکِنْ چِقَاسْ پِیسَه.

١٠. اَوْ، دَرْ بَارێ تُو مُسِلْمَانَکی دَه اَقرَبَاتِی و پێمَانێ بَرْچَاڤْ نَاگِرِنْ و هَا اَوِنْ یێنْ ژِ حَدێ خَوه دَرْ و اَوِنْ یێنْ تَعْدَائِییێ دِکِنْ.

١١. (دِگَلْ ڤێ ژِی) اَگَرْ اَوْ تُوبَه بِکِنْ و بِرَنْگِیێ پێدِڤِی نِمێژْ بِکِنْ و زِکَاتَا مَالِیێ خَوه بِدِنْ،

---

١ ژِ بُو مُشْرِکَانْ لِجَمْ خُدێ و پێخَمْبَرێ وِی دێ چَاوَا پێمَانْ چێببَه؟ ڤێ وَانْ پێدِڤێینْ پێمَانێ ئَانِینَه جهْ؟ ڤێ وَانْ دَسْتێ خَوه ژِ اِیشَانْدِنَا پێخَمْبَرْ و بَاوَرْمَنْدَانْ ڤَکِشَانْدِنَه؟ ڤێ وَانْ دَڤْ ژِ فَسَادِییێ بَرْدَانَه؟ نَا. نَاخَوه؛ وَانْ حَقْ کِرِیَه کُو خُدێ خَوه ژِ وَانْ دُورْ بِکَه و حَقَه کُو ژِ بُو وَانْ لِجَمْ خُدێ و پێخَمْبَرێ وِی تُو پێمَانْ نَبَه. دِ ئَایَتَا پیرُوزْ دَه اَوێنْ کُو حُکْمێ وَانْ ژِ یێ مُشْرِکَانْ هَاتِیَه جُدَا کِرِنْ، بَنِی خُزِیمَه و مُدْلِجِنْ کُو اَوْ ژِی کِتِنَه بَرْ پێمَانَا حُدَیْبِییێ.

ڤێجه اَوْ دِ دینْ دَه بِرَایێنْ وَه نَه و اَمْ بِئَاوَایَکی ڤَکِری ئَایَتێنْ خوه ژِ بُوْ مِلَّتَکی کُو دِزَانِنْ اَشْکَرَا دِکِنْ.

١٢. اَگَرْ پشْتی پَیْمَانْدَانِنَا خوه وَانْ صُوْنْدَا خوه شِکَانْدْ و دَرْبَارێ دینێ وَه دَه زِمَانْدِرێژی کِرْ، هِنْگێ بِپێشَنْگ و سَرُوْکێنْ کُفْرێ رَه تِبِکُوْشِنْ. بێگُمَانْ ژِ وَانْ رَه صُوْنْدْ و پَیْمَانْ نینَه، (بِوَانْ رَه تێ بِکُوْشِنْ) دَا کُو دَڤْ ژِ کُفرْ و دِژْمِنَاهِیێ بَرْدِنْ.

١٣. (گَلی مُسِلْمَانَانْ!) مَا هُونێ شَرێ قَوْمَکی نَکِنْ کُو وَانْ پَیْمَانَا خوه شِکَانْدْ و هَوْلْ دَانْ کُو پێخَمْبَرْ (ژِ وَارێ وی) دَرْخِنْ و دِ سَرێ پێشینْ دَه ژی وَانْ دَسْتْ بِشَرێ وَه کِرِبُو؟ مَا هُونْ ژِ وَانْ دِطِرْسِنْ؟ اَگَرْ بِرَاسْتی هُونْ بَاوَرْمَنْدِنْ، خُدێ هێژَاتِرَه کُو هُونْ ژێ بِطِرْسِنْ.

١٤. شَرێ وَانْ بِکِنْ، خُدێ بِدَسْتێنْ وَه دێ وَانْ بِدَه عَذَابْدَانْ و وَانْ رِسْوَا بِکَه، لِسَرْ وَانْ وَه سَرْکَفْتی بِکَه و دێ دِلێ جِڤَاتَا بَاوَرْمَنْدْ شَادْ بِکَه.

١٥. دێ ژِ دِلێنْ وَانْ (بَاوَرْمَنْدَانْ) کینێ بِبَه و خُدێ کِێ بِڤێ تُوْبَیَا وی قَبُولْ دِکَه. خُدێ زَانَا و کَارْبِنَجِهَه.[١]

١٦. اَرێ مَا هُونْ بَاوَرْ دِکِنْ کُو دێ دَڤْ ژِ وَه بێ بَرْدَانْ (و هُونْ نِیێنْ جِربَانْدِنْ). حَیَانی خُدێ (بِزَانینَکَه بَرْچَاڤْ) نِزَانِبَه کَا کی ژِ وَه جِهَادْ کِرِیَه و کَا کی ژِ وَه ژِ بِلی خُدێ، پێخَمْبَرێ وی و مُسِلْمَانَانْ تُو کَسْ ژِ خوه رَه نَکِرِبَه دُوْسْتْ و ئَارِیکَارْ؟ خُدێ ژِ یَا کُو هُونْ دِکِنْ تَقَزْ ئَاگَاهْدَارَه.

١٧. ژِ مُشْرِکَانْ رَه نَابَه کُو اَوْ مِزْگَفتێنْ خُدێ ئَاڤَا بِکِنْ دِگَلْ کُو اَوْ بِخوه ژی شَاهْدَهِیَا

١ اَوْ خَلْکێنْ کُو ژِ دُوْرْهِێلا وَلاتێنْ نێزیكْ دِهَاتِنْ مَدینێ، بَاوَری تَانینْ و ڤَدگَرِیَانْ وَلاتێنْ خوه ژِ هَڤْوَلاتیێنْ خوه ظُلِمْ و نَحَقی دِدیتِنْ، لِهَمْبَرێ وَانْ دِلێنْ وَانْ تِژی کینْ و نَفرَتْ بُوبُو. ڤێجه اَڤْ ئَایَتَا پیرُوْزْ وَانْ بَاوَرْمَنْدێنْ سِتَمْبَارْ دَسْتْنیشَانْ دِکَه. دِگَلْ ڤێ ژی ئَایَتْ دِدَه زَانینْ؛ اَگَرْ اَوْ ظَالِمْ تُوْبَه بِکِنْ و بَاوَری بینِنْ، خُدێ یێ تُوْبَیَا وَانْ ژی قَبُولْ بِکَه. لَوْرَا خُدێ گُنَهْڤَشێرْ و دِلُوْڤَانَه.

بِكُفرِێ لِسَرْ خَوه دِدِنْ. اَڤِێنْ هَا كَارْ و كِرِيَارِێنْ وَانْ پُوچْ بُونَه و هَرْ اَوِێ دِ اِێگِرْ دَه بِمِينِنْ.

**١٨.** بێگُمَانْ يِێ كُو مِزْگَفتِێنْ خُدِێ ئَاڤَا دِكَه بَسْ اَوِێ كُو بِخُدِێ و رُوْژَا ئَاخْرَتِێ بَاوَرِی ئَانِيَه و بِرَنْگِێ پێدِڤِی نِمێژْ دِكَه و زَكَاتَا مَالِێ خَوه دِدَه و ژِ خُدِێ پێشْتِرْ ژِ تُو كَسِی دِنْ نَاطِرْسَه. ڤێجَه هِێڤِی هَيَه كُو اَوْ بِبِنْ ژِ يِێنْ لِسَرْ رِيَا رَاسْتْ.

**١٩.** مَا هُونْ (كَارِێ) ئَاڤْدَايِينَا حَجِيَانْ و ئَاڤَاكِرِنَا بِيْتُ اللَّهِێ (دِگَلْ كُو اَوْ مُشْرِكِنْ) مِينَا (كَارِێ) وِی كَسِێ كُو بِخُدِێ و رُوْژَا ئَاخْرَتِێ بَاوَرِی ئَانِيَه و دِ رِيَا خُدِێ دَه جِهَادْ كِرِيَه وَكْهَڤْ دِگِرِنْ؟ (اَڤْ) لِجَمْ خُدِێ نَه وَكْهَڤِنْ. خُدِێ قَوْمِێ ظَالِمْ لِسَرْ رِيَا رَاسْتْ رَاسْتَرِێ نَاكَه.

**٢٠.** اَوِێنْ كُو بَاوَرِی ئَانِينَه، هِجرَتْ كِرِنَه و دِ رِيَا خُدِێ دَه بِمَالِێ خَوه و جَانِێ خَوه جِهَادْ كِرِنَه لِجَمْ خُدِێ مَرتَبَيَا وَانْ مَزِنْتِرَه. هَا اَوْ يِێنْ كُو (بِگِهِشْتِنَا آرْمَانْجَا خَوه) بِسَرْكَتِنَه.

**٢١.** خُدَايِێ وَانْ، بِدِلْوُڤَانِيكَه ژِ جَمْ خَوه، بِرَاظِيبُونَكِێ و بِبِهِشْتِێنْ كُو دِ وَانْ دَه ژِ بُوّ وَانْ نِعْمَتِێنْ سَرَاڤَتِی هَنَه، مِزْگِينِيِێ دِدَه وَانْ.

**٢٢.** اَوِێ هَرْ و هَرْ دِ وَانْ (بِهِشْتَانْ) دَه بِمِينِنْ. بێگُمَانْ لِجَمْ خُدِێ (ژِ بُوّ وَانْ) خَلاتَكَه مَزِنْ هَيَه.

**٢٣.** هَیْ گَلِی يِێنْ كُو بَاوَرِی ئَانِينَه! بَاڤِێنْ وَه و بِرَايِێنْ وَه، اَگَرْ اَوْ كُفْرِێ دِ سَرْ اِيمَانِێ رَه بِگِرِنْ، ژِ خَوه رَه نَكِنْ دُوْسْتُ و ئَارِيكَارْ. اِێدِی چِه كَسِێ وَانْ ژِ خَوه رَه بِكَه دُوْسْتُ و ئَارِيكَارْ، ڤێجَه هَا اَوْ سِتَامْكَارْ بِخَوه نَه.[1]

---

١ خُدِێ دِ ڤِێ ئَايَتِێ دَه نَهْيَا مَه ژِ دُوْسْتَئَانِی و پِشْتُگَرْمْكِرنَا بِكَافِرَانْ كِرِيَه، چَنْدِی كُو نێزِيكْ و لێزِمْ بِنْ ژِی. ژِ سُورَه‌يِێ مُجَادَلَه ئَايَتَا ٢٢ێ ڤِێ رَوْشِێ بێهْتِرْ زَلَالْ دِكَه؛ «تُو دِێ جِڤَاتَكَه كُو بَاوَرِی بِخُدِێ و رُوژَا ئَاخِرَتِێ ئَانِيبَه نَبِينِی كُو اَوْ ژِ وَانْ كَسِێنْ كُو نَيَارتِيَا خُدِێ و پێخَمْبَرِێ وِی دِكِنْ حَزْ بِكِنْ، چَنْدِی اَوْ بَاڤِێنْ وَانْ، كُرِێنْ وَانْ، بِرَايِێنْ وَانْ، انْ عَشِيرَا وَانْ بِنْ ژِی..»

**٢٤.** (رَسُولِێ مِنْ!) بِبێژَه: اَگَرْ بَاڤِێنْ وَه، كُرِێنْ وَه، بِرَايێنْ وَه، ژِنێنْ وَه، عَشيرَا وَه، مَالِێ كُو وَه بِدَسْتْ خِسْتِيَه، تِجَارَتَا كُو هُونْ ژِ بِێ بَازَرَارِيَا وِێ دِطِرْسِنْ و خَانِيێنْ كُو هُونْ ژِ وَانْ حَزْدِكِنْ، لِجَمْ وَه، ژِ خُدِێ، ژِ پێخَمْبَرِێ وِی و ژِ جِهَادَا دِ رِيَا وِی دَه شِيرِينتِرْ و خَوشْتِرْ بِنْ، ڤێجَه چَاڤْلِرِێ بِنْ حَتَا خُدِێ فَرْمَانَا خَوه (بِعَذَابِێ ژِ وَه رَه) بِينَه. خُدِێ تَقَزْ قَوْمِێ ژِرِێدَرْكَتِی نَايِێنَه سَرْ رِيَا رَاسْتْ.[1]

**٢٥.** صُۆنْدْ بَه، خُدِێ دِ گَلَكْ جِهَانْ دَه ئَارِيكَارِيَا وَه كِرْ. رُۆژَا حُنَيْنِێ ژِی (ئَارِيكَارِيَا وَه كِرْ)؛ وِێ دَمَا پِرَانِيَا وَه هُونْ گَرْمْ (قُرَه) كِرِنْ، ڤێجَه پِرَانِيَا وَه تُو فَيْدَه نَگِهَانْدَه وَه و تُو تِشْتْ ژِ وَه نَدَا پَاشْ. عَرِدْ دِگَلْ فِرَهِيَا خَوه ژِی لِوَه تَنْگ بُو و پَاشِێ وَه پِشْتَا خَوه دَا شَرْ و هُونْ رَڤِيَانْ.

**٢٦.** پِشْتِی رَڤَا وَه، خُدِێ ئَارَامِی و دِلْخُوشِيَا خَوه بِسَرْ پێخَمْبَرْ و بَاوَرْمَنْدَانْ دَه ئَانی و لَشْكَرَكِی كُو ژِ وَه ڤَه نَخُيَا (ژِ بُۆ ئَارِيكَارِيَا وَه) هِنَارْتْ و اَوِێنْ كَافِرْ بُونَه جَزَا كِرِنْ. هَا اَڤَه جَزَايِێ كَافِرَانْ.

**٢٧.** پَاشِێ خُدِێ، تُۆبَيَا كَسِێ كُو اَوْ بِڤِێ قَبُولْ دِكَه و خُدِێ گُنَهْژِێبِرَه، دِلْۆڤَانَه.

**٢٨.** هَێ گَلِی يِێنْ كُو بَاوَرِی ئَانِينَه! بێگُمَانْ هَرْچِی كُو مُشْرِكِنْ بَسْ اَوْ پِيسِنْ، ڤێجَه پِشْتِی ڤِێ سَالِێ (سَالا نَهِێ هِجْرَتِێ) بِلا نێزِی بَيْتُ اللهِ (مِزْگَفتَا حَرَمِێ) نَبِنْ. اَگَرْ هُونْ (ژِ نَهَاتِنَا وَانْ ژِ بُۆ حَجِێ) ژِ خِزَانِيِێ بِطِرْسِنْ، ڤێجَه اَگَرْ خُدِێ بِڤِێ ژِ كَرَمَا خَوه دِێ وَه دَوْلَمَنْدْ بِكَه. بێگُمَانْ خُدِێ عَلِيمَه، حَكِيمَه.

**٢٩.** (گَلِی بَاوَرْمَنْدَانْ!) ژِ جِهُو و فِلَهَانْ اَوِێنْ كُو بِخُدِێ و رُۆژَا قِيَامَتِێ بَاوَرِی نَايِنِنْ

---

١ رَسُولِێ اَكرَمْ، پِشْتِی فَتْحَا مَكِّێ بِدُوازْدَهْ هَزَارْ (١٢,٠٠٠) لَشْكَرِێنْ خَوه ڤَه بَرِێ خَوه دَا تَائِفِێ و چُو شَرِێ . هَوَازِنْ و سَقَفِيَانْ. هِنْ مُسَلْمَانَانْ لِپِرَانِيَا لَشْكَرِێنْ اِسْلَامِێ نێرِينْ و گُوتِنْ:»اِيدِی تُو كَسْ نِكَارَه ڤِی لَشْكَرِی بِشْكِينَه«. لِێبَلِێ چه دَمَا لَنوَالَا حُنَيْنِێ اَوْ و لَشْكَرِێنْ مُشْرِكَانْ، يِێنْ كُو بِهَژْمَارَا خَوه گَلَكی ژِ وَانْ هِنَدْكْتِرْ بُونْ هَاتِنْ هَمْبَرِێ هَڤْ. مُسِلْمَانْ دِگَلْ پِرَانِيَا وَانْ تێكچُونْ و بَزِيِيَانْ. لَوْرَا وَانْ ئَارِيكَارِيَا خُدِێ ژِبِيرْ كِر و بِپِرَانِيَا خَوه پَسِنِينْ.

و تِشْتێ کُو خُدێ و پێخَمْبَرێ وی حَرَامْ کِرِیَه حَرَامْ نَادێرِنْ و دِینێ حَقْ (دِینێ اِسْلاَمێ) ژِ خوه رَه نَاکِنْ دِینْ، حَتَا کُو اَوْ بِدَسْتێ خوه، نَه دَیْکری جِزْیَا خوه نَدِنْ، شَرێ وَانْ بِکِنْ.

**٣٠.** جهُویَانْ گُوْتْ: عُزَیرْ کُرێ خُدێ یَه! فِلَهَانْ ژی گُوْتْ: مَسیحْ کُرێ خُدێ یَه! اَڤْ گُوْتِنْ یَا دَڤێنْ وَانْه، گُوْتِنَا خوه دِشِبِینِنْ گُوْتِنَا وَانْ کَافِرێنْ بَرێ. خُدێ وَانْ بِکُژَه (لَعْنَتَا خُدێ لِوانْ بَه)، چَاوَا بَرێ خوه ژِ حَقِیێ ڤِدگَرِینِنْ بَالْ پُوچِیێ ڤَه!

**٣١.** وانْ (جِهُو و فِلَهَانْ) ژِ بلی خُدێ، خَاخَامْ و رَاهِبێنْ (زَانَا و عَابِدێنْ) خوه و عِیسَایێ کُرێ مَرْیَمێ ژِ بُوْ خوه اِلٰهْ گِرْتِنْ. حَالْ اَڤَه کُو اَوْ هَرْ هَاتِنَه فَرْمَانْکِرِنْ کُو یَكْ خُدَایی بِحَبِینِنْ کُو ژِ وی پێ ڤَه تُو اِلٰهْ نِینِنْ و اَوْ ژِ یَا کُو ژێ رَه دِکِنْ هَمْکُوفْ پَاكْ و دُورَه.[1]

**٣٢.** اَوْ دِخَوازِنْ نُورَا خُدێ (کُو قُرْئَانَـه) بِدَڤێنْ خوه ڤَمرِینِنْ. خُدێ نَاهِێلِێ (اَوْ ڤَمرِینِنْ)؛ اَوِێ هَرْ نُورَا خوه تَمَامْ بِکَه (و بِسَرْکَڤَه)، چَنْدی کَافِرْ ڤێ نَخَوازِنْ ژی.

**٣٣.** اَوَه یێ کُو پێخَمْبَرێ خوه بِرِیَا رَاسْتْ و دِینێ حَقْ شَانْدِیَه، دَا کُو وی لِسَرْ هَمُو دِینَانْ بِلِنْدْتِرْ بِکَه، هَرْ چِقَاسْ مُشْرِكْ نَخَوازِنْ ژی.

**٣٤.** هَیْ گَلی یێنْ کُو بَاوَری ئَانِینَه! بێگُمَانْ گَلَكْ ژِ رَاهِبْ و اَحْبَارَانْ مَالێنْ خَلْکێ

---

١ وانْ جِهُو و فِلَهَانْ ژِ بلی خُدێ رَاهِبْ و اَحْبَارْ (زَانَا و عَابِد)ێنْ خوه ژِ خوه رَه کِرِنْ اِلٰهْ؟! اَرێ مَا ڤَانْ ژِ وَانْ رَه گُوْتْ هُونْ اَلاَهێنْ مَه نَه؟ نَا، وِصَا نَگُوْتِنْ. لِێبَلِێ مُعَامَلَتَا وَانْ مِینَا مُعَامَلَتَا عَابِدَانْ بِرَبِّێ وَانْ رَه یَه. لَوْرَا؛ یێ کُو حَلاَلْ و حَرَامْ دِکَه خُدێ یَه. یێ کُو ژِ عَبْدێ خوه رَه دبێژَه»بکَه و نَکَه»خُدێ یَه. ڤێجَه تُو بِنێرَه؛ دَمَا یَكْ ژِ ڤَانْ رَاهِبَانْ یَانْ اَحْبَارَانْ تِشْتَکی حَلاَلْ بِکِنْ کُو خُدێ اَوْ حَرَامْ کِرِیَه یَانْ تِشْتَکی حَرَامْ بِکِنْ کُو خُدێ اَوْ حَلاَلْ کِری، وێ دَمێ؛ اَوْ وَسفِێ اَلاَهْتِیێ وَرْدِگرِنْ. چِمْکی حَلاَلْکِرِنْ و حَرَامْکِرِنْ کَارێ خُدێ یَه. ژِ بَرْ ڤێ یَکێ بُو؛ دَمَا عَدِی کُرێ حَاتِمْ کُو اَوْ فِلَهْ بُو هَاتَه جَمْ پێخَمْبَرْ (س)، پێخَمْبَرْ ژێ رَه گُوْتْ: هُونْ زَانَا و عَابِدێنْ خوه ژِ خوه رَه دِکِنْ اِلٰهْ . عَدِی گُوْتْ: اَمْ ژِ وَانْ رَه عِبَادَتْ نَاکِنْ. پێخَمْبَرْ گُوْتْ: مَا هُونْ بِگُوْتِنَا وَانْ نَاکِنْ دَمَا اَوْ تِشْتَکی حَلاَلْ یَانْ ژی حَرَامْ بِکِنْ. گُوْتْ: بَلِێ. پێخَمْبَرْ گُوْتْ: هَا اَوْ عِبَادَتَه.

بِستَمْكَارِى دِخُونْ، رِيَا خُدِىٚ لِبَرْ خَلْكِىٚ دِگِرِنْ. اَوِيٚنْ كُو زِيٚرْ و زِيڤْ كُوْمْ دِكِنْ و دِ رِيَا خُدِىٚ دَه خَرْجْ نَاكِنْ، ڤِيٚجه مِزْگِينِيَا عَذَابَكى دِژْوَارْ بِدَه وَانْ![1]

**٣٥.** رُوٚژَا كُو (دِرَاڤِيٚنْ وَانْ) دِ ئَاگِرِىٚ دُوٚژَهِىٚ دَه تِيٚنَه سُوٚرْكِرِنْ و اَنِيَا وَانْ، طَنِشْتِيٚنْ وَانْ و پِشْتَا وَانْ بِوَانْ تِيٚنَه دَاخْكِرِنْ (و ژِ وَانْ رَه تِىٚ گُوٚتِنْ): هَا اَڤْ، اَوْ سَرْوَتَه كُو وَه ژِ بُوٚ خَوه دَابُو هَڤْ. اِيدِى جَزَايِىٚ يَا كُو وَه اَوْ دَابُو هَڤْ طَعْمْ بِكِنْ!

**٣٦.** بِيٚگُمَانْ ژِ رُوٚژَا كُو خُدِىٚ عَرْدْ و ئَاسِمَانْ چِيٚكِرِنْ، لِجَمْ خُدِىٚ هَژْمَارَا مَهَانْ دِ كِتِيبَا خُدِىٚ دَه دُوٚزْدَهِنْ. ژِ وَانْ مَهَانْ چَارْ ژِىٚ بِرُومَتِنْ (ذِى القَعْدَه، ذِى الحِجَّه، مُحَرَّمْ و رَجَبِنْ كُو دِ وَانْ دَه شَرْ و كُشْتِنْ حَرَامَه). هَا اَڤْ، دِينِىٚ رَاسْتْ و دُرِسْتَه. دِ وَانْ مَهَانْ دَه ظُلْمِىٚ لِخَوه نَكِنْ. (گَلِى مُسِلْمَانَانْ!) چَاوَا كُو مُشْرِكْ هَمُو بِهَڤْ رَه شَرِىٚ وَه دِكِنْ، هُونْ ژِى وِسَا هَمُو بِهَڤْ رَه شَرِىٚ وَانْ بِكِنْ و بِزَانِنْ كُو خُدِىٚ بِمُتَّقِيَانْ رَه يَه.

**٣٧.** بِيٚگُمَانْ پَاشْدَخِسْتِنْ (ئَا مَهِيٚنْ بِرُومَتْ) زِيٚدَچُونَا دِ كُفْرِىٚ دَه يَه. اَوِيٚنْ كُو كَافِرْ بُونَه پِىٚ گُمْرَاه دِبِنْ. سَالَكِىٚ حَلالْ دِكِنْ و سَالاَ دِنْ ژِى حَرَامْ دِكِنْ دَا كُو هَژْمَارَا وَانْ بِبَه هَڤْدَنْگِيىٚ هَژْمَارَا (مَهِيٚنْ) كُو خُدِىٚ اَوْ حَرَامْ كِرِنْ. ڤِيٚجه اَوْ بِڤِىٚ كِرِيَارَا خَوه حَرَامِىٚ خُدِىٚ حَلَالْ دِكِنْ. كَارِيٚنْ وَانْ اِيٚنْ خَرَابْ ژِ وَانْ رَه هَاتِنَه خَمِلانْدِنْ. خُدِىٚ تَڤْزْ جِڤَاتَا كَافِرَانْ بِسَرْ رِيَا رَاسْتْ ڤَه نَاكَه.[2]

---

١ هَاهَامِيٚنْ جِهُويَانْ و كَشِيشِيٚنْ فِلَهَانْ، ئَايَتِيٚنْ پِيرُوٚزْ يِيٚنْ كُو دِ كِتِيبِيٚنْ وَانْ دَه، لِگُوٚرى دَاخوازَا حُكمْدَارْ و مَالْدَارَانْ دِگُهَارْتِنْ و بِڤِىٚ گُهَارْتِنِىٚ ژِ خَوه رَه مَالِىٚ دِنْيَايِىٚ دِستَانْدِنْ. گَلَكْ جَارَانْ حُكْمِيٚنْ وَانْ لِگُوٚرى بَرژَوَنْدِيِيٚنْ خَوه شِيرُوٚڤَه دِكِرِنْ. بِتَايْبَتِى ژِى ئَايَتِيٚنْ كُو دِ بَارَا پِيٚخَمْبَرِيَا مُحَمَّدْ (سْ) دَه بُونْ دِگُهَرْتِنْ. ڤِيٚجه اَڤْ ئَايَتَا كُو لِژُوٚرْ بُهُورى ڤِىٚ رَوْشِىٚ دِيَارْ دِكَه و ڤِى كَارِىٚ نَرَوَا ژِ بُوٚ مَه دِكَه مِينَاكْ. لَوْرَا دِ نَاڤْ مُسِلْمَانَانْ دَه ژِى گَلَكْ اِنْسَانْ لِسَرْ نَاڤِىٚ عَالِمْتِيىٚ فَتْوِيىٚ شَاشْ و خَلَتْ دِدِنْ دَا كُو بِكَڤِنْ چَاڤِىٚ زِلامِىٚ دَوْلَتِىٚ و ژِ خَوه رَه پِىٚ قِيمَتكى هِنْدِكْ قَزَنجْ بِكِنْ.

٢ چه دَمَا رَسُولِىٚ خُدِىٚ ژِ غَزْوَا طَايِفْ و حُنَيْنِىٚ ڤَگَرِيَا، پِيٚحَسِيَا كُو «إمْپَرَتُوٚرِيَا بِيزَانْسِىٚ ٤٠هَزَارْ لَشْكَرْ ئَامَادَه كِرِيَه دَا كُو وَرَه شَرِىٚ مُسِلْمَانَانْ بِكَه و وَانْ ژِ نَاڤِىٚ بِبَه. اَڤْ بُويَرْ دِ سَالاَ نَهَمْ يَا هِجرَتِىٚ دَه رُودَابُو. ڤِيٚجه پِيٚخَمْبَرْ (سْ) ژِى لِهَمْبَرِىٚ بِيزَانْسِىٚ جِهَادْ اِعْلانْ كِرْ كُو دِ دَمَكَه كُو تَنْگزَارى پِرْ بُو، لِوَلِيٚتْ دِلْ ئَاخِيٚڤِى بُو، گَرْمِى پِرْ دِژْوَارْ بُو و دِ چَاخِىٚ خُرْمَكِهَاشْتِنِىٚ دَه بُو. ڤِيٚجه لِسَرْ خَلْكِىٚ زُوٚرْ و گِرَانْ هَاتْ كُو بِچِنْ شَرِىٚ

**٣٨.** گَلی یێنْ کُو بَاوَری ئَانینَە! مَا چە لِوَە قَومیبُو؛ دَمَا ژ وَە رَە هَاتَە گُوْتِنْ: هُونْ هَمُو دِ رِیَا خُدێ دە دَرْکَڤِنْ جِهَادێ. وَە خوە بَرْدَا عَرْدێ (و هُونْ دَرْنَکَتِنْ جِهَادێ). ارێ مَا وَە ژِیَانَا ئَاخْرَتێ بِژِیَانَا دِنْیَایێ دَا. ڤێجَە (بِزَانِنْ) خَوشِیَا ژِیَانَا دِنْیَایێ لِبَرْ یَا ئَاخْرَتێ کێمْ و بێقیمَتَە.

**٣٩.** اَگَرْ هُونْ پێکْ ڤَە دَرْنَکَڤِنْ جِهَادێ، خُدێ دێ بعَزَابَکی دِژْوَارْ وَە بدَە عَذَابْدَانْ و وێ قَوْمَکی دِنْ تێخَە شُونَا وَە و هُونێ نِکَارِبنْ تُو زِیَانێ ژی بِدِنْ خُدێ. خُدَا لِسَرْ هَرْ تِشْتی تَقَزْ کَارَا یَە.

**٤٠.** اَگَرْ هُونْ ئَاریکَاریَا پێخَمْبَرْ نَکِنْ، ڤێجَە بِرَاسْتی خُدێ ئَاریکَاریَا وی کِریَە. وێ دَمَا کَافِرَانْ اَوْ (ژ مَکّێ) دَرْخِسْتِنْ کُو اَوْ یَکْ ژ دِدُیَانْ بُو (اَوْ و اَبُوبَکِرْ بهَڤْ رَە بُونْ). وێ دَمَا اَوْ هَرْ دُو دِ شَکَفْتێ دَە بُونْ، ژ هَڤَالێ خوە رَە گُوْتْ: غَمْگینْ مَبَە، بێگُمَانْ خُدێ بمَە رَە یَە. اێدی خُدێ ئَارَامِیَا خوە بسَرْ دَە ئَانی و پِشْتَڤَانِیَا وی بلَشْکَرَکی کِرْ کُو وَە اَوْ نَە دِدیتِنْ. (خُدێ) دَاخَوَازَا کَافِرَانْ بِبِنْ خِسْتْ و دَاخَوازَا خُدێ یَا هَری بِلِنْدَە. خُدێ بِرَاسْتی ژی عَزیزَە، حَکیمَە.

**٤١.** (گَلی مُسلِمَانَانْ!) بِبَارْسِڤِکی و بَارْگِرَانی ڤَە دَرْکَڤِنْ جَنْگێ، بمَالێ خوە و بجَانێ خوە دِ رِیَا خُدێ دَە جِهَادێ بِکِنْ، اَگَرْ بِرَاسْتی هُونْ دِزَانِنْ هَا اَڤْ ژِ بُوْ وَە چێترَە.[1]

---

رُوْمێ. وانْ دِخوسْتْ لِبَرْ سِهێ بێهْنَا خوە بَرْدِنْ، لِنَاڤَا جهْ و مَالێ خوە بمینِنْ و ژ وَانْ رَە پِرْ زُوْرْ هَاتْ کُو دَرْکَڤِنْ جَنْگێ. دِ ڤێ نَاڤێ دَە مُنَافِق ژی لِدژێ پێخَمْبَرْ ئَاخِڤینْ و لِنَاڤ خَلْکێ بَلاڤ کِرِنْ کُو اِعْلانَا شَرْ لِهَمْبَری بیزَانْسێ انْتِحَارَە. ژ لُوْمَا هِنْ مُسلِمَانْ بِڤێ ئَاخَافْتِنَا مُنَافِقَانْ خَاپِیَانْ و نَخوسْتِنْ بَشْدَاری جِهَادێ بِبِنْ. لێبَلێ بحَولْدَانَا پێخَمْبَرْ و هَڤَالێنْ وی ٣٠هَزَارْ لَشْکَرْ هَاتَە ئَامَادَە کِرِنْ و هَاتِنْ حَتَا تَبُوکێ. ڤێجَە چە دَمَا بیزَانْسیَانْ بِهیسْتِنْ کُو وا یَە مُسلِمَانْ هَاتِنَە شَرێ وَانْ دِ جهْ دَە بِپَاشْ ڤَە ڤَگَرِیَانْ. ڤێجَە ژ ڤێ و پێدَە، اَڤْ ئَایَتێنْ کُو تێنْ دِ ڤێ سَفَرێ دَە دِ بَارَا رَوْشْ و هَلْوَسْتَا مُسلِمَانْ و مُنَافِقَانْ دَە نَازِلْ بُونَە.

١ دِ ئَایَتَا پیرُوْزْ دَە مَبَسْتْ ژ «بِبَارْسِڤِکْ و بَارْگِرَانی ڤَە»اَڤَە: شَرْتێنْ شَرْ چە دِبِنْ بِلَا بِبِنْ، چە شَرْ رَحَتْ بَە چە زُوْرْ بَە، چە هُونْ سُوَارْ بِنْ چە هُونْ پِیَا بِنْ، چە هُونْ خُرْتْ و چە لاوازْ بِنْ، چە هُونْ کَالْ بِنْ چە هُونْ جُوانْ بِنْ دَرْکَڤِنْ شَرێ کَافِرَانْ، دَا کُو بِڤی ئَاوَایی هُونْ سَرْبَسْتِیَا خوە بِسْتینِنْ و بِرَوْشَکی ئَازَادْ عِبَادَتێ رَبّێ خوە بِکِنْ.

٤٢. (رَسُولێ مِنْ!) اَگَرْ (گَازِیَا تَه نَه ژِ بُوْ جَنْگێ بُویَا، لێ) ژِ بُوْ بِدَسْتْخِسْتِنَکَه هێسَانْ ئَانْ ژِی سَفَرَکَه نَاڤِنْجْ (نَه کُرتْ و دِرێژْ) بُویَا، بێگُمَانْ دێ وَانْ بِدَانَا دُوڤْ تَه. لێبَلێ رِیَا زَحْمَتْ ژِ وَانْ رَه دُورْ هَاتْ و لَاشْگِرَانْ بُونْ. اَوێ بنَاڤێ خُدێ صُوْنْدْ بخُونْ؛ اَگَرْ مَه کَارِیبُویَا تَڤَزْ اَمێ ژِی دِگَلْ وَه دَرْکَتِبُونَا. اَوْ (بِسُوْندێنْ دَرَوْ) خَوه دِبِنْ هَلاکێ. خُدێ تَڤَزْ دِزَانَه کُو اَوْ بێگُمَانْ دَرَوْکَارِنْ.[١]

٤٣. خُدێ تَه بِبَخْشِینَه، حَیَانِی یێنْ رَاسْتْبێژْ ژِ تَه رَه دِیَارْ نَبِنْ و یێنْ دَرَوْکَرْ ژِی تُو نَاسْ نَکِی، اَرێ مَا ژِ بُوْ چِه تَه دَسْتُورَا وَانْ دَا؟

٤٤. اَوێنْ کُو بِخُدێ و رُوْژَا ئَاخْرَتێ بَاوَرِی تِینِنْ، نَه اَونْ کُو دَسْتُورێ ژِ تَه بِخَوازِنْ دَا کُو خَوه ژِ جِهَادَا بِمَالْ و جَانْ دِ رِیَا خُدێ دَه خَوه بِپَاشْ دَه بِهێلِنْ. خُدێ ژِی تَڤَزْ بِیێنْ تَڤْوَادَارْ دِزَانَه.

٤٥. لێبَلێ، اَوێنْ کُو بِخُدێ و رُوْژَا ئَاخْرَتێ بَاوَرِی نَایینِنْ و دَرْ بَارێ دِینْ دَه دِلێنْ وَانْ کَتِیَه گُمَانێ و هَرْ اَوْ دِ نَاڤْ گُمَانَانْ دَه بِسَرْگێژَانَه دِچِنْ و تێنْ، ژِ تَه دَسْتُورێ دِخَوازِنْ (دَا کُو نَچِنَه شَرْ).

٤٦. اَگَرْ وَانْ بِڤِیَا بِوَه رَه دَرْکَڤِنْ شَرْ، تَڤَزْ ژِ بُوْ ڤێ ئَامَادَاهِیَکْ دێ بِکِرِنَا. لێبَلێ خُدێ دَرْکَتِنَا وَانْ بِوَه رَه نَخَوسْتْ، ڤێجَه لِبَرْ وَانْ گِرَانْ کِرْ و (ژِ وَانْ رَه) هَاتَه گُوْتِنْ: هُونْ ژِی دِگَلْ اێنْ رُونِشْتِی رُونِنْ!

٤٧. اَگَرْ اَوْ دِگَلْ وَه دَرْکَتِبُونَا ژِ زَرَارَا وَه پێڤَه تِشْتَکْ لِوَه زێدَه نَدِکِرِنْ و دِ نَاڤْبَرَا وَه دَه بِمَبَسْتَا فِتْنێ دێ ژِ وَه بِڤَتِیَانَا و دِ نَاڤْ وَه دَه ژِی یێنْ کُو گُهْ دِدِنْ وَانْ هَنَه. خُدێ بِسْتَمْکَارَانْ دِزَانَه.

---

١ دَمَا پێخَمْبَرْ خَوه ئَامَادَه دِکِرْ دَا کُو دَرْکَڤَه غَزْوَی تَبُوکێ، مُنَافِڤْ هَاتِنْ بَالێ، ژێ رَه عُزْرێ خَوه گُوْتِنْ و نَخُوسْتِنْ دَرْکَڤِنْ شَرْ. ژِ بَرْ کُو پێخَمْبَرْ زَانِیبُو ژِ وَانْ اێنْ کُو بِیِی دِلێ خَوه بێنَه شَرْ خێرْ ژێ نَایێ، دَسْتُورْ دَا وَانْ. ڤێجَه اَڤْ ئَایَتَا کُو هێ تێ دَرْحَقَا ڤێ مِژَارێ دَه دَاکَتْ.

**٤٨.** (رَسُولىٚ مِنْ!) بێگُمَانْ بَرى ڤِێگَا (دِ جَنْگَا تَبُوكىٚ دَه) ژِى ژِ بُوٚ وَه خَرَابى دِخوسْتِنْ، دَكُّ و دُوٚلَابْ ژِ بُوٚ تَه دِگَرَانْدِنْ، حَتَا كُو حَقْ (ئَاريكَاريَا خُدىٚ و پِشْتَڤَانِيَا وِى ژِ بُوٚ تَه) هَاتْ و دِينىٚ خُدىٚ بِسَرْ كَتْ، دِگَلْ كُو وَانْ اَڤْ نَدِڤِيَا ژِى.

**٤٩.** هِنْ ژِ وَانْ (مُنَافِقَانْ) دِبێژِنْ: دَسْتُورَا مِنْ بِدَه(كُو اَزْ نَيێمَه شَرىٚ رُومىٚ) و مِنْ نَخَه گُنَهْكَارِيىٚ. بزَانِبِنْ گُنَهْ اَوَه يَا كُو اَوْ بِخَوه تِىٚ دَه نَه و بێگُمَانْ دُوٚژَهِىٚ دُوٚرْ لِكَافِرَانْ گِرْتِيَه.[١]

**٥٠.** اَگَرْ قَنْجِيكْ بِگَهِيژَه تَه لِخُوشَا وَانْ نَاچِه و اَگَرْ خَرَابِيكْ بِگَهِيژَه تَه، دِبێژِنْ: مَه، ژِ بَرىٚ ڤَه تَدْبِيرَا خَوه گِرْتِبُو و بِكێفْخَوشِى بَرىٚ خَوه دِدِنْ مَالێنْ خَوه.

**٥١.** بِبێژَه: ژِ يَا كُو خُدىٚ ژِ بُوٚ مَه نِڤِيسى پێڤَه قَتْ تِشْتَكْ نَاگَهِيژَه مَه. خُدىٚ ئَاريكَارْ و پِشْتَڤَانىٚ مَه يَه، ڤِێجَه بِلا بَاوَرْمَنْدْ تَنىٚ خَوه بِسْپێرِنْ خُدىٚ.

**٥٢.** بِبێژَه: مَا هُونْ چَاڤْنێرِيَا يَكىٚ ژِ دُو قَنْجِيێنْ كُو بِگْهِيژَه مَه دِكِنْ؟ اَمْ ژِى ژِ بُوٚ وَه لِهێڤِيىٚ نَه كُو خُدىٚ ژِ جَمْ خَوه يَانْ ژِى بِدَسْتێنْ مَه عَذَابَكى بِگَهِينَه وَه. دَه هَايْدِىٚ هُونْ چَاڤْلِرىٚ بِنْ، بِرَاسْتِى اَمْ ژِى بِوَه رَه چَاڤْلِرىٚ نَه.

**٥٣.** بِبێژَه: هُونْ چه بِدِلىٚ خَوه و چه بێبِى دِلىٚ خَوه مَالىٚ خَوه بِدِنْ هَرْ ژِ وَه نَايىٚ قَبُولْكِرِنْ. بێگُمَانْ هُونْ جِڤَاتَكه ژِرێدَرْكَتِى نَه.

---

١ اَڤْ ئَايَتَا ٤٩انْ دِ حَقىٚ جَدْ كُرىٚ قَيْسْ دَه نَازِلْ بُويَه كُو اَوْ مرُوٚڤَكى مُنَافِقْ بُو. چه دَمَا پێخَمْبَرىٚ خُدىٚ خَوسْتْ دَرْكَڤَه غَزْوِى تَبُوكىٚ ژِ جَدْ كُرىٚ قَيْسْ رَه گُوٚتْ: يَا اَبُو وَهَبْ! مَا تُو تِيِبى شَرىٚ جَلَادىٚ كُرىٚ اَسْفَرىٚ رُوٚمى كُو تُو ژِ خَوه رَه ژِ وَانْ خُوٚرْتْ و قِيزێنْ جوَانْ وَرْگِرى؟ جَدْ گُوٚتْ: يَا رَسُولىٚ خُدىٚ! بِرَاسْتِى مِلَّتىٚ مِنْ دِزَانىٚ كُو اَزْ پێوَنْدىٚ ژِنَا مَه و اَزْ هِيچْ نِكَارِمْ بێبِى وَانْ بِژِيمْ. اَزْ دِطِرْسِمْ كُو گَاڤَا زَارُوێنْ اَسفَرى بِبِينِمْ اَزْ خَوه رَانَگِرِمْ. ڤِێجَه مِنْ نَيێخَه نَاڤَا تَڤْدَانىٚ و دَسْتُورىٚ بِدَه مِنْ كُو اَزْ لِمَالىٚ رُونِمْ. لِىٚ اَزىٚ بِمَالىٚ خَوه ئَاريكَاريَا تَه بِكِمْ. ڤِێجَه پێخَمْبَرىٚ خُدىٚ تَعَالىٰ دَڤْ ژِىٚ بَرْدَا و ژِىٚ رَه گُوٚتْ: مِنْ دَسْتُورَا تَه دَا! ژِ لُوٚمَا خُدىٚ اَوْ ئَايَتَا كُو لِژُوٚرىٚ بُهِرى دِ بَارَا وِى و يێنْ وَكى دَه شَانْدْ و رَاسْتِيَا وِى اَشْكَرَه كِرْ.

٥٤. بێگُمَانْ اَوْ تِشْتِێ کُو نَاهێلَه سَدَقَه و خێرێنْ وَانْ قَبُولْ بِبَه، ژِ بِلی کُو وَانْ بَاوَرِی بخُدێ و پێخَمْبَرێ وِی نَائِینِنْ و نِمێژْ هَرْ بِسِسْتَایِی و جَانْگِرَانی کِرِنْ و کُو ژِ نَچَارِی مَالِێ خَوه خَرْجْ کِرِنْ پِێ ڤه نَه تِشْتَکی دِنْ بُو.

٥٥. ڤێجَه بِلا مَالێنْ وَانْ و زَارُوکێنْ وَانْ تَه عَجێبْمَایِی نَهێلِنْ. بێگُمَانْ خُدێ دِ ژِیَانَا جیهَانِێ دَه بَسْ دِخوازَه وَانْ پِێ بِدَه عَذَابْدَاینْ و وَانْ لِسَرْ کُفْرِێ بِمِرِینَه.

٥٦. مُنَافِقْ بِخُدێ صُوْنْدْ دِخُونْ کُو بێگُمَانْ اَوْ ژِ وَه نَه. حَالْ اَڤه، اَوْ نَه ژِ وَه نَه. لێبَلِێ اَوْ جِڤَاتَکه بِزْدُوْنَکِنْ.

٥٧. اَگَرْ وَانْ اَوْلَگَهکْ ئَانْ شِکَفْتَکْ (کُو تِێ دَه خَوه ڤَشَارْتِنَا) یَانْ ژِی سِتَارْگَهکْ دِیتِبُونَا، وِێ بِبَزْ بَرِێ خَوه بِدَانَایِێ.

٥٨. هِنْ ژِ وَانْ دَرْ بَارِێ (پَارْڤَکِرِنَا) صَدَقَانْ دَه تَه عَیْبْدَارْ دِکِنْ، ڤێجَه اَگَرْ ژِ صَدَقَا (پَارَکْ) بِگَهِژَه وَانْ قَایِلْ دِبِنْ و اَگَرْ نَگَهِژَه وَانْ هَمَنْ دِغَیدِنْ.

٥٩. اَگَرْ اَوْ بِیَا کُو خُدێ و پێخَمْبَرێ وِی دَایَه وَانْ قَایِلْ بِبُونَا و بِگُوْتِنَا: خُدێ بَسی مَه یَه؛ خُدێ دِێ ژِ کَرَمَا خَوه بِدَه مَه و پێخَمْبَرێ وِی ژِی (دِێ بِدَه مَه) و اَمْ بێگُمَانْ ژِ خُودَایِێ خَوه بِهێڤِی نَه (دِێ ژِ بُوْ وَانْ بِخێرْتِرْبَایَا).

٦٠. بێگُمَانْ زَکَاتْ، بَسْ ژِ بُوْ فَقِیرْ و بَلَنْگَازَانْ، ژِ بُوْ کَارْمَنْدێنْ زکَاتِێ و یێنْ کُو دِلێنْ وَانْ بِاِسْلَامِێ خَوشْ بِبَه، ژِ بُوْ کُوْلِیێنْ کُو دِخَوازِنْ ئَازَادْ بِبِنْ و دَیْنْدَارێنْ کُو نِکَارِنْ دَیْنێنْ خَوه بِدِنْ، ژِ بُوْ یێنْ دِ رِیَا خُدێ دَه و ژِ بُوْ رێوِیَانَه. (اَڤْ دَابَشْکِرِنْ) فَرْزَکه ژِ جَمْ خُدێ یَه. خُدێ زَانَا یَه، کَارْبِنَجِهَه.[1]

١ دِ ڤِێ ئَایَتَا پِیرُوْزْ دَه ڤَالا هَشْتْ بَشْ مِرُوْڤْ هَاتِیَه کِرِنْ کُو زَکَاتْ لِوانْ دِچه. هَمْ ژِی دَایَه زَانِینْ کُو زَکَاتْ فَرْزَه. بِرَاسْتِی اَڤْ هَشْتْ سِنِفْ دِ کُوْکَا خوه دَه دُو سِنفِنْ: یَکَامْ، ژِ بُوْ کُو حَوْجَه یَه دَا کُو ژِێ فَیْدێ بِبینَه، زَکَاتْ ژِێ رَه تِێ دَایینْ. مِینَا؛ خِزَانْ و بَلَنْگَازَانْ، کُوْلَه و دَینْدَارَانْ، رِێوِی و ... دُویَمْ، ژِ بُوْ کُو اِحْتِیَاجْ بِوِی هَیَه، دَا کُو فِیْدَیَا وِی بِگَهِیژَه اِسْلَامِێ و مُسِلْمَانَانْ، زِکَاتْ ژِێ رَه تِێ دَایینْ. خُدێ اَڤْ پَارَا زَکَاتِێ

**٦١.** ژِ مُنَافِقَانْ هِنْ هَنَه کُو اَزِیَتِیٚ دِدِنَه پِیٚخَمْبَرْ و دِبیٚژِنْ: اَوْ گُهِیٚ خَوه دِدَه هَرْ تِشْتِی و ژِ هَرْ گُوٚتِنِیٚ بَاوَرْ دِکَه. بِبیٚژَه: اَوْ گُهْدَارِیَا هَرْ تِشْتِی دِکَه لِیٚ اَوْ ژِ بُوٚ خِیٚرَا وَه یَه. اَوْ بَاوَرِیِیٚ بِخُدِیٚ تِینَه و بِگُوٚتِنیٚنْ بَاوَرْمَنْدَانْ ژِی بَاوَرَه. اَوْ ژِ بُوٚ بَاوَرْمَنْدَانْ رَحْمَتَکَه. اَوِیٚنْ کُو پِیٚخَمْبَرِیٚ خُدِیٚ دِئیٚشِینِنْ ژِ بُوٚ وَانْ عَزَابَکِی دِژْوَارْ هَیَه.

**٦٢.** اَوْ، ژِ وَه رَه بِنَاڤِیٚ خُدِیٚ صُوٚنْدْ دِخُونْ دَا کُو دِلیٚنْ وَه خَوش بِکِنْ. اَگَرْ بِرَاسْتِی اَوْ بَاوَرْمَنْدِنْ، ڤَایِلْبُونَا خُدِیٚ و پِیٚخَمْبَرِیٚ وِی پِیٚدِڤِیترَه.

**٦٣.** اَرِیٚ، مَا اَوْ نِزَانِنْ کِی دِژْمِنَاتِیَا خُدِیٚ و پِیٚخَمْبَرِیٚ وِی بِکَه، بِیٚگُمَانْ ژِ وِی رَه ئَاگِرِیٚ دُوٚژَهِیٚ هَیَه، وِیٚ هَرْ و هَرْ تِیٚ دَه بِمِینَه. هَا اَڤَه، رِسْواتِی و شَرْمَزَارِیَا مَزِنْ.

**٦٤.** مُنَافِقْ دِطِرْسِنْ کُو لِسَرْ رَوْشَا وَانْ سُورَیَكْ بِیٚ شَانْدِنْ کُو نِیفَاقَا دِ دِلیٚنْ وَانْ دَه هَیَه (ژِ بُوٚ مُومِنَانْ) رَاگِهِینَه. (ژِ وَانْ رَه) بِبیٚژَه: هُونْ طِنَازیٚنْ خَوه بِکِنْ، بِیٚگُمَانْ خُدِیٚ یَا کُو هُونْ ژِیٚ دِطِرْسِنْ دِیٚ دَرِینَه رَاسْتِیٚ.

**٦٥.** اَگَرْ تُو ژِ وَانْ بِپِرْسِی (وَه طِنَازیٚنْ خَوه بِپِیٚخَمْبَرْ و هَڤَالِیٚ وِی دِکِرْ)، تَڤَزْ دِیٚ بِبیٚژِنْ: بِیٚگُمَانْ هَرْ اَمْ کَتِبُونْ نَاڤْ خَبَرْدَانِیٚ و مَه خَوه پِیٚ مِژُولْ دِکِرْ. بِبیٚژَه: اَرِیٚ مَا وَه طِنَازیٚنْ خَوه بِخُدِیٚ، ئَایَتیٚنْ وِی و پِیٚخَمْبَرِیٚ وِی دِکِرْ؟

**٦٦.** (ژِ مُنَافِقَانْ رَه بِبیٚژَه) : ڤَتْ عُزرْ نَخوازِنْ. بِرَاسْتِی پِشْتِی وَه بَاوَرِی ئَانِی دِیسَا هُونْ کَافِرْ بُونْ. اَگَرْ اَمْ لِجِڤَاتَکِیٚ ژِ وَه بِبُوٚرِنْ ژِی، اَمِیٚ بِسَدَمْ گُنَهْکَارِیَا وَانْ کُوٚمَکِیٚ بِدِنَ عَذَابِیٚ.

**٦٧.** مِیٚرْ و ژِنیٚنْ مُنَافِقْ ژِ هَڤِنْ بِیَا نَلِیٚ (مُنْکَرِی) فَرْمَانْ دِکِنْ و رِیٚ لِبَرْ ئَا بَاشْ (مَعْرُوفِی) دِگِرِنْ، دَسْتیٚنْ خَوه (ژِ دَانَا زَکَاتِیٚ و صَدَقَیَانْ) دِگِرِنْ. وانْ خُدِیٚ ژِ بِیرْ کِرْ، ڤِیٚجَه خُدِیٚ ژِی دَڤْ ژِ وَانْ بَرْدَا (هِدَایَتْ نَدَا وَانْ)، بِیٚگُمَانْ مُنَافِقْ فَاسِقْ بِخَوه نَه.

---

دِ مَالِیٚ دَوْلَمَنْدَانْ دَه فَرِظْ کِرِیَه دَا کُو پِیٚ حَوجَیییٚنْ اِسْلامِیٚ و مُسِلْمَانَانْ یٚنْ خُصُوصِی و گَلاَمْپِرِی بیٚنَه تَأْمِینْکِرِنْ.

**٦٨.** خُدِێ، ژِ مُنَافِقِێنْ مِێرْ و ژِنْ و ژِ كَافِرَانْ رَه ژِی بَئَاگِرِێ دُوْژَهِێ پَیْمَانْ دَایَه كُو هَرْ و هَرْ اَوِێ تِێ دَه بِنْ، اَوْ بَسِی وَانَه. خُدِێ لَعْنَتْ لِوانْ بَارَانْدِیَه و ژِ وَانْ رَه عَذَابَكی سَرَاقَتِی هَیَه.

**٦٩.** هُونْ ژِی وَكِی وَانِێنْ بَرِیَا خَوه كُو اَوْ ژِ وَه بِهێزْتِرْ و خُرْتْتِرْ بُونْ و ژِ هِێلَا مَالْ و زَارُوْكَانْ ڤَه ژِی ژِ وَه پِرْتِرْ بُونْ، ڤِێجَه وَانْ بِپَارَا خَوه پێخُوشی كِرِبُونْ. اِێدِی وَه ژِی بِپَارَا خَوه كِێفْخُوشی و پێخُوشی كِرْ هَرْ وَكِی یێنْ بَرِیَا وَه بِپَارا خَوه كێفْخُوشی كِرِبُونْ. هُونْ كَتِنْ نَاڤْ پُوچَاتِی و رِێشَاشِیِێ چَاوَا كُو یێنْ بَرِیَا وَه كَتِبُونِێ. اَڤِێنْ هَا، كَارْ و كِرِیَارێنْ وَانْ لِدِنْیَا و ئَاخْرَتِێ پُوچْ بُونَه و هَرْ اَونْ یێنْ دِ زِیَانِێ دَه.

**٧٠.** مَا ژِ بُوْ وَانْ (مُنَافِقَانْ) خَبَرَا قَومێنْ بَرِیَا وَانْ نَهَاتِیَه؛ قَوْمِێ نُوحْ، عَادْ، سَمُودْ، قَومِێ اِبْرَاهِیمْ، خَلْكێنْ مَدْیَنِێ (كُو اَوْ گَلِێ شُعَیْبَه) و گُنْدێنْ هَاتِنْ سَرُوبِنْكِرِنْ (كُو اَوْ قَومِێ لُوطَه). پێخَمْبَرێنْ وَانْ ژِ بُوْ وَانْ دَلِیلْ و مُعْجِزَیێنْ زَلَالْ ئَانِیبُونْ (بَاوَرِی نَئَانِینْ؛ هَلَاكْ بُونْ). ڤِێجَه خُدِێ نَه اَوَه كُو نَحَقِیِێ لِوانْ بِكَه، لِێبَلِێ وَانْ بِخَوه نَحَقِی لِخَوه كِرِنَه.

**٧١.** مِێرْ و ژِنِێنْ بَاوَرْمَنْدْ پِشْتَڤَانْ و ئَارِیكَارێنْ هَڤِنْ، بِقَنْجِی و بَاشِیِێ (لِهَڤْ) فَرْمَانْ دِكِنْ و رِێ لِبَرْ خَرَابِیِێ دِگِرِنْ و بِرْنْگِێ پێدِڤِی نِمێژْ دِكِنْ و زَكَاتِێ دِدِنْ، گُهْدَارِیَا خُدَا و پێخَمْبَرِێ وِی دِكِنْ. اَڤِێنْ هَا، خُدِێ دِێ رَحْمِێ لِوانْ بِكَه، بێگُمَانْ خُدِێ عَزِیزَه، حَكِیمَه.

**٧٢.** خُدِێ، ژِ مِێرْ و ژِنِێنْ بَاوَرْمَنْدْ رَه پَیْمَانَا بِهِشْتێنْ وِسَا دَایَه كُو دِ بِنْ وَانْ دَه چَمْ دِهَرِكِنْ، هَرْ و هَرْ اَوْ دِێ لِوانْ بِمِینِنْ و (پَیْمَانَا) وَارْگَهێنْ خَوشْ لِبِهِشْتێنْ عَدْنِێ ژِی (دَایَه وَانْ) و یَا ژِ هَمُو (نِعْمَتَانْ) مَزِنترْ ژِی قَایِلِیَا خُدِێ یَه. سَرْفِرَازِیَا مَزِنْ هَا اَڤَه.[1]

١ دِ ئَایَتَا پِیرُوْزْ دَه بێژِیَا «مَعْرُوف» بُهُری كُو مَه ژِی بـ«قَنْجِی»وَرْگَرَانْدْ. لِێبَلِێ دِڤِێ اَمْ بِزَانِنْ كُو مَعْرُوفْ نَاڤْلِێكَكِی اَوْڤَاسْ فَرَهَه كُو دِ بِنْ خَوه دَه هَمُو بِیرْ و بَاوَرِیێنْ سِپَهِی و كِرِنێنْ بَاشْ و اَخلاقێنْ پَاكْ دِگْرَه. پِیڤَا «مُنْكَر» ئَا كُو مَه بـ «نَقَنْجِی» وَرْگَرَانْدْ تَامْ دِژِێ وِێ یَه كُو هَمُو عَقِیدَیێنْ پُوچْ، كِرِنێنْ نَبَاشْ و اَخلاقێنْ رِسْوا دِكَڤِنَه بِنِێ.

**٧٣.** اَیْ پێخَمْبَرْ! لِهَمْبَرِی كَافِرْ و مُنَافِقَانْ جِهَادِیَ بِكَه و لِهَمْبَرِی وَانْ دِژْوارْ بَه. اِیورْگَهَا وَانْ دُوْژَهَه و جِهِیَ وَانْ چه پِیسَجِهَه!

**٧٤.** اَوْ بِخُدِیَ صُوْنْدْ دِخُونْ كُو وَانْ (گُوْتِنَا نَخَوشْ) نَگُوْتِنَه. بێگُمَانْ وَانْ گُوْتِنَا كَافِرِی گُوْتْ و پِشْتِی مِسْلِمَانْبُونَا خَوه كَافِرْ بُونْ و قَصْدَا یَا كُو بِدَسْتْ وَانْ ڤَه نَهَاتِیَه كِرِنْ. ژ بلِی كُو خُدِیَ و پێخَمْبَرِیَ وِی، ژ كَرَمْ و قَنْجِیَا خَوه اَوْ (مُنَافِقْ) دَولَمَنْدْ كِرِنْ پێڤَه اَوْ نِكَارِنْ پێخَمْبَرْ عَیبْدَارْ و كێمْ بِكِنْ. اَگَرْ اَوْ تُوْبَه بِكِنْ دِیَ ژ بُوْ وَانْ چێترْ بَه و اَگَرْ اَوْ بَرِیَ خَوه (ژ حَقِیىَ) ڤَگَرِینِنْ، خُدِیَ لِدِنیَا و ئَاخْرَتِیَ دِیَ عَذَابَكِی دِژْوارْ بِدَه وَانْ و ژ بُوْ وَانْ لِسَرْ عَرْدِیَ نَه دُوْسْتْ و پِشْتَڤَانَكْ نَه ژِی ئَارِیكَارَكْ هَیَه.[١]

**٧٥.** ژ مُنَافِقَانْ هِنْ هَنَه كُو پَیْمَانْ بِخُدِیَ رَه دَانْ (و گُوْتِنْ): اَگَرْ خُدِیَ، ژ خَوشْدَاینْ و كَرَمَا خَوه (مَالْ) بِدَه مَه، تَقَزْ اَمِیَ صَدَقَیَانْ (حَقِیَ خُدِیَ) بِدِنْ و بِسُوْنْدْ اَمِیَ بِبِنْ ژ یێنْ قَنْجِیكَارْ!

**٧٦.** ڤێجَه چه دَمَا خُدِیَ ژ خَوشْبَخْشِیَا خَوه (مَالْ) دَا وَانْ، نَمَرْدِی و چِكُوسِی كِرِنْ، پِشْتَا خَوه دَانَه حَقِیىَ. رَوْشْ اَڤَه: اَوْ هَرْ بَرِیَ خَوه ژ خێرِیَ ڤَدگَرِینِنْ.

---

خُدِیَ پِشْتِی دِ ئَایَتَا ٦٧انْ دَه دَا زَانِینْ كُو «مێرْ و ژنێنْ مُنَافِقْ ژ هَڤِنْ (دِ تَمْتێلْ و دُرُوتِیىَ دَه وَكْهَڤِنْ)»، لِپَی وِیَ دِ ئَایَتَا ٧١یَ دَه رَاگَهَانْدْ كُو «مێرْ و ژنێنْ مُسلْمَانْ پِشْتَڤَانْ و ئَارِیكَارێنْ هَڤِنْ..» هَرْوِهَا بَحْسَا وَصْفێنْ وَانْ مُومِنَانْ كِرْ كُو وَانْ رَحْمَا وِی حَقْ كِرِنَه و اَوْ وَصْفْ ژِی وِهَا رِیزْ كِرِنَه:

- مُومِنْ دِ هَزْژێكرِنْ و دُوْسْتَانِی و هَڤْكَارِیىَ دَه خُودِییَ هَڤِنْ.
- شیرَتَا قَنْجِیىَ لِهَڤْ دِكِنْ.
- ژ نَقَنْجِیىَ هَڤْ دِدِنْ پَاشْ.
- بِگُوْتِنَا خُدِیَ و پێخَمْبَرِیَ وِی دِكِنْ.

١ بَرِی كُو پێخَمْبَرْ هِجْرَتِی بَالْ مَدِینِیَ ڤَه بِكَه پِرَانِیَا گَلِیَ وِیَ خِزَانْ بُونْ. پِشْتِی كُو پێخَمْبَرْ هَاتَه مَدِینِیَ، ڤێجَه خُدِیَ بَرَكَتَا خَوه دَایِیَ و خَلْكِیَ وِیَ زَنْگِینْ بُونْ. پِشْتْرَه هِنَكْ ژ خَلْكِیَ وِیَ یێنْ مُنَافِقْ نَانْكُوْرِی و شِیرْحَرَامِی كِرِنْ و حَولْ دَانْ كُو پێخَمْبَرْ بِكُژِنْ.

**٧٧.** اِێدی ژِ بَرْ کُو پَیْمَانَا خَوه بِجه نَئَانِینْ و ژِ بَرْ کُو دَرَوْ کِرِنْ، خُدێ حَتَا رُوْژَا کُو اَوْ بێنَه حُزُورَا وی، نِفَاقْ (دُرُوتی) خِسْتَه دِلێنْ وَانْ.

**٧٨.** مَا هێ ژی اَوْ (مُنَافِقْ) نزَانِنْ کُو خُدێ نَهێنِی و پِسْتَه پِسْتَا وَانْ ژی دزَانَه. بِرَاسْتِی ژی خُدێ زێدَه زَانَایێ نَپَنْدیَانَه.

**٧٩.** اَوێنْ کو وَانْ بَاوَرْمَنْدێنْ کُو ژِ دِلێ خَوه صَدَقَیَانْ دِدِنْ عَیبْدَارْ دِکِنْ و اَوێنْ کُو ژِ بلی کَدَا خَوه تِشْتَکی دِنْ نَابینِنْ کُو بِدِنْ بِوَانْ ژی طِنَازَانْ دِکِنْ؛ خُدێ ژی لِسَرْ طِنَازْکَریَا وَانْ، وَانْ جَزَا دِکَه و ژِ بُو وَانْ عَذَابَکی دِژْوَارْ هَیَه.[1]

**٨٠.** (رَسُولێ مِنْ!) چه تُو لێبُوْرینَا گُنَهێنْ وَانْ بِخَوازێ چه ژی نَخَوازی، اَگَرْ تُو هَفْتێ جَاری لێبُوْرینَا گُنَهێنْ وَانْ دَاخَوازْ بِکی ژی، ڤێجه خُدێ قَتْ لِگُنَهێنْ وَانْ نَابهُرَه. اَڤْ، ژِ بَرْ کُو بِرَاسْتِی وَانْ بَاوَری بِخُدێ و پێخَمْبَرێ وی نَائینِنْ. خُدێ ژی تَقَزْ جِڤَاتَا ژِرێدَرْکَتیَانْ نَاینَه سَرْ ریَا رَاسْتْ.

**٨١.** اَوێنْ کُو ژِ بُو دِژْرَابَریَا پێخَمْبَرێ خُدێ ژِ شَرْ مَانَه، بِرُونِشْتِنَا خَوه (یَا لِمَالێ) کێفْخَوشْ بُونْ و نَه خَوسْتِنْ کُو بِمَالێ خَوه و جَانێ خَوه دِ ریَا خُدێ دَه جِهَادێ بِکِنْ، دِگُوْتِنْ: دِ ڤێ گَرْمێ دَه دَرْنَکَڤِنْ جِهَادێ. (ژِ وَانْ مُنَافِقَانْ رَه) بِبێژَه: ئَاگرێ دُوْژَهێ هێ گَرْمْتِرَه. اَگَرْ اَوْ ڤێ بِزَانِبِنْ (اَوێ ژِ شَرْ خَوه نَدِنْ پَاشْ).

**٨٢.** اِێدی بِسَدَمَا کَارْ و کِرْیَارێنْ کُو کِرِنْ، بِلا هِنْدِکْ بِکَنِنْ و پِرْ بِگِرینْ.

**٨٣.** (رَسُولێ مِنْ!) ڤێجَه اَگَرْ خُدێ تُو ڤَگَرَانْدی بَالْ رَفَکی ژِ وَانْ (یێنْ کُو ژِ سَفَرَا تَبُوکێ مَانَه)، ڤێجَه وَانْ ژی ژِ بُو دَرْکَتِنَا (شَرکی دِی) دَسْتُورْ ژِ تَه خَوسْتْ، ژِ وَانْ

---

١ گَاڤَا سَرْدَارێ مُنَافِقَانْ عَبدُ الله کُرێ اُبَیْ کُرێ سَلُولْ بِنَخُوشِیَا مِرِنێ کَتْ، کُرێ وی عَبْدُ الله هَاتْ جَمْ پێخَمْبَرْ و ژێ خَوسْتْ کُو ژِ بُو بَاڤێ وی دُعَا بِکَه دَا کُو خُدێ وی عَفُو بِکَه. ژِ بَرْ کُو اَوْ مُسلْمَانَکی بَاشْ بُو پێخَمْبَرْ نَخَوسْتْ دِلێ وی بِهێلَه و ژِ بُو عَفْوَا بَاڤێ وی ژِ خُدێ دُعَا کِرْ. ڤێجه اَڤْ ئَایَتَا ٨٠یێ دِ بَارَا ڤێ مِژَارێ دَه نَازِلْ بُو.

رَە بێژَە: ژِ ڤِرْ و پێ دَە هُونێ بِمِنْ رَە ڤَتْ دَرْنَکَڤِنْ و هُونێ دِگَلْ مِنْ بِتُو دِژْمِنی رَە شَرْ نَکِنْ! بێگُمَانْ هُونْ جَارَا پێشِینْ بِرُونِشْتِنێ ڨَایِلْ بُونْ، نَاخَوە هُونْ ژی دِگَلْ وَانێنْ رُونِشْتِی(کُو ژِ شَرْ مَانَە) بِمِینِنْ.

٨٤. (رَسُولێ مِنْ!) تُو، لِسَرْ تُو کَسِی ژِ وَانْ -کُو بِمِرَە - نِمێژْ نَکَە و لِسَرْ گُوْرَا وِی ژی رَانَوَسْتَە. لَوْرَا وَانْ بِخُدێ و پێخَمْبَرێ وِی بَاوَرِی نَئَانِینَە و لِسَرْ کُفْرێ مِرِنَە.

٨٥. بِلا مَالێنْ وَانْ و زَارُوْکێنْ وَانْ تَە عَجێبْمَایی نَهێلِنْ. بێگُمَانْ خُدێ بَسْ لِدِنْیَایێ دِخوازَە وَانْ پێ بِدَە عَذَابْدَاینْ و وَانْ لِسَرْ کُفْرێ بِمِرِینَە.

٨٦. دَمَا ژِ پێخَمْبَرْ رَە سُورَیَكْ بِهَاتَا (کُو تێ دَە بِگُوْتَا): بَاوَرِیێ بِخُدێ بِینِنْ و دِگَلْ پێخَمْبَرێ وِی جِهَادێ بِکِنْ، اَوێنْ کُو خَودِی سَرْوَتْ بُونْ وَانْ ژِ تَە دَسْتُورَا نَچُونێ دِخَوسْتْ و وَانْ وِسَا دِگُوتْ: دَڤْ ژِ مَە بَرْدَە، اَمێ دِگَلْ یێنْ رُونِشْتِی رُونِنْ.

٨٧. اَوْ (مُنَافِقْ) رَازِی بُونْ کُو دِگَلْ پَاشْمَایِیَانْ (ژِنْ، نَخَوشْ و کَالانْ) لِمَالْ بِمِینِنْ و مُوْرْ لِسَرْ دِلێنْ وَانْ هَاتْ خِسْتِنْ، ڤێجَە اَوْ تێنَاگِهێژِنْ.

٨٨. لێبَلێ پێخَمْبَرْ و اَوێنْ کُو پێ رَە بَاوَرِی ئَانِینْ، بِمَالێ خَوە و جَانێ خَوە جِهَادْ کِرِنْ. تَڤْکِی ڨَنْجِیَانْ ژِ بُوْ وَانِنْ و هَرْ اَونْ اِینْ (بِدَاینَا خُدێ) سَرْفِرَازْ.

٨٩. خُدێ، ژِ وَانْ رَە بِهِشْتێنْ وِسَا ئَامَادَە کِرِنَە کُو دِ بِنْ وَانْ دَە چَمْ دِهَرِکِنْ و هَرْ و هَرْ اَوێ لِوانْ بِمِینِنْ. هَا اَوَە خَلاسِیَا مَزِنْ.

٩٠. بَدَوِیێنْ عَرَبْ هَاتِنْ (ژِ بُوْ نَچِنْ شَرْ) عُزْرێ خَوە خُوسْتِنْ دَا کُو دَسْتُورَا وَانْ بێ دَایِنْ. وانێنْ کُو بَاوَرِی بِخُدێ و پێخَمْبَرێ وِی نَئَانِنْ ژی (لِمَالا خَوە) رُونِشْتِنْ (و نَهَاتِنْ عُزْرێ خَوە نَخَوسْتِنْ). اَوێنْ کُو ژِ وَانْ کَافِرْ بُونَە دێ عَذَابَکِی دِژْوَارْ وَانْ بِگِرَە.

٩١. لِسَرْ لَاوَازْ و نَخوشَانْ، لِسَرْ اَوێنْ کُو تُو تِشْتِی نَابِینِنْ کُو ژِ بُوْ جِهَادێ خَرْجْ بِکِنْ

تُو گُنَهْ نِينَه، بِشَرْطِێ كُو بِخُدِێ و پِێخَمْبَرْ وِی رَه رَاسْتْ بِنْ. لَوْرَا لِسَرْ اِێنْ قَنْجكَارْ (يێنْ خَودَانْهێنْجَتْ اَوێنْ كُو بِخُدِێ و پِێخَمْبَرْ وِی رَه رَاسْتِنْ) تُو گُنَهْ نِينَه و گَازِنْ ژِی ژِ وَانْ نَايِێ كِرِنْ. خُدِێ بِخَوه گُنَهْژێبِرَه، دِلُوْڤَانَه.

**٩٢.** لِسَرْ وَانْ كَسَانْ ژِی (گُنَهْ نِينَه) اَوْ (خِزَانِ)ێنْ كُو دَمَا هَاتِنْ جَمْ تَه دَا كُو تُو وَانْ سِوَارْ بِكِی (بِشِينِی شَرْ)، تَه ژِ وَانْ رَه گُوْتْ: تِشْتَكِی كُو اَزْ وَه لِێ سِوَارْ بِكِمْ تُنَه، بِپَاشْ ڤَه ڤَگَرِيَانْ و ژِ غَمْگِينِيَا كُو وَانْ تِشْتَكْ نَديتْ كُو پِێ دَرْكَڤِنْ جِهَادِێ چَاڤێنْ وَانْ تِژِی هێسْطِرْ بُونْ.[1]

**٩٣.** بێگُمَانْ اَوێنْ كُو ژِ تَه دَسْتُورِێ دِخَوازِنْ (ژِ بُوْ نَيێنْ جِهَادِێ) -دگَلْ كُو اَوْ دَوْلَمَنْدِنْ ژِی- گُنَهْكَارِی و رِيَا جَزَادَانِێ بَسْ لِسَرْ وَانْه. اَوْ قَايِلْ بُونْ كُو دِگَلْ رُونِشْتِيَانْ (ژِنْ و زَارُوْكْ و پِيرَكَالانْ) بِمِينِنْ. خُدِێ ژِی مُوْرْ لِسَرْ دِلێنْ وَانْ خِسْتْ، ڤێجَه اَوْ (اَنْجَامَا پَاشْمَايِنَا ژِ شَرْ) نِزَانِنْ (كَا دِێ بِبَه چِه!).

**٩٤.** دَمَا هُونْ (ژِ جِهَادِێ) لِوَانْ ڤَگَرِيَانْ، دِێ ژِ بُوْ وَه هێنْجَتَا خَوه اَشْكَرَا بِكِنْ. (ژِ وَانْ رَه) بِبێژَه: قَتْ مَهْنَا نَكِنْ، اَمْ هِيچْ ژِ وَه بَاوَرْ نَاكِنْ. بێگُمَانْ خُدِێ سَالِخێنْ وَه ژِ مَه رَه اَشْكَرَا كِرِنْ. خُدِێ و پِێخَمْبَرِێ وِی دِێ كَارێنْ وَه بِبِينِنْ. پَاشِێ هُونِێ بِبَالْ زَانَايِێ غَيْبِێ و يَا دَارِی چَاڤْ ڤَه ڤَگَرِنْ، ڤێجَا اَوِێ وَه ئَاگَاهْدَارْ بِكَه بِيَا كُو وَه كِرِی.

**٩٥.** دَمَا هُونْ لِوَانْ ڤَگَرِيَانْ، ژِ بُوْ هُونْ لـ(گُنَهْ و سُوجێنْ) وَانْ بِبِهُورِنْ، دِێ ژِ وَه رَه بـ(نَاڤِێ) خُدِێ صُوْنْدْ بِخُونْ (كُو هێنْجَتَا وَانْ هَبُويَه). هُونْ ژِی بَرِێ خَوه ژِ وَانْ ڤَگَرِينِنْ. بێگُمَانْ اَوْ دِلْپِيسِنْ و بِسَبُونَتْ يَا كُو كِرِنْ جِهِێ وَانْ دُوْژَهه.[2]

---

١ گَلَكْ هَڤَالێنْ پِێخَمْبَرْ يێنْ خِزَانْ، خُوسْتِنْ كُو بَشْدَارِی سَفَرَا تَبُوكِێ بِبِنْ. لِێبَلِێ خَوارِنْ، جِلْ و حَيْوَانَكه كُو لِێ سِوَارْ بِبِنْ بِدَسْتْ وَانْ نَكَتْ. ژِ بُوْ ڤِێ دَاخَوازِێ لِپِێخَمْبَرْ ڤَگَرِيَانْ. پِێخَمْبَرْ ژِ وَانْ رَه گُوْتْ: دِ دَسْتْ مِنْ دَه تُو حَيْوَانَكْ تُنَه يَه كُو اَزْ وَه لِێ سُوارْ بِكِمْ و وَه بِشِينِمْ شَرْ. ڤێجَه ژِ غَمْگِينِی گِرِينْ و ڤَگَرِيَانْ. هَا اَڤْ ئَايَتَا كُو بُهِرِی ڤِێ يَكِێ دَسْتْنيشَانْ دِكَه.

٢ اَگَرْ اَوْ، وَه بِخَاپِينِنْ ژِی نِكَارِنْ خُدِێ بِخَاپِينِنْ. خُدِێ بَاشْ دِزَانِێ كُو اَوْ چِه نَه. اَوْ، هِيچْ ژِ جِڤَاتَا فَاسِقَانْ رَازِی نَابَه. نَاخَوه رَازِيبُونَا وَه ژِ وَانْ رَه تُو فَيْدِێ نَادَه وَانْ. لَوْرَا خُدِێ ژِ وَانْ غِيِيدِيَه.

٩٦. اَوْ ژ وَه رَه دِىَ صُوِنْدْ بخُونْ دَا كُو هُونْ ژ وَانْ رَازِى بِبنْ. اَگَرْ هُونْ ژ وَانْ رَازِى بِبنْ ژِى ڤِيْجَا بِرَاسْتِى خُدِىَ ژ جِڤَاتَا فَاسِقَانْ قَتْ رَازِى نَابَه.

٩٧. بَدَوِيْنْ عَرَبْ كُفْرَا وَانْ نِيفَاقَا وَانْ (ژ يَا خَلْكِىَ دِنْ) دِژْوَارْتِرَه و بحُكْمِىَ كُو خُدِىَ ژ پِيْخَمْبَرِىَ خوه رَه هِنَارْتِيَه بيْهْتِرْ بَابَتِنْ كُو اَوْ نزَانِبِنْ. خُدِىَ عَلِيمَه، حَكِيمَه.

٩٨. ژ بَدَوِيْنْ عَرَبْ هِنَكْ وِسَا هَنَه كُو (دِ رِيَا دِينِىَ خُدِىَ دَه) يَا خَرْجْ دِكَه وِىَ زِرَارْ دِزَانَه و ژ بُوْ وَه ژِى چَاڤْنِيْرِيَا بَلَايِىَ دِكَه. اَوْ بَلَايَا پِيسْ (يَا كُو ژ وَه رَه چَاڤْنِيْرِى دِكِنْ) دِىَ وَرَه سَرِىَ وَانْ. خُدِىَ بِهِيزَرَه، زَانَا يَه.

٩٩. ژ بَدَوِيْنْ عَرَبْ هِنْ ژِى هَنَه كُو بخُدِىَ و رُوْژَا ئَاخْرَتِىَ بَاوَرِى تِينِنْ و (دِ خِيْرِىَ دَه) يَا كُو خَرْجْ بكَه وِىَ دِكَه وَكْ نَاڤْگِينَا نِيْزِيكْبُونِىَ لِجَمْ خُدِىَ و دِكَه وَسِيلَه ژ بُوْ بَدَسْتْخِسْتِنَا دُعَايِيْنْ پِيْخَمْبَرْ. ئَاگَاهْدَارْ بِنْ! بِيْگُمَانْ اَڤْ كَارِىَ وَانْ ژ بُوْ وَانْ (لِجَمْ خُدِىَ) نَاڤْگِينَا نِيْزِيكبُونِىَ يَه. خُدِىَ دِىَ وَانْ بخَه نَاڤْ رَحْمَا خوه. بِيْگُمَانْ خُدِىَ گُنَهْڤَشِيْرَه، دِلُوْڤَانَه.

١٠٠. ژ مُهَاجِرْ و اَنْصَارِيَانْ اَوِيْنْ كُو پِيْشِى مُسلْمَانْ بُونَه و اَوِيْنْ كُو بِرِنْدِى دَانَه پَىْ وَانْ، خُدِىَ ژ وَانْ رَازِى بُويَه و اَوْ ژِى ژ خُدِىَ رَازِى بُونَه. خُدِىَ ژ بُوْ وَانْ بهِشْتِيْنْ وِسَا ئَامَادَه كِرِنَه كُو دِ بِنْ وَانْ رَه چَمْ دِهَرِكِنْ و حَتَا بِحَتَايِىَ اَوِىَ لِوَانْ بِمِينِنْ. هَا اَوْ، سَرْكَفْتِنْ و رِزْگَارِيَا مَزِنَه.

١٠١. ژ بَدَوِيْنْ لِهَاوِيرْدُوْرَا وَه و ژ خَلْكِىَ مَدِينِىَ ژِى هِنَكْ مُنَافِقِيْنْ وِسَانْ هَنَه كُو دِ مُنَافِقْتِيِىَ دَه پِيْشْكَتِى نَه و لِسَرِىَ بِرِكِنْ! (ژ بَرْ كُو بِكُوْنَتِى تَڤْدگَرِنْ) تُو وَانْ نزَانِى؛ (لِيْبَلِىَ) اَمْ وَانْ بَاشْ دِزَانِنْ. اَمِىَ (لِدِنْيَايِىَ) عَذَابْ لِدُوڤْ عَذَابْ بِدِنْ وَانْ. پَاشِىَ (رُوْژَا قِيَامَتِىَ) اَوِىَ لِعَذَابَكِى مَزِنْ بِيْنَه ڤَگَرَانْدِنْ.

١٠٢. جِڤَاتَكَه دِنْ ژِى هَيَه كُو گُنَهِيْنْ خوه اِعْتِرَافْ كِرِنَه. وانْ، كَارَكِى قَنْجْ تِيْكِلِى كَارَكِى

نَقَنْج كِرِيَه (بَشْدَارِى شَرِيْنْ دِنْ بُونَه لِيْبَلِىَ بَشْدَارِى شَرِىَ تَبُكِىَ نَبُونَه)؛ هِيْڤِى هَيَه كُو خُدِىَ تُوبَا وَانْ قَبُولْ بِكَه. بِرَاسْتِى ژِى خُدِىَ گُنَهْڤَشِيْرَه، دِلُوْڤَانَه.

١٠٣. ژِ مَالِيْنْ وَانْ زَكَاتِىَ وَرْگِرَه، دَا كُو (اَوْ زَكَاتْ ژِ گُنَهَانْ) وَانْ پَاقِژْ بِكَه و وَانْ خودَانْ خِيْرْ بِكَه و ژِ بُوْ وَانْ دُعَا بِكَه. بِيْگُمَانْ دُعَايِيْنْ تَه ژِ وَانْ رَه دِلْرِحَتِى يَه. خُدِىَ بِهِيزَرَه، زَانَا يَه.

١٠٤. مَا هِىَ ژِى اَوْ نِزَانِنْ كُو خُدِىَ هَرْ اَوَه يِىَ كُو ژِ بَنْدَيِىَ خوه تُوبِىَ دِپَژِرِينَه و صَدَقَانْ قَبُولْ دِكَه. بِيْگُمَانْ خُدِىَ هَرْ اَوَه يِىَ تُوْبَپَژِيْرْ، يِىَ دِلُوْڤَانْ.

١٠٥. (ژِ وَانِيْنْ كُو تُوبَه كِرِنْ رَه) بِبِيْژَه: هُونْ بِخَبِتِنْ، ڤِيْجَا خُدِىَ، پِيْخَمْبَرِىَ وِى و بَاوَرْمَنْدْ دِىَ خَبَاتَا وَه بِبِينِنْ. پِشْتْرَه هُونِىَ لِعَالِمِىَ بِيَا لِبَرْ چَاڤْ و نَپَنْدِى بِيْنْ ڤَگَرَانْدِنْ. ڤِيْجَا بِكَارْ و كِرْيَارِيْنْ كُو وَه كِرِنَه اَوِىَ وَه ئَاگَاهْدَارْ بِكَه.

١٠٦. (ژِ وَانِيْنْ كُو نَچُونَه سَفَرَا تَبُوكِىَ) هِنَكِيْنْ دِنْ ژِى هَنَه كُو اَوْ لِهِيْڤِيَا فَرْمَانَا خُدِىَ هَاتِنَه هِشْتِنْ. خُدِىَ، يَانْ وِىَ عَذَابْ بِدَه وَانْ ئَانْ ژِى دِىَ تُوبَا وَانْ قَبُولْ بِكَه. خُدِىَ زَانَا يَه كَارْبِنَجِهَه.

١٠٧. اَوْ (مُنَافِق)ـيْنْ كُو وَانْ مِزْگَفْتَكْ ئَاڤَا كِرْ دَا كُو پِىَ زَرَارِىَ بِدِنْ (بَاوَرْمَنْدَانْ)، كَافِرِيِىَ بِهِيْزْ بِكِنْ و دُوبَنْدِيِىَ تِيْخِنْ نَاڤْ بَاوَرْمَنْدَانْ و چَاڤْنِيْرِيَا وِى مِرُوْڤِى دِكِنْ كُو هِىَ بَرِى ڤِيْگَا شَرِىَ خُدِىَ و پِيْخَمْبَرِىَ وِى كِرِيَه. اَوْ صُوْنْدْ دِخُونْ (و دِبِيْژِنْ كُو) مَه بِڤِىَ ژِ قَنْجِيِىَ پِىَ ڤَه تِشْتَكِى دِنْ نَخوسْتِيَه. حَالْ اَڤَه كُو خُدَايِىَ پَاكْ و بِلِنْدْ، شَهْدَيِيِىَ دِدَه كُو بِيْگُمَانْ اَوْ دَرَوْكَارِنْ.

١٠٨. تِه جَارْ لِىَ نَرَاوَسْتَه و تِىَ دَه نِمِيْژْ مَكَه! مِزْگَفْتَكَه كُو ژِ رُوْژَا پِيْشِى ڤَه لِسَرْ بِنْگَهَا تَقْوَايِىَ هَاتِيَه ئَاڤَاكِرِنْ، تَقَزْ رَاسْترَه كُو تُو تِىَ دَه نِمِيْژْ بِكِى. دِ وِىَ دَه هِنْ زِلَامِيْنْ وَلِىَ هَنَه كُو حَزْ دِكِنْ خوه (ژِ گُنَهَانْ) پَاقِژْ بِكِنْ. خُدِىَ ژِى، ژِ يِىَ خَوه پَاقِژْ دِكَه، حَزْ دِكَه.

١٠. (ژێ رَه تِێ گۆتِنْ): هَا اَڤ، ژِ بَرْ کَارْ و کِرْیَارِێنْ تَه یَه. تَقَزْ خُدِێ لِبَنْدَیێنْ خوه ظُلْمِێ نَاکَه.

١١. هِنْ ژِ مِرُۆڤانْ هَنَه کُو عِبَادَتِێ خُدِێ نَه ژِ دِلْ دِکِنْ، ڤێجا اَگَرْ قَنْجیَكْ لِوی بِبَه پێ کێفْخَوشْ دِبَه و اَگَرْ بَلایَكْ بِسَرْ دَه وَرَه رُویێ خَوه دِگُهَرینَه (ژِ دینْ دَرْدِکَڤَه). بِڤێ رَوْشێ لِدِنْیَا و ئَاخْرَتِێ زیَانْ کِریَه. خَسَارَتَا اَشْکَرَا هَا اَڤْ بِخَوه یَه.

١٢. اَوْ ژِ بِلی خُدِێ ژِ وِی یێ کُو نَه دِکَارَه زَرَارِێ بِدَه و نَه ژِی دِکَارَه فَیدِێ بِدَه وِی عِبَادَتِێ دِکَه. هَا رێشَاشیَا دُورْ اَڤَه.

١٣. اَوْ پَرَسْتِنَا یَکی دِکَه کُو (لِگُوری عَاقِلْ) زَرَارَا وِی ژِ فێدَیَا وِی نێزیکْتِرَه. اَوْ (یێ کُو مِرُۆڤێ کَافِرْ پَرَسْتِنَا وِی دِکَه) چِه پیسْ ئَاریکَارَه و چِه پیسْ هَڤَالَه!

١٤. بێگُمَانْ خُدِێ، دِێ وَانْ کَسێنْ کُو بَاوَری ئَانینْ و کَارێنْ قَنْجْ کِرِنْ بِخَه بِهِشْتێنْ کُو دِبِنێ وَانْ رَه چَمْ دِهَرِکِنْ. بێگُمَانْ خُدِێ تِشْتِێ کُو بِڤێ دِێ بِکَه.

١٥. چِه کَسێ گُمَانْ بِکَه کُو خُدِێ لِدِنْیَا و ئَاخْرَتِێ دِێ ئَاریکَارِیَا پێخَمْبَرْ نَکَه، بِلا بوسِلَیکِێ بِگِرَه؛ بِبَالْ ئَاسیمَانْڤَه هِلْکِشَه، پَاشێ ئَارکَارِیَا کُو ژِ ژُورْ ڤَه تِێ بِبِرَه. ڤێجَ بِلا بِنێرَه؛ گَلُۆ اَڤْ کَارێ وِی یَا کُو وِی ژێ هێرْسْ دِكَ ژِ حُوْلِێ رَادِکَه؟

١٦. هَرْ وِهَا مَه قُرْئَانْ بِئَایَتێنْ اَشْکَرَا هِنَارْتِیَه. تَقَزْ خُدِێ یێ بِڤێ وِی رَاسْتَرِێ دِکَه.

١٧. اَوێنْ کُو بَاوَری ئَانینَه و یێنْ بُونَه جِهُو، صَابِئینْ، فِلَه، مَجُوسی و یێنْ مُشْرِكْ، بێگُمَانْ خُدِێ رُوژَا قِیَامَتِێ دِێ بِحُکْمِێ خَوه وَانْ ژِ هَڤْ بِقَتینَه. بێگُمَانْ خُدِێ لِسَرْ هَرْ تِشْتی شَهیدَه.[1]

١ الشَهیدْ: اَوێ کُو لِسَرْ مَخْلُوقێ خَوه حَازِرْ و زیرَڤَانَه. لِسَرْ خَوه بیَکتِی و دَادپَرْوَرِیێ شَهدَییێ دِدَه و دَمَا بَاوَرْمَنْدْ وِی یَكْ دِدیرِنْ لِسَرْ رَاسْتیتِیَا وَانْ شَهدَییێ دِدَه و ژِ بُۆ پێخَمْبَرْ و مَلائِکَتَانْ ژِی شَهدَییێ دِدَه.

خُدِێ بَحْسَا اُوْلیێنْ لِسَرْ اَرْدِێ دِکَه. کُو اَوْ مُسلمَانْ، یَهُودی، فِلَهْ، صَابِئی، مَجُوسی و مُشْرِکِنْ. خُدِێ رُوژَا قِیَامَتِێ وَانْ لِهَڤْ کُومْ دِکَه و بِوِی حُکْمِێ خَوه یێ عَادِلْ دِنَاڤْبَرَا وَانْ دَه حُکِمْ دِدَه. وَانْ ژِ هَڤْ

١٨. مَا تُو نزَانى اَوێنْ كُو لِئَاسِيمَانانْ و اَوێنْ كُو لِاَرْدىَ نَه؛ رُوژْ، هَيفْ و سْتێرْ، چيَا و دَارْ، حَيْوَانْ و گَلَكْ ژ مرُوٚڤانْ ژى، ژ خُدىَ رَه دِچنْ سِجُودىَ و ژ گَلَكَانْ رَه ژى عَذَابْ حَقْ بُويَه. خُدىَ كِىَ رَبَنْ و پێقِيمَتْ بِكَه اِيْدى تُو كَسْ تُنَه كُو قَدْرِىَ وِى بِگرَه. بێگُمَانْ خُدىَ يَا كُو بِڤِىَ دِكَه.

١٩. اَڤْ هَرْدُو جِڤَاتْ، (بَاوَرْمَنْدْ و كَافِرْ) دِژْرَابَرِىَ هَڤنْ، دَرْ بَارِىَ خُدَايىَ خَوه دَه بِهَڤْ كَتنَه. ڤێجَا يێنْ كُو كَافِرْ بُونَه ژ وَانْ رَه جِليێنْ ژ ئَاگِرْ هَاتِنَه دِرُوتِنْ كُو بِسَرْ سَرێنْ وَانْ دَه ژى ئَاڤَا كَلِى دِىَ وَرَه رِژَانْدِنْ!

٢٠. بِوِىَ (ئَاڤَا كَلِى) نَاڤْ و هِنَاڤێنْ وَانْ تێنْ حَلانْدِنْ و چَرْمێنْ وَانْ (تێنْ بِرَاشْتِنْ!)

٢١. گُرْزێنْ هَسِنى ژى ژ وَانْ رَه هَنَه!

٢٢. ژ بَرْ خَمْ و عَذَابْ، هَرْ جَارَا كُو دِخوازنْ ژ دُوژَهِىَ دَرْكَڤِنْ دِيسَا لِورْ تێنَه ڤَگَرَانْدِنْ و (ژ وَانْ رَه تِىَ گُوٚتِنْ): دَه عَذَابِىَ شَوَاطْ تَعْمْ بِكِنْ!

٢٣. بێگُمَانْ اَوێنْ كُو بَاوَرى ئَانِينْ و كَارێنْ قَنْجْ كِرنَه خُدىَ دِىَ وَانْ بِخَه بِهِشْتێنْ كُو دِبِنِىَ وَانْ دَه چَمْ دِهَرِكِنْ. اَڤْ تێدَه بِبَازِنێنْ زێرْ و لُوٚلُئَانْ تێنَه خَملانْدِنْ و جِليێنْ وَانْ ژى تێدَه ژ هَڤْرِيشِمَه.

٢٤. بِبَالْ گُوٚتِنێنْ هَرى خَوشْ ڤَه هَاتِنَه رَاسْتَرێكِرنْ و بِبَالْ رِيَا خُدَايىَ حَمِيدْ (پَسْنَانْدَه) ڤَه هَاتِنَه هِيدَئَايَتْكِرنْ.

٢٥. بێگُمَانْ اَوێنْ كَافِرْ بُونَه و رِيَا خُدىَ و مَسجِدُلْحَرَامِىَ لِبَرْ خَلْكِىَ دِگرِنْ، اَوْ (مَسجِدُلْحَرَامْ) ئَا كُو مَه اَوْ ژ هَمُو مرُوٚڤانْ -يێنْ نشتَجِه و يێنْ ژ دَرْڤَه هَاتِنْ. رَه

صَافِى دِكَه؛ كَا كي لِدنْيَايىَ لِسَرْ رِيَا رَاسْتْ بُو و كِى لِسَرْ رِيَا شَاشْ بُو. خُدىَ دِىَ وَانْ لِسَرْ كِرنێنْ وَانْ جزَا بِكَه. لَوْرَا خُدىَ تَڤكِىَ عَملِىَ وَانْ نِڤِيسيَه، تُومَارْ كِريَه و لِسَرِىَ بُويَه شَاهِدْ. ژ بَرْ ڤِىَ يَكِىَ؛ دِ دَاوِيَا ئَايَتِىَ دَه «خُدىَ لِسَرْ هَرْ تِشْتى شَهِيدَه» گُوٚتيَه.

وَكْهَفْ گِرْتيَه و اَوْ كَسىٚ دِكَعْبِيىٚ دَه بِستَمْكَارِى ژ رَاسْتِيىٚ اَڤرِىٚ بِبَه اَمِىٚ عَذَابَكِى جَانْسُوژْ بِوِى بِدِنْ چِيژَانْدِنْ.

**٢٦.** دَمَا كُو مَه جِهِىٚ مَالَا خُدِىٚ ژ اِبْرَاهِيمْ رَه دِيَارْ كِرْ و (مَه ژِىٚ رَه گُوْتْ): ژ مِنْ رَه تُو تِشْتِى هَڤْپِشْكْ نَكِرَه و مَالَا مِنْ ژِ طَوَافْكَرَانْ، نِمِيژْكَرَانْ، رِكُوعْكَرَانْ و سَجْدَبِرَانْ رَه پَاقِژْ بِكَه.

**٢٧.** دِنَاڤْ مِرُوٚڤانْ دَه ژِ بُوٚ چُونَا حَجِىٚ گَازِى بِكَه كُو بِيِنْ پِيَا و بِيِنْ سُوَارْ لِسَرْ حَيْوَانِيِنْ وَزَا و وَسْتِيَايِى ژ هَرْ رِيِيِنْ دُورْ ڤَه وَرِنْ جَمْ تَه (سَرْدَانَا كَعْبِىٚ بِكِنْ).

**٢٨.** دَا كُو ژِ بُوٚ خَوه (دِحَجِىٚ دَه) بَرْژَوَنْدِيَانْ (اِيْنْ دِنِيَايِى و ئَاخْرَتِى) بِبِينِنْ، دَا كُو نَاڤِىٚ خُدِىٚ لِسَرْ شَرْژِيكِرِنَا حَيْوَانِيِنْ قُرْبَانِىٚ بِبِيژِنْ، اَوِيْنْ كُو مَه بِرِزْقِينِى دَايَه وَانْ. ڤِيجَا ژ (گُوشْتِىٚ) وَانْ بِخُونْ و بِدِنْ ژَارْ و خِزَانَانْ ژِى.

**٢٩.** پَاشِىٚ بِلا قِرِيژَا خَوه ژ سَرْ خَوه رَاكِنْ و بِلا قُرْبَانِيِنْ كُو لِسَرْ خَوه نَزِرْ كِرِبُونْ بِينِنْ جِهْ و بِلا وِىٚ مَالا قَدِيمْ (كَعْبِىٚ) طَوَافْ بِكِنْ.

مَبَسْتْ ژ ژِيبِرِنَا قِرِيژِىٚ اَڤْه كُو پُورَا خَوه كُرْ بِكِنْ، نِينُوكِيِنْ خَوه ژِىٚ بِكِنْ و خَوه تَامْ پَاڤِژْ بِكِنْ.

**٣٠.** رَوشْ اَڤْه؛ كِى كُو رِيزْ لِفَرْمَانِيِنْ خُدِىٚ بِگِرَه، اَڤْ لِجَمْ خُدَايِىٚ وِى ژِىٚ رَه چِيتِرَه. (دِ دِينْ دَه اَوِىٚ كُو حَرَامبُونَا وَانْ) ژِ وَه رَه هَاتِيَه خَونْدِنْ، اَوْ نَه تِيْدَه يَه، حَيوَانِيِنْ دِنْ ژِ وَه رَه هَاتِنَه حَلَالْكِرِنْ. نَاخوه، ژِ وَانْ پُوتِيِنْ كُو اَوْ پِيسِنْ خَوه دُورْ بِگْرِنْ و ژِ شَادَزُوٚرِيىٚ ژِى خَوه بِپَارِيزِنْ.[1]

---

١ (دِ دِينْ دَه اَوِىٚ كُو حَرَامْبُونَا وَانْ) ژِ وَه رَه هَاتِيَه خَونْدِنْ، اَوْ نَه تِيْدَه يَه، حَيوَانِيِنْ دِنْ ژِ وَه رَه هَاتِنَه حَلَالْكِرِنْ. اَوِيْنْ كُو حَرَامْبُونَا وَانْ هَاتِيَه گُوتِنْ ژِ سُورَهِيىٚ اَنْعَامْ ئَايَتَا ١٤٥ىٚ وِىٚ بَيَانْ دِكَه: (رَسُولِىٚ مِنْ!) بِبِيژَه: اَزْ دِ يَا كُو ژِ مِنْ رَه هَاتِيَه ئَاگَاهْكِرِنْ دَه، ژِ نَانْخُورَكِى رَه، رَاسْتِى تِشْتَكِى حَرَامْكِرِى نَايِيمْ، ژِ بِلِى

**٣١.** ژِ دینێن پُوچ بَریێ خَوه ڤَگَرینن؛ بَریێ خَوه بِدن دینێ خُدێ و ژێ رَه هَڤپشکَان چێنَکن. ڤێجا کی تشتَکی ژِ خُدێ رَه بکَه هَڤپشك، هَر وَکی اَو ژِ ئَاسمێن کَتبَه خَوارێ، ڤێجا طَیرَك هێ لِهَوَا خَوه لیێ بِدَه، یَان ژی بَا وِی بَاڤێژێ جهکی دُور و کُور.

**٣٢.** رَوش اَڤَه؛ کی، نیشَانێن خُدێ مَزن بدێرَه (ژِ حُکم و فَرمَانێن وِی رَه ریزدَار بَه) بێگُمَان اَو ژِ تَقوادَاریَا دِلانَه.

**٣٣.** ژِ بُو وَه دوَان (حَیوَانێن قُربَانیێ) دَه، حَیَانی دَمَکَه نَاڤلێکری (کُو دَمَا سَرژێکرنَا وَانَه) هِن فَیدَه هَنَه (مینَا سوَاربُون، شیر و هریَا وَان). پشترَه جهێ قُربَانکرنَا وَان مَالا پیرُوزَه (کُو اَویێ لِکَعبێ بێن سَرژێکرن).

**٣٤.** مَه ژِ هَر اُمَّتێ رَه قُربَانگَهَك دَانیَه دَا کُو لِسَر سَرژێکرنَا وَان تَرشَان (دَڤَه، دوار، پَزێن) کُو وَك رِزق مَه دَایَه وَان نَاڤێ خُدێ بینن. (گَلی مرُوڤَان!) خُدَایێ وَه خُدَایکی یکَه، ڤێجا رَادَستی بَر فَرمَانَا وی ببن. مزگینێ بدَه وَان کَسێن کُو ژِ بُو خُدێ خَوه دشکینن و دلنزمن!

**٣٥.** اَوێن کُو دَمَا (نَاڤێ) خُدێ تێ گُوتن، دلێن وَان دلرزَه و دَمَا بَلایَك پێ سَریێ وَان خَوه رَادگرن، نمێژێ بَئَاوَایێ پێدڤی دکن و ژِ رِزقێ مَه دَایَه وَان (دریَا خُدێ دَه) خَرج دکن.

**٣٦.** مَه (قُربَانکرنَا) حَیوَانێن گر ژِ وَه رَه کریَه نشَانێن دینێ خُدێ، دوَان دَه ژِ بُو وَه خێر و پێر هَیَه. نَاخَوه دَمَا وَه لِسَر سێ لِنگَان ژِ پیَا سَرژێکرن، لِسَر وَان (نَاڤێ) خُدێ بینن و دَمَا کُو بسَر کێلَکَا خَوه ڤَه کَتن (سَرژێکرنَا وَان هَاتَه جه)، اِیدی ژێ بخُون و بیێن خُودی اِحتیَاج و یێن نَه خَودی اِحتیَاج ژی بدن خَوارن. هَر وِسَا مَه اَڤ حَیوَان ژِ وَه رَه بَردَست کرنَه دَا کُو هُون سپَاسیَا من بکن.

---

کُو مرَار بَه یَان خُوینَا هَرك بَه یَان گُوشتێ بریژ بَه، ڤێجا بێگُمَان اَو چپَل و پیسن. یَان ژی بفَرمَانشکێنی کُو نَه ژِ بُو خُدێ بێتَه سَرژێکرن (اَو ژی چپَل و پیسن).

٣٧. نَه گُوشْتێ وَانْ قُرْبَانَانْ نَه ژِى خُوينَا وَانْ دِگِهِيژَه خُدێ، لِێبَلێ بَسْ تَقْوَهدَارِيَا وَه دِگِهِژِيێ. هَرْ وِهَا خُدێ اَڤْ حَيْوَانْ ژِ وَه رَه سَرْنَرمْ كِرِنَه دَا كُو هُونْ خُدێ مَزِنْ بِدێرِنْ و مِزْگِينِێ بِدَه قَنْجِيكَارێنْ رَاسْتْ و دُرِسْتْ!

٣٨. بِێگُمَانْ خُدێ بَرَڤَانِيَا يێنْ كُو بَاوَرِى ئَانِينَه دِكَه. بِێگُمَانْ خُدێ ژِ تُو خَايِنْ و نَانْكُورَانْ حَزْ نَاكَه.

٣٩. ژِ بُوْ وَانْ (بَاوَرْمَنْدِ)ێنْ كُو شَرێ وَانْ تێ كِرِنْ ژِ بَرْ ظُلْمَا كُو لِوَانْ هَاتِيَه كِرِنْ دَسْتُورَا وَانْ (بِجَنْگْكِرِنێ) هَاتِيَه دَايِنْ. بِێگُمَانْ خُدێ لِسَرْ ئَارِيكَارِيَا وَانْ قَادِرَه.

٤٠. اَوێنْ كُو بَسْ ژِ بُوْ دِگُوْتِنْ: «پَرْوَرْدَگَارێ مَه «اللهَ»»، بِنَحَقِى ژِ مَالێنْ خَوه هَاتِنَه دَرْئَانِينْ. اَگَرْ خُدێ هِنْ مِرُوْڤ بِهِنَكَانْ نَدَابَا ئَالِى، مِسُوگَرْ دێ كَشِيشْخَانَه، دێرْ، كَنِيشْتْ و مِزْگَفْتێنْ كُو نَاڤێ خُدێ دِوَانْ دَه پِرْ تێ گُوْتِنْ بِهَاتَانَا خَرَاكِرِنْ. كَسێ كُو ئَارِيكَارِيَا (دِينێ) خُدێ بِكَه تَقَزْ خُدَا ژِى دێ ئَارِيكَارِيَا وِى بِكَه. بِێگُمَانْ خُدێ هێزْدَارْ و دَسْتْهِلاتْدَارَه.

٤١. اَوێنْ كُو اَگَرْ اَمْ لِسَرْ اَرْدێ دَسْتْهِلاتِيێ بِدِنْ وَانْ، دێ نِمێژێ بِشَكْلێ پێدِڤِى بِكِنْ، زَكَاتَا مَالێ خَوه بِدِنْ، فَرْمَانَا بِقَنْجِيێ و نَهْيَا ژِ نَقَنْجِيێ بِكِنْ و هَرْ ژِ خُدێ رَه يَه اَنْجَامَا كَارْ و كِريَارَانْ.

٤٢. (يَا مُحَمَّدْ!) اَگَرْ اَوْ بِتَه بَاوَرِى نَيِينِنْ، ڤێجَا بِێگُمَانْ بَرِيَا وَانْ گَلێ نُوحْ، عَادْ و سَمُودْ ژِى پێخَمْبَرێنْ خَوه دَرَوْكَرْ دێرَابُونْ.

٤٣. گَلێ اِبْرَاهِيمْ و گَلێ لُوطْ ژِى (پێخَمْبَرێنْ خَوه دَرَوْكَرْ دێرَابُونْ).

٤٤. گَلێ مَدْيَنێ ژِى (پێخَمْبَرێ خَوه شُعَيبْ) دَرَوْكَرْ دێرَانْدِنْ. مُوسَا ژِى دَروِينْ هَاتبُو دێرَانْدِنْ. ڤێجَا مَه مُهْلَتْ دَا كَافِرَانْ، پِشْتْرَه مَه اَوْ بِعَذَابْ گِرْتِنْ، ڤێجَا (بِنێرَه) نَقَايِلِيَا مِنْ لِهَمْبَرِى وَانْ كَا چَاوَا بُو؟

**٤٥.** گَلَكْ وَلاتِيّنْ كُو خَلْكِىَ وِى ظَالِمْ بُونْ مَه اَوْ هَلاكْ كِرِنْ. ڤِيّجَا خَانِيِيّنْ وَانْ بِسَرْ هَڤْ دَه هَرِفِينَه و بِير(يّنْ ئَاڤِىَ) بِيّخَودِى نَه و كُوشْكِيّنْ دِيوَارْبِلِنْدْ و خُوشِكْ (پِيّكَسْ مَانَه).[١]

**٤٦.** اَرِىَ مَا اَوْ لِسَرْ اَرْدِىَ نَاگَرِنْ، ڤِيّجَا كُو ژِ وَانْ رَه دِلْ هَبِنْ كُو پِىَ تِيّبِگَهِژِنْ و عِبْرَتْ بِگِرِنْ و گُه هَبِنْ پِىَ سَحْ بِكِنْ و فَهمْ بِكِنْ. ڤِيّجَا بِرَاسْتِى كُوّرَايِى نَه كُوّرَايِيَا چَعْڤَا يَه، بَلْكِى كُوّرَايِى يَا دِلِىَ دِسِينْگَانْ دَه يَه.

**٤٧.** (يَا مُحَمَّدْ!) اَوْ لَزَا هَاتِنَا عَذَابْ ژِ تَه دِكِنْ. خُدِىَ هِيچْ ژِ پِيّمَانَا خوه ڤَنَاگَرَه. بِيّگُمَانْ رُوژَكَه لِجَمْ خُدَايِىَ تَه، بَرَانْبَرِى هَزَارْ صَالِيّنْ كُو هُونْ دِژمِيّرِنْ.[٢]

**٤٨.** پِرْ وَلاتِيّنْ كُو (خَلْكِىَ وَانْ) ظُلمْ دِكِرِنْ مِنْ مُهْلَتْ دَا وَانْ، پَاشِىَ مِنْ اَوْ (بِعَذَابْ) هَلاكْ كِرِنْ و ڤَگَرْ هَرْ بِبَالْ مِنْ ڤَه يَه.

**٤٩.** بِبِيّژَه: گَلِى مِرُوّڤَانْ! اَزْ ژِ بُوّ وَه تَنِىَ هِشِيَارْكَرَكِى اَشْكَرَا مَه.

**٥٠.** هَرْچِى اَوِيّنْ كُو بَاوَرِى ئَانِينْ و كَارِيّنْ ڤَنْجْ كِرِنَه، ژِ بُوّ وَانْ لِيّبُورِينْ و رِزْقَكِى بِرُومَتْ هِيَه.

**٥١.** هَرْچِى اَوِيّنْ كُو پِيّشْبَازِيِىَ دِكِنْ دَا كُو دَئَايَتِيّنْ مَه دَه مَه پِيّچَارَه بِهِيّلِنْ، هَا اَوْ خَلْكِىَ دُوژَهِىَ نَه.

**٥٢.** مَه بَرِيَا تَه هَرْ چِڤَاسْ رَسُولْ و نَبِيَكْ شَانْدِبَه، دَمَا وِى تِشْتَكْ دَاخَوازْ كِرِيَه، شَيْطِيّنْ

---

١ خُدِىَ تَعَالٰى دِ ڤِىَ ئَايَتِيّدَه بَيَانْ دِكَه وِى گَلَكْ گُنْدْ و بَاژَارْ بِسَدَمَا ظُلْمَا كُو كِرِنْ وِيّرَانْ كِرِيَه. وَانْ، اِنْكَارَا خُدِىَ دِكِرْ و بِپِيّخَمْبَرِيّنْ وِى بَاوَرِى نَدئَانِينْ، ڤِيّجَه اَوْ بُو سَدَمَا هَلاكَا وَانْ و وِيّرَانْكِرِنَا بَاژَارِيّنْ وَانْ. اَڤْ وَاطَه دِ گَلَكْ ئَايَتَانْ دَه اَشْكَرَه و ڤَكِرِى هَاتِيَه. يَكْ ژِ وَانْ ژِ سُورَهيِىَ طَلاقْ دِ ئَايَتَا ٨-١٠ىَ دَه «گَلَكْ ژِ خَلْكِىَ وَلاتَانْ ژِ فَرْمَانَا خُدَايِىَ خوه و پِيّخَمْبَرِىَ وِى دَرْكَتِنْ، ڤِيّجَا مَه اَوْ كِشَانْدِنْ حَسَابَكِى دِژْوَارْ و مَه اَوْ بِعَزَابَكِى كَسْنَدِيتِى جَزَا كِرِنْ. وَانْ جَزَايِىَ كَارْ و كِرِيَارِيّنْ خوه تَعْمْ كِرِنْ و دَاوِيَا رَوْشَا وَانْ ژِى زِيَانَه. خُدِىَ ژِ وَانْ رَه عَزَابَكِى دِژْوَارْ ئَامَادَه كِرِيَه..»

٢ زَمَانْ، اِيزَافِى يَه. نَخَاسِمْ گَاڤَا مِرُوّڤ دِخوازِنْ زُو زَمَانْ دَرْبَاسْ بِبَه، اَوْ زُو دَرْبَاسْ نَابَه بَلْكِى رُوژَكْ بِڤَاسِى صَالْ و زَمَانَانْ دِرِيّژْ تِىَ گُمَانْكِرِنْ. اَڤْ ژِى نِيشَانْ دِدَه كُو زَمَانْ اِيزَافِى يَه. هَزَارْ صَالِىَ كُو اَمْ دِژْمِيّرِنْ لِجَمْ خُدِىَ بِڤَاسِى رُوژَكِىَ كِنَه. لَوْرَا پَارْچِيَكِى زَمِيّنْ يِىَ كُو ژِ بُوّ خُدِىَ سَرِىَ وِى و بِنِىَ وِى دِيَارْكِرِى بَه تُنَه يَه. لِنِكْ خُدِىَ پِيّدَاوِيبُونْ و هَرُوهَرِى هِيَه.

هَرْ حَولْ دَايَه كُو تِشْتَكى (فَسَادِيكَىٰ، ئَاسْتَنْگيكَىٰ) بَاڤِيژَه نَاڤْ دَاخوازَا وِى دَه. ڤِيْجَا خُدِىٰ يَا كُو پَلِيدْ دَاڤِيژَه دِلِىٰ وَانْ پُوچْ دِكَه. پِشْتْرَه خُدِىٰ ئَايَتِيْنْ خوه بِسَاغْلَمى بِجهْ دِكَه. خُدِىٰ زَانَا يَه، كَارْبنَجِهه.

٥٣. (خُدِىٰ ڤِىٰ دَسْتُورِىٰ دِدَه شَيْطِيْنْ) دَا كُو اَوْ تِشْتِىٰ كُو شَيْطَانْ زِيْدَه دِكَه ژِ بُوْ وَانِيْنْ كُو دِدلِيْنْ وَانْ دَه نَخَوشى(يَا نِيفَاقِىٰ) هَيَه و ژِ بُوْ وَانِيْنْ كُو دِلِيْنْ وَانْ (بپُوتپَرَسْتِيِىٰ) هِشْكْ و هُولا بُويَه بِكَه (نَاڤگِينَا) جَربَانْدِنِىٰ. بِيْگُمَانْ ظَالِمْ دِنَاڤْ اِخْتِلافَكَه كُورْ دَه نَه.

٥٤. و دَا كُو اَوْ كَسِيْنْ كُو زَئَانِينْ (قُرْئَانْ) ژِ وَانْ رَه هَاتِيَه دَايِنْ، بِزَانِنْ كُو اَڤْ (قُرْئَانْ) حَقَه و ژِ جَمْ خُدَايِىٰ تَه هَاتِيَه هِنَارْتِنْ. ڤِيْجَا دَا كُو بَاوَرِى پِىٰ بِينِنْ و دِلِيْنْ وَانْ پِىٰ ئَارَامْ بِبَه. بِيْگُمَانْ خُدِىٰ بَرِىٰ وَانِيْنْ كُو بَاوَرِى ئَانِينَه دِدَه بَالْ رِيَا رَاسْتْ و دُرِسْتْ ڤَه.

٥٥. اَوِيْنْ كُو كَافِرْ بُونَه دَرْ بَارِىٰ قُرْئَانِىٰ دَه هَرْ دِنَاڤَا شِكْ و گُمَانِىٰ دَه نَه، حَيَانِى كُو ژِ نِشْكَا ڤَه قِيَامَتْ بِسَرْ وَانْ دَه بِىٰ يَانْ ژِى عَذَابِىٰ رُوژَكَه بِىٰ خِيْرْ (كُو اَوْ رُوْژَا قِيَامَتِىٰ يَه) بِيْتَه وَانْ.

٥٦. وِىٰ رُوژِىٰ حُكمْرَانِى بَسْ يَا خُدِىٰ يَه. اَوْ دِنَاڤْ وَانْ (بَاوَرْمَنْدْ و كَافِرَانْ) دَه حُكمْ دِدَه. هَرْچِى اَوِيْنْ كُو وَانْ بَاوَرِى ئَانِينَه و كَارِيْنْ قَنْجْ كِرِنَه اَوْ دِنَاڤْ بِهِشْتِيْنْ خُدَانْ نِعْمَتْ دَه نَه.

٥٧. هَرْچِى اَوِيْنْ كُو كَافِرْ بُونَه و بَاوَرِى بَئَايَتِيْنْ مَه نَئَانِينَه، هَا ژِ بُوْ وَانْ عَذَابَكِى رِسْوَاكَرْ و دِژْوَارْ هَيَه.

٥٨. اَوِيْنْ كُو وَانْ دِرِيَا خُدِىٰ دَه هِجْرَتْ كِرِنَه، پِشْتْرَه ژِى هَاتِنَه كُشْتِنْ يَانْ ژِى دِكُوْچبَرِيَا خوه دَه مِرِنَه، بِيْگُمَانْ خُدِىٰ دِىٰ (لِبِهِشْتِىٰ) رِزْقَكِى سپَحِى بِدَه وَانْ و بِيْگُمَانْ خُدِىٰ هَرْ اَوَه چِيْتِرِينِىٰ رِزقْدَارَانْ.

٥٩. خُدِىٰ دِىٰ وَانْ بِخَه جِهَكِى كُو وَانْ مَمْنُونْ بِهِيْلَه و بِيْگُمَانْ خُدِىٰ هَرْ زَانَا يَه، بِيْهِنْفَرَهَه.

٦٠. رَوشْ اَڤْه؛ چِه كَسِىٰ كُو ظُلِمْ لِىٰ هَاتبَه كِرِنْ خُدِىٰ دَسْتُورْ دَايَه كُو بِقَاسِى ظُلْمَا لِىٰ

هَاتيَه كِرِنْ تُولَا خَوه ڤَكَه، پِشْتِى ڤِىَ دِيسَا كُو اِيْرِيشْ و ظُلِمْ لِىَ وَرَه كِرِنْ، مُحَقَّقْ خُدِىَ دِىَ ئَارِيكَارِيَا وِى بِكَه. بێگُمَانْ خُدِىَ بَخْشَنْدَه يَه، گُنَهْژِێبِرَه.

٦١. اَڤَا مَه گُوْتِى رَاسْتَه؛ بِسَدَمَا كُو خُدِىَ شَڤِىَ دِخَه سَرْ رُوژِىَ و رُوژِىَ ژِى دِخَه سَرْ شَڤِىَ، بێگُمَانْ خُدِىَ بِهِيزَرَه، بِينَرَه.

٦٢. اَڤَا مَه گُوْتِى رَاسْتَه؛ بِسَدَمَا كُو بِرَاسْتِى ژِى خُدَا، اَوْ هَرْ حَقْ بِخَوه يَه و اَوێنْ كُو ژ بِلِى خُدِىَ پَرَسْتِنَا وَانْ دِكِنْ اَوْ تَڤْ پُوچْ (و بَاطِلِ )نْ و پێگُمَان يِىَ عَلِىّ يِىَ كَبِيرْ هَرْ خُدِىَ يَه.[1]

٦٣. مَا تُو نزَانِى كُو خُدِىَ ژِ عَوْرَانْ ئَاڤْ دَاخِسْتِيَه (و بِوِىَ ئَاڤِىَ) اَرْدْ كَسْكْ و هِێشِينْ بُويَه. بێگُمَانْ خُدِىَ هُوربِينَرَه، ئَاگَاهْدَارَه.

٦٤. چه تِشْتێنْ لِاَرْدْ و ئَاسِيمَانَانْ هَنَه تَڤْ يێنْ خُدِىَ نَه. بێگُمَانْ اَللهْ، تَڤْزْ اَوْ، دَوْلَمَنْدَه، هِێژَايِىَ پَسِنْدَايِنِىَ يَه.

٦٥. اَرِىَ مَا تُو نزَانِى خُدِىَ تِشْتِىَ دِاَرْدِىَ دَه هَيَه و اَوْ كَشْتِيێنْ كُو لِگُورِى فَرْمَانَا خُدِىَ دِدَرْيَايِىَ دَه دِكِشِنْ ژِ وَه رَه سِتُوخَوارْ كِرِنَه. خُدِىَ ئَاسْمِێنْ رَادِگِرَه دَا كُو نَكَڤَه سَرْ اَرْدِىَ، ژِ بِلِى كُو اَوْ دَسْتُورْ بِدَه. بێگُمَانْ خُدِىَ ژِ بُوْ مِرُوْڤانْ رَوُفَه، رَحِيمَه.[2]

٦٦. يِىَ كُو (ژِ تُنَيِى) هُونْ سَاغْ كِرِنَه خُدِىَ يَه. پِشْتْرَه دِىَ وَه بِمِرِينَه، پَاشِىَ دِيسَا دِىَ وَه سَاغْ بِكَه. بێگُمَانْ اِنْسَانْ پِرْ نَانْكُورَه!

٦٧. مَه ژِ هَرْ اُمَّتَكِىَ رَه شَرِيعَتَكْ (رِيْبَازَكْ) دَانِيَه كُو اَوْ ژِى وِىَ بِكَارْ تِينِنْ. (يَا مُحَمَّدْ!)

١ العَلِىّ: اَوِىَ كُو رَوْشَا وِى بِلِنْدَه، سَرْدَسْتِيَا وِى بِلِنْدَه و زَاتِىَ وِى بِلِنْدَه، هَرْ تِشْتْ دِبِنْ سَرْدَسْتِيَا وِى و حُكمْرَانِيَا وِى دَه يَه، تُو تِشْتْ دِسَرْ وِى رَه تُنِى.

الكَبِيرْ: اَوِىَ كُو خُودِيِىَ مَزْنَاتِيِىَ يَه و ژِ هَرْ تِشْتِى مَزِنْترَه.

٢ الرَّووفْ: اَوِىَ كُو رَحْمْ و دِلُوڤَانِيَا وِى پِرْ زێدَه يَه. دِدِنْيَايِىَ دَه ژِ بُوْ هَمِى مِرُوْڤانَه و لِئَاخْرَتِىَ ژِ بُوْ هِنَكَانَه كُو اَوْ وَلِيِىَ خُدِىَ يِىَ بَاوَرْمَنْدِنْ.

نَاخَوه بِلَا دِڤِیێ دَه تُو کَسْ بِتَه رَه تِێنَکُوشَه. تُو ژِی (مِرُۆڤانْ) ڤَخُوینَه بِبَالْ خُدَایێ خَوه ڤَه. بێگُمَانْ تُو دِرِیکَه رَاسْتْ و دُرِسْتْ دَه یی.

٦٨. اَگَرْ اَوْ بِتَه رَه مُنَاقَشِیێ بِکِنْ (ژِ وَانْ رَه) بِبێژَه: خُدِیێ، بِیَا کُو هُونْ دِکِنْ بِێهْتِرْ دِزَانَه.

٦٩. خُدِیێ، رُوژَا قِیَامَتِیێ دِنَاڤْبَرَا وَه دَه، دَرْ بَارِیێ وَانْ مِژَارِیێنْ کُو وَه دِژِیتِیَا هَڤْ دِکِرْ دَه، دِیێ حُکِمْ بِدَه.

٧٠. مَا تُو نِزَانِی کُو چه تِشْتێنْ لِاَرْدْ و ئَاسِیمَانَانْ هَنَه خُدِیێ پێ دِزَانَه؟ بێگُمَانْ اَڤْ (زَانینَا خُدِیێ) دِکِتێبَکِیێ دَه (دِ لَوْحُ الْمَحْفُوظِیێ دَه) نِڤِیسَانْدِی یَه و اَڤْ رَوشْ لِبَرْ خُدِیێ هێسَانَه.

٧١. اَوْ ژِ بِلِی خُدِیێ عِبَادَتِیێ تِشْتَکِی دِکِنْ کُو خُدِیێ لِسَرِیێ تُو دَلِیلْ دَانَخِسْتِیَه و زَانِینَکَه وَانْ ژِی پێ نِینَه و ژِ بُوْ ظَالِمَانْ تُو ئَارِیکَارْ تُنَه یَه.

٧٢. دَمَا کُو ئَایَتێنْ مَه یێنْ اَشْکَرَا و رُونْکَرْ ژِ وَانْ رَه تێنْ خَونْدِنْ، تُو دِیێ ژِ رُوێێنْ وَانْ نَه رَازِیبُونِیێ (یَا لِهَمْبَرِی قُرْئَانِیێ) بِبِینِی. هِنْدِکْ دِمِینَه کُو اَوْ اِێرِیشِی وَانێنْ کُو ئَایَتێنْ مَه ژِ وَانْ رَه دِخُوینِنْ بِکِنْ. (ژِ وَانْ رَه) بِبێژَه: مَا اَزْ ژِ وَه رَه یَا ژِ ڤِیێ (هێرْسُ و نَرَازِیبُونَا وَه) خَرَابْتِرْ بِبێژِمْ؛ (اَو ژِی) ئَاگِرَه! خُدِیێ، ژِ بُوْ وَانێنْ کُو کَافِرْ بُونَه پێمَانْ پێ دَایَه. اَو، چه پِیسْ وَارْگَهه!

٧٣. گَلِی مِرُۆڤَانْ! ژِ وَه رَه دَرْبُ و مَسَلَکْ هَاتِیَه دَاینْ، ڤێجَا رِنْدْ لِیێ گُهْدَارِی بِکِنْ؛ اَوێنْ کُو ژِ بِلِی خُدِیێ هُونْ پَرَسْتِنَا وَانْ دِکِنْ و لِبَرْ وَانْ دِگَرِنْ، اَگَرْ اَوْ ژِ بُوْ وِیێ ئَارْمَانْجِیێ بێنْ جَمْ هَڤْ ژِی، اَوْ نِکَارِنْ مێشَکِیێ ژِی بَئَافِرِینِنْ. اَگَرْ مێشْ تِشْتَکِی ژِ (دَسْتِیێ) وَانْ بِرَڤِینَه، اَوْ نِکَارِنْ وِی ژِی ژِیێ ڤَگَرِینِنْ؟! یێ کُو دِخَوازَه بێ چَارَه یَه و یێ کُو ژِیێ تێ خَوهسْتِنْ ژِی بێ چَارَه یَه!

٧٤. وَانْ بَئَاوَایکِی بَابَتِی خُدِیێ، قَدْرِیێ وِی نَگِرْتِنَه. بێگُمَانْ خُدِیێ هَرْ قَوِیَّه، عَزِیزَه.[١]

١ القَوِیُّ: اَوِیێ کُو هَرْ ژِیێ رَه یَه قُدْرَتَا بێ قَیْدُ و شَرْطْ دِگَلْ مَشِیئَتَا پێکِیمَاسِی.

**٧٥.** خُدىَ هَمْ ژِ فِرِيشْتَيَانْ هَمْ ژِى ژِ مِرُوْڤانْ قَاصِدْ بژَارْتِنَه. بێگُمَانْ خُدىَ سَمِيعَه، بَصِيرَه.[١]

**٧٦.** خُدىَ، بِيَا كُو اَوْ دِكِنْ و بِيَا كُو اَوىَ بِكِنْ ژِى دِزَانَه. هَمُو كَارْ و بَارْ لِخُدىَ ڤَدگَرِنْ.

**٧٧.** گَلِى يێنْ كُو بَاوَرِى ئَانِينَه! هَرِنْ رِكُوعِىَ، هَرِنْ سِجُودِىَ، عِبَادَتِىَ خُدَايِىَ خَوه بِكِنْ و ڤَنْجِيىَ بِكِنْ دَا كُو هُونْ بِسَرْ بِكَڤِنْ.

**٧٨.** دِبَرْ (دِينِىَ) خُدىَ دَه بِرَاسْتُ و دُرِسْتِى كَارُ و خَبَاتِىَ بِكِنْ. خُدىَ (ژِ بُوْ ئَارِيكَارِيَا دِينِىَ خَوه) هُونْ بژَارْتِنَه. دِمژَارَا دِينْ دَه وِى تُو زَحْمَتِى لِوَه بَارْ نَكِرِيَه. بِدِنْ پَىْ دِينِىَ بَاڤِىَ خَوه اِبْرَاهِيمْ. خُدىَ، ژِ بَرىَ دَه و دِڤُرْئَانِىَ دَه ژِى هُونْ بِمُسِلْمَانِى نَاڤْ كِرِنَه. دَا كُو پێخَمْبَرْ (رُوژَا ڤِيَامَتِىَ) لِسَرْ وَه بِبَه شَاهِدْ و هُونْ ژِى لِسَرْ مِرُوْڤانْ بِبِنْ شَاهِدْ. نَاخَوه بِئَاوَايِىَ پێدِڤِى نِمێژْ بِكِنْ، زَكَاتَا مَالِىَ خَوه بِدِنْ و خَوه بِخُدىَ بِگِرِنْ. اَوْ دُوسْتُ و ئَارِيكَارِىَ وَه يَه، ڤێجَا اَوْ چِه خَوشْ دُوسْتَه، چِه خَوشْ ئَارِيكَارَه!

## ٢٣. سُورَه يىَ مُوْمِنُونْ

سُورَه يىَ (مُوْمِنُونْ)، (١١٨) صَدْ و هژدَه ئَايَتَه. لِمَكِّىَ دَاكَتِيَه. ڤِى سُورَه يى، نَخَاسِمْ ئَايَتێنْ وِى يێنْ پێشِينْ ژِ بَرْ كُو بَحْسَا عِبَادَتْ، اَخْلَاقْ، سِلُوكْ و نِعْمَتَانْ دِكَه كُو لِئَاخْرَتِىَ اَوْ بَاوَرْمَنْدێنْ بِڤَانْ سَالِخَانْ دىَ بِگِهِيژِنْ وَانْ و لِجِيهَانِىَ ژِى بِگِهِيژِنْ سَرْكَفْتِنِىَ، ژىَ رَه سُورَه يىَ مُومِنُونْ هَاتِيَه گُوْتِنْ.

بِنَاڤِىَ خُدَايِىَ كُو رَحْمَنَ رَحِيمَ

**١.** بێگُمَانْ بَاوَرْمَنْدْ سَرْفِرَازْ بُونَه و گِهِيشْتِنَه مِرَادَا خَوه.

العَزِيزْ: اَوىَ كُو تَڤَكِىَ وَاتِيێن عِزَّتِىَ ژىَ رَه يَه؛ سَرْدَسْتِيَا ڤُوَّتِىَ، ڤێجَا يىَ وِى تێكْ بِبَه تُنَه، سَرْدَسْتِيَا نَهِشْتِنِىَ، اِيجَارْ نَه حَوجِيىَ تُو كَسِى يَه، سَرْدَسْتِيَا تێكبِرِنْ، و سَرْكَفْتِنِىَ نَاخَوه بِىَ دَسْتُورَا وِى تُو تِشْتْ خَوه نَالَڤِينَه.

١ السَمِيعُ:اَوىَ كُو بِگُوْتِنَا پِسْتَپِسْتِى و يَا بِدِزِى، بِگُوْتِنَا اَشكَرَه و يَا خُيَا بِهِيزَرَه؛ بَلْكِى بِتَڤَكِىَ دَنْگَانْ اَوْ چِڤَاسْ هُورْ و گِرْ بِنْ ژِى و اَوىَ كُو بَرسِڤَا لاڤَاكَارَانْ دِدَه.

البَصِيرْ: اَوىَ كُو دِعَالَمَا نَه لِبَرْ چَاڤْ و يَا لِبَرْ چَاڤْ دَه بِهِمِى هِيِنَانْ بِينَرْ و دِيدَڤَانَه، هَرْ چِڤَاسْ اَوْ ڤَشَارْتِى و اَشْكَرَه، هُورْ و گِرْ بِنْ ژِى.

٢. اَوِيْنْ كُو دِنِمێژَا خَوه دَه بِتِرْسِنْ..

٣. اَوِيْنْ كُو بَرێ خَوه ژِ كَلَڤَاژِيَانْ ڤَدِگَرِينِنْ..

٤. اَوِيْنْ كُو زَكَاتَا مَالێ خَوه دِدِنْ..

٥. اَوِيْنْ كُو نَامُوسَا خَوه دِپَارێزِنْ..

٦. ژِ بِلِى هَڤْسَرُ و جَارِيێنْ وَانْ، اَوْ پێگَازِنْدِنْ..

٧. نَاخَوه كِى بِخَوازَه ژِ ڤێ و وِرْ دَه هَرَه، ڤێجَا يێنْ كُو تِخُوپێ (حَلالِيێ) دَرْبَاسْ كِرِنَه اَوِنْ.

٨. اَوِيْنْ كُو هَاىْ ژِ اَمَانَتْ و پێمَانێنْ خَوه هَنَه..

٩. اَوِيْنْ كُو لِنِمێژێنْ خَوه مِقَاتَه نَه..

١٠. هَا اَڤِنْ، اَوِيْنْ مِيرَاتْگِرْ..

١١. اَوِيْنْ كُو فِرْدَوسێ مِيرَاتَه وَرْدِگْرِنْ و اَوْ تێدَه سَرَاقَتِى دِمِينِنْ.

١٢. صُونْدْ بَه كُو مَه اِنْسَانْ ژِ حَرِيَكَه صَفَانْدِى ئَافِرَانْدِيَه.

١٣. پَاشێ مَه اَوْ كِرِيَه نُطْفَه (خُوِينْپَارَه) و دِمَالْزَارُوكێ دَه بِجِهْ كِرِيَه.

١٤. پَاشێ مَه اَوْ نُطْفَه كِرِيَه خُوِينَكَه هِشْكْ، دِپَىْ رَه مَه خُوِينَا هِشْكْ كِرِيَه پِچِكَكْ گُوشْتْ، مَه اَوْ پِچِكَا گُوشْتْ كِرِيَه هَسْتِى (سِكْلێتْ)، مَه اَوْ هَسْتِى بِگُوشْتْ كِرَاسْ كِرِيَه، پَاشێ مَه اَوْ كِرَه ئَافِرَانْدِيكِى دِنْ. ڤێجَا خُدێ پِيرُوزْ و بِلِنْدَه كُو اَوْ سِپَحِيتِرِينێ ئَافِرِينێرَانَه.

١٥. پِشْتِى ڤێ قَاسِێ بێگُمَانْ هُونێ بِمِرِنْ.

١٦. پِشْتْرَه، هُونێ رُوژَا قِيَامَتێ تَڤْزْ بێنَه ڤَژَانْدِنْ.

١٧. صُونْدْ بَه، مَه دِسَرْ وَه رَه حَفْتْ ئَاسِيمَانْ ئَافِرَانْدِنَه و اَمْ ژِ وَانْ نَه بێ هَايِنْ.

١٨. مَه ژِ عَوْرَانْ بِپِيڤَانْ (لِگُورِى پێدِڤِيێ) ئَاڤَكْ دَاخِسْتِيَه، ڤێجَا مَه اَوْ دِ اَرْدێ دَه دَايَه سَكِنَانْدِنْ و بێگُمَانْ قُوَّتَا مَه لِسَرْ بِرِنَا وێ ژِى هَيَه.

**١٩.** هَرْ وِهَا بِوِێ (ئَاڤێ) مَه ژِ وَه رَه بَاخْچێنْ خُرْمَه و تِرِى ئَانِينَه رَاسْتِێ كُو ژِ وَه رَه دِوَانْ بُوسْتَانَانْ دَه گَلَكْ مِێوَه هَنَه و هُونْ ژِ وَانْ دِخُونْ.

**٢٠.** مَه (بِوِێ ئَاڤێ) ژِ وَه رَه دَارَكْ شِينْ كِرِيَه (كُو اَوْ دَارَا زَيْتُونِێ يَه) كُو لِچِيَايێ سِينَايێ چێدِبَه. بَرِێ وِێ ژِ بُوْ كَسِێ كُو بِخَوه دِبَه رُونْ و پێخَوارِنْ.

**٢١.** بێگُمَانْ ژِ بُوْ وَه دِتَرْشَانْ (دَڤَه، دَوَارْ و پَزْ) دَه ژِى عِبْرَتْ هَنَه. اَمْ ژِ يَا دِ زِكێنْ وَانْ دَه بوَه دِدِنْ ڤَخَوارِنْ و ژِ بُوْ وَه دِوَانْ دَه هِنْ فَيْدَيێنْ دِنْ ژِى هَنَه، ژِ بِلِى ڤِێ هُونْ ژِ (گُوشْتِێ) وَانْ ژِى دِخُونْ.

**٢٢.** هُونْ لِسَرْ وَانْ و لِسَرْ كَشْتِيَانْ (بِسُوَارِى) تێنَه هِلْگِرْتِنْ.

**٢٣.** صُونْدْ بَه كُو مَه نُوحْ ژِ گَلِێ وِى رَه شَانْدْ. ڤێجَا وِى (ژِ وَانْ رَه) گُوْتْ: اَى گَلِێ مِنْ! خُدِێ بِحَبِينِنْ، ژِ وِى پِێ ڤَه ژِ بُوْ وَه تُو اِلٰه نِينِنْ. اَرِێ مَا هِێ ژِى هُونْ خَوه نَاپَارێزِنْ؟

**٢٤.** ڤێجَا (لِهَمْبَرِى ڤِێ يَكِێ)، ژِ گَلِێ وِى، گِرَگِرێنْ كُو كَافِرْبُونَه (ژِ پِيرَوێنْ خَوه رَه) گُوْتِنْ: اَوْ ژِى، تَنِێ مِرُوْڤَكى عَيْنِى وَكِى وَه يَه. اَوْ دِخَوازَه لِسَرْ وَه خَوه قُرَه بِكَه. اَگَرْ خُدِێ بِخَوهسْتَا (كُو پێخَمْبَرَكى بِشِينَه) مُحَقَّقْ دِێ فِرِيشْتَيَكْ بِشَانْدَا. مَه تِشْتَكى مِينَا ڤِێ ژِ بَاڤْ و بَاپِيرێنْ خَوه يێنْ پێشى نَبِهيسْتِيَه.

**٢٥.** اَوْ زِلاَمَكى وِسَا يَه كُو دِينِيتِيَكْ پِێ رَه هَيَه. نَاخَوه هَيَا دَمَكِێ چَاڤْدێرِيَا وِى بِكِنْ.

**٢٦.** نُوحْ گُوْتْ: خُدَايێ مِنْ! ژِ بَرْ كُو بَاوَرِى بِمِنْ نَئَانِينْ ئَارِيكَارِيَا مِنْ بِكَه!

**٢٧.** مَه پَيَامْ دَا نُوحْ كُو دِبِنْ چَاڤْدێرِيَا مَه دَه و بِئَاوَايێ كُو مَه وَحِێ ژِێ رَه رَاگِهَانْدِيَه كَشْتِيێ سَازْ بِكَه. ڤێجَا دَمَا فَرْمَانَا مَه (يَا بِهَلاَكَا وَانْ) هَاتْ و ئَاڤْ ژِ تَنُورِێ زَا و پِژِڤِى، ژِ هَرْ جِنْسَكى حَيْوَانَانْ جُوتَكى و -ژِ بِلِى وَانْ كَسێنْ كُو فَرْمَانَا مَه بِهَلاَكْبِرِنَا وَانْ هَاتِيَه- مَالْبَاتَا خَوه ژِى بِخَه كَشْتِيێ. دَرْ بَارِێ وَانْ كَسێنْ كُو ظُلِمْ كِرِنَه لِبَرْ مِنْ قَتْ نَگِرَه! بێگُمَانْ اَوْ تَقِزْ دِێ بێنَه بِنْئَاڤْكِرِنْ.

٢٨. (اَى نُوحْ!) دَمَا تُو و اَوْ كَسێنْ كُو لِگَلْ ته لِكَشْتِيِىٚ بِجِهْ بِبِنْ، وِهَا بِبێژَه: حَمْدْ ژِ خُدِىٚ رَه بَه كُو اَمْ ژِ بَرَكَا ظَالِمَانْ رَهَا كِرِنْ.

٢٩. دِيسَا بِبێژَه: خُدَايِىٚ مِنْ! مِنْ لِجِهَكِى پِيرُوزْ و بِبَرَكَتْ بِجِهْ بِكَه و هَرْ تُويِى چێتِرِينِىٚ بِجِهْكَرَانْ.

٣٠. بێگُمَانْ دِڤِىٚ دَه (ژِ بُوٚ وَه) نِشَانْ هَنَه و بێگُمَانْ مَه اَوْ پِىٚ جِربَانْدِنْ.

٣١. پَاشِىٚ لِدُوڤْ وَانْ مَه مِلَّتَكِى دِنْ ئَانِى حُوٚلِىٚ.

٣٢. ڤێجَا مَه ژِ نَاڤْ وَانْ بِخَوه پێخَمْبَرَكْ ژِ بُوٚ وَانْ شَانْدْ، (ژِ وَانْ رَه گُوٚتْ): ژِ خُدِىٚ رَه عِبَادَتِىٚ بِكِنْ، ژِ بِلِى وِى ژِ بُوٚ وَه تُو خُدَا نِينِنْ. اَرِىٚ مَا هِىٚ ژِى هُونْ (ژِ گُنَه و شِرْكِىٚ) خَوه نَاپَارێزِنْ؟

٣٣. گِرَه گِرێنْ گَلِىٚ وِى اَوێنْ كُو كَافِرْ بُونَه، اَوێنْ كُو بَاوَرِى بِرُوژَا ئَاخْرَتِىٚ نَئَانِينْ و اَوێنْ كُو ژِيَانَا نِعْمَتێنْ كُو مَه دَايِى وَانْ اَوْ ژِ رِىٚ بِرِنْ، گُوٚتِنْ: اَڤْ ژِى مِرُوٚڤَكِى وَكِى وَه يَه؛ ژِ يَا كُو هُونْ دِخُونْ دِخَوه و ژِ يَا كُو هُونْ ڤَدِخُونْ اَوْ ژِى ڤَدِخَوه.

٣٤. (گِرَه گِرَانْ گُوٚتْ): اَگَرْ هُونْ بِگُوٚتِنَا مِرُوٚڤَكِى وَكِى خَوه بِكِنْ، مُحَقَّقْ هُونِىٚ بِخَسِرِنْ.

٣٥. اَرِىٚ مَا اَوْ (پێخَمْبَرْ) پَيْمَانِىٚ دِدَه وَه و دِبێژَه: دَمَا هُونْ مِرِنْ و بُونَه ئَاخْ و هَسْتِى، هُونِىٚ جَارَكَه دِنْ (ژِ گُورێنْ خَوه) بێنَه دَرَانِينْ؟

٣٦. اَڤْ پَيْمَانَا كُو ژِ وَه رَه تِىٚ دَاينْ دُورَه، دُورَه!

٣٧. اَڤْ ژِيَانَا مَه بَسْ ژِيَانَا ڤِىٚ دِنْيَايِىٚ يَه. اَمِىٚ بِمِرِنْ و هِنَكێنْ دِنْ ژِى دِىٚ سَاغْ بِبِنْ (بێنَه دِنْيَايِىٚ) و پِشْتِى مِرِنِىٚ اَمْ بِخَوه دِيسَا نَايێنَه ڤَژَانْدِنْ.

٣٨. اَڤْ پێخَمْبَرْ بَسْ زِلاَمَكَه، لِسَرْ نَاڤِىٚ خُدِىٚ دَرَوَانْ دِكَه. اَمْ بِخَوه پِىٚ نَبَاوَرِنْ.

٣٩. (پێخَمْبَرِىٚ وَانْ) گُوٚتْ: خُدَايِىٚ مِنْ! بِسَدَمَا كُو وَانْ بَاوَرِى بِمِنْ نَئَانِى ئَارِكَارِيَا مِنْ بِكَه!

٤٠. (خُدِىٚ ژِىٚ رَه) گُوٚتْ: دِدَمَكَه نِيٚزِيكْ دَه اَوْ دِىٚ (ژِ بَرْ كُفْرَا خَوه) پُوشْمَانْ بِبِنْ!

٤١. ڤِيٚجَا وِىٚ قِيرِينَا جَانْسُوژْ بِرَاسْتِى اَوْ گِرْتِنْ (و هَلَاكْ كِرِنْ). ايجَارْ مَه اَوْ كِرِنْ وَكِى قَافُوكِيٚنْ سَرْ ئَاڤِىٚ. دُورْبُونَا ژِ رَحْمَا خُدِىٚ هَرْ ژِ بَرْكَا ظَالِمْ رَه بَه!

٤٢. پَاشِىٚ مَه لِدُوفْ وَانْ هِنْ مِلَّتِيٚنْ دِنْ ئَانِينْ حُوٚلِىٚ.

٤٣. قَتْ اُمَّتَكْ نَه دِكَارَه دَمَا (هِلاكَا) خَوه بِدَه پِيٚشْ نَه ژِى دِكَارَه بِدَه پَاشْ.

٤٤. پَاشِىٚ مَه لِپَىْ هَڤْ قَاصِدِيٚنْ خَوه شَانْدِنْ. ژِ كِيژَانْ اُمَّتِىٚ رَه قَاصِدِىٚ وِىٚ هَاتِبَه، هَرْ بَاوَرِى پِىٚ نَئَانِينَه. مَه ژِى (دِهَلاكِىٚ دَه) اَوْ دَانَه دُوفْ هَڤْ و مَه اَوْ كِرِنْ مِژُولَاهِى (كُو خَلْكْ دِجِڤَاتَانْ دَه پِىٚ مِژُولْ دِبَه). ڤِيٚجَا هِلاكْ و عَذَابْ ژِ بُوٚ مِلَّتَكِى بَه كُو بَاوَرِى نَايِينَه!

٤٥. پِشْتْرَه مَه مُوسَا و بِرَايِىٚ وِى هَارُونْ بِمُعْجِزَيِيٚنْ خَوه و تَڤِى دَلِيلِيٚنْ اَشْكَرَا شَانْدِنْ...

٤٦. بِبَالْ فِرْعَونْ و گِرَه گِرِيٚنْ وِى ڤَه. ڤِيٚجَا وَانْ خَوه قُرَه كِرْ (و بَاوَرِى نَئَانِينْ) و اَوْ جِڤَاتَكَه پُوزْبِلِنْدْ بُو.

٤٧. گُوٚتِنْ: اَرِىٚ مَا اَمِىٚ بِدُو مِرُوٚڤِيٚنْ وَكِى خَوه بَاوَرِى بِينِنْ و رَوْشْ اَڤْه كُو خَلْكِىٚ وَانْ ژِى ژِ مَه رَه خِزْمَتْكَارِنْ؟

٤٨. ڤِيٚجَا وَانْ بَاوَرِى بِوانْ نَئَانِى و بُونَه ژِ يِيٚنْ هَلَاكْبُويِى.

٤٩. صُونْدْ بَه، مَه كِتِيٚبْ دَايَه مُوسَا دَا كُو اَوْ (زَارُويِيٚنْ اِسْرَائِيلْ پِىٚ) رَاسْتَرِىٚ بِبِنْ.

٥٠. مَه كُرِىٚ مَرْيَمِىٚ (عِيسَا) و دَايِكَا وِى ژِى كِرِنَه نِيشَانَكْ (لِسَرْ قُدْرَتَا خَوه) و مَه اَوْ لِجِهَكِى بِلِنْدْ كُو خُدَانْ دَارْ و كَانِى يَه نِشْتَجِهْ كِرِنْ.

٥١. گَلِى قَاصِدَانْ! ژِ خَوارِنِيٚنْ پَاكْ و حَلَالْ بِخُونْ و كَارِيٚنْ قَنْجْ بِكِنْ. بِيٚگُمَانْ اَزْ بِيَا كُو هُونْ دِكِنْ دِزَانِمْ.

٥٢. اَڤْ دِينێ وَه تَڤَانْ يَكْ دِينَه، اَزْ ژِى خُدَايێ وَه مَه، ڤێجَا (بِپێكْئَانِينَا فَرْمَانِێنْ مِنْ و بِدُورْبُونَا ژِ قَدَخَيَانْ) خوه ژِ مِنْ بِپَارِێزِنْ.

٥٣. اِيدِى اَوْ (اُمَّتێنْ پێخَمْبَرَانْ) دِكَارێ دِينێ خَوه دَه پَرْچَه پَرْچَه بُونَه. هَرْ جِڤَاتْ بِيَا لِجَمْ خَوه دِلْخَوشِنْ.

٥٤. ڤێجَا تُو حَيَانِى دَمَكێ وَانْ دِنَاڤْ رێشَاشِيَا وَانْ دَه بِهێلَه!

٥٥. مَا ژِ وَانْ وَه يَه كُو بوِى مَالْ و زَارُوكێنْ كُو اَمْ دِدِنْ وَانْ...

٥٦. اَمْ ژِ وَانْ رَه لَزێ لِخێرَانْ دِكِنْ؟ نَا، بَلْكِى اَوْ تێنَاگِهيژِنْ.

٥٧. بێگُمَانْ يێنْ كُو ژِ تِرْسَا خُدَايێ خَوه بِسَاوْ و بِتِرْسِنْ...

٥٨. اَوێنْ كُو بَاوَرِى بَئَايَتێنْ خُدَايێ خَوه تِينِنْ...

٥٩. اَوێنْ كُو ژِ خُدَايێ خَوه رَه تِشْتَكِى نَاكِنْ هَڤْپِشْكْ...

٦٠. اَوێنْ كُو يَا لِسَرْ وَانْ پێوِسْتَه دِدِنْ دِگَلْ كُو دِلێنْ وَانْ بِتِرْسَه ژِ بَرْ كُو بِرَاسْتِى اَوێ لِخُدَايێ خَوه ڤَگَرِنْ.

٦١. هَا اَڤێنْ هَانێ، لِخێرْ و قَنْجِيَانْ دِبَزِنْ و بَرِى خَلْكێ خَوه دَاڤێژِنَه خێرێ.

٦٢. اَمْ تُو كَسِى زێدەيِى قُوَّتَا وِى بَرْپِرْسْ نَاگِرِنْ. لِبَالْ مَه كِتێبَكْ (ئَا كَارْ و كِرِيَارَانْ) هَيَه كُو رَاسْتِيێ دِبێژَه و نَحَقِى دێ لِوانْ نَيێ كِرِنْ.

٦٣. نَخێرْ، دَرْ بَارێ ڤێ قُرْئَانێ دَه دِلێنْ وَانْ (كَافِرَانْ) دِكُورِيتِى و نَزَانِينێ دَه يَه و ژِ بِلِى ڤێ ژِى هِنْ كَارێنْ وَانێنْ خَرَابْ هَنَه كُو اَوْ دِكِنْ.

٦٤. پَاشێ دَمَا اَمْ دَوْلَمَنْد و سَرَكێنْ وَانْ بِعَذَابْ بِگِرِنْ تُو دێ بِبِينِى كُو اَوْ دِكِنْ فَرْيَادْ و فِيخَانْ!

٦٥. (ژِ وَانْ رَه تێ گُوتِنْ): اِيرُو، بێهُودَه نَكِنْ هَاوَارْ! بێگُمَانْ هُونێ ژِ مَه ئَارِيكَارِيێ نَبِينِنْ!

٦٦. بِرَاسْتِى ژِى ئَايَتێنْ مِنْ ژِ وَه رَه دِهَاتِنْ خونْدِنْ، ڤێجَا هُونْ لِسَرْ پَاحْنِيَا خَوه بِپَاشْ ڤَه زِڤْرِينْ (سَرْ كُفْرِىٚ) كُو وَه ژِ گُوهْدَارِكِرِنِىٚ بَرِىٚ خَوه زِيڤِرَانْدْ.

٦٧. بِبێتُ اللَّهِىٚ خَوه (لِسَرْ خَلْكِىٚ) ڤُرَه دِكِرِنْ، لِدُورْ بێتِىٚ دِكِرِنْ شَڤْبِهێرْكْ كُو تێدَه دَڤْ دَئَاڤێتِنْ (قُرْئَانْ و پێخَمْبَرْ).

٦٨. اَرِىٚ مَا اَوْ لِڤِىٚ قُرْئَانِىٚ ڤَتْ نَفِكِرِينَه؟ يَانْ ژِى، مَا يَا كُو بَرِىٚ ژِ بَاڤْ و بَاپِيرێنْ وَانْ رَه نَهَاتِبُو ژِ وَانْ رَه هَاتِيَه؟

٦٩. يَانْ ژِى مَا هِىٚ وَانْ پێخَمْبَرِىٚ خَوه نَاسْ نَكِرِيَه، ڤێجَا ژِ بُوٚ ڤِىٚ يَكِىٚ وِى اِنْكَارْ دِكِنْ؟

٧٠. يَانْ ژِى اَوْ دِبێژِنْ: بِوِى رَه دِينِيتِيكْ هَيَه؟ نَخێرْ، بَلْكِى وِى حَقِى ژِ وَانْ رَه ئَانِيَه، دِگَلْ كُو پِرِىٚ وَانْ ژِ حَقِيىٚ حَزْ نَاكِنْ.

٧١. اَگَرْ حَقِى بِدَايَا پَىْ هَوَسێنْ وَانْ، مُحَقَّقْ (پَرْگَالا) اَرْدْ و ئَاسِيمَانَانْ و يێنْ كُو دِوَانْ دَه هَنَه دِىٚ خَرَا بِبُوِيَا. نَا بَلْكِى مَه ژِ وَانْ رَه (اَڤْ قُرْئَانَا كُو) سَرْبِلِنْدِيَا وَانَه دَايَه وَانْ، لێبَلِىٚ وَانْ بَرِىٚ خَوه ژِ سَرْبِلِنْدِيَا خَوه گُهَارْتِيَه.

٧٢. يَانْ ژِى مَا تُو خَرَاجَكِىٚ ژِ وَانْ دِخوازِى (ڤێجَا اَوْ نَائێنَه اِيمَانِىٚ)؟ اِێدِى دَانَا خُدَايِىٚ تَه (ژِ يَا كُو اَوْ بِدِنْ) چێتِرَه و هَرْ اَوْه چێتِرِينِىٚ رِزْقْدَارَانْ.

٧٣. رَاسْتِى اَڤَه كُو تُو وَانْ ڤَدِخُوِينِى رِيَكَا رَاسْتْ و دُرِسْتْ.

٧٤. بێگُمَانْ يێنْ كُو بَاوَرِى بَئَاخْرَتِىٚ نَائِينِنْ اَوْ ژِ سَرْ رِيَا حَقْ و رَاسْتْ كَتِنَه.

٧٥. اَگَرْ اَمْ لِوَانْ بِهَاتِنَا رَحْمِىٚ و تَنْگَاسِيَا كُو گِهَاتِى وَانْ مَه ژِ سَرْ وَانْ رَاكِرَا، دِيسَا دِىٚ دِ رِێشَاشِيَا خَوه دَه بِكَتِنَا رِكِىٚ و اَوِىٚ حێرْمَايِى بِمَانَا.

٧٦. صُونْدْ بَه مَه اَوْ بِعَذَابِىٚ (بِرْچِيبُونِىٚ) گِرْتِنْ، دِيسَا ژِى وَانْ خَوه ژِ رَبِّىٚ خَوه رَه نِزْمْ نَكِرْ و بِزَارَه زَارْ لِبَرْ وِى نَگِرِيَانْ.

٧٧. حَیَانِی دَمَا اَمْ دَرِیِیٚ عَذَابَکی دِژْوَارْ لِسَرْ وَانْ ڤَکِنْ، تُو دِیٚ بِنِیٚرِی کُو ڤَا یَه وَانْ لِورْ هِیٚڤِیَا خوه وِنْدَا کِرِیَه، شَاشْ مَانَه!

٧٨. خُدِیٚ یَه، یِیٚ کُو ژِ بُوٚ وَه گُه، چَاڤْ و دِلْ ئَافِرَانْدِنَه، هُونْ چِقَاسْ هِنْدِكْ سِپَاسِی(یَا وَانْ نِعْمَتَانْ) دِکِنْ!

٧٩. خُدِیٚ یَه، یِیٚ هُونْ لِسَرْ اَرْدِیٚ ئَافِرَانْدِنَه و هُونِیٚ لِبَرْ وِی بِیٚنَه جِڤَانْدِنْ.

٨٠. خُدِیٚ یَه، یِیٚ کُو سَاغْ دِکَه و دِمِرِینَه، گُهَرِینَا شَڤْ و رُوژِیٚ ژِی کَارِیٚ وِی یَه، مَا هِیٚ ژِی هُونْ ئَاقِلِیٚ خَوه بِکَارْ نَایِینِنْ!

٨١. دِگَلْ ڤِیٚ ژِی وَانْ وَکِی گُوٚتِنَا پِیٚشِیِیٚنْ خَوه گُوٚتْ.

٨٢. گُوٚتِنْ: نَاخَوه رَاسْتَه کُو دَمَا اَمْ بِمِرِنْ، بِبِنْ ئَاخْ و هَسْتِی مَا اَمِیٚ دِیسَا بِیٚنَه سَاغْکِرِنْ؟

٨٣. صُونْدْ بَه عَیْنِی اَڤْ پَیْمَانْ هِیٚ بَرِیٚ ژِ مَه و بَاڤِیٚنْ مَه رَه هَاتِبُو دَایِینْ، (لِیٚبَلِیٚ) اَڤْ ژِ چِیرُوكْ - چِیڤَانُوکِیٚنْ پِیٚشِیَانْ پِیٚ ڤَه، نَه تِشْتَکی دِنَه؟

٨٤. بِبِیٚژَه: اَگَرْ بِرَاسْتِی هُونْ دِزَانِنْ (دَه کَا بِبِیٚژِنْ): اَڤْ جِیهَانْ و یِیٚنْ کُو تِیٚدَه هَنَه، یِیٚنْ کِیٚ نَه؟

٨٥. دِیٚ بِبِیٚژِنْ: یِیٚنْ خُدِیٚ نَه. بِبِیٚژَه: کُو وِسَا یَه، اَرِیٚ مَا هُونْ ئَاقِلْ نَاگِرِنْ؟!

٨٦. بِبِیٚژَه: مَا خُدَایِیٚ ئَاسِیمَانِیٚنْ حَفْتْ طَبَقْ و خُدَایِیٚ عَرْشِیٚ مَزِنْ کِی یَه؟

٨٧. دِیٚ بِبِیٚژِنْ: یِیٚنْ خُدِیٚ نَه. بِبِیٚژَه: اَرِیٚ مَا ڤِیٚجَا هُونْ ژِیٚ نَاتِرْسِنْ؟

٨٨. بِبِیٚژَه: اَگَرْ بِرَاسْتِی هُونْ دِزَانِنْ (دَه کَا بِبِیٚژِنْ): مَا کِی یَه، اَوِیٚ کُو مُلْکِیَتْ و گَرَا هَرْ تِشْتِی دِدَسْتِیٚ وِی دَه، اَوِیٚ کُو هَرْ تِشْتِی دِپَارِیٚزَه و اَوْ نَه حَوْجِیی پَارَاسْتِنِیٚ یَه؟

٨٩. دِیٚ بِبِیٚژِنْ: (اَڤْ هَمُو) یِیٚنْ خُدِیٚ نَه. بِبِیٚژَه: نَاخَوه چَاوَا هُونْ تِیٚنْ خَاپَانْدِنْ؟

٩٠. نَخِیٚرْ، بِیٚگُمَانْ مَه حَقْ ژِ وَانْ رَه ئَانِیَه و بِیٚگُمَانْ اَوْ دَرَوْکَارِنْ.

٩١. خُدێ (ژ بُو خَوه) تُو زَارُوكْ نَگِرْتِنَه و دِگَلْ وِی تُو خُدَا ژِی تُنِنْ. اَگَرْ وِسَا بُویَا دێ هَرْ خُدَایَكْ بمَخْلُوقێ خَوه ڤَه بُویَا (دێ اَوْ ایدَارَه بِكِرَا و نَهشْتَا خُدَاییْنْ دِنْ مُسَلَّطِی سَرْ وِی بِبُویَا) و دِیْ هِنَانْ ژِ وَانْ زُورَا یێ دِنْ بِبِرَا. خُدَا ژِ یَا كُواَوْ وِی دُوَصِفِینِنْ، پَاكْ و بِلِنْدَه.

٩٢. خُدێ، زَانَایێ نَپَنِی و اَشْكَرَایَانَه، ڤێجَا ژِ یَا كُو ژێ رَه دِكِنْ شِرِیكْ اَوْ پِرْ بِلِنْدَه.

٩٣. بِبێژَه: خُدَایێ مِنْ! اَگَرْ تَه حُكِمْ دَابَه كُو هِیْژْ اَزْ سَاغْ بِمْ تُو وَانْ بِدِی عَذَابێ...

٩٤. خُدَایێ مِنْ! مِنْ نَه ئێخَه نَاڤْ جِڤَاتَا ظَالِمَانْ.

٩٥. بێگُمَانْ اَمْ دِكَارِنْ هِنَكِی ژِ وِی عَذَابێ كُو مَه پێمَانْ پێ دَایَه نِیشَانِی تَه بِدِنْ.

٩٦. تُو نَبَاشِیێ بِیَا هَرِی سِپَحِی بِدَه ئَالِی. اَمْ بِیَا كُواَوْ دَرْ حَقێ تَه دَه دِبێژِنْ، بێهْتِرْ دِزَانِنْ.

٩٧. بِبێژَه: خُدَایێ مِنْ! اَزْ خَوه بِتَه ژِ تَاسَوَاسِێنْ شَیْطَانَانْ دِپَارێزِمْ!

٩٨. خُدَایێ مِنْ! اَزْ خَوه بِتَه دِپَارێزِمْ كُواَوْ دِگَلْ مِنْ بِنْ.

٩٩. پَاشێ دَمَا مِرِنَا یَكِی ژِ وَانْ (كَافِرَانْ) هَاتْ، دِبێژَه: خُدَایێ مِنْ! مِنْ ڤَگَرِینَه (بَالْ دِنْیَایێ)..

١٠٠. دَا كُو اَزْ بَرَانْبَرِی وِی عُمْرێ خَوه یێ كُو مِنْ بێفَیْدَه بِهُورَانْدِیَه كَارێ قَنْجِیێ بِكِمْ. نَا! اَڤْ گُوْتِنَا كُو وِی گُوْتِی، گُوْتِنَكَه بێفَیْدَه یَه. حَیَانِی رُوژَا كُو دِیسَا بِێنَه سَاغْكِرِنْ لِپِیْشِیَا وَانْ بَرْزَخَكْ (ئَاسْتَنْگَكْ) هَیَه.

١٠١. دَمَا دِصُورێ دَه هَاتَه پِفْكِرِنْ، اِیْدِی وِێ رُوژێ دِنَاڤْ وَانْ دَه تُو نَسَبْ (اَقْرَبَاتِی) نَامِینَه و پِرْسَا هَڤْ ژِی نَاكِنْ.

١٠٢. اِیْدِی كِیْشَانَا كێ گِرَانْ وَرَه، هَا اَوْبِسَرْ كَتِنَه.

١٠٣. كێشَانَا كێ ژِی سِڤِكْ وَرَه، اِیْدِی وَانْ ژِی بِخَوه زِرَارْ كِرِیَه، (لَوْرَا اَوْ) دێ هَرْ و هَرْ لِدُوژَهێ بِمِینِنْ.

١٠٤. لِدُوژَهِىَ ئَاگِرْ رُويِيْنْ وَانْ دِشَوتِينَه، لِيْڤِيْنْ وَانْ دِقُرْمِچِنْ و دِرَانِيْنْ وَانْ قِيچْ دِبِنْ.

١٠٥. (ژِ وَانْ رَه تِىَ گُوْتِنْ): ڤَىْ ئَايَتِيْنْ مِنْ ژِ وَه رَه نَدِهَاتِنْ خَونْدِنْ، ڤِيْجَا وَه ژِى اَوْ اِنْكَارْ دِكِرِنْ؟

١٠٦. اَوْ دِىَ بِبِيْژِنْ: خُدَايِىَ مَه! خَرَابِيَا مَه سَرِى ژِ مَه سْتَانْدْ و اَمْ جِڤَاتَكَه ژِرِيْكَتِى بُونْ.

١٠٧. خُدَايِىَ مَه! مَه ژِ ڤِرْ دَرِينَه. اَگَرْ جَارَكَه دِنْ اَمْ (لِكِرِنِيْنْ خوه يِيْنْ خَرَابْ) ڤَگَرِنْ، اِيْدِى خُيَا يَه‌كُواَمْ ظَالِمِنْ.

١٠٨. (خُدِىَ ژِ وَانْ رَه) دِبِيْژَه: لِورْ رَزِيلْ و رِسْوَا بِمِينِنْ، هِشْ بِنْ. اِيْدِى بِمِنْ رَه نَپِيڤِنْ!

١٠٩. بِيْگُمَانْ رَوْشْ اَڤْه، ژِ بَنْدِيِيْنْ مِنْ جِڤَاتَكِىَ دِگُوْتْ: خُدَايِىَ مَه! مَه اِيمَانْ ئَانِيَه، لِگُنَهِيْنْ مَه بِبِهُرَه و لِمَه وَرَه رَحْمِىَ. بِيْگُمَانْ هَرْ تُويِى چِيْتِرِينِىَ دِلُوڤَانَانْ.

١١٠. ڤِيْجَا وَه اَوْ ژِ خَوه رَه كِرِنْ مِژُولاهِى حَيَانِى كُواَوْ طِنَازْپِيْكِرِنَا وَه زِكْرِىَ مِنْ ژِ بِيرَا وَه بِرْ و هُونْ هَرْ بِوَانْ بِطِنَازْكِرِى دِكَنِيَانْ.

١١١. اِيرُو مِنْ بَرَانبَرِىَ وِىَ صَبْرَا كُو كِيْشَابُونْ خَلاتْ دَايَه وَانْ؛ بِيْگُمَانْ هَرْ اَونْ يِيْنْ خَلَاصْبُويِى.

١١٢. (خُدِىَ) دِبِيْژَه: هُونْ چَنْدْ صَالَانْ لِسَرْ رُويِىَ اَرْدِىَ ژِيَانَه؟

١١٣. دِبِيْژِنْ: اَمْ رُوژَكِىَ يَانْ ژِى بِڤَاسِى دَانَكِى ژِ رُوژِىَ ژِيَانَه، ڤِيْجَا دَه كَا ژِ يِىَ كُو حَسَابْ دِگْرِنْ بِپِرْسَه.

١١٤. (خُدِىَ) دِبِيْژَه: اَگَرْ وَه بِزَانِبَا (كُو ژِيَانَا هُونْ بِبَالِىَ ڤَه دِچِنْ چِڤَاسْ دِرِيْژَه)، هُونِىَ بِزَانِنْ كُولِدِنْيَايِىَ هُونْ هِنْدِكْ ژِيَانَه.

١١٥. (گَلِى مِرُوْڤَانْ!) اَرِىَ مَا هُونْ گُمَانْ دِكِنْ كُو مَه هُونْ بَرَدَايِى ئَافِرَانْدِنَه و هُونْ گُمَانْدَارِنْ كُو هُونِىَ لِمَه نِيِيْنَه ڤَگَرَانْدِنْ؟

١١٦. ڤێجا اَوْ خُدَایِیٚ حُکِمْرَانْ اِیٚ دَسْتْهِلاتَدَارْ اِیٚ حَقْ اِیٚ کُو ژِ گٚوتِنێنْ مُشْرِکَانْ پَاكْ و بِلِنْدَه، ژِ وِی پِیٚ ڤَه تُو خُدَا نِینِنْ. اَوْ خَودِیِیٚ عَرْشِیٚ پِیرُوزَه.

١١٧. چه کَسِیٚ کُو دِگَلْ خُدِیٚ عِبَادَتِیٚ اِلٰهَکِی دِنْ بِکَه کُو تُو دَلِیلَکَه وِی لِسَرِیٚ تُنَه یَه، ڤێجا جَزَایِیٚ وِی لِجَمْ خُدَایِیٚ وِی یَه. بێگُمَانْ مِرُوْڤێنْ کَافِرْ بِسَرْ نَاکَڤِنْ.

١١٨. بِبێژَه: خُدَایِیٚ مِنْ! لِمِنْ بِبِهُرَه، لِمِنْ رَحْمِیٚ بِکَه، بِرَاسْتِی چێتِرِینِیٚ دِلُوڤَانَانْ تُو یِی.

## ٢٤. سُورَه یِیٚ نُورْ

سُورَه‌یِیٚ(نُورْ)، ٦٤ (شێسْتْ و چَارْ) ئَایَته. لِمَدِینِیٚ دَاکَتِیَه. ژِ بَرْ کُو دِئَایَتَا ٣٥انْ دَه هَاتِیَه گٚوتِنْ: «خُدِیٚ نُورَا ئَاسِیمَانَانْ و اَرْدِیٚ یَه« کُو نُورْ ژِی بِمَعْنَیَا رُونَاهِی یَه، ژِ ڤِی سُورَه‌یِی رَه نُورْ هَاتِیَه گٚوتِنْ.

بِنَاڤِیٚ خُدَایِیٚ کُو رَحْمٰنَ رَحِیمَ

١. اَڤْ سُورَه‌یَکَه کُو مَه اَوْ هِنَارْتِیَه و مَه (حُکْمێنْ کُو تێدَه نَه لِسَرْ وَه) فَرْزْ کِرِنَه. مَه ئَایَتێنْ اَشْکَرَا تێدَه ئَانِینَه دَا کُو هُونْ بِفِکِرِنْ، ژِیٚ شِیرَتْ بِگِرِنْ.

٢. ژِنْ و مێرِیٚ زِنَاکَرْ هَرْ یَکِی ژِ وَانْ صَدْ دَارِی لِوَانْ بِدِنْ و اَگَرْ هُونْ بِخُدِیٚ و رُوژَا ئَاخْرَتِیٚ بَاوَرْدَارِنْ، دِمژَارَا دِینِیٚ خُدِیٚ دَه، بِلا دِبوَارَا وَانْ دَه هَسْتِیٚ مَرْحَمَتِیٚ (ژِ تَطْبِیقَا جَزَایِی) وَه نَگِرَه! بِلا ژِ بَاوَرْمَنْدَانْ جِڤَاتَكْ حَازِرِی جَزَایِیٚ وَانْ بِبَه.

٣. زِلامِیٚ زِنَاکَرْ دِکَارَه تَنِیٚ بِژِنَکَه زِنَاکَرْ رَه یَانْ ژِی بِژِنَکَه مُشْرِكْ رَه بِزَوِجَه. ژِنَا زِنَاکَرْ ژِی تَنِیٚ بِمێرَکِی زِنَاکَرْ رَه یَانْ ژِی مێرَکِی پُوتْپَرَسْتْ دِکَارَه وِیٚ مَهرْ بِکَه. اَڤْ (زَوَاجَا بِزِنَاکَرَانْ رَه) لِسَرْ (مێرْ و ژِنـ)ـێنْ بَاوَرْمَنْدْ هَاتِیَه حَرَامْکِرِنْ.

٤. اَوْ کَسێنْ کُو زِنَایِیٚ بَاڤێژِنْ سِتُوِیِیٚ ژِنێنْ بِنَامُوسْ، پِشْتْرَه (ژِ بُو اِسْبَاتَا ڤِیٚ ژِی) چَارْ

شَاهِدَانْ نَيِينِنْ، ڤِێجَا هَرْ يَكِى ژِ وَانْ هَشْتِىَ دَارِى لِوَانْ بِدِنْ و اِيجَارْ تُو جَارْ شَاهِدِيَا وَانْ قَبُولْ نَكِنْ. هَا اَوْ ژِرێدَرْكَتِى بِخوه نَه.

٥. لِێبَلِىَ اَوْ كَسێنْ كُو پِشْتِى ڤِىَ تُوبَه بِكِنْ (حَالْ و حَرَكَتِێنْ خَوه) رَاسْتْ بِكِنْ، اَوْ جُدَا نَه. بێگُمَانْ خُدِىَ گُنَهْژێبِرَه، دِلُوڤِينَه.

٦. اَوْ كَسێنْ كُو زِنَايِىَ بَاڤێژِنْ سِتُويِىَ ژِنێنْ خَوه و ژِ بِلِى وَانْ تُو شَاهِدێنْ وَانْ ژِى تُنَه بَه، شَاهِدِيَا هَرْ يَكِى ژِ وَانْ اَڤَه كُو بِ(نَاڤِىَ) خُدِىَ چَارْ جَارَانْ صُونْدْ بِخَوه كُو اَوْ ژِ رَاسْتْبێژَانَه.

٧. دِجَارَا پێنْجِىَ دَه ژِى، (اَوِىَ بِبێژَه): لَعْنَتَا خُدِىَ لِوِى (مێرِى) بَه اَگَرْ اَوْ ژِ دَرَوْبێژَانْ بَه.

٨. جَزَايِىَ زِنَايِىَ لِدِنْيَايِىَ ژِ سَرْ تِىَ ئَاڤِێتِنْ كُو ژِنْ ژِى، چَارْ جَارَانْ بِ(نَاڤِىَ) خُدِىَ صُونْدْ بِخَوه و شَاهْدِيِى بِدَه كُو مێرِىَ وِىَ ژِ دَرَوْبێژَانَه.

٩. جَارَا پێنْجِىَ (دِىَ بِبێژَه): غَزَبَا خُدِىَ لِوِىَ (ژِنِىَ) بِبَارَه اَگَرْ مێرِىَ وِىَ ژِ رَاسْتْبێژَانْ بَه.

١٠. اَگَرْ قَنْجِى و دِلُوڤَانِيَا خُدِىَ لِسَرْ وَه نَبُويَا (هُونِىَ شَرْمَزَارْ و هَلَاكْ بُونَا) و بێگُمَانْ خُدِىَ تُوبَه پَژْرێنَه، خُدَانْحِكْمَتَه.

١١. بێگُمَانْ اَوْ كَسێنْ كُو اَڤْ بێبَخْتِيَا گِرَانْ (لِدَايِكَا مُسِلْمَانَانْ عَائِشَيِىَ) ئَانِينْ چَنْدْ كَسێنْ ژِ وَه نَه. هُونْ ڤِىَ يَكِىَ ژِ خَوه رَه خَرَابِى حَسێبْ مَكِنْ. بَلْكِى اَوْ ژِ بُوْ وَه خێرَه. ژِ بُوْ هَرْ يَكِى وَانْ بێبَخْتَانْ گُنَه هَيَه. اَوِىَ كُو اَڤْ گُنَهِىَ مَزِنْ ژِى هِلْگِرْتِيَه ژِىَ رَه عَذَابَكِى مَزِنْ هَيَه.

١٢. دَمَا وَه اَڤْ (بێبَخْتِيَا گِرَانْ) بِهيسْتْ، دَه بِلا وَه مێرْ و ژِنێنْ بَاوَرْمَنْدْ دَرْ بَارِىَ هَڤْ دَه ظَنَّكَه قَنْجْ بِكِرَا و وَه بِگُوتَا كُو اَڤْ بێبَخْتِيكَه اَشْكَرَا يَه.

۱۳. دَه بِلا وَانْ (بِیٚبَخْتَانْ) دَرْ بَارِیٚ وِیٚ (اِدِعَائَا خَوه) دَه چَارْ شَاهِدْ بَئَانِینَا؟ ڤِیٚجَا چِه دَمَا وَانْ شَاهِدْ نَئَانِینْ، اِیجَارْ لِجَمْ خُدِیٚ اَوْ دَرَوْکَرْ بِخَوه نَه.

۱٤. اَگَرْ لِدِنْیَا و ئَاخْرَتِیٚ نَه ژِ قَنْجِی و دِلُوڤَانِیَا خُدِیٚ یَا لِسَرْ وَه بُویَا، ژِ بَرْ وِیٚ (بِیٚبَخْتِیَا کُو) وَه خَوه نُوقِی وِیٚ کِرِبُو، مُحَقَّقْ دِیٚ عَذَابَکِی مَزِنْ هُونْ بِهِنْگَافْتِنَا.

۱٥. وِیٚ دَمِیٚ وَه بِزِمَانِیٚ خَوه ژِ هَڤْ رَه رَادِگِهَانْدْ و یَا کُو زَانِینَا وَه پِیٚ تُنَبُو وَه بِدَڤِیٚنْ خَوه دِگُوتْ. وَه حِزِرْ دِکِرْ کُوَاَوْ تِشْتَکِی بِچُوکْ و هِیٚسَانَه. حَالْ اَڤْه کُو لِجَمْ خُدِیٚ اَوْ پِرْ مَزِنَه.

۱٦. دَمَا وَه اَوْ (بِیٚبَخْتِی) بِهِیسْتْ، دَه بِلا وَه بِگُوتَا: نَه بَابَتَه ژِ بُوٚ مَه کُو اَمْ بِڤِیٚ بِپِیڤِنْ. حَاشَا؛ اَمْ خُدِیٚ پَاکْ دِدِیٚرِنْ کُوڤِیٚ دَرَوَا بِهَتِیکَتِی ژِ مَه رَه مُوسَامَحَه بِکَه! اَڤْ، بِیٚبَخْتِیکَه پِرْ مَزِنَه!

۱۷. اَگَرْ بِرَاسْتِی هُونْ بَاوَرْمَنْدِنْ؛ خُدِیٚ لِوَه شِیرَتْ دِکَه دَا کُو هَیَا هُونْ سَاغْ بِنْ جَارَکَه دِنْ لِبِیٚبَخْتِیکَه وِهَا ڤَنَگَرِنْ.

۱۸. خُدِیٚ (دَرْ بَارِیٚ فَرْمَانْ و قَدَخَیِیٚنْ خَوه دَه) ژِ وَه رَه ئَایَتِیٚنْ خَوه اَشْکَرَا دِکَه، خُدِیٚ زَانَا یَه، خُودِیحِکْمَتَه.

۱۹. بِیٚگُمَانْ اَوِیٚنْ حَزْ دِکَنْ کُو کِرْیَارِیٚنْ خَرَابْ (مِینَا زِنَایِیٚ) دِنَاڤْ بَاوَرْمَنْدَانْ دَه بَلاڤْ بِبَه (و بِکَڤَه سِتُویِیٚ وَانْ)، ژِ وَانْ رَه هَمْ لِدِنْیَایِیٚ هَمْ ژِی لِئَاخْرَتِیٚ عَذَابَکِی جَانْسُوژْ هَیَه. خُدِیٚ دِزَانَه و هُونْ نِزَانِنْ.

۲۰. اَگَرْ نَه ژِ کَرَمْ و رَحْمَا خُدِیٚ یَا لِسَرْ وَه بُویَا (هُونِیٚ بِهَتِکِینَا و هَلاکْ بُونَا). بِیٚگُمَانْ خُدِیٚ خُودِیشَفْقَتَه، دِلُوڤِینَه.

۲۱. گَلِی بَاوَرْمَنْدَانْ! نَدِنْ پَیْ شُونْگَاڤِیٚنْ شَیْطِیٚنْ. کِی بِدَه پَی شُونْگَاڤِیٚنْ شَیْطِیٚنْ، (بِلا بِزَانَه کُو) بِیٚگُمَانْ شَیْطَانْ فَرْمَانِیٚ بِبِیٚتُورَتِی و کِرْیَارِیٚنْ نَقَنْجْ دِکَه. اَگَرْ قَنْجِی و رَحْمَا

خُدێ لِسَرْ وَه نَبُویَا (کُو دَرِیێ تُوبێ لِوَه ڤَکِرِیَه)، ژِ وَه تُو کَسْ (ژِ گُنَهێ وێ بێبَخْتِییێ) پَاقِژْ نَدِمَا. لِێبَلێ خُدێ کِی بِڤێ وی پَاقِژْ دِکَه و خُدێ بِهِیزَرَه، زَانَا یَه.

٢٢. بِلا ژِ وَه، اَوێنْ کُو جَامێرْ و خَودِی سَرْوَتِنْ صُونْدْ نَخُونْ کُو اِێدِی (ژِ مَالێ خَوه) دێ نَدِنْ خِزْمْ و بَلَنْگَازْ و یێنْ کُو دِرِیَا خُدێ دَه مُهَاجِرْ بُونَه؛ بِلا لِوَانْ بِبُورِنْ و لِوَانْ نَگِرِنْ. مَا هُونْ حَزْ نَاکِنْ کُو خُدێ ژِی لِگُنَهێنْ وَه بِبُورَه؟ خُدێ گُنَهْژێبِرَه، دِلُوڤِینَه.[1]

٢٣. بێگُمَانْ اَوێنْ کُو ژِنێنْ بَاوَرْمَنْدێنْ دَاوپَاقِژْ یێنْ کُو (ژِ زِنَایێ) بێئَاگَاهِنْ بِزِنَایێ سُوجْدَارْ دِکِنْ لِدِنْیَا و ئَاخْرَتێ لَعْنَتْ لِوَانْ هَاتِیَه بَارَانْدِنْ و ژِ بُوّ وَانْ عَذَابَکِی مَزِنْ هَیَه.

٢٤. وێ رُوژِێ دێ زِمَانێنْ وَانْ، دَسْتێنْ وَانْ و پِیێنْ وَانْ ژِ بَرْ ئَا کُو کِرِنَه، لِسَرْ وَانْ شَاهِدِییێ بِدِنْ.

٢٥. وێ رُوژِێ خُدێ دێ جَزَایێ وَانْ پێکێاسِی بِدَه وَانْ و اَوێ بِزَانِنْ کُو خُدَا حَقْ بِخَوه یَه.

٢٦. ژِنێنْ پِیسْ ژِ بُوّ مێرێنْ پِیسِنْ، زِلامێنْ پِیسْ ژِی ژِ بُوّ ژِنێنْ پِیسِنْ و ژِنێنْ بَاشْ ژِ بُوّ مێرێنْ بَاشِنْ، مێرێنْ بَاشْ ژِی ژِ بُوّ ژِنێنْ بَاشِنْ. هَا اَڤْ (اِێنْ دَاوِینْ) ژِ وێ بێبَخْتِیَا کُو (دَرْ بَارێ وَانْ دَه) دِبێژِنْ دُورْ و پَاکِنْ. ژِ بُوّ وَانْ لِێبُورِینَكْ و رِزْقَکِی بِرُومَتْ هَیَه.

٢٧. گَلِی بَاوَرْمَنْدَانْ! ژِ بِلِی مَالا خَوه، حَتَا کُو هُونْ دَسْتُورِێ نَخْوازِنْ و لِسَرْ خَلْکێ وێ سِلَاڤێ نَدِنْ نَچِنْ تُو مَالێ. اَڤْ ژِ وَه رَه (ژِ چُونَا بێدَسْتُورْ) چِێترَه. (مَه اَڤْ لِوَه فَرْمَانْ کِرْ) دَا کُو هُونْ بِفِکِرِنْ و تِێبِگَهِیژِنْ.

---

١ دَمَا دِیَا مُومِنَانْ عَائِشَه (ر.ض) بِاِفْترَایَکَه گِرَانْ رُوبرُو بُو، یَكْ ژِ وَانْ مُفْتَرِیَانْ ژِی مُسْطَحْ بُو کُو اَبُوبَکِرْ اَوْ کِربُو بِنْ حِمَایَتَا خَوه و دَابَارَا وی ژِی دَابُو سَرْ خَوه. پِشْتِی اَبُوبَکِرْ اَڤْ اِفْتِیرَا بِهِیسْتْ صُونْدْ خَوارْ کُواَوْ بَسْ ئَاریکَارِیَا وی بِکَه. ڤِێجَا ئَایَتْ نَازِلْ بُو کُو ژِ ڤِرْ و پِێ دَه لِسَرْ نَدَایِینێ صُونْدْ نَخُنْ، ئَاریکَارِیَا خَوه نَبِرِنْ و لِوَانْ بِبُورِنْ. هَرْ چِقَاسْ سَبَبێ نُزُولا ڤێ ئَایَتێ خَاصْ بَه ژِی، لِێ مُرَادْ ژِێ گَلَمْپَرِی یَه. یَانِی خِطَابْ ژِ تَڤْکِێ مُومِنَانْ رَه یَه. بَاوَرْمَنْدْ تَڤْ ژِ مَفْهُومێ ئَایَتێ بَرپِرْسِیَارِنْ.

**٢٨.** اَگَرْ وَه لِوێ (مَالِیْ) تُو کَسْ نَدیتْ (کُو دَسْتُورێ بِدَه وَه)، حَیَانِی ژ وَه رَه دَسْتُورْ نَییێ دَاینْ نَچِنْ وِرْ. اَگَرْ ژ وَه رَه بِیێ گُوْتِنْ: «ڤَگَرِنْ!» دِچِهْ دَه ڤَگَرِنْ. لَوْرَا اَڤْ (ڤَگَرِینْ) ژ بُوْ وَه (ژ رُونِشْتِنَا لِبَرْ دَرِی) بِخێرْتِرَه. خُدێ بِیَا کُو هُونْ دِکِنْ دِزَانَه.[١]

**٢٩.** لِسَرْ وَه تُو گُنَه تُنَه یَه‌کُو (بێدَسْتُورْ) هُونْ بِچِنَه خَانِییێنْ کُو مَالبَاتْ تێدَه نَامِینِنْ، اَوێنْ کُو ژ بُوْ وَه جِهێ ڤێدَه‌وِرْگِرْتِنِیێ نَه (مِینَا خَانْ، خَوارِنْگَهْ و دَزْگَهێنْ گِشْتِی). خُدێ بِیَا کُو هُونْ اَشْکَرَا دِکِنْ و بِیَا کُو هُونْ ڤَدِشێرِنْ دِزَانَه.

**٣٠.** ژ زِلَامێنْ بَاوَرْمَنْدْ رَه بِبێژَه: بِلا چَاڤێنْ خَوه (ژ حَرَامِییێ) بِگِرِنْ، عَوْرَتێنْ (شَرْمَگَهَا) خَوه بِپَارێزِنْ. لَوْرَا اَڤْ (چَاڤگِرْتِنْ و نَامُوسْپَارێزِی) ژ بُوْ وَانْ چێتِرَه. بێگُمَانْ خُدێ ژ یَا کُواَوْ دِکِنْ ئَاگَاهْدَارَه.

**٣١.** ژ زِنێنْ بَاوَرْمَنْدْ رَه ژِی بِبێژَه: بِلا چَاڤێنْ خَوه (ژ نێرِینَا حَرَامْ) بِگِرِنْ، عِفَّتْ و شَرْمَگَهَا خَوه بِپَارێزِنْ، ژ بَشَا کُو خُیَا دِکَه پێ ڤَه -اَوْ نَه تێدَه یَه- بِلا خَمِلْ و زِینَتَا خَوه دَرْنَخِنْ دَرْ. بِلا چَارِکێنْ خَوه بَرْدِنْ سَرْ سِینْگێنْ خَوه. بِلا خِشْرێنْ خَوه ژ بِلِی مێرێنْ خَوه، بَاڤێنْ خَوه، خَزُورێنْ خَوه، کُرێنْ خَوه، کُرێنْ مێرێنْ خَوه، بِرَایێنْ خَوه، بِرَازِییێنْ خَوه، خَوارْزِییێنْ خَوه، ژِنێنْ دِگَلْ خَوه، قَرْوَاشێنْ خَوه یێنْ کُو دِبِنْ دَسْتێنْ وَانْ دَه نَه، ژ مێرَانْ ژِی اَوْ خِیزْمَتْکَارێنْ کُوتُو پێدِڤِیَا وَانْ بِژِنَانْ نَمَایَه یَانْ ژِی اَوْ زَارُوکێنْ کُو هێژْ نَگِهَانَه کُو دِلِیێ وَانْ بِچَه دَڤَرێنْ ڤَشَارْتِی یێنْ ژِنَانْ، نِیشَانِی تُو کَسِی دِنْ

---

١ اَڤْ ئَایَتَا پیرُوزْ، رێزْ و تُورَیَکَه بێهنْپَاکِی و قَاعِدَه‌یَکِی پِرْ گِرِنْگْ یَا شَارَزَاییێ هینِی مرُوْڤَاتِییێ دِکَه. مرُوْڤَكْ گَاڤَا بِچَه مَالا یَکِی، دِڤێ پێشِی دَسْتُورێ بِخَوازَه، پِشْتِی کُو ژێ رَه دَسْتُورْ هَاتَه دَاینْ، سِلاڤَا اِسْلامِیێ لِخَلْکێ مَالِیێ بِکَه. لِگُورِی کُو هَاتِیَه رِیوَئَایَتْکِرِنْ، زِلَامَکِی ژ پِیخَمْبَرێ خُدێ ﷺ رَه گُوْتْ: «مَا اَزْ دَسْتُورَا چُونَا مَالِیێ ژ دِیَا خَوه ژِی بِخَوازِمْ؟ گُوْتْ: بَلێ. زِلَامِی گُوْتْ: ژ مِنْ پێ ڤَه تُو خِزْمَتْکَارِیێ وێ تُنِنْ، ڤێجَا مَا چِهْ گَاڤَا اَزْ هَرِمْ مَالِیێ دِیسَا اَزْ دَسْتُورِیێ ژێ بِخَوازِمْ؟ پێخَمْبَرْ گُوْتْ: مَا تُو حَزْ دِکِی کُو دَایِکَا خَوه طَازِی بِبِینِی؟ گُوْتْ: نَا. گُوْتْ: نَاخَوه ژێ دَسْتُورێ بِخَوازَه.» اَڤْ شیرَتَا کُو پِیخَمْبَرْ ﷺ لِوِی زِلَامِی کِرِی ژِی، گِرِینْگِی و پێدِڤِیَا ڤێ قَاعِدَه‌یێ نِیشَانْ دِدَه و دِدَه زَئَانِینْ کُو اِسْلَامِیێ چِه قَاسِی شَرَفْ و رُومَتْ دَایَه اِنْسِیێنْ، رێزْ و حُرْمَتَا وِی گِرْتِیَه، مَافێ وِی پَارَاسْتِیَه. لَوْرَا اِسْلَامْ مَدَنِیتْ بِخَوه‌یَه.

نَدِنْ. بِلا (بِتَپِينی) لِنْگێنْ خوهلاَرْدیێ نَدِنْ کُو اِیْدِی خِشْرێنْ وَانْ یێنْ قَشَارْتِی بێنَه زَئَانِینْ. گَلِی بَاوَرْمَنْدَانْ! تَڤْ بِبَالْ خُدِیێ ڤَه تُوبَه بِکِنْ دَا کُو هُونْ (هَمْ لِدِنْیَایێ هَمْ ژِی لِئَاخْرَتیێ) سَرْفِرَازْ بِبِنْ.

**٣٢.** (گَلِی مُوْمِنَانْ!)عَزَبْ (و ژِنَبِیـ)ـێنْ خوه بِزَوجِینِنْ و کُولَه و قَرْوَاشێنْ خوه یێن اَهلْ ژِی بِزَوجِینِنْ. اَگَرْ اَوْ خِزَانْ بِنْ، خُدِیێ ژِ کَرَمَا خوه (بِزَوَاجیێ) دِیێ وَانْ دَولَمَنْد بِکَه. خُدِیێ خُدَانِیێ کَرَمَکَه بَرْفِرَهَه و زَانَایێ بِکَرْیَارێنْ عِبَادێنْ خوهیَه.

**٣٣.** اَوْ کَسێنْ کُو دَرْفَتَا زَواجیێ نَابِینِنْ بِلا نَامُوسَا خوه بِپَارێزِنْ (بِلا خوه بِدِنْ زَحْمَتیێ و بِلا خوه رَاگِرِنْ)، حَیَانِی کُو خُدِیێ ژِ قَنْجِیَا خوه وَانْ دَوْلَمَنْد بِکَه (اِیْدِی کُو کَارِینْ بِزَوجِنْ بِلا اَوْ ژِی بِزَوجِنْ). اَوْ (کُولَه و قَرْوَاشـ)ـێنْ وَه یێنْ کُو دِخوازِنْ بوَه رَه تِفَاقَکیێ چێکِنْ دَا کُو ئَازَادْ بِبِنْ، ڤێجَا اَگَرْ هُونْ ژِ وَانْ اَمِینْ بِنْ کُواَویێ ڤیێ تِفَاقیێ پێكْ بِینِنْ بوَانْ رَه (لِسَرْ هِنَكْ مَالْ) تِفَاقَا مُکَاتَبیێ دێنِنْ و ژِ وِی مَالیێ کُو خُدِیێ دَایَه وَه هِنَکِی بِدِنْ وَانْ. ژِ بُوْ کُو هُونْ هِنَكْ ژِ مَالیێ دِنْیَایێ بِدَسْتْ بِخِنْ قَرْوَاشێنْ وَه یێنْ کُو دِگَلْ کُو اَوْ دِخوازِنْ پَاقِژْ و بِنَامُوسْ بِمِینِنْ بِکُوتَکِی بَریێ وَانْ نَدِنَه زِنَایێ. کِی کُوتَکیێ لِوَانْ بِکَه، ڤێجَا بێگُمَانْ پِشْتِی زُورْدَسْتِیَا وَه لِسَرْ وَانْ، خُدِیێ (ژِ بُوْ وَانْ) گُنَهْژێبِرَه، دِلُوڤَانَه.

**٣٤.** (گَلِی بَاوَرْمَنْدَانْ!) صُونْدْ بَه کُو مَه ئَایَتێنْ اَشْکَرَاکَرْ (یێنْ کُو پێدِڤِیَا وَه بِوَانْ هَبُویَه) و ڤِسَیێنْ (سَرْپێهَاتِیێنْ) وَانْ کَسێنْ کُو بَرِیَا وَه بُورِینَه ژِ وَه رَه ئَانِینَه کُواَوْ ژِ بُوْ تَقْوَهدَارَانْ پَنْدُ و شِیرَتِنْ.

**٣٥.** خُدِیێ رُونِیکَریێ اَرْدُ و ئَاسِیمَانَانَه. مِینَاکَا رُونَاهِیَا وِی، وَکِی کُلَکَکیێ یَهکُو تێدَه چِرَایَكْ هَبَه. اَوْ چِرَا ژِی دِنَاڤْ شُوشَکیێ دَه بَه، اَوْ شُوشَه ژِی هَرْ وَکِی سْتێرَکَه رُونَاكْ بَه کُو (رُونَاهِیَا وِیێ) ژِ دَارَکَه پِیرُوزْ بَه کُو دَارَا زَیْتُونیێ یَه. نَه لِرُوژْهِلاَتَه نَه ژِی لِرُوژَاڤَا یَه، چَنْدِی کُو ئَاگِرْ نَگِهێژیێ ژِی هِنْدِكْ دِمِینَه کُو زَیْتَا وِیێ رُونَاهِی بِدَه.

(اَڤْ رُونَاهِی) نُورَا لِسَرْ نُورِیْ یَه. خُدِیْ، کِی کُو نُورَا وِی بِڤِیْ وِی بِبَالْ ڤَه رَاسْتَرِیْ دِکَه و خُدِیْ ژِ بُوْ مِرُوْڤَانْ دَرْبُ و مَسَلاَنْ تِینَه (دَا کُو تِیْبِگِهِیژِنْ، ژِیْ دَرْسْ وَرْگِرِنْ و بَاوَرِی بِینِنْ). خُدِیْ بِهَرْ تِشْتِی زَانَا یَه.

**٣٦.** (اَڤْ رُونَاهِی) دِهِنْ مَالْ (و مِزْگَفْتِیْنْ) وِسَا دَهیَهکُو خُدَا فَرْمَانْ دَایَه دَا اَوْ (مَالْ) بِیْنَه بِلِنْدْکِرِنْ و نَاڤِیْ خُدِیْ دِوَانْ دَه وَرَه گُوْتِنْ و دِوَانْ دَه سِبَهُ و اِیْڤَارَانْ (پِیْنْجْ وَخْتْ) ژِ بُوْ خُدِیْ نِمِیْژْ بِیْ کِرِنْ.

**٣٧.** هِنْ مَرِڤِیْنْ وِسَا (دِوَانْ دَه هَنَه) کُو نَه بَازِرْگَانِی نَه ژِی دَانُ وِسِتَانْدِنْ نِکَارَه ژِ بِیرْئَانِینَا (نَاڤِیْ) خُدِیْ، ژِ کِرِنَا نِمِیْژِیْ و دَانَا زَکَاتِیْ وَانْ مِژُولْ بِکَه. اَوْ ژِ رُوژَکَه وِسَا دِتِرْسِنْ کُو تِیْدَه دِلْ و چَاڤْ سَرُوبِنِی هَڤْ دِبِنْ.

**٣٨.** دَا کُو خُدِیْ، ژِ یَا کُو کِرِنَه خَلاَتَا هَرِی سِپَحِی بِدَه وَانْ و ژِ کَرَمْ و ڤَنْجِیَا خوه ژِ وَانْ رَه هِیْ زِیْدَتِرْ بِکَه. خُدِیْ کِیْ بِڤِیْ بِیْحَسَابْ و بِیْهَژْمَارْ رِزِڤْ دِدِیْ.

**٣٩.** اَوِیْنْ کُو کَافِرْ بُونَه کَدَا (کِرِنِیْنْ) وَانْ، لِدَشْتَکَه تَنْهَا وَکِی لِیلاَنَکِیْ یَهکُو ژِ کَسِیْ تِی وَه یَهکُواَوْ اڤَه، پَاشِیْ دَمَا کُو بِگِهِیژَه وِیْ لِورْ تِشْتَکِی نَابِینَه، ڤَجَا اَوْلِوِیْ دَرِیْ لَڤَایِی خُدَایِیْ خوه دِبَه، اِیْدِی حَسَابِیْ وِی دِبِینَه. حَسَابْدِیتِنَا خُدِیْ بِلَزَه.

**٤٠.** یَانْ ژِی (کَدَا کَارِیْ کَافِرَانْ) وَکِی طَارِیتِیِیْنْ دِبَحْرَکَه کُورْ دَهیَه (دَرْیَایَکَه وِسَا) کُو پِیْلْ لِسَرْ پِیْلِیْ بِلِنْدْ بِبَه، لِسَرْ ڤَانْ پِیْلاَنْ پِیْلَکَه دِنْ بِلِنْدْ بِبَه و دِسَرْ وِیْ رَه ژِی عَوْرَکِی (رَشْ و طَارِی) هَبَه. اَڤْ طَارِیسْتَانِنْ، طَارِیسْتَانِیْ لِسَرْ طَارِیسْتَانِیْ نَه. (طَارِیسْتَانَکَه وِسَا) اَگَرْ کُو مِرُوْڤ دَسْتِیْ خَوه دَرِینَه نِکَارَه دَسْتِیْ خَوه بِبِینَه. اَوْ کَسِیْ کُو خُدِیْ رُونَاهِیكْ نَدَابَه وِی، ڤِیْجَا ژِیْ رَه تُو رُونَاهِیکَه (دِنْ) تُنَه.[1]

---

١ هِنْ زَانِسْتِیْن عِلْمِیْ طَبِیعَتِیْ کُو نَه مِسْلِمَانِنْ اَڤْ ئَایَتْ ژِ مِسْلِمَانَانْ بِهِیسْتِنْ، ژِ وَانْ پِرْسْ کِرِنْ: گَلُو مُحَمَّدْ دِدَرْیَایِیْ دَه گِرِیَایَه؟ گُوْتِنْ: نَا! ڤِیْجَا وِی زَانِسْتِی شَهْدَیَا خوه ئَانِی و گُوْتْ: اَزْ بَاوَرْ دِکِمْ کُو مُحَمَّدْ پِیخَمْبَرِیْ خُدِیْ یَه. ژِیْ رَه گُوْتِنْ: تُو چَاوَا دِزَانِی کُوَاَوْ پِیخَمْبَرَه؟ گُوْتْ: اَزْ ژِ ڤِیْ دِزَانِمْ. لَوْرَا اَڤْ وَصْفِیْ

٤١. مَا تُو نِزَانِی کُو یێنْ لِاَرْدْ و ئَاسِمَانَانْ هَنَه و طَیْرێنْ لِهَوَایێ بَاسِکْڤَکِرِیَه، (اَڤْ تَڤْ) خُدێ پَاكْ دِدێرِنْ؟ هَرْ یَكْ ژِ وَانْ نِمێژْ و تَسْبِیحِێ خَوه دِزَانِنْ. خُدێ بِیَا کُواَوْ دِکِنْ دِزَانَه.

٤٢. خُدَانِی و حُکِمْرَانِیَا اَرْدْ و ئَاسِمَانَانْ هَرْ ژِ خُدێ رَه یَه و ڤَگَرْ ژِی هَرْ بِبَالْ خُدَا ڤَه یَه.

٤٣. مَا تُو نِزَانِی کُو خُدێ، (جِهێ بِڤِێ) عَوْرَانْ دَاژُو سَرْ وِرْ. پَاشِێ وَانْ تِینَه بَالْ هَڤْ، پِشْتْرَه وَانْ لِسَرْ هَڤْ دِکَه شِکێرْ، ڤِێجَا تُو دِبِینِی کُو ژِ نَاڤَا وَانْ (عَوْرَانْ) بَارَانْ دِبَارَه. خُدێ ژِ عَوْرِێنْ مِینَا چِیَانْ طَیْرُوکِێ دِبَارِینَه. اِیجَا خُدێ کِێ بِڤِێ بِطَیْرُوکِێ لِێ دِخَه، کِێ ژِی بِڤِێ وِێ ژِ (سَرْ) وِی ڤَدِگَرِینَه. هِنْدِكْ دِمِینَه کُو رُونِیَا بِرُوسْکَانْ چَاڤَانْ کُورْ بِکَه!

٤٤. خُدێ، شَڤِێ و رُوژِێ لِهَڤْ وَرْدِگَرِینَه، بِێگُمَانْ دِڤِێدَه ژِ عَاقِلْمَنْدَانْ رَه عِبْرَتَكْ هَیَه.

٤٥. خُدێ هَرْ رِیْڤَهَرَكْ ژِ ئَاڤِێ ئَافِرَانْدِیَه. ژِ وَانْ هِنَكْ لِسَرْ زِکِێ خَوه دِمَشِنْ، هِنَكْ ژِی لِسَرْ دُو لِنْگَانْ، هِنَكْ ژِی لِسَرْ چَارْ لِنْگَانْ دِمَشِنْ. خُدێ یَا کُو بِڤِێ دَئَافِرِینَه، بِێگُمَانْ خُدێ لِسَرْ هَرْ تِشْتِی قَادِرَه.

٤٦. صُونْدْ بَه کُو مَه ئَایَتِێنْ اَشْکَرَاکَرْ هِنَارْتِنَه. خُدَا یێ کُو هِیدَئَایَتِێ بِڤِێ وِی لِسَرِێ رَاسْتَرِێ دِکَه.

٤٧. دِبێژِنْ: مَه بَاوَرِی بِخُدێ و بِپێخَمْبَرِێ وِی ئَانِیَه و مَه بِگُوٚتِنَا (وَانْ) کِرْ. پِشْتِی وِێ (اِقْرَارْ کِرِنِێ) دَسْتَیَکِێ ژِ وَانْ بَرِێ خَوه (ژِ حَقِیێ) ڤَدِگَرِینِنْ. هَا اَوْ نَه بَاوَرْمَنْدِنْ.

---

دَرْیَایێ بَسْ اَوْ مِرُوٚڤِێ کُو تَمَنِێ خَوه دِدَرْیَایێ دَه دَرْبَاسْ کِرِبَه، تِێدَه ژِیَابَه و زَحْمَتِی و خَطَرێنْ وِێ دِیتِبَه دِکَارَه ڤِێ بِزَانَه. دَمَا وَه گُوٚتْ: «مُحَمَّدْ، صُوَارِی دَرْیَایێ نَبُویَه و لِێ نَگَرِیَایَه« مِنْ زَانِی کُواَوْ ئَایَتْ نَه گُوٚتِنَا وِی یَه؛ گُوٚتِنَا خُدَایَه.

٤٨. (اَوْ) دَمَا بَانْگْ لِوَانْ وَرَه کِرِنْ دَا کُو بێنَه جَمْ خُدێ و پێخَمْبَرێ وی ژ بُوّ کُو دِنَاڤْبَرَا وَانْ دَه حُکِمْ بِکَه، تُو دِنێرِی کُو دَسْتَیَكْ ژ وَانْ بَرێ خَوه ژێ ڤَدِگَرِینِنْ.

٤٩. لِێبَلِێ اَگَرْ اَوْ (حُکِمْدَاینَا پێخَمْبَرْ) حَقْ بِدَه وَانْ، اَوْژ دِلْ و جَانْ تێنْ بَرْ (حُکْمێ) وی و بِگُوّتِنَا وی دِکِنْ.

٥٠. اَرێ مَا دِدِلێ وَانْ دَه نَخُوشِی (یَا نِیفَاقِێ) هَیَه، یَانْ ژِی (دَرْ بَارێ پێخَمْبَریَا مُحَمَّدْ دَه) کَتِنَه گُمَانێ؟ یَانْ ژِی اَوْ دِتِرْسِنْ کُو خُدێ و پێخَمْبَرێ وی نَحَقِیێ لِوَانْ بِکِنْ؟ نَخێرْ، نَه وِسَانَه، بَلْکِی اَوْبِخَوه ظَالِمِنْ!

٥١. دَمَا کُو بَاوَرْمَنْدْ بِبَالْ حُکْمێ خُدێ و پێخَمْبَرێ وی ڤَه بێنَه گَازِکِرِنْ دَا کُو (پێخَمْبَرْ) دِنَاڤْ وَانْ دَه حُکِمْ بِکَه، گُوّتِنَا وَانْ بَسْ اَڤَه: مَه (فَرْمَانَا تَه) سَحْ کِرْ و مَه قَبُولْ کِرْ. ڤێجَا هَا اَڤْ، یێنْ کُو دِ دَاخَوازَا خَوه دَه سَرْفِرَازْ بُونَه.

٥٢. هَچِی کَسێ کُو بِگُوّتِنَا خُدێ و پێخَمْبَرێ وی بِکَه، ژ (عَذَابێ) خُدێ بِتِرْسَه و خَوه ژ (حَرَامِیَانْ) بِپَارێزَه، هَا اَوْ، یێنْ (کُو بِدَانَا خُدێ) سَرْفِرَازْ بُونَه.

٥٣. وَانْ مُنَافِقَانْ بِصُونْدَا هَرِی ئَاصِێ صُونْدْ خَوارْ؛ کُو اَگَرْ تَه فَرْمَانْ (ئَا دَرْکَتِنَا جِهَادێ) لِوَانْ بِکِرَا مُحَقَّقْ دێ اَوْ دَرْکَتِنَا (جِهَادێ). بِبێژَه: صُونْدْ نَخُونْ، اِطَاعَتْ اَشِیکَارَه! بێگُمَانْ خُدێ ژ یَا کُو هُونْ دِکِنْ ئَاگَاهْدَارَه.

٥٤. (ژ وَانْ رَه) بِبێژَه: بِگُوّتِنَا خُدێ و قَاصِدێ وی بِکِنْ. اَگَرْ وَانْ گُهْدَارِی نَکِرْ، ڤێجَا بِزَانِنْ کُو اَوْ ژ وَظِیفَیَا کُو لِسَرْ هَاتِیَه بَارْکِرِنْ بَرْپِرْسَه (ڤێجَا وی اَوْ بِجِهْ ئَانِی) و هُونْ ژِی ژ وَظِیفَیَا کُو لِسَرْ وَه هَاتِیَه بَارْکِرِنْ بَرْپِرْسِنْ. اَگَرْ هُونْ بِگُوّتِنَا وی بِکِنْ، هُونێ رَاسْتَرِێ بِبِنْ. وَظِیفَیَا پێخَمْبَرْ، بِرَوْشَکِی رُوّنْکَارْ و اَشکَرَه بَسْ تَبْلِیغَا فَرْمَانَا خُدێ یَه.

٥٥. خُدێ ژ نَاڤْ وَه پێمَانْ دَایَه وَانْ کَسێنْ کُو بَاوَرِی ئَانِینْ و کَارێنْ ڤَنْجْ کِرِنَه؛ کُو تَڤَزْ دێ وَانْ لِشُونَا هِنَکێنْ دِنْ لِاَرْدێ بِکَه شُونْگِرْ، کَا چَاوَا اَوێنْ بَرِیَا وَانْ ژِی لِشُونَا

هِنَكيْنْ دِنْ كِرِبُونْ شُونْگِرْ. اَوىَ دِينِىَ وَانْ (اِسْلَامِىَ) دَسْتهِلاتْ بِكَه، اَوْ دِينِىَ كُو خُدِىَ ژِ بُوْ وَانْ هِلْبِژَارْتِيَه و يىَ رَازِى بُويَه. اَوىَ رَوْشَا وَانْ پِشْتِى تِرْسَا وَانْ بِاَوْلَهِى و تَنَاهِيىَ بِگُهَرِينَه. اَوىَ عِبَادَتِىَ مِنْ بِكِنْ و دِىَ تِشْتَكِى ژِ مِنْ رَه نَكِنْ هَڤْپِشْكْ. اِيْدِى پِشْتِى ڤِىَ كِى نَانْكُورِيِىَ بِكَه ڤِيْجَا هَا اَوْ فَاسِقْ بِخَوه نَه.[1]

٥٦. بِئَاوَايِىَ پِيْدِڤِى نِمِيْژْ بِكِنْ، زَكَاتَا مَالِىَ خَوه بِدِنْ و بِگُوْتِنَا قَاصِدْ بِكِنْ دَا كُو رَحْمَتْ لِوه بِىَ كِرِنْ.

٥٧. تُو حِزِرْ نَكَه كُو اَوِيْنْ كَافِرْ بُونَه وَانْ زُوْرَا خُدِىَ بِرِيَه كُو لِسَرْ اَرْدِىَ نَهَاتِنَه عَذَابْدَانْ! جِهِىَ وَانْ ئَاگِرَه، اَوْ چِه پِيسَجِهَه و چِه پِيسْ وَارْگَهَه!

٥٨. گَلِى بَاوَرْمَنْدَانْ! اَوِيْنْ كُو دِبِنْ دَسْتِيْنْ وَه دَه (كُولَه و جَارِيِيْنْ وَه) و اَوِيْنْ كُو ژِ وَه هِىَ بَالِغْ نَبُونَه بِلا دِ سِىَ وَخْتَانْ دَه ژِ وَه دَسْتُورِىَ بِخَوازِنْ (ژِ بُوْ كُو وَرِنْ جَمْ وَه)؛ بَرِيَا نِمِيْژَا سِپِيْدِىَ (فَجْرِىَ)، دَمَا نِيڤرُو وِىَ وَخْتَا كُو هُونْ جِلِيْنْ خَوه دَاتِينِنْ و پِشْتِى نِمِيْژَا عَشَايِىَ. ژِ وَه رَه اَوْ سِىَ وَخْتْ؛ دَمِيْنْ بِتَنِيَايِنِىَ نَه. پِشْتِى ڤَانْ سِىَ دَمَانْ نَه ژِ وَه رَه نَه ژِى ژِ وَانْ رَه تُو گُنَهْ تُنَه (كُو بِيْدَسْتُورْ اَوْ ژِ بُوْ خِزْمَتِىَ) لِسَرْ وَه دِگَرِنْ؛ هِنْ ژِ وَه لِسَرْ هِنَانْ دِچِنْ و تِيْنْ. هَرْ وِسَا خُدَا ژِ وَه رَه ئَايَتَانْ اَشْكَرَا دِكَه و خُدِىَ (دِكَارْ و بَارِىَ خَوه دَه) زَانَا يَه، كَارْبِنَجِهَه.

٥٩. دَمَا زَارُوكِيْنْ وَه بَالِغْ بُونْ، بِلا اَوْ ژِى (ژِ بُوْ وَرِنْ جَمْ وَه) دَسْتُورِىَ بِخَوازِنْ، كَا چَاوَا يِيْنْ بَرِى وَانْ دَسْتُورْ خَوسْتِنَه. هَرْ وِهَا خُدِىَ ژِ وَه رَه ئَايَتِيْنْ خَوه اَشْكَرَا دِكَه (ژِ بُوْ كُو هُونْ رِيْزْ و تُورَيَا خَوه ژِ وَانْ بِگِرِنْ و لِگُورِى وَانْ تَڤْبِگَرِنْ). خُدِىَ (دِكَارْ و بَارِىَ خَوه دَه) زَانَا يَه، كَارْبِنَجِهَه.

---

١ اَڤْ ئَايَتَا پِيرُوزْ دِچَاخَكِى وِلُو دَه دَاكَتِيَه كُو پِيخَمْبَرْ، ژِ نُو دَسْتْ بِتَبلِيغِىَ كِرِبُو، مُسلمَانْ هِىَ لَاوَازْ بُونْ، ظُلِمْ و زُورْ لِوَانْ دِهَاتْ كِرِنْ، اَڤْ ئَايَتْ مِزْگِينْ دِدَا وَانْ كُو مُسلمَانْ پِشْتِى دَمَكَه نِيْزْ دِىَ زُورَا مُشْرِكَانْ بِبِنْ و دَسْتهِلاتِى، دِىَ بِكَڤَه دَسْتِىَ وَانْ و دِينِىَ وَانْ دِىَ بَلاڤْ بِبَه، بِسَرْ بِكَڤَه.

٦٠. اَوْ ژِنێنْ كَتى كُو ژِ زَواجىَ هِێڤِى بِرِينَه، ژِ وَانْ رَه تُو گُنَهَكْ تُنَه يَه كُواَوْ جِلێنْ ژِ سَرْ خوه دَيْنِنْ، بێيى كُو خِشْرێنْ خوه نِيشَانْ بِدِنْ. دِيسَا ژى اَگَرْ اَوْ خَوه بِنِخُمِينِنْ ژِ وَانْ رَه هِىَ چێتِرَه. خُدِىَ بِهِيزَرَه، زَانَا يَه.[١]

٦١. لِسَرْ يىَ كُورْ، لِسَرْ يىَ كُلَكْ و لِسَرْ يىَ نَخَوشْ گُنَهْ نِينَه (كُو ژِ جِهَادِىَ بِپَاشْ دَه بمِينِنْ، لَوْرَا كِرْيَارێنْ كُواَوْ نكَارِبنْ بِكِنْ لِوَانْ نَايێنَه بَارْكِرِنْ). ژِ وَه بِخَوه رَه ژى گُنَهْ تُنَه كُو هُونْ ژِ مَالَا (زَارُوكێنْ) خَوه، يَانْ ژِ مَالَا بَاڤێنْ خَوه، يَانْ ژِ مَالَا دَايِكێنْ خَوه، يَانْ ژِ مَالَا بِرَايێنْ خَوه، يَانْ ژِ مَالَا خَوهێنْ خَوه، يَانْ ژِ مَالَا ئَاپێنْ خَوه، يَانْ ژِ مَالَا مَتێنْ خَوه، يَانْ ژِ مَالَا خَالێنْ خَوه، يَانْ ژِ مَالَا خَالَتێنْ خَوه، يَانْ ژِ جِهێنْ كُو كِلِيتێنْ وَانْ دِدَسْتىَ وَه دَه نَه (يَانى سِپَارێنْ كُو بێحَقْدَسْتْ هُونْ لِوَانْ دِنێرِنْ) يَانْ ژى ژِ مَالِىَ دُوسْتێنْ خَوه بێدَسْتُورْ بِخُونْ. ژِ وَه رَه گُنَهْ تُنَه كُو هُونْ تَڤْ بِهَڤْ رَه، يَانْ ژى ژِ هَڤْ جُدَا بِخُونْ. دَمَا هُونْ هَرِنْ مَالَكِىَ (كُوتُو كَسْ لِهُنْدِرْ تُنَه بَه ژى) بِوِىَ سِلاڤَا كُو لِنِكْ خُدِىَ پِيرُوزْ و پَاكَه، سِلاڤِىَ لِسَرْ خَوه بِخَوه بِدِنْ. هَرْ وِهَا خُدِىَ، ژِ وَه رَه ئَايَتَان اَشكَرَه دِكَه دَا كُو هُونْ (وَانْ) فَهمْ بِكِنْ (و لِگُورِى وَانْ تَڤْبِگَرِنْ).

٦٢. بێگُمَانْ بَاوَرْمَنْدێنْ رَاسْتْ و دُرِسْتْ، اَوێنْ كُو ژِ دِلْ و جَانْ بِخُدِىَ و پێخَمْبَرِىَ وِى بَاوَرِى ئَانِينَه. اَوْ دَمَا دِگَلْ پێخَمْبَرْ دِكَارَكِى گِرِينْگِىَ جِڤَاكِى دَه بِنْ، حَتَا كُو دَسْتُورِىَ ژِىَ نَخوازِنْ اَوْ نَاچِنْ. بێگُمَانْ اَوێنْ كُو ژِ تَه دَسْتُورِىَ دِخوازِنْ؛ هَا اَوِنْ يێنْ كُو

---

١ شَرْمَگَهَا پِيرَكِىَ لِهَمْبَرْ يێنْ دِنْ لِسَرْ سِىَ بَشَانَه: ١- لِهَمْبَرْ مێرِىَ خَوه؛ ژِ مێرِىَ وِىَ رَه دُرِسْتَه جِهِىَ كُو بِخَوازَه لِىَ بِنێرَه. ٢- لِهَمْبَرْ ژِنْ و مَحْرَمێنْ وِىَ، جِيىَ كُو اَغْلَبْ خُيَا دِبَه اَوْ دِكَارِنْ لِىَ بِنێرِنْ، مِينَا؛ رُو، پُورْ، قِرِكْ، دَسْتْ، جَنْگ، لِنْگ و.. ٣- لِهَمْبَرْ زلامێنْ دِنْ، ژِ بِلى اِحْتِيَاجِىَ، مِينَا كُو ژِ بُوّ كُو پِىَ رَه بزَوِجِىَ يَانْ ژى ژِ بُوّ دَرْمَانكِرِنِىَ و غَيْنِى ڤَانْ.. اَوْ نكَارِنْ لِرُوِيىَ وِىَ و لِتُو جِهَكِى ژِنِىَ بِنێرِنْ. چِما؟ لَوْرَا فِتْنَا پِيرَكِىَ بِرُوِيىَ وِىَ يَه. فَاطِمَهيَا كَچه مُنْزِرْ (خُدِىَ ژِىَ رَازِيبَه) گُوّتْ: «مَه رُوِيىَ خوه ژِ زلامَانْ دِگرتْ.» (الحَاكِمْ) دِيَا مُومِنَانْ عَائِشَه (خُدِىَ ژِىَ رَازِيبَه) دِبێژَه: «سُوَارْ دِبرْ مَه رَه دَرْبَاسْ دِبُونْ و اَمْ دِگَلْ پێخَمْبَرْ دِ اِحْرَامَانْ دَه بُونْ؛ دَمَا مێرْ دِهَاتِنْ هَمْبَرِى مَه، مَه جِلْبَابِىَ خوه دَئَاڤێتْ سَرْ رُوِيىَ خوه و دَمَا ژِ مَه دَرْبَاسْ دِبُونْ مَه رُوِيىَ خوه ڤِدِكِرْ.» (اَبُو دَاوودْ).

بِرَاسْتِی بَاوَرِی بِخُدَا و پێخَمْبَرِێ وِی ئَانِینَه. نَاخوه؛ دَمَا کُواوْ ژِ بُو هِنْ کَارِێنْ خَوه دَسْتُورِێ ژِ تَه بِخَوازِنْ، ڤێجَا ژِ وَانِێ کُوتُو بِڤِێ دَسْتُورَا چُونِێ بِدِیِێ. ژِ خُدِێ ژِ بُو وَانْ لِێبُورِینَا گُنَهِێنْ وَانْ بِخَوازَه. بێگُمَانْ خُدِێ گُنَهْژێبِرَه، دِلُوڤَانَه.

٦٣. (گَلِی مُومِنَانْ!) هُونْ گَازِیکِرِنَا پێخَمْبَرْ ژِ بُو خَوه نَکِنْ مِینَا گَازِیکِرِنَا وَه یَا دِنَاڤْبَرَا خَوه دَه. بێگُمَانْ خُدِێ، ژِ نَاڤْ وَه بِوَانِێنْ کُوخَوه ڤَدِدِزِنْ، دِپِشْتْ هَڤْ دَه خَوه دِقَلێزِنْ (و بێدَسْتُورْ) دَرْتِێنْ، دِزَانَه. ڤێجَا بِلا اَوێنْ کُو بِگُوتِنَا وِی نَاکِنْ بِتِرْسِنْ کُو بَلایَكْ بِسَرْ وَانْ دَه بِێ، یَانْ ژِی عَذَابَکِی جَانْسُوژْ اِصَابَتِی وَانْ بِکَه.[1]

٦٤. ئَاگَاهدَارْ بِنْ، بێگُمَانْ چِه تِشْتێنْ لِاَرْدْ و ئَاسِیمَانَانْ هَنَه هَرْ اَوێنْ خُدِێ نَه. بێگُمَانْ خُدِێ بِرَوْشَا کُو هُونْ لِسَرِێ نَه دِزَانَه و رُوژَا کُو هُونِێ تێدَه لِخُدِێ ڤَگِرِنْ ژِی خُدِێ دِێ وَانْ ژِ کِرِنێنْ وَانْ ئَاگَاهدَارْ بِکَه. خُدِێ بِهَرْ تِشْتِی زَانَا یَه.

## ٢٥. سُورَه یێ فُرْقَانْ

سُورَه‌یِێ(فُرْقَانْ)،٧٧ (حَفْتِێ و حَفْتْ) ئَایَتَه. لِمَکِّێ دَاکَتِیَه. ژِ بَرْ کُو دِئَایَتَا یَکَمْ دَه بێژَیَا فُرْقَانْ دَرْبَاسْ بُویَه کُواوْ بِمَعْنَیَا جُدَاکَرَا حَقِی و بَاطِلِی یَه و نَئَاڤَكْ ژِ نَاڤێنْ قُرْئَانَا پِیرُوزَه، ژِ ڤِی سُورَه‌یِی رَه فُرْقَانْ هَاتِیَه گُوتِنْ.

بِنَاڤِێ خُدَایِێ کُو رَحْمَنَ رَحِیمَ

١. اَوِێ کُو فُرْقَانْ ژِ عَقْدِێ خَوه رَه هِنَارْتِیَه دَا کُو ژِ عَالَمِێ رَه بِبَه هِشِیَارْکَرْ، پَاكْ و پِیرُوزَه.

---

١ اَڤْ ئَایَتَا پِیرُوزْ؛ ژِ بُو بَاوَرْمَنْدَانْ دَرْسَکَه، تَعْلِیمَکَه کُو وَانْ هِینِی بَرْسِڤْدَانَا پێخَمْبَرْ دِکَه، دَا کُو مُسلِمَانْ لِبَوَارَا پێخَمْبَرْ نَه خَمْلێسْ بِنْ. دَمَا گَازِی وَانْ کِرْ لازِمَه هَرْنَه حُظوُرَا وِی دَا کُو لِفَرْمَانێنْ وِی گُهْدَارِی بِکِنْ. لَوْرَا پێخَمْبَرْ ژِ بُو تِشْتِێ بَسِیطْ گَازِی وَانْ نَاکَه؛ اَوْ ژِ بُو رَوْشَکَه گِرِینْگْ و فَرْمَانَکَه گِشْتِی گَازِی وَانْ دِکَه. مِمْکُنَه مَرَڤْ لِهَمْبَرْ هَڤْ خَمْلێسْ بَه؛ لێبَلِێ لِپَشْبَرِی پێخَمْبَرْ خَمْلێسِی قَتْ نَابَه.

٢. اَوْ خُدَا يَه، يێ كُو حُكِمْرَانِى و دَسْتْهِلاتِيَا اَرْدْ و ئَاسِيمَانَانْ هَرْ ژِێ رَه يَه، اَوْێ كُو تُو زَارُوْكْ ژِ خَوه رَه نَگِرْتِيَه و اَوْێ كُو دِ حُكِمْرَانِيَا وِى دَه تُو شِرِيكْ ژِێ رَه تُنَه، ڤِێجَا هَرْ تِشْتْ بِپِيڤَانْ و اَنْدَازْ ئَافِرَانْدِيَه.

٣. مُشْرِكَانْ ژِ بِلِى خُدِێ هِنْ مَعْبُودْ گِرْتِنَه كُو اَوْ نِكَارِنْ تِشْتَكِى بِخُلِقِينِنْ و اَوْ بِخَوه هَاتِنَه خُلِقَانْدِنْ. اَوْ نَه دِكَارِنْ تُو زِرَارِێ ژِ سَرْ خَوه بِدِنْ ئَالِى نَه ژِى فَيْدَيِكِێ بِدِنْ خَوه. اَوْ نَه دِكَارِنْ تُو كَسِى بِمِرِينِنْ و نَه ژِى سَاغْ بِكِنْ و اَوْ نِكَارِنْ تُو كَسِى پِشْتِى مِرِنِێ دِيسَا ڤَژِينِنْ.

٤. اَوِێنْ كَافِرْ بُونَه گُوْتِنْ: اَڤْ (قُرْئَانْ) ژِ دَرَوكِێ پێ ڤَه نِينَه كُو وِى اَوْ ژِ جَمْ خَوه ڤَه لِێئَانِيَه، دَرْ بَارِێ لِێئَانِينَا وِێ دَه قَوْمَكِى دِنْ ژِى ئَارِكَارِيَا وِى كِرِيَه. بِرَاسْتِى ژِى وَانْ كَافِرَانْ (بِڤِێ گُوْتِنَا خَوه) ظُلِمْ و دَرَوْكَارِى كِرِنَه...

٥. گُوْتِنْ: (اَڤْ قُرْئَانْ) چِيرُوكْ و چِيڤَانُوكِێنْ پِێشِيَانَه كُو (مُحَمَّدْ) اَوْ بِنِڤِيسْيَارَكِى دَانَه نِڤِيسَانْدِنْ. ڤِێجَا اَوْ سِبَهُ و اِيڤَارِێ ژِ وِى رَه تِێنَه خَونْدِنْ.

٦. بِبێژَه: اَوْ خُدَايێ كُو سِرْ و رَازَا اَرْدُ و ئَاسِيمَانَانْ دِزَانَه اَڤْ قُرْئَانْ (ژِ مِنْ رَه) شَانْدِيَه. بێگُمَانْ اَوْ گُنَهْژِێبِرَه، دِلُوڤَانَه.

٧. گُوْتِنْ: اَڤْ چه پێخَمْبَرَه كُو (اَوْ ژِى وَكِى مَه) خَوارِنێ دِخَوه و لِسُوكَانْ دِگَرَه! دَه بِلا فِرِيشْتَيَكْ ژِ بُوْ وِى بِهَاتَا خَوارِێ دَا كُو پێ رَه بِبُويَا هِشِيَارْكَرَكْ (و اَوْ رَاسْتْ بِدِێرَايَا)؟

٨. يَانْ ژِ بُوْ وِى (ژِ ئَاسْمِێنْ) گَنْجِينِيَكْ هَاتِبُويَا خَوارِێ، يَانْ ژِى ژِێ رَه بَاخْچِيَكْ هَبُويَا كُو ژِێ بِخَوارَا (دَا كُو فَرْقَكَه وِى ژِ مَه هَبُويَا). وَانْ ظَالِمَانْ (ژِ بَاوَرْمَنْدَانْ رَه) گُوْتْ: بَسْ وَه دَايَه پَىْ زِلامَكِى سِێرلِێبُويِى!

٩. (رَسُولِێ مِنْ!) دَه بِنێرَه كَا چَاوَا دَرْ بَارِێ تَه‌دَه دَرْبُ و مَسَلْ ئَانِينَه. ڤِێجَا اَوْ ژِ رِێ كَتِنَه و اِێدِى اَوِێ رِێيَكِێ نَبِينِنْ.

١٠. پَاكْ و پیرُوزَه، اَوێ كُو اَگَرْ اَوْ بِقِێ یێنْ كُو ژ ڤَانْ هِێ چێترْ كُو اَوْ بِهِشْتِنْ كُو دِبنِێ وَانْ دَه چَمْ دِهَرِكنْ دِێ بدَه تَه و اَوِێ كُوشْكُ و قَسْرَانْ ژی بدَه تَه.

١١. نَخێرْ! بَلْكِی وَانْ بَاوَری برُوژَا قِیَامَتِێ نَئَانیبُونْ و مَه ژی ژ بُوّ وَانێنْ كُو بَاوَری بقِیَامَتِێ نَئَانیه ئَاگِرَكی بِپێتْ و هَارْ ئَامَادَه كِریَه.

١٢. دَمَا كُو جَهَنَمْ ژِ مَسَافَیكَه دُورْ ڤَه وَانْ دِبینَه، اَوْ، گَرَه گُرْ و فِزینیَا وِێ هِێ ژ دُورْ ڤَه دِبِهیزِنْ.

١٣. دَمَا كُو دَسْتێنْ وَانْ بِستُوِیێ وَانْ ڤَه گرێدَایی دِ دُوژَهِێ دَه لِجهَكِی تَنْگْ بێنَه وَرْكرِنْ، لِوِێ دَرِێ مِرنَا خَوه دِخَوازِنْ (دَا كُو ژِ عَذَابْ خَلاصْ ببِنْ).

١٤. (ژِ وَانْ رَه دِێ بِێ گُوّتِنْ): ایرُو نَه بَسْ جَارَكِێ؛ گَلَكْ جَارَانْ مِرنَا خَوه بِخَوازِنْ (لِێ خَوسْتِنَا وَه دِێ تُو فَیْدِێ نَدَه وَه).

١٥. (ژ وَانْ رَه) بِبێژَه: اَرِێ مَا اَڤْ (دُوژَهْ) چێترَه یَانْ اَوْ بِهِشْتَا سَرَاڤِتی یَا كُو تَقْوادَارْ پِێ هَاتِنَه سُوّزْدَاینْ كُواَوْ ژ بُوّ وَانْ هَرْ پَادَاشْ و وَارَه؟

١٦. دبِهِشْتێدَه تِشْتِێ كُواَوْ دِخَوازِنْ ژِ وَانْ رَه هَیَه، اَوْ لِورْ دَائِمی نَه. اَڤْ لِسَرْ خُدَایێ تَه پَیْمَانَكَه مِسُوگَرَه كُو مَافْدَارْ ژِێ دِخَوازِنْ.

١٧. وِێ رُوژِێ خُدَا دِێ وَانْ و وَانْ مَعْبُودێنْ كُو ژِ بِلِی وِی پَرَسْتِنَا وَانْ دِكرِنْ، بینَه جَمْ هَڤْ و (ژِ مَعْبُودَانْ رَه دِێ) بِبێژَه: اَرِێ مَا وَه اَڤْ بَنْدَییێنْ مِنْ ژِ رِێ خِسْتِنْ ئَانْ اَوْ بِخَوه ژ رِێ كَتِنَه؟

١٨. اَوْ مَعْبُودْ دِبێژِنْ: اَمْ ژِ كَارِێ كُو وَانْ كِری تَه پَاكْ دِدێرِنْ. نَه حَدِێ مَه یَه كُو ژ بِلِی تَه اَمْ دُوسْتُ و ئَاریكَارَانْ ژِ خَوه رَه بِگرِنْ، (ڤێجَا اَمِێ چَاوَا بِبێژِنْ بلا خَلْكْ پَرَسْتِنَا مَه بِكنْ). لِێبَلِێ تَه اَوْقَاسْ نِعْمَتْ لِوَانْ و بَاڤێنْ وَانْ كِرنْ حَتَا كُو وَانْ تُو ژِ بیرْ كِرنْ و اَوْ بُونْ قَوْمَكی وِسَا كُو هَلاكْ حَقْ كِرنَه.

١٩. (ژِ مُشْرِکَانْ رَه تِیْ گُوْتِنْ): بِرَاسْتِی اَوێنْ کُو وَه پَرِسْتِنَا وَانْ دِکِرْ، دِگُوْتِنَا وَه دَه هُونْ دَرَوِینْ دَرْخِسْتِنْ. ڤێجَا هُونْ نَه دِکَارِنْ عَذَابْ ژِ خَوه ڤَگِرِینِنْ نَه ژِی دِکَارِنْ ئَارِیکَارِیکِیْ ژِ خَوه رَه بِکِنْ. ژِ نَاڤْ وَه کِی ظُلْمِیْ (شِرْکِیْ) بِکَه اَمِیْ عَذَابِکِی مَزِنْ (و دِژْوَارْ) بِوِی بِدِنْ چێژَانْدِنْ!

٢٠. (یَا مُحَمَّدْ!) مَه بَرِیَا تَه هَرْ چِقَاسْ پێخَمْبَرَکْ شَانْدِبَه، هَرْ وَانْ خَوارِنْ دِخَوارْ و لِسُوکَانْ دِمَشِیَانْ. مَه هِنْ ژِ وَه ژِ هِنَانْ رَه کِرِنَه اِمْتِحَانُ و جَرِبَانْدِنْ، کَا هُونِیْ خَوه رَاگِرِنْ (یَانْ نَا). خُدَایِیْ تَه هَرْ بِینَرَه.

٢١. اَوێنْ کُو هێڤِیَا هَاتِنَا بَرْ دَسْتِیْ مَه نَاکِنْ، گُوْتِنْ: دَه بِلا مَلَائِکَتْ ژِ بُو مَه هَاتِبُونَا خَوارِیْ یَانْ ژِی دَه بِلا مَه اَشْکَرَا خُدَایِیْ خَوه بِدِیتَایَا. صُونْدْ بَه، وَانْ دِنَفْسَا خَوه دَه خَوه مَزِنْ دِێرَا و بِپُوزْبِلِنْدِیکَه مَزِنْ ژِ حَدِیْ خَوه دَرْکَتِنْ.

٢٢. رُوژَا کُو (مُشْرِكْ) مَلَائِکَتَانْ دِبِینِنْ، وِیْ رُوژِیْ ژِ گُنَهْکَارَانْ رَه تُو مِزْگِینِیَا خێرِیْ تُنَه و مَلَائِکَتْ ژِ وَانْ رَه دِبێژِنْ: (بِهِشْتْ و دِلْشَادِی ژِ بُو وَه) مَمْنُوعَه (هُونْ ژِیْ مَحْرُومِنْ)!

٢٣. اَمْ کَارْ و کِرْیَارێنْ کُو وَانْ کِرِنْ تِینِنْ و اَمْ مِینَا تُوزِیْ وِیْ لِبَرْ بَا دِخِنْ.[١]

٢٤. وِیْ رُوژِیْ اَهلِیْ بِهِشْتِیْ دِچێتِرِینْ جِهَانْ دَه و دِبَاشْتِرِینْ اِسْتِیرَاحَتْگَهَانْ دَه نَه.

٢٥. وِیْ رُوژِیْ ئَاسِیمَانْ دِگَل عَوْرێنْ سِپِی شَقْ دِبَه و مَلَائِکَتْ بێژْمَارْ تێنَه خَوارِیْ.

٢٦. هَا وِیْ رُوژِیْ حُکمْرَانِیَا سَرْدَسْتْ ئَا رَاسْتَقِینَه ژِ خُدَایِیْ رَحْمٰنْ رَه یَه. اَوْ ژِ بُو کَافِرَانْ رُوژَکَه دِژْوَارَه.

١ اَڤْ ئَایَتَا پِیرُوزْ دِدَه زَئَانِینْ کُو دَمَا مَرِڤِیْ کَافِرْ کَارْ و بَارَکِی بَاشْ بِکَه، مِینَا کُو مێڤَانَانْ خَودِی بِکَه، ئَارِیکَارِیَا خَودِی و دُوسْتَانْ بِکَه، سَرِیَا لَاقْرَبَا بِدَه، صَدَقَا بِدَه و دِ هَوارَا بِنْدَسْتْ و ژَارَانْ هَرَه، ژِ بُو کُو بَاوَرِی نَئَانِیَه تُو فَیْدِیْ ژِیْ نَابِینَه. لَوْرَا؛ یَا کُو اَوْ دِکَه نَه ژِ بُو خُدِیْ یَه؛ یَانْ ژِ جِبلِیَتَا وِی یَه یَانْ ژِی ژِبُو مَرَامَکَه دِنْ کِرِنَه. مَرِڤِیْ مُسِلْمَانْ ژِی دَمَا نَه ژِبُو خُدِیْ بِکَه خُدِیْ ژِیْ قَبُولْ نَاکَه.

٢٧. وِىٚ رُوژِىٚ يِىٚ ظَالِمْ دِىٚ هَرْدُو دَسْتِيْنْ خوه گَزْ بِكَه و وِىٚ بِبيْژَه: خَوزِيكَا مِنْ لِگَلْ پِيْخَمْبَرْ ژِ خَوه رَه رِيَكْ بِگِرْتَا!

٢٨. (دِبيْژَه): وَاخْ لِحَالِىٚ مِنْ بَه! خَوزى مِنْ فِلاَنْكَسْ ژِ خَوه رَه نَكِرَا دُوسْتْ!

٢٩. صُونْدْ بَه، پِشْتِى كُو قُرْئَانْ ژِ مَه رَه هَاتْ وِى اَزْ خِرَانْدِمْ و ژِىٚ دَامَه پَاشْ. شَيْطَانْ ژِ بُوٚ اِنْسَانَانْ هَرْ رَزِيلْكَرَه.

٣٠. پِيْخَمْبَرْ گُوٚتْ: خُدَايِىٚ مِنْ! گَلِىٚ مِنْ قُرْئَانْ تَرْكْ كِرْ و پِىٚ عَمَلْ نَكِرِنْ.

٣١. هَرْ وِسَا اَمْ ژِ هَرْ پِيْخَمْبَرَكِى رَه ژِ گُنَهْكَارَانْ دِژْمِنَكِى پَيْدَا دِكِنْ، خُدَايِىٚ تَه ژِ هيْلا رِيْبَرِى و ئَارِيكَارِى ڤَه بَسِى تَه يَه.

٣٢. اَوِيْنْ كَافِرْ بُونَه گُوٚتِنْ: دَه بِلا قُرْئَانْ بِيَكْ جَارِىٚ، بِنَقْلَكِىٚ ژِىٚ رَه بِهَاتَا هِنَارْتِنْ. مَه وِسَا اَوْ هِنْ بِهِنْ هِنَارْتْ دَا كُو اَمْ دِلِىٚ تَه پِىٚ مِكُومْ بِكِنْ و مَه اَوْ ئَايَتْ ئَايَتْ (بِرِيْكَا جِبْرِيلْ) بِتَه دَا خَونْدِنْ.

٣٣. (يَا مُحَمَّدْ!) اَوْ چِقَاسْ مَسَلَيَكِىٚ لِهَمْبَرِىٚ تَه بِينِنْ (دَا كُو دُوزَا تَه پُوچْ بِكِنْ)، اَمْ هَرْ ئَا رَاسْتِرِينْ و تَفْسِيرَكَه سِپَحِيتِرْ ژِ تَه رَه تِينِنْ.

٣٤. اَوِيْنْ كُو لِسَرْ رُوِيِيْنْ خَوه بَرْ بِدُوژَهِىٚ ڤَه تِيْنَه ئَاژُوتِنْ، هَا اَوْ پِيسْتِرِينْ خُدَانْجِهِنْ و شَاشْتِرِينْ خُدَانْرِيْكِنْ.

٣٥. صُونْدْ بَه، مَه كِتِيْبْ دَايَه مُوسَا و مَه بِرَايِىٚ وِى هَارُونْ ژِى ژِ بُوٚ وِى كِرَه وَزِيرْ و ئَارِيكَارْ.

٣٦. مَه ژِ وَانْ رَه گُوٚتْ: هَرِنْ بَالْ وِى قَوْمِىٚ كُو بَئَايَتِيْنْ مَه بَاوَرِى نَائِينِنْ، ڤِيْجَا (پِشْتِى كُو اَوْ چُونْ و وَانْ بَاوَرِى نَئَانِى) مَه اَوْ ژِ بِنِى ڤَه قِرْ كِرِنْ.

٣٧. قَوْمِىٚ نُوحْ، چِه دَمَا كُو وَانْ بَاوَرِى بِپِيْخَمْبَرَانْ نَئَانِى، مَه اَوْ ژِى بِطُوفَانِىٚ خَنِقَانْدِنْ

و مَه اَوْ ژ بُو مرُوْڤانْ كِرِنْ عِبْرَتْ. مَه ژِ بُو ظَالِمَانْ (لِئَاخْرَتِیْ) عَذَابَكِی جَانْسُوژْ ئَامَادَه كِرِيَه.

٣٨. مَه عَادْ، سَمُودْ، خَلْكِیْ رَسِّیْ و گَلَكْ مِلَّتِيْنْ كُو دِنَاڤْبَرَا ڤَانْ دَه ژِی...

٣٩. مَه ژِ هَرْ يَكِی ژِ وَانْ رَه ئَايَتْ و دَلِيلْ ئَانِينْ، (لِيْبَلِیْ ژِ بَرْ كُو وَانْ بَاوَرِی نَئَانِی) مَه تَڤَكْ بِرِنْ هَلاكِیْ.

٤٠. صُونْدْ بَه، اَوْ (مُشْرِكْ) دِبَرْ وِی وَلاتِیْ كُو بَارَانَا كَارَسَاتْ و بَلايَا پِيسْ لِیْ بَارِيَايَه دَرْبَاسْ بُونَه. اَرِیْ مَا وَانْ اَوْ نَدِيتْ (كُو ژِیْ عِبْرَتْ بِگِرِنْ). نَا، بَلْكِی اَوْ بِسَاغْبُونَا پِشْتِی مِرِنِیْ بَاوَرِی نَايِينِنْ.[1]

٤١. (يَا مُحَمَّدْ!) دَمَا كُو اَوْ تَه دِبِينِنْ اَوْ هَرْ حَنَكِيْنْ خَوه بِتَه دِكِنْ (و دِبِيْژِنْ): مَا اَوِیْ كُو خُدِیْ بِپِيْخَمْبَرِی (ژِ مَه رَه) شَانْدِيَه اَڤَه؟

٤٢. (اَوْ ژِ هَڤْ رَه دِبِيْژِنْ): اَگَرْ مَه لِسَرْ حَبَانْدِنَا مَعْبُودِيْنْ خَوه سَبَاتْ نَكِرَا، هِنْدِكْ دِمَا كُو وِی اَمْ ژِ رِيَا اِلٰهِيْنْ مَه بِخِرَانْدَا. پَاشِیْ دَمَا اَوْ عَذَابْ بِبِينِنْ، اَوْ دِیْ بِزَانِنْ كَا كِی رِيْشَاشْتِرَه!

٤٣. (يَا مُحَمَّدْ!) اَرِیْ مَا تَه اَوْ كَسِیْ كُو هَوَسَا خَوه ژِ خَوه رَه كِرِيَه اِلٰهْ نَدِيتْ، اَرِیْ مَا ڤِيْجَا تُو يِیْ بِبِی كَفِيلِیْ وِی؟

٤٤. يَانْ ژِی، مَا ژِ تَه وَه يَه كُو پِرِيْنْ وَانْ سَحْ دِكِنْ ئَانْ ژِی فَهمْ دِكِنْ؟ اَوْ بَسْ مِينَا دَوَارَانِنْ، بَلْكِی ژِ دَوَارَانْ ژِی رِيْشَاشْتِرِنْ.

---

١ اَوْ وَلاتِیْ كُو اَڤْ فَلاكَتْ هَاتَه سَرِیْ وَانْ «سَدُومْ» بُو كُو اَوْ وَلاتِیْ گَلِیْ لُوطْ پِيْخَمْبَرَه. خُدِیْ، بِسَدَمْ عَمَلِیْ وَانْ اِیْ كِرِيْتْ بَارَانْ و كَفْرْ بِسَرْ وَانْ دَه بَارَانْدْ و اَوْ هلاكْ كِرِنْ. مُشْرِكِيْنْ قُرَيْشِی ژِی گَاڤَا ژِ بُو بَازِرْگَانِيِیْ دِچُونَه سَفَرَا شَامِیْ دِ وِی وَلاتِی رَه دَرْبَاسْ دِبُونْ، اَنْجَامَا خِرَابْ ئَا كُو هَاتِيَه سَرِيْنْ وَانْ بِچَاڤِیْ سَرِیْ خَوه دِيتِنَه و دِيسَا ژِی عِبْرَتْ نَگِرْتِنَه و نَه هَاتِنَه اِيمَانِیْ.

**٤٥.** مَا تُو نَانێرى كُو خُدَايێ تَه چَاوَا سِى دِرێژْ كِريَه؟ اَگَرْ بِخوسْتَا تَقَزْ دِێ اَوْ نَلِبتَانْدَا. پِشْتْرَه مَه رُوژْ ژِى لِسَرْ هَبُونَا وِێ كِرَه نِشَانْ.

**٤٦.** پَاشِێ مَه اَوْ سِى هِێدِى هِێدِى بِبَالْ خَوه ڤَه كِشَانْدْ.

**٤٧.** (گَلِى مِرُوڤانْ!) خُدِێ يَه، يِێ كُو شَڤْ ژِ وَه رَه كِريَه سِتَارْگَه و خَوْ ژِى كِريَه تَنَاهِى و رُو ژِى كِريَه ڤَژِينْ ژِ بُو كَارْ و خَبَاتِێ.

**٤٨.** خُدِێ يَه، يِێ كُو بَرِى رَحْمَتَا خَوه بِبَارِينَه بِمزْگِينْدێرِى بَايِێ دِشِينَه و مَه ژِ ئَاسْمێنْ بَارَانَكه پَاقِژْكَرْ بَارَانْدْ.

**٤٩.** دَا كُو اَمْ وَلاتَكِى هِشْكَمِرِى پِێ ڤَژِينِنْ و هِنَكْ ژِ وَانْ حَيْوَانێنْ كُو مَه اَوْ ئَافِرَانْدِنَه و گَلَكْ اِنْسَانَانْ ژِى پِێ ئَاڤْ بِدِنْ.

**٥٠.** صُونْدْ بَه، مَه اَوْ بَارَانْ دِنَاڤْ وَلاتَانْ دَه بَلاڤْ كِرْ دَا كُو خُدَايِێ خَوه دِبِيرْ بِينِنْ. ڤێجَا پِرێنْ مِرُوڤانْ لِبَرْ وِێ ئَاصِێ بُونْ و وَانْ هَرْ نَانْكُورِى كِرْ.

**٥١.** اَگَرْ مَه بِخوسْتَا هَلْبَتْ مَه دِێ ژِ هَرْ بَاژَارَكِى رَه (پێخَمْبَرَكِى) هِشِيَارْكَرْ بِشَانْدَا، (لێبَلِێ ژِ بُو هِشِيَارْكَرِيِێ مَه تُو بِژَارْتْ).

**٥٢.** ڤێجَا بِگُوتِنَا كَافِرَانْ مَكَه و بِقُرْئَانِێ لِهَمْبَرِى وَانْ جِهَادَكَه مَزِنْ بِكَه!

**٥٣.** خُدِێ يَه، يِێ كُو دُو دَرْيَا دِكێلَكَا هَڤْ دَه، وَانْ ژِ وَانْ رَه بَرْدِدَه. اَڤَا هَا شِێرِينَكَه كُو تِيبُونِێ رَادِكَه و اَڤَا هَا ژِى شُورَكَه كُو تِيبُونِێ زێدَه دِكَه. دِنَاڤْبَرَا وَانْ دَه نَاڤْبرَكْ هَيَه كُو اَوْ تَڤْلِيهَڤْ نَابِنْ.

**٥٤.** خُدِێ يَه، يِێ كُو ژِ ئَاڤِێ اِنْسَانْ خُلقَانْدِيَه و اَوْ كِريَه خُدَانْنَسَبْ و خُدَانْخِزْمِى. تَقَزْ خُدَايِێ تَه قَادِرِێ هَرْ تِشْتِى يَه.

**٥٥.** اَوْ (كَافِرْ) ژِ بِلِى خُدِێ پَرَسْتِنَا هِنْ تِشْتێنْ وِسَا دِكِنْ كُو اَوْ نَه دِكَارِنْ فَيْدِێ بِدِنْ وَانْ

نَه ژی دِکَارِنْ زَرَارِێ بِدِنْ وَانْ. مِرُۆڤێ کَافِرْ لِهَمْبَرِی خُدَایِێ خَوه هَرْ (ژِ شَیْطِێنْ رَه پِشْتَكْ و) ئَارِیکَارَه.

٥٦. (یَا مُحَمَّدْ!) مَه تُو بَسْ بِمزْگِینْبَرِی و هِشِیَارْکَرِی شَانْدِیَه.

٥٧. (ژِ وَانْ رَه) بِبێژَه: اَزْ، بَرَانْبَرِی ڤێ (تَبلِیغَا خَوه) تُو حَقَکِێ ژِ وَه نَاخَوازِمْ. لِێبَلِێ اَوْ کَسِێ کُو بِڤێ بِبَالْ خُدَایِێ خَوه ڤَه رِیَکِێ بِگْرَه (و دِرِیَا وِی دَه ژِ بُۆ رِزَایَا وِی مَالِێ خَوه بِدَه) اَوْ جُدَا یَه.

٥٨. تُو خَوه بِسْپێرَه یِێ کُو هَرْ سَاغَه اَوِێ کُو هِیچْ نَامِرَه. حَمْدِێ وِی بِکَه ژِ هَرْ کِێمَاسِیێ پَاكْ بِدێرَه. خُدِێ، بِگُنَهێنْ بَنْدَیێنْ خَوه ژِ ئَاگَاهْدَارِی ڤَه بَسَه.

٥٩. خُدِێ یَه، یِێ کُو اَرْدْ و ئَاسِیمَانْ و یێنْ کُو دِنَاڤْبَرَا وَانْ دَه هَنَه دِشَشْ رُوژَانْ دَه ئَافِرَانْدِنَه. پَاشِێ خُدَایِێ رَحْمٰنْ لِسَرْ عَرْشِێ خَوه رَاسَرْ بُو (رَاسَرْبُونَکَه بَابَتِی خَوه)؛ ڤێجَا تُو پِرْسِێ ژِ یَکِی زَانَا بِکَه (کُو اَوْ ژی خُدَا یَه).

٦٠. دَمَا ژِ وَانْ رَه بِێ گُۆتِنْ: ژِ خُدَایِێ رَحْمٰنْ رَه هَرِنْ سِجُودِێ، دِبێژِنْ: مَا خُدَایِێ رَحْمٰنْ چِی یَه؟ اَمِێ چَاوَا ژِ بُۆ یِێ کُو تُو فَرْمَانَا مَه بِسِجُودَا ژِێ رَه دِکِی هَرِنْ سِجُودِێ! اَڤْ گَازِیَا وَه نَفْرَتَا وَانْ زێدَه دِکَه.

٦١. اَوِێ کُو لِاَسْمَانَانْ رِێگَهْ چێکِرِنْ و تێدَه رُوژْ و هَیْڤَکَه رُونَاكْ دَئَانِینْ، پِیرُوزْ و خُدَانْکَرَمَه.

٦٢. اَوَه، یِێ کُو شَڤْ و رُوژْ ژِ هَڤْ رَه کِرِنَه شُونْگِرْ، ژِ بُۆ وَانْ کَسێنْ کُو بِخَوازَه (کَرَمْ و ڤَنْجِیَا خُدَا) بِینَه بِیرَا خَوه، یَانْ ژی بِخَوازَه شُکْرِێ وِی بِکَه.

٦٣. بَنْدِیێنْ رَحْمٰنْ ، اَوِێنْ کُو لِسَرْ اَرْدِێ بِنَفْسْبِچُوکِی بِرِێ ڤَه دِچِنْ و دَمَا کُو مِرُۆڤێنْ نَزَانْ ژِ وَانْ رَه پِیڤێنْ نَه لِرِێ دِبێژِنْ (اَوْ ژِ وَانْ رَه دِبێژِنْ) سِلاڤْ لِوه بَه (و ژِ وَانْ دَرْبَاسْ دِبِنْ)

٦٤. اَوِیٚنْ کُو ژِ خُدَایِیٚ خَوه رَه شَڤِیٚ لِپِیَانِنْ و سَجْدَه دِبِنْ...

٦٥. اَوِیٚنْ کُو دِبیٚژِنْ: خُدَایِیٚ مَه! عَذَابِیٚ دُوژَهِیٚ ژِ سَرْ مَه بِدَه ئَالِی. بِیٚگُمَانْ عَذَابِیٚ وِیٚ لاَزِمْ و دَائِمِی یَه.

٦٦. بِیٚگُمَانْ اَوْ دَرْ چه پِیسَجِهْ و چه پِیسْ وَارْگَهَه!

٦٧. اَوِیٚنْ کُو دَمَا خَرْجْ دِکِنْ، دَسْتْبَلاَڤِی و دَسْتَنْگِیِیٚ نَاکِنْ و دِنَاڤَا هَرْدِیَانْ دَه رِیٚیَکَه نَاڤِنْجْ دِگِرِنْ.

٦٨. اَوِیٚنْ کُو دِگَلْ خُدِیٚ عِبَادَتِیٚ مَعْبُودَکِی دِنْ نَاکِنْ و بِنَحَقِی اَوْ جَانِیٚ کُو خُدِیٚ (کُشْتِنَا) وِی حَرَامْ کِرِیَه نَاکُژِنْ و زِنَایِیٚ نَاکِنْ. کِی کُو ڤَانْ بِکَه دِیٚ (لِئَاخْرَتِیٚ) رُوبِرُویِی جَزَا بِبَه.

٦٩. رُوژَا قِیَامَتِیٚ عَذَابِیٚ وِی دِیٚ ڤَاتْ بِڤَاتْ زِیٚدَه بِبَه و بِشَرْپَزِیِی هَرْ و هَرْ دِیٚ تِیٚدَه بِمِینَه.

٧٠. ژِ بِلِی وِی کَسِیٚ کُو تُوبَه بِکَه، بَاوَرِی بِینَه و کَارَکِی ڤَنْجْ بِکَه، ڤِیٚجَا هَا اَوْ، خُدِیٚ گُنَهِیٚنْ وَانْ بِخیٚرَانْ تَبدِیلْ دِکَه. خُدِیٚ گُنَهْژِیٚبِرَه، دِلُوڤِینَه.

٧١. چه کَسِیٚ کُو ژِ گُنَهَانْ تُوبَه بِکَه و کَارْ و کِرْیَارِیٚنْ ڤَنْجْ بِکَه، بِیٚگُمَانْ اَوِیٚ بِتُوبَیَکَه مَقْبُولْ لِخُدِیٚ ڤَگَرَه.

٧٢. اَوِیٚنْ کُو شَاهْدَزُورِیِیٚ نَادِنْ و دَمَا دِبَرْ کِرِیٚتِی و کَلَڤَاژِیِیٚ رَه دَرْبَاسْ دِبِنْ، بِجُوَانْمِیٚرِی تِیٚکِلْ نَابِنْ.

٧٣. اَوِیٚنْ کُو دَمَا بَئَایَتِیٚنْ خُدَایِیٚ خَوه تِیٚنَه پَنْدْ و شِیرَتْکِرِنْ، اَوْ مِینَا کَرْ و کُورَانْ ژِیٚ غَافِلْ نَامِینِنْ.

٧٤. اَوِیٚنْ کُو دِبیٚژِنْ، خُدَایِیٚ مَه! ژِ ژِنْ و زَارُوکِیٚنْ مَه تِشْتِیٚ کُو چَاڤِیٚ مَه پِیٚ رُونَاهِی بِبَه بِدَه مَه و مَه ژِ تَقْوَادَارَانْ رَه بِکَه رِیٚبَرْ و پِیٚشَوَا!

**٧٥.** هَا اَوْ (بَنْدَیێنْ رَحْمٰنْ)، بِسَبُنَتْ صَبْرَا کُو کِێشَانَه دِێ بِیهِشْتَا هَری بِلِنْدْ بێنَه خَلاتْکِرِنْ و دِێ بِبِخێرهَاتِنْ و سِلاڤَا (مَلَائِکَتَانْ) بێنَه پێشْوَازِیکِرِنْ.

**٧٦.** اَوْ تێدَه سَرَاقَتِی و اَبَدِی نَه، اَوْ خَوشْ نِشْتَجِهْ و رِنْدلِیْمایینَه!

**٧٧.** بێژَه: اَگَرْ نَه ژِ دُعَا و عِبَادَتِێ وَه بَه، خُدَایِێ مِنْ دِێ چه ژِ وَه بِکَه؟! ڤێجَا وَه بَاوَری نَئَانِی، اِیجَارْ عَذَابْ دِێ لِسَرْ وَه مِسُوگَرْ بِبَه.[١]

## ٢٦. سُورَه یِێ شُعَرَاء

سُورَەیِێ (شُعَرَاء) ، ٢٢٧ (دُو سَدْ و بیسْتُ و حَفْتْ) ئَایَتَه. ژِ چَارْ ئَایَتێنْ دَاوِیێ پێ ڤَه تَڤْ لِمَکِّیێ دَاکَتِنَه. شُعَرَاء پرْژمَارِیَا بێژَیَا «شَاعِرْ» کُو بِمَعْنَیَا هَلْبَسْتْڤَانَه. ژِ بَرْ کُو سُورَه دِئَایَتَا ٢٢٤'اَمْ دَه بَحْسَا شَاعِرَانْ کِرِیَه ژِێ رَه شُعَرَاء هَاتِیَه گُوتِنْ.

**بِنَاڤِێ خُدَایِێ کُو رَحْمٰنَ رَحِیمَ**

١. طَا، سِینْ، مِیمْ.

٢. اَوْ ئَایَتێنْ کِتێبَا رُونْکَرِنْ.

٣. (یَا مُحَمَّدْ!) هِنْدِكْ مَایَه تُو خَوه بِکُژِێ ژِ بَرْ اَنْدِیشَیَا کُو اَوْ بَاوَرِیێ نَاینِنْ؟

---

١ خُدِێ تَعَالا ژِ ئَایَتَا ٦٣یێ حَیَانِی ئَایَتَا ٧٧یێ بَحْسَا سَالِخِێ «عِبَادُ الرَحْمَانْ» کِرِیَه.

عِبَادُ الرَحْمَانْ: لِگُوری اَهْلِێ تَحْقِیقِێ، عِبَادَتْکَرێ خُدَایِێ رَحْمٰنْ ، یَعْنِی اَوِێ کُو ژِ خُدِێ رَه عِبَادَتْ دِکِنْ. لَوْرَا عِبَادْ: گَلْژمَارَا «عَابِدْ» یَه بواتَیَا عِبَادَتْکَرَه.

تِشْتَا اَمْ ژِ ڤَانْ ١٥ ئَایَتَانْ فَهمْ دِکِنْ اَڤَه: پێشی، خُدِێ عِبَادْ نِسْبَتِی بَالْ خَوه ڤَه کِرِنَه دَا کُو اَمْ بزَانِنْ؛ عِبَادَتْکرنَا ژِ خُدِێ رَه، ژِ بُو بَنیَانْ نَه کِیمَاسِیَه بَلْکِی شَرَفَه. پَاشِێ، اَمْ بزَانِنْ کُو اَڤْ قُرئَانْ کَلامِێ خُدِێ یَه، بِبِیڤَانْ و اَنْدَازَه. پِشْتِێ ڤِێ اَمْ دِبینِنْ کُو سَالِخێنْ عِبَادێنْ خُدِێ بِبَالْ چَارْ بَشَانْ ڤَه هَاتِیَه بَشکِرِنْ.

١- سَالِخێنْ وَانْ اِێ دِکَسَایَتَا وَانْ دَه یَه. ٢- سَالِخێنْ وَانْ اِێ دِگَلْ جِڤَاکَا وَانَه. ٣- سَالِخێنْ وَانْ اِێ دِگَلْ خُدَایِێ وَانَه. ٤- سَالِخێنْ وَانْ اِێ کُو بِسَدَمْ کُو جِڤَاکَا خَوه دِگَهژِنَه لُتْکِیَا پَاقژِی و مَدَنِیتِێ.

٤. اَگَرْ مَه بِخوسْتَا مَه يِىٚ ژِ ئَاسْمِێنْ ژِ بُۆ وَانْ مُعْجِزَيَكْ بِئَانِيَا، ڤێجَا اَوِىٚ ژِىٚ رَه سِتُوخَوارْ بِبُونَا.

٥. هَرْ چِقَاسْ ئَايَتَكَه نُو ژِ جَمْ خُدَايِىٚ رَحْمٰنْ ژِ وَانْ رَه وَرَه، هَرْ اَوْ بَرِىٚ خَوه ژِىٚ ڤَدِگَرِينِنْ.

٦. ڤێجَا وَانْ پِىٚ بَاوَرِى نَئَانِى، اِێدِى خَبَرَا وِى عَذَابِىٚ كُو وَانْ پِىٚ طِنَازْ دِكِرْ، دِنێزِيكْ دَه دِىٚ ژِ وَانْ رَه بِىٚ.

٧. مَا اَوْ لِاَرْدِىٚ نَامِيزِينِنْ كُو ژِ هَرْ رَنْگێنْ خُوشِكْ و رِنْدْ مَه اَوْ هێشِينْ كِرِيَه؟

٨. بێگُمَانْ دِڤِىٚ دَه عِبْرَتَكْ هَيَه، لِىٚ پِرێنْ وَانْ بَاوَرِى نَايينِنْ.

٩. بێگُمَانْ خُدَايِىٚ تَه هَرْ اَوَه يِىٚ دَسْتْهِلاتْ اِىٚ دِلُوڤَانْ.

١٠. وِىٚ دَمَا خُدَايِىٚ تَه گَازِى مُوسَا كِرْ (و ژِىٚ رَه گُوتْ): بِپێغَمْبَرِى هَرَه جَمْ قَومِىٚ سِتَمْكَارْ...

١١. كُو اَوْ قَوْمِىٚ فِرْعَوْنَه؛ كَا اَوْ خَوه نَاپَارێزِنْ (و اِيمَانْ نَايينِنْ)؟!

١٢. مُوسَا گُوتْ: خُدَايِىٚ مِنْ! اَزْ دِتِرْسِمْ كُو اَوْ بَاوَرِى بِمِنْ نَئِيينِنْ...

١٣. دِلِىٚ مِنْ ژِى تَنْگْ بِبَه و زِمَانِىٚ مِنْ نَگَرَه، ڤێجَا (وَحْيِىٚ) بِبَالْ هَارُونْ ڤَه بِشِينَه.

١٤. هَمْ ژِى طُوْلَكَه وَانْ لِسَرْ مِنْ هَيَه، ڤێجَا اَزْ دِتِرْسِمْ كُو اَوْ مِنْ بِكُژِنْ.

١٥. خُدِىٚ گُوتْ: نَخێرْ، هُونْ هَرْدُو تَڤِى ئَايَتێنْ مَه هَرِنْ. بێگُمَانْ اَمْ دِگَلْ وَه نَه (و اَمْ لِسَرْ وَه) گُهْدێرِنْ.

١٦. هُونْ هَرْدُو هَرِنْ جَمْ فِرْعَونْ و (ژِىٚ رَه) بێژِنْ: بِرَاسْتِى اَمْ قَاصِدێنْ پَرْوَرْدَگَارِىٚ عَالَمِىٚ نَه.

١٧. (اَمْ هَاتِنْ كُو) تُو زَارُوێێنْ اِسْرَائِيلْ دِگَلْ مَه بِشِينِى (و وَانْ بَسْ بِدِى عَذَابْدَانْ).

**١٨.** (فِرْعَونْ) گُوْتْ: اَرِێ مَا مَه تُو لِجَمْ خَوه بِزَارُوكِيتِى خَودِى نَكِرِبُو و مَا دِنَاڤْ مَه دَه تُو بِصَالانْ نَمَابُويِى؟

**١٩.** (پَاشِێ بَرَامْبَرِى قَنْجِيێنْ مَه بِتَه كِرِنْ)، تَه اَوْ كِرْيَارْ ژِى كِرْ يَا تَه كِرِى (كُو تَه يَكْ ژِ مَه كُشْتِبُو) و تُو ژِ نَانْكُوْرَانِى.

**٢٠.** مُوسَا (ژِێ رَه) گُوْتْ: وِێ چَاخَا كُو مِنْ اَوْ كِرْ اَزْ نَزَانْ بُومْ (مِنْ نَه بِحَمْدِێ خَوه كِرْ).

**٢١.** ڤێجَا ژِ بَرْ كُو اَزْ ژِ وَه تِرْسِيَامْ، اَزْ ژِ بَرْ وَه رَڤِيمْ. پِشْتْرَه خُدَايێ مِنْ پێغَمْبَرِى دَا مِنْ و اَزْ گَرَانْدِمْ ژِ پێغَمْبَرَانْ.

**٢٢.** اَوَا كُو تُو مِنَّتَا وِێ لِمِنْ دِكِى مَا اَوْ قَنْجِى يَه؛ تَه زَارُويێنْ اِسْرَائِيلْ تَڤْ ژِ خَوه رَه كِرِنَه كُولَه و خِزْمَتْكَارْ!

**٢٣.** فِرْعَوْنْ گُوْتْ: خُدَايێ عَالَمِێ كِيَه؟

**٢٤.** مُوسَا گُوْتْ: اَوْ خُدَايێ اَرْدُ و ئَاسِيمَانَانْ و خُدَايێ يێنْ دِنَاڤْبَرَا وَانْ دَه يَه، اَگَرْ كُو بِرَاسْتِى يَقِينِيَا وَه پِێ هَبَه.

**٢٥.** فِرْعَونْ، ژِ گِرَه گِرِێنْ هَاوِرْدُورَا خَوه رَه گُوْتْ: اَرِێ مَا وَه دَنْگِێ (مُوسَا) سَحْ نَكِرْ؟

**٢٦.** مُوسَا گُوْتْ: (رَبُّ الْعَالَمِينْ) هَمْ خُدَايێ وَه يَه هَمْ ژِى خُدَايێ بَاڤْ و بَاپِيرێنْ وَه يێنْ پێشِينَه.

**٢٧.** فِرْعَونْ گُوْتْ: قَاصِدِێ كُو ژِ وَه رَه هَاتِيَه شَانْدِنْ مُحَقَّقْ دِينَه!

**٢٨.** مُوسَا گُوْتْ: اَگَرْ هُونْ عَاقِلِێ خَوه بِشُغْلِينِنْ (هُونِێ فَهمْ بِكِنْ كُو) اَوْ خُدَايێ رُوژْهِلاتْ و رُوژَاڤَا يَه و خُدَايێ يێ دِنَاڤْبَرَا وَانْ دَه يَه.

**٢٩.** فِرْعَونْ گُوْتْ: اَگَرْ ژِ بِلِى مِنْ تُو ژِ خَوه رَه خُدَايَكِى دِنْ بِگِرِى، صُونْدْ بَه كُو اَزِێ تَه بِخِمْ زِينْدَانِێ!

**٣٠.** مُوسَا گُوٚتْ: مَا کُو مِنْ تِشْتَکِی اَشْکَرَا ژِ تَه رَه ئَانِیبَه ژِی؟

**٣١.** فِرْعَونْ گُوٚتْ: اَگَرْ بِرَاسْتِی تُو رَاسْتْگُو یِی، دَه هَایْدِیٚ وِی بِینَه!

**٣٢.** ڤِیٚجَا مُوسَا گُوپَالِیٚ خَوه ئَاڤِیٚتْ و دِیتْ کُو اَوْ بُو مَارَکِی ئَاشِیکَارْ!

**٣٣.** دَسْتِیٚ خَوه (ژِ پَاخِلا خَوه) دَرَانِی، اَوْ ژِی ژِ بُوٚ تَمَاشَکَارَانْ بُو رُوٚنَاهِیکَه سِپِی.

**٣٤.** فِرْعَونْ، ژِ گِرَه گِرِیٚنْ هَاوِردُورَا خَوه رَه گُوٚتْ: بِیٚگُمَانْ اَڤْ سِیٚرْبَازَکِی زَانَا یَه!

**٣٥.** اَوْ بِسِیٚرْبَازِیَا خَوه دِخَوازَه وَه ژِ جِهْ و وَارِیٚ وَه بِکَه دَرْ. (گَلِی گِرَه گِرَانْ!) ڤِیٚجَا
هُونِیٚ چِه فَرْمَانِیٚ بِدِنْ؟

**٣٦.** گِرَه گِرَانْ ژِیٚ رَه گُوٚتِنْ: وِی و بِرَایِیٚ وِی مِژُولْ بِکِنْ و وَظِیفَدَارَانْ بِشِینَه بَاژَارَانْ؛
بِلا سِیٚرْبَازَانْ بِجِڤِینِنْ..

**٣٧.** بِلا هَرْ سِیٚرْبَازِیٚنْ زَانَا ژِ تَه رَه بِینِنْ.

**٣٨.** ڤِیٚجَا سِیٚرْبَازْ دِرُوژَکَه کِفْشْکِرِی دَه هَاتِنْ جِڤَانْدِنْ.

**٣٩.** ژِ خَلْکِیٚ رَه ژِی هَاتْ گُوٚتِنْ: دَه هُونْ ژِی کُومْ بِبِنْ!

**٤٠.** گُوٚتِنْ: اَمْ دِوِیٚ هِیٚڤِییٚ دَه نَه کُو سِیٚرْبَازْ بِسَرْ بِکَڤِنْ و اَمْ ژِی لِپَیْ وَانْ بِچِنْ.

**٤١.** ڤِیٚجَا چِه دَمَا سِیٚرْبَازْ هَاتِنْ ژِ فِرْعَونْ رَه گُوٚتِنْ: اَگَرْ اَمْ بِسَرْ بِکَڤِنْ مَا ژِ بُوٚ مَه خَلَاتَكْ
هَیَه؟

**٤٢.** فِرْعَونْ ژِ وَانْ رَه گُوٚتْ: بَلِیٚ، تَڤَزْ هُونْ دِیٚ بِبِنْ ژِ یِیٚنْ نِیٚزِیکِی مِنْ.

**٤٣.** مُوسَا ژِ وَانْ رَه گُوٚتْ: تِشْتِیٚ کُو هُونِیٚ بَاڤِیٚژِنْ، دَه هَایْدِیٚ بَاڤِیٚژِنْ!

**٤٤.** ڤِیٚجَا سِیٚرْبَازَانْ وَرِیسْ و گُوپَالِیٚنْ خَوه ئَاڤِیٚتِنْ و گُوٚتِنْ: بِقُوَّتَا فِرْعَوْنْ هَرْ اَمِنْ یِیٚنْ
سَرْکَفْتِی.

٤٥. ڤێجا مُوسَا ژِی گُوّپَالِێ خَوه ئَاڤێت، دِيتِنْ (اَوْ بُو مَارَكِی مَزِنْ و) سِێرَا كُو وَانْ لِێئَانِی، دَادبَلِينَه!

٤٦. سِێرْبَازَانْ (پِشْتِی كُو حَقِی دِيتِنْ) خَوه ئَاڤێتِنْ اَرْدِێ و چُونَه سِجُودِێ.

٤٧. گُوّتِنْ: مَه بَاوَرِی بِخُدَايِێ عَالَمِێ ئَانِی...

٤٨. خُدَايِێ مُوسَا و هَارُونْ.

٤٩. فِرْعَونْ گُوّتْ: بَرِيَا اَزْ دَسْتُورِێ بِدِمْ وَه، وَه چَاوَا بَاوَرِی بِمُوسَا ئَانِی! بِێگُمَانْ هَرْ اَوَه مَزِنِێ وَه يِێ كُو سِێرْ فِێرِی وَه كِرِيَه! ڤێجا هُونِێ بِزَانِنْ (كَا اَزِێ چِه بِينِمْ سَرِێ وَه). صُونْدْ بَه، اَزِێ دَسْتْ و پِيێنْ وَه چَپْ و رَاسْتْ ژِێكَمْ و اَزِێ وَه تَڤَانْ دَالَقِينِمْ.

٥٠. سِێرْبَازَانْ گُوّتْ: نَه غَمَا مَه يَه؛ اَمِێ مُحَقَّقْ لِخُدَايِێ خَوه ڤَگَرِنْ!

٥١. اَمْ هِێڤِی دِكِنْ كُو خُدَايِێ مَه لِگُنَهێنْ مَه بِبُورَه، لَوْرَا مَه بَرِيَا هَرْ كَسِی بَاوَرِی ئَانِی.

٥٢. مَه وَحِی دَا مُوسَا كُو بَنْدَيێنْ مِنْ بِشَڤْ (ژِ مِصْرِێ) دَرِينَه، مُحَقَّقْ هُونِێ بِێنَه تَعْقِيبْكِرِنْ (بَرِيَا هُنْ بِگَهِژِنْ بَحْرِێ بِلا نَگَهِژِنْ وَه).

٥٣. ڤێجا فِرْعَونْ وَظِيفَدَارْ شَانْدِنْ بَاژَارَانْ دَا كُو لَشْكَرَانْ بِدِنْ هَڤْ.

٥٤. (ژِ وَانْ رَه گُوّتْ): بِێگُمَانْ اَڤْ جِڤَاتَكَه هِنْدِكْ و كِێمْهێزِنْ.

٥٥. بِرَاسْتِی ژِی وَانْ بِكَارْ و كِرِيَارێنْ خَوه اَمْ هێرْسْ كِرِنَه.

٥٦. اَمْ ژِی بِرَاسْتِی جِڤَاتَكَه (يَكْوِجُودْ و) هِشْيَارِنْ.

٥٧. ڤێجا مَه ژِی اَوْ (فِرْعَونْ و جِڤَاتَا وِی) ژِ نَاڤَا بَاخْچَه و كَانِيَانْ دَرَانِينْ...

٥٨. ژِ نَاڤَا خَزِينَه و (دِيوَانُ و) مَقَامێنْ شَرَفْنَاكْ ژِی.

٥٩. هَا بِڤِی ئَاوَايِی (مَه اَوْ دَرَانِينْ و) مَه زَارُوكێنْ اِسْرَائِيلْ كِرِنْ مِيرَاتْگِرێنْ وَانْ.

٦٠. (فِرْعَونْ و جِڤَاتَا خَوه) دِدَانِێ سِبَهِێ دَه كَتِنْ پَێْ شُوپَا وَانْ.

٦١. دَمَا هَرْدُو دَسْتَكَانْ هَڤْ دِيتِنْ، هَڤَالێنْ مُوسَا گُوتِنْ: هَیْ وَاخْ اَمْ هَاتِنْ گِرْتِنْ!

٦٢. مُوسَا گُوتْ: نَخێرْ، بێگُمَانْ خُدَایێ مِنْ دِگَلْ مِنَه، دێ رِێ نِیشَانِی مِنْ بِدَه.

٦٣. بَرَانْبَرِی ڤِێ مَه پَیَامْ دَا مُوسَا، مَه ژِێ رَه گُوتْ: گُوپَالِێ خَوه لِبَحْرِێ بِخَه! (چِه دَمَا گُوپَالِێ خَوه لِێ دَا) دِجِه دَه بُو دُو شَقْ هَرْ شَقَكِی ئَاڤِێ بُو وَكِی چِیَاكَكِی مَزِنْ.

٦٤. مَه اَوێنْ دِنْ (فِرْعَونْ و دَسْتَگِرێنْ وِی) دِبَحْرِێ دَه نێزِیكِی وَانْ كِرِنْ.

٦٥. مَه مُوسَا و یێنْ دِگَلْ وِی تَڤْ رِزْگَارْ كِرِنْ.

٦٦. پَاشِێ مَه اَوێنْ دِنْ خَنِقَانْدِنْ.

٦٧. بێگُمَانْ دِڤِێ دَه عِبْرَتَكْ هَیَه، لِێ پِرێنْ وَانْ بَاوَرِی نَایینِنْ.

٦٨. بێگُمَانْ خُدَایێ تَه هَرْ اَوَه یێ دَسْتهِلاتْ اِێ دِلُوڤَانْ.

٦٩. (یَا مُحَمَّدْ!) ژِ وَانْ رَه سَرْپێهَاتِیَا اِبْرَاهِیمْ ژِی بِخُوینَه.

٧٠. دَمَا اِبْرَاهِیمْ ژِ بَاڤِێ خَوه و گَلِێ خَوه رَه گُوتْ: هُونْ چِه دِحَبینِنْ؟

٧١. ژِێ رَه گُوتِنْ: اَمْ پُوتَانْ دِحَبینِنْ و اَمِێ هَرْ و هَرْ پَرَسْتِنَا وَانْ ژِی بِكِنْ.

٧٢. اِبْرَاهِیمْ گُوتْ: اَرِێ بَاشَه، دَمَا كُو هُونْ لِبَرْ وَانْ دِگَرِنْ ڤَیْ اَوْ دَنْگێنْ وَه دِبِهِیزِنْ؟

٧٣. مَا اَوْ فَیْدِێ یَانْ ژِی زَرَارِێ دِدِنْ وَه؟

٧٤. ژِێ رَه گُوتِنْ: نَا! لِێبَلِێ مَه بَاڤْ و بَاپیرێنْ خَوه دِیتِنْ كُو وَانْ ژِی وَلِێ دِكِرْ.

٧٥. اِبْرَاهِیمْ گُوتْ: اَرِێ بَاشَه، مَا هُونْ فِكِرِینَه كَا هُونْ پَرَسْتِنَا چِه دِكِنْ؟

٧٦. هُونْ و بَاڤْ و بَاپیرێنْ وَه یێنْ بَرِێ ژِی...

٧٧. بێگُمَانْ اَوْ ژِ مِنْ رَه دِژْمِنِنْ؛ (دُوسْتِێ مِنْ) تَنِێ پَرْوَرْدَگَارِێ عَالَمِێ یَه...

٧٨. اَوَه يێ كُو اَزْ ئَافِرَانْدِمَه و رِيَا رَاسْتْ نِيشَانِى مِنْ دَايَه...

٧٩. اَوَه يێ كُو خَوارِنْ و ڤَخَوارِنێ دِدَه مِنْ...

٨٠. دَمَا اَزْ نَخَوشْ بِكَڤِمْ اَوَه يێ كُو مِنْ شِيفَا بِكَه...

٨١. اَوَه يێ كُو مِنْ بِمِرِينَه، پَاشێ (دِيسَا) مِنْ سَاغْ بِكَه...

٨٢. اَوَه يێ كُو اَزْ هِيڤِى دِكِمْ كُو رُوژَا خَلاتْ و جَلاتێ لِشَاشِيێنْ مِنْ بِبُورَه.

٨٣. خُدَايێ مِنْ! حِكْمَتێ بِدَه مِنْ و مِنْ بِگَهِينَه ڤَنْجِيكَارَانْ.

٨٤. دِنَاڤَا كَسێنْ كُو پِشْتِى مِنْ تێنْ دَه، مِنْ بِكَه ژِ يێنْ كُو بِرَاسْتِى و دُرِسْتِى بَحْسَا وَانْ
تێ كِرِنْ.

٨٥. مِنْ بِكَه ژِ مِيرَاتْگِرێنْ بِهِشْتَا كُو نِعْمَتێنْ وێ پِرِنْ.

٨٦. لِبَاڤێ مِنْ ژِى بِبُورَه، بێگُمَانْ اَوْ ژِ رێشَاشَانَه.

٨٧. رُوژَا كُو مِرُوڤ بێنَه سَاغْكِرِنْ، مِنْ رِسْوَا مَكَه...

٨٨. اَوْ رُوژَا كُو مَالْ و زَارُوكْ فَيْدێ نَادِنْ تُو كَسِى.

٨٩. ژِ بِلِى يێ كُو بِدِلَكِى پَاكْ بێتَه بَالْ خُدێ ڤَه.

٩٠. (وێ رُوژێ) جَنَّتْ ژِ مُتَّقِيَانْ رَه تێ نێزِيكْكِرِنْ.

٩١. جَهَنَمْ ژِى ژِ رێشَاشێنْ كَافِرْ رَه پێشْچَاڤْ دِبَه.

٩٢. ژِ وَانْ رَه تێ گُوتِنْ: اَوێنْ كُو وَه پَرَسْتِنَا وَانْ دِكِرْ، كَا لِكُونَه..؟

٩٣. اَرێ، مَا ژِ بِلِى خُدێ؛ اَوْ دِكَارِنْ ئَارِيكَارِيَا وَه بِكِنْ ئَانْ ژِى ئَارِيكَارِيَا خَوه بِكِنْ؟

٩٤. اِيْدِى اَوْ و مَعْبُودێنْ وَانْ يَكْ لِدُو يَكِى دِ دُوژَهێ دَه تێنْ وَرْكِرِنْ...

٩٥. تَڤَكِى لَشْكَرێ اِبْلِيسْ ژِى.

٩٦. اَوْ لِگُنَهێنْ خَوه مُكرْ هَاتِنْ و بِهَڤْ رَه كَتِنْ نَاڤْ گَنْگَشِيىَ.

٩٧. اَمْ بِخُدِىَ صُونْدْ دِخُونْ كُو اَمْ دِنَاڤْ رِێشَاشِيَكَه اَشْكَرَا دَه بُونْ.

٩٨. لَوْرَا مَه هُونْ و خُدَايىَ عَالَمِىَ دِيَكْ رِێزَكِىَ دَه دِگِرْتِنْ.

٩٩. هَرْ وَانْ گُنَهْكَارَانْ اَمْ ژِ رِىَ خِسْتِنْ.

١٠٠. اِێدِى ژِ مَه رَه نَه مَهْدَرْڤَانْ هَنَه...

١٠١. نَه ژِى دُوسْتَكِى نێزِيكْ هَيَه.

١٠٢. ئَاخْ خوزِى ژِ مَه رَه ڤَگَرَكْ هَبُويَا، ڤێجَا كُو اَمْ ژِى بِبُونَا ژِ بَاوَرْمَنْدَانْ!

١٠٣. بێگُمَانْ دِڤِىَ دَه عِبْرَتَكْ هَيَه، لِىَ پرێنْ وَانْ بَاوَرِى نَايِينِنْ.

١٠٤. بێگُمَانْ خُدَايىَ تَه هَرْ اَوَه يىَ دَسْتْهِلاتْ، يىَ دِلُوڤَانْ.

١٠٥. گَلِىَ نُوحْ ژِى بِرَسُولانْ (ڤَاصِدَانْ) بَاوَرِى نَئَانِينْ.

١٠٦. دَمَا بِرَايىَ وَانْ نُوحْ ژِ وَانْ رَه گُوْتْ: مَا هُونْ (ژِ هَاتِنَا لِهَمْبَرِى فَرْمَانَا خُدِىَ) نَاتِرْسِنْ؟

١٠٧. بێگُمَانْ اَزْ ژِ بُوْ وَه پێخَمْبَرَكِى پێبَاوَرِمْ.

١٠٨. ڤێجَا ژِ خُدِىَ بِترْسِنْ و بِگُوْتِنَا مِنْ بِكِنْ.

١٠٩. اَزْ ژِ بُوْ ڤِىَ (تَبلِيغَا كُو ژِ وَه رَه رَادِگِهِينِمْ) تُو حَقَكِى نَاخوازِمْ، تَقَزْ خَلاتَا مِنْ ژِ خُدَايىَ عَالَمِىَ يَه.

١١٠. ڤێجَا ژِ خُدِىَ بِترْسِنْ و بِگُوْتِنَا مِنْ بِكِنْ.

١١١. (ڤَومِىَ وِى ژِىَ رَه) گُوْتِنْ: اَمِىَ چَاوَا بَاوَرِى بِتَه بِينِنْ، مَا نَه يێنْ كِێمْ و رَبَنْ دَانَه پَىْ تَه؟!

١١٢. نُوحْ گُوْتْ: دَرْ بَارِىَ يَا كُو اَوْ دِكِنْ دَه تُو زَانِينَا مِنْ نِينَه.

١١٣. حَسَابێ وَانْ تَنێ لِجَمْ خُدَايێ مِنه، اَگَرْ وَه بِزَانِبَا (وَه اَڤْ نَدِگُوٚتْ).

١١٤. اَزْ نَه اَوِمْ كُو بَاوَرْمَنْدَانْ ژِ جَمْ خَوه بِقَورِينِمْ.

١١٥. اَزْ تَنێ هِشيَارْكَرَكِى اَشْكَرَا مَه.

١١٦. گُوٚتِنْ: اَىْ نُوحْ! اَگَرْ تُو (ژِ ڤێ دُوٚزَا خَوه) ڤَنَگَرِى، تَقَزْ تُو يێ بِكَڤِرَانْ بێيِى كُشْتِنْ.

١١٧. نُوحْ گُوٚتْ: خُدَايێ مِنْ! گَلێ مِنْ، بَاوَرِى بِمِنْ نَئَانِى.

١١٨. اِێدِى دِنَاڤْبَرَا مِنْ و وَانْ دَه حُكْمێ خَوه بِكَه، مِنْ و بَاوَرْمَنْدێنْ دِگَلْ مِنْ رِزْگَارْ بِكَه.

١١٩. ڤێجَا مَه نُوحْ و يێنْ كُو دِگَلْ وِى بُونْ دِكَشْتِيَا تِژَه (مِرُوٚڤ، ئَاژَالْ و طَيرْ) دَه رَهَا كِرِنْ.

١٢٠. پَاشێ مَه يێنْ مَايينْ دَئَاڤێ دَه خَنِقَانْدِنْ.

١٢١. بێگُمَانْ دِڤێ دَه عِبْرَتَكْ هَيَه، لێ پِرێنْ وَانْ بَاوَرِى نَايينِنْ.

١٢٢. بێگُمَانْ خُدَايێ تَه، هَرْ اَوَه يێ دَسْتهِلاتێ دِلُوڤِينْ.

١٢٣. گَلێ عَادْ ژِى بِرَسُولانْ بَاوَرِى نَئَانِينْ.

١٢٤. دَمَا بِرَايێ وَانْ هُودْ ژِ وَانْ رَه گُوٚتْ: مَا هُونْ ژِ خُدێ نَاتِرْسِنْ؟

١٢٥. بێگُمَانْ اَزْ ژِ بُوٚ وَه پێخَمْبَرَكِى اِێمِنْدَارِمْ.

١٢٦. ڤێجَا ژِ خُدێ بِتِرْسِنْ و بِگُوٚتِنَا مِنْ بِكِنْ.

١٢٧. اَزْ ژِ وَه، تُو حَقَكِى نَاخَوازِمْ، تَقَزْ خَلاتَا مِنْ تَنێ ژِ خُدَايێ عَالَمێ يَه.

١٢٨. اَرێ مَا لِهَرْ جِهێ بِلِنْدْ، هُونێ بێفَيْدَه و پێمَقْصَدْ ئَاڤَاهِيێنْ بِنَاڤْ و نِيشَانْ ئَاڤَا بِكِنْ؟

١٢٩. بِهێڤِيَا كُو هُونێ هَرْ و هَرْ بِمِينِنْ هُونْ ئَاڤَاهِيێنْ مِكُومْ و مَزِنْ لێدِكِنْ؟

١٣٠. دَمَا كُو هُونْ جَزَا دِدِنْ، هُونْ بِستَمْكَارِى جَزَا دِدِنْ؟

١٣١. ڤێجَا ژِ خُدێ بِترْسِنْ و بِگُوّتِنَا مِنْ بِكِنْ.

١٣٢. ژِ وِى خُدَايێ كُو تِشْتێ هُونْ دزَانِنْ بَخْشِى وَه كِرِيَه بِترْسِنْ.

١٣٣. (ژِ وِى خُدَايێ ) كُو تَرْشْ (دَڤَه، دَوَارْ و پَزْ) و زَارُوكْ بَخْشِى وَه كِرِنَه...

١٣٤. بَاخْچَه و كَانِى ژِى دَانَه وَه.

١٣٥. بێگُمَانْ اَزْ ژِ بُوّ وَه، ژِ عَذَابێ رُوژَكَه مَزِنْ دِترْسِمْ.

١٣٦. ژێ رَه گُوّتِنْ: چِه تُو شِيرَتَانْ بِكِى، چِه ژِى تُو نَكِى ژِ مَه رَه وَكْهَڤَه (اَمْ بَاوَرِيێ نَايێنِنْ).

١٣٧. اَڤَا (كُو اَمْ لِسَرێ نَه) ژِ دِينێ پێشِييَانْ پِێ ڤَه نَه تِشْتَكِى دِنَه...

١٣٨. اَمێ قَتْ نِيێنْ عَذَابْدَاينْ.

١٣٩. وَانْ بَاوَرِى بِهُودْ نَئَانِى، ڤێجَا مَه ژِى اَوْ هَلاكْ كِرِنْ. بێگُمَانْ دِڤێ دَه عِبْرَتَكْ هَيَه، لِێ پِرِێنْ وَانْ بَاوَرِى نَايينِنْ.

١٤٠. بێگُمَانْ خُدَايێ تَه هَرْ اَوَه يێ دَسْتْهِلاتێ دِلُوڤَانْ.

١٤١. گَلِێ سَمُودْ ژِى بِرَسُولانْ بَاوَرِى نَئَانِينْ.

١٤٢. وِێ دَمێ بِرَايێ وَانْ صَالِحْ ژِ وَانْ رَه گُوّتْ: مَا هُونْ ژِ خُدێ نَاترْسِنْ؟

١٤٣. بێگُمَانْ اَزْ ژِ بُوّ وَه پێخَمْبَرَكِى اِيمِنْدَارِمْ.

١٤٤. ڤێجَا ژِ خُدێ بِترْسِنْ و بِگُوّتِنَا مِنْ بِكِنْ.

١٤٥. اَزْ ژِ بُوّ ڤِێ تِه حَقَكِى ژِ وَه نَاخَوازِمْ، تَقَزْ خَلاتَا مِنْ بَسْ ژِ خُدَايێ عَالَمێ يَه.

١٤٦. اَرێ مَا ژِ وَه وَه يَه كُو هُونێ لِڤێ (دِنْيَايێ) اَوْلَه بِمِينِنْ و خُدێ دِێ عَذَابْ نَدَه وَه؟

١٤٧. دِنَاڤَا بَاخْچَه و كَانِيَانْ دَه...

١٤٨. دِنَاڤَا چَانْدِنی و دَارْخُرْمَییٚنْ گِهِشْتِی، تَازَه و خَوشْ دَه.

١٤٩. هُونْ بِهُوسْتَایِی چِیَانْ دِقَویٚرِنْ خَانِیَانْ چیٚدِکِنْ.

١٥٠. ڤیٚجَا ژِ خُدِیٚ بِترْسِنْ و بِگُوٚتِنَا مِنْ بِکِنْ.

١٥١. بِگُوٚتِنَا مُسْرِفَانْ مَکِنْ...

١٥٢. اَویٚنْ کُو لِسَرْ رُوییٚ اَرْدِیٚ فَسَادِییٚ دِکِنْ و ڤَنْجِییٚ نَاکِنْ.

١٥٣. ژِیٚ رَه گُوٚتِنْ: بیٚگُمَانْ تُو بَسْ ژِ وَانیٚنْ سیٚرْ لِوانْ هَاتِیَه کِرِنْ!

١٥٤. تُو ژِی مِرُوٚڤکِی وَکِی مَه یِی. اَگَرْ بِرَاسْتِی تُو رَاسْتْ دِبیٚژِی دَه هَایْدِیٚ مُعْجِزَیَکِیٚ ژِ مَه رَه بِینَه.

١٥٥. صَالِحْ ژِ وَانْ رَه گُوٚتْ: هَا اَڤْ دَڤَه ژِ وَه رَه مُعْجِزَه یَه، رُوٚژَکِیٚ دُورَا ئَاڤِیٚ ژِیٚ رَه یَه و رُوژَکَه دِیَارْ ژِی ژِ وَه رَه یَه.

١٥٦. زِنْهَارْ بِنَڤَنْجِی دَسْتْ نَدِنِیٚ، ڤیٚجَا عَذَابِیٚ رُوٚژَکَه مَزِنْ دِیٚ وَه بِگِرَه.

١٥٧. لِیٚبَلِیٚ وَانْ اَوْ سَرْژیٚکِرْ و (دِ پَیْدَه) پُوٚشْمَانْ بُونْ.

١٥٨. ژِ بَرْ ڤِیٚ کِرِنَا وَانْ عَذَابْ اَوْ گِرْتِنْ. بیٚگُمَانْ دِڤِیٚ دَه عِبْرَتَکْ هَیَه، لِیٚ پِریٚنْ وَانْ بَاوَرِی نَاییِنِنْ.

١٥٩. بیٚگُمَانْ خُدَایِیٚ تَه هَرْ اَوَه یِیٚ دَسْتْهِلاتْ اِیٚ دِلُوڤَانْ.

١٦٠. گَلِیٚ لُوطْ ژِی بِرَسُولانْ بَاوَرِی نَئَانِینْ.

١٦١. دَمَا بِرَایِیٚ وَانْ لُوطْ ژِ وَانْ رَه گُوٚتْ: مَا هُونْ ژِ خُدِیٚ نَاتِرْسِنْ؟

١٦٢. بیٚگُمَانْ اَزْ ژِ بُوٚ وَه پیٚخَمْبَرَکِی پیٚبَاوَرِمْ.

١٦٣. ڤیٚجَا ژِ خُدِیٚ بِترْسِنْ و بِگُوٚتِنَا مِنْ بِکِنْ.

١٦٤. اَزْ ژِ بُوّ ڤِێ ژِ وَه تُو حَقَكِى نَاخوازِمْ، تَقَزْ خَلاتَا مِنْ ژِ خُدَايِێ عَالَمِێ يَه.

١٦٥. اَرِێ مَا ژِ عَالَمِێ هُونْ بِزِلامَانْ رَه تَالُقَاتِيێ دِكِنْ؟..

١٦٦. ژِنێِنْ وَه يێِنْ كُو خُدِێ ژِ وَه رَه ئَافِرَانْدِنْ ژِى هُونْ دِهێلِنْ. نَخێرْ، بَلْكِى هُونْ قَوْمَكِى تِخُوبْبِهێرِنْ!

١٦٧. وَانْ ژِى گُوّتْ: اَىْ لُوطْ! اَگَرْ تُو ژِ ڤِێ (دُوّزَا خَوه) ڤَنَگَرِى بێِگُمَانْ اَمِێ تَه ژِ نَاڤْ خَوه دَرْخِنْ!

١٦٨. لُوطْ ژِ وَانْ رَه گُوّتْ: بێِگُمَانْ اَزْ ژِ ڤِێ كِرِنَا وَه يَا كِرێتْ پِرْ دِكَرِبِمْ.

١٦٩. خُدَايِێ مِنْ! مِنْ و مَالْبَاتَا مِنْ ژِ يَا كُو اَوْ دِكِنْ خَلاصْ بِكَه.

١٧٠. ژِ بُوّ ڤِێ دَاخَوازَا وِى، مَه اَوْ و مَالْبَاتَا وِى تَڤْ رِزْگَارْ كِرِنْ.

١٧١. لِێبَلِێ پِيرَكَا وِى نَا؛ اَوْ دِنَاڤْ اِێنْ هَلاكْبُويِى دَه مَا.

١٧٢. پِشْتْرَه مَه يێِنْ دِنْ قِرْ كِرِنْ.

١٧٣. مَه كَڤِرْ بِسَرْ وَانْ دَه بَارَانْدِنْ، چِه پِيسْ بَارَانْ بُو لِيێِنْ كُو هَاتِنْ هِشِيَارْكِرِنْ!

١٧٤. بێِگُمَانْ دِڤِێ دَه عِبْرَتَكْ هَيَه، لِێ پِرێِنْ وَانْ بَاوَرِى نَايِينِنْ.

١٧٥. بێِگُمَانْ خُدَايِێ تَه، هَرْ اَوَه يِێ دَسْتْهِلاتْ اِێ دِلُوڤَانْ.

١٧٦. گَلِێ اَيْكَتِێ ژِى بِرَسُولانْ بَاوَرِى نَئَانِينْ.

١٧٧. دَمَا شُعَيْبْ ژِ وَانْ رَه گُوّتْ: مَا هُونْ ژِ خُدِێ نَاتِرْسِنْ؟

١٧٨. بێِگُمَانْ اَزْ ژِ بُو وَه پِێخَمْبَرَكِى اِێمِنْدَارِمْ.

١٧٩. ڤِێجَا ژِ خُدِێ بِتِرْسِنْ و بِگُوّتِنَا مِنْ بِكِنْ.

١٨٠. اَزْ ژِ بُوّ ڤِێ تُو حَقَكِى ژِ وَه نَاخَوازِمْ، تَقَزْ خَلاتَا مِنْ ژِ خُدَايِێ عَالَمِێ يَه.

١٨١. پيڤا نیێ تَامْ بِكِنْ و ژِ كِێمْكَرَانْ نَبِنْ.

١٨٢. بِمِێزِينَا رَاسْتْ بِكِشِينِنْ.

١٨٣. ژِ حَقِێ مِرُۆڤانْ تِشْتَكِى كِێمْ نَكِنْ و لِسَرْ اَرْدِێ گَلَاجِى و تَڤْدَانِێ دَرْنَخِنْ.

١٨٤. خَوه ژِ عَذَابِێ خُدِێ بِپَارِێزِنْ، اَوِێ كُو هُونْ و نِفْشِێنْ بَرِێ ئَافِرَانْدِنَه.

١٨٥. ژِێ رَه گُۆتِنْ: بِێگُمَانْ تُو، ژِ وَانْ كَسَانِى اَوِێ كُو سِێرْ لِوَانْ هَاتِيَه كِرِنْ؟

١٨٦. تُو ژِى مِرُۆڤكِى وَكِى مَه يِى و اَمْ تَه ژِ دَرَوْكَرَانْ دِزَانِنْ.

١٨٧. اَگَرْ بِرَاسْتِى تُو ژِ رَاسْتْگُۆيَانِى، دَه هَايْدِێ ژِ ئَاسْمِێنْ پَارْچَيَكِى بِسَرْ مَه دَه دَاخَه خَوارْ.

١٨٨. شُعَيْبْ گُۆتْ: خُدَايِێ مِنْ بِكِرِنِێنْ وَه بِێهْتِرْ دِزَانَه.

١٨٩. وَانْ بَاوَرِى پِێ نَئَانِى، ڤِێجَا عَذَابِێ رُوژَا بِعَوْرُ و مِژْ اَوْ گِرْتِنْ. بِرَاسْتِى اَوْ عَذَابِێ رُوژَكَه مَزِنْ بُو!

١٩٠. بِێگُمَانْ دِڤِێ دَه عِبْرَتَكْ هَيَه، لِێ پِرِێنْ وَانْ بَاوَرِى نَايِينِنْ.

١٩١. بِێگُمَانْ خُدَايِێ تَه هَرْ اَوَه، يِێ دَسْتْهِلاتْ اِێ دِلُوڤَانْ.

١٩٢. بِێگُمَانْ اَڤْ (قُرْئَانْ) ژِ ئَالِيِێ خُدَايِێ عَالَمِێ ڤَه هَاتِيَه نَازِلْكِرِنْ.

١٩٣. رُوحُ الاَمِينْ (جِبْرِيلْ) اَوْ (قُرْئَانْ) ئَانِيَه خَوارِێ.

١٩٤. لِسَرْ دِلِێ تَه، دَا كُو تُو بِبِى ژِ هِشْيَارْكَرَانْ.

١٩٥. بِزِمَانَكِى عَرَبِيَكَه زَلالْ.

١٩٦. بِێگُمَانْ (مِزْگِينْ و سَالُوخِێنْ ڤِێ) قُرْئَانِێ، دِكِتِێبِێنْ پِێشِيَانْ دَه هَيَه.

١٩٧. اَرِێ مَا كُو عَالِمِێنْ اِسْرَائِيلِيَانْ ڤِێ قُرْئَانِێ نَاسْ دِكِنْ ژِ وَانْ رَه نَه دَلِيلَكَه؟

١٩٨. اَگَرْ مَه قُرْئَانْ لِسَرْ يىَ كُو نَه عَرَبِنْ هِنَارْتِبُويَا...

١٩٩. ڤِێجَا ژ وَانْ رَه ژى بِخَونْدَا، دِيسَا دِىَ بَاوَرِى پِىَ نَئَانِيَانَا.

٢٠٠. بِڤِى ئَاوَايى مَه (تَكْزِيبَا) وِىَ خِسْتِيَه دِلێنْ سُوجْدَارَانْ.

٢٠١. حَتَا كُو اَوْ عَذَابِىَ دِژْوَارْ نَبِينِنْ دِىَ بَاوَرِى پِىَ نِيِينِنْ.

٢٠٢. ڤِێجَا اَڤْ (عَذَابْ) ژِ نِشْكَا ڤَه دِىَ بِسَرْ وَانْ دَه بِىَ و هَايَا وَانْ ژِ (هَاتِنَا) وِى تُنَه.

٢٠٣. وِىَ چَاخِىَ دِىَ بِبێژِنْ: گَلُو ژِ بُو كُو اَمْ (بَاوَرِى بِينِنْ) مُهْلَتْ ژِ مَه رَه نَايِىَ دَايِنْ؟

٢٠٤. ڤَىْ اَوْ بِلَزْ عَذَابِىَ مَه دِخَوازِنْ؟

٢٠٥. (يَا مُحَمَّدْ!) دَه كَا بِبێژَه، اَگَرْ بِصَالَانْ اَمْ ژِيَانَكَه خَوشْ بِدِنْ وَانْ.

٢٠٦. پشْتْرَه (عَذَابِىَ) كُو پێمَانَا وِى ژِ وَانْ رَه هَاتِيَه دَايِنْ، بِسَرْ وَانْ دَه بِىَ.

٢٠٧. اَوْ خَوشِيَا كُو پِىَ ژِيَانَه دِىَ فَيْدَيَكِىَ نَدَه وَانْ.

٢٠٨. چِڤَاسْ وَلَاتَكِى كُو مَه (خَلْكِىَ وِى) هَلَاكْ كِرِبَه هَرْ ژِ وَانْ رَه هِشْيَارْكَرْ هَبُونَه.

٢٠٩. (اَوْ هِشِيَارْكَرِى دَا كُو ژِ وَانْ رَه) بِبَه پَنْدُ و شِيرَتْ. بِرَاسْتِى ژِى اَمْ نَه ظَالِمِنْ.

٢١٠. شَيْطَانَانْ اَڤْ (قُرْئَانْ) دَانَخِسْتِيَه.

٢١١. اَڤْ ژِ وَانْ رَه نَابَه و نِكَارِنْ ڤِىَ بِكِنْ ژِى.

٢١٢. اَوْ ژِ گُهْدَارِيكِرِنَا وَحْيِىَ هَاتِنَه دُورْخِسْتِنْ.

٢١٣. ڤِێجَا دِگَلْ خُدِىَ عِبَادَتِىَ تُو اِلْهانْ نَكَه، ڤِێجَا تُو دِىَ بِبِى ژِ يێنْ كُو بِبَرْ عَذَابْ دِكَڤِنْ!

٢١٤. (بَرِى هَرْ كَسِى) خَودِى و لِێزِمێنْ خَوه يێنْ نێزِيكْ هِشْيَارْ بِكَه.

٢١٥. ژِ بُو بَاوَرْمَنْدێنْ كُو دَانَه پَىْ تَه خَوه پَرْشِكَسْتِى و نَرمْ بِكَه.

٢١٦. اَگَرْ گُهْدَارِيَا تَه نَكِرِنْ، ڤِێجَا بِبێژَه: بێگُمَانْ اَزْ ژِ يَا كُو هُونْ دِكِنْ بێرِى مَه.

**٢١٧.** تُو خَوه بِسْپێرَه وِى خُدَايىٚ دَسْتْهِلاتْ اِىٚ دِلُوڤَانْ.

**٢١٨.** اَوْ خُدَايىٚ دَمَا تُو رَادِبى (شَڤْنِمێژَانْ) تَه دِبِينَه.

**٢١٩.** رَابُونْ و رُونِشْتِنَا تَه يَا دِنَاڤْ نِمێژْكَرَانْ دَه ژِى (دِبِينَه).

**٢٢٠.** بێگُمَانْ خُدِىٚ، هَرْ اَوَه يِىٚ بِهيزَرْ اِىٚ زَانَا.

**٢٢١.** مَا اَزْ ژِ وَه رَه نَبێژِمْ كَا شَيْطَانْ دَادِكَڤِنْ سَرْ دِلِىٚ كِىٚ؟

**٢٢٢.** اَوْ دَادِكَڤِنْ سَرْ دِلِىٚ هَرْ كَسِىٚ پِرْ دَرَوْكَارْ اِىٚ پِرْ گُنَهْكَارْ.

**٢٢٣.** اَوْ (لِئَاسِيمَانَانْ) گُهْڤَچِنِيىٚ دِكِنْ و پِرێنْ وَانْ دَرَوْكَارِنْ.

**٢٢٤.** هَرْچِى كُو شَاعِرِنْ، مِرُوْڤێنْ ژَرِيدَرْكَتِى بِپِىْ وَانْ دِكَڤِنْ.

**٢٢٥.** مَا تُو نِزَانِى كُو اَوْ بِێزَئَانِينْ و ئَارْمَانْجْ خَوه بَردِدِنْ نَاڤْ هَرْ دَرَوْ و هُنَرِىٚ.

**٢٢٦.** بێگُمَانْ اَوْ يَا كُو نَاكِنْ دِبێژِنْ.

**٢٢٧.** ژِ بِلِى يێنْ كُو بَاوَرِى ئَانِينَه، اَوێنْ كُو كَارُ و كِرِيَارێنْ قَنْجْ كِرِنَه، يێنْ كُو زِكْرِىٚ
خُدِىٚ پِرْ كِرِنَه و پِشْتِى كُو نَحَقِى لِوَانْ هَاتِيَه كِرِنْ خَوه بِسَرْ خِسْتِنَه (اَوْ جُدَا نَه).
يێنْ كُو ظُلِمْ كِرِنَه تَقَزْ دِىٚ بِزَانِنْ كَا بِبَالْ كُو جِهِى و كِيژَان اَنْجَامِىٚ ڤَه ڤَگَرِنْ.

## ٢٧. سُورَه يِىٚ نَمِلْ

سُورَەيىٚ (نَمِلْ) ، ٩٣ (نُوتْ و سِىٚ) ئَايَتَه. لِمَكِّىٚ دَاكَتِيَه. سُورَه نَاڤِىٚ خَوه ژِ پِيڤَا نَمِلْ گِرْتِيَه
كُو بِمَعْنَيَا مِيرُو (مُورِى -گِيرِكْ) تِىٚ كُو دِئَايَتَا ١٨'اَمْ دَه بِهُرِى.

بِنَاڤِىٚ خُدَايىٚ كُو رَحْمَنَ رَحِيمَ

١. طَا، سِينْ. اَڤْ، ئَايَتێنْ قُرْئَانِىٚ و كِتێبَا رُونكَرِنْ.

**٢٦.** ڤێجَا لُوطْ بَاوَرِى بِابْرَاهِيمْ ئَانِى. اِبْرَاهِيمْ وِهَا گُوتْ: بێگُمَانْ اَزێ هِجْرَتِى بَالْ خُدَايێ خوه ڤه بِكِمْ. بێگُمَانْ خُدَايێ مِنْ سَرْدَسْتَه زَانَايَه.

**٢٧.** مَه اِسْحَاقْ و يَعْقُوبْ بَخْشى اِبْرَاهِيمْ كِرِنْ، مَه پێخَمْبَرِى و كِتێبْ دِكِنێسَا وِى دَه گَرَانْدِنْ، مَه پَادَاشَا وِى لِجِيهَانِێ دَايێ و بێگُمَانْ اَوْ لِئَاخْرَتێ ژِى ژِ قَنْجِيكَارَانَه.

**٢٨.** لُوطْ ژِى (بِێنِنْ بِيرَا خَوه)؛ وِێ دَمَا ژِ گَلِێ خَوه رَه گُوتْ: بِرَاسْتِى هُونْ فَحِيشَتِيَكَه وِسَا دِكِنْ كُو بَرِيَا وَه ژِ عَالَمِێ تُو كَسى اَوْ (فَحْشِيتِى) نَكِرِيَه!

**٢٩.** اَرِێ مَا هُونْ دِچِنْ جَمْ زِلاَمَانْ، هُونْ رِيَا دِبِرِنْ و دِجِڤِينێنْ خَوه دَه پێتُورَتِيێ دِكِنْ؟! بَرْسِڤَا گَلِێ وِى تَنێ اَڤْ گُوتِنَا وَانْ بُو: اَگَرْ بِرَاسْتِى تُو رَاسْتْ دِبێژِى دَه هَايْدِێ عَذَابِێ خُدِێ ژِ بُوٚ مَه بِينَه!

**٣٠.** لُوطْ وِهَا دُعَا كِرْ: خُدَايێ مِنْ! لِهَمْبَرِى ڤِێ جِڤَاتَا ژِرێدَرْكَتِى ئَارِيكَارِيَا مِنْ بِكَه.

**٣١.** گَاڤَا قَاصِدێنْ مَه مِزْگِينِى ژِ اِبْرَاهِيمْ رَه ئَانِينْ (ژِێ رَه وِهَا) گُوتِنْ: اَمِێ گَلِێ ڤِى وَلاتِى (سَدُومِێ يێ گَلِێ لُوطْ) هَلاكْ بِكِنْ. بێگُمَانْ گَلِێ وِى هَرْ سِتَمْكَارِنْ.

**٣٢.** اِبْرَاهِيمْ ژِ قَاصِدَانْ رَه گُوتْ: مَا نَه لُوطْ تێدَه يَه! قَاصِدَانْ گُوتْ: اَمْ بێهْتِرْ دِزَانِنْ كَا كِى تێدَه يَه. مِسُوگَرْ اَمِێ لُوطْ و مَالْبَاتَا وِى رِزْگَارْ بِكِنْ، ژِ بِلِى ژِنَا وِى؛ اَوْ بُو ژِ يێنْ هِلاكْبُويِى.

**٣٣.** دَمَا قَاصِدێنْ مَه هَاتِنْ جَمْ لُوطْ، اَوْ (ژِ تِرْسَا دَسْتْدِرێژِيَا لِسَرْ وَانْ) بِهَاتِنَا وَانْ غَمْگِينْ بُو و (ژِ بُوٚ خَلاَسِيَا وَانْ) بِێ طَاقَتْ بُو. قَاصِدَانْ ژِێ رَه گُوتْ: مَتِرْسَه و غَمْگِينْ مَبَه! بێگُمَانْ اَمِێ تَه و مَالْبَاتَا تَه رِزْگَارْ بِكِنْ، ژِ بِلِى ژِنَا تَه؛ اَوْ ژِ يێنْ كُو هَلاكْ بُونَه.

---

و ژِ بُو وَانْ تُو ئَارِيكَارْ ژِى نِينِنْ.» و ژِ سُورَه‌يِێ مَائِدَه ئَايَتَا ٤١ێ «چه كَسِێ كُو خُدِێ، بَرْزَبُونِێ ژێرَه بَخوازَه تُو دِێ نِكَارِبِى لِهَمْبَرِى خُدِێ تِشْتَكى ژێرَه بِكِى اَڤێنْ هَا اَونْ كُو خُدِێ نَخوسْتِيَه دِلِێ وَانْ (ژِ كُفْرِێ) پَاڤِژْ بِكَه« و دِ گَلَكْ جِهێنْ دِنْ دَه بِئَاوَايَكى ڤَرَهْ و زَلاَلْ اَشْكَرَه دِكَه.

**٣٤.** بێگُمَانْ اَمێ بِسَرْ خَلْكێ ڤی وَلاتِی دَه، ژِ بَرْ ژرِێدَرْكَتِنَا وَانْ عَذَابَكِی (دِژْوَارْ) ژِ ئَاسْمێنْ بینِنْ خَوارِێ.

**٣٥.** صُونْدْ بَه، مَه ژِ وِی گُنْدِی ژ بُوْ مِلَّتَكِی كُو تێ بِگَهِیژَه نِیشَانَكَه اَشْكَرَا هِێلایَه.

**٣٦.** مَه ژِ (گَلِێ) مَدْیَنِێ رَه ژِی بِرَایێ وَانْ شُعَیبْ شَانْدْ و وِی وِهَا گُوْتْ: گَلِی مِلَّتِێ مِنْ! عِبَادَتِێ خُدِێ بِكِنْ، هِێڤِیَا خَوه بِرُوژَا ئَاخْرَتِێ ڤَه گِرِێبِدِنْ و لِسَرْ رُویێ اَرْدِێ فَسَادِیێ زێدَه نَكِنْ!

**٣٧.** لێبَلِێ وَانْ بِشُعَیبْ بَاوَرِی نَئَانِی، ڤێجَا وِێ عَرْدْهَژَا جَانْسُوْژْ اَوْ گِرْتِنْ، اِیجَارْ دِخَانِیێ خَوه دَه لِسَرْ چُوكَانْ كُمِشِی مَانْ.

**٣٨.** مَه عَادْ و سَمُودْ ژِی (بِرِنْ هَلاكِێ). تَقَزْ ژ بُوْ وَه (یَا هَاتِی سَرِێ وَانْ) ژِ جهْ و وَارِێنْ وَانْ اَشْكَرَا تِێ زَئَانِینْ. بێگُمَانْ شَیْطَانْ ژِ وَانْ رَه كِرِنێنْ وَانْ سِپَحِی نِیشَانْ دَانْ و اَوْ ژِ رِیَا حَقْ دَرَانِینْ. حَالْ اَڤْه كُو اَوْ بِخَوه بِیرَوَرْ بُونْ.

**٣٩.** مَه قَارُونْ، فِرْعَونْ و هَامَانْ ژِی (بِرِنْ هَلاكِێ). صُونْدْ بَه، مُوسَا ئَایَتْ ژِ وَانْ رَه ئَانِیبُونْ، ڤێجَا وَانْ لِسَرْ اَرْدِێ خَوه قُرَه كِرِنْ و اَوْ نِكَارِنْ زُوْرَا مَه بِبِنْ.

**٤٠.** مَه هَرْ یَكْ ژِ وَانْ ژِ بَرْ گُنَهێنْ وَانْ، بِعَذَابْ اَوْ گِرْتِنْ. هِنْ ژِ وَانْ مَه كَڤِرْ بِسَرْ وَانْ دَه بَارَانْدِنْ، هِنْ ژِ وَانْ ڤِیرِینَا جَانْسُوژْ اَوْ هِنْگَافْتِنْ، هِنْ ژِ وَانْ مَه اَوْ دِ عَرْدِێ دَه بِرِنْ خَوارِێ و هِنْ ژِ وَانْ مَه اَوْ دِئَاڤِێ دَه خَنِقَانْدِنَه. خُدِێ نَه اَوَه كُو ظُلْمِێ لِوَانْ بِكَه، لێبَلِێ اَوْ بِخَوه ظُلْمِێ لِخَوه دِكِنْ.

**٤١.** مِینَاكَا وَانێنْ كُو ژِ بِلِی خُدِێ ژِ خَوه رَه دُوسْتْ و ئَارِیكَارْ گِرْتِنَه، عَیْنِی مِینَا كُونِێ تَڤْنَپِیرِێ یَه. حَالْ اَڤْه كُو مَالا هَرِی قَلْسْ مَالا تَڤْنَپِیرِێ یَه. اَگَرْ وَانْ اَڤْ زَانِبَایَا (دِێ پَرَسْتِنَا وَانْ پُوتَانْ نَكِرِبُونَا).

**٤٢.** بێگُمَانْ خُدێ دِزَانَه كُو اَوێنْ ژِ بِلِی خُدێ ژِ وَانْ رَه عِبَادَتێ دِكِنْ، نَه تِشْتَكِنْ. هَرْ خُدێ يَه يێ سَرْدَسْتْ، يێ خودِی حِكْمَتْ.

**٤٣.** اَمْ ڤَانْ مِينَاكَانْ ژِ بُوْ مِرُوْڤَانْ دَرْبُ و مَسَلْ تِينِنْ، ژِ يێنْ زَانَا پێ ڤَه كَسْ تێ نَاگِهێژِنْ.

**٤٤.** خُدێ عَرْدُ و ئَاسِيمَانْ بِرَاسْتِی ئَافِرَانْدِنَه. بێگُمَانْ دِڤێ دَه ژِ بُوْ بَاوَرْمَنْدَانْ نِيشَانَكْ هَيَه.

**٤٥.** (يَا مُحَمَّدْ!) اَڤْ وَحْيَا كُو ژِ ڤێ قُرْئَانێ ژِ تَه رَه هَاتِی بِخُوينَه و بِئَاوَايێ پێدِڤِی نِمێژْ بِكَه. بێگُمَانْ نِمێژْ مِرُوْڤ ژِ نَقَنْجِی و پِيتُوْرَتِيَانْ دُورْ دِگِرَه و بِرَاسْتِی زِكْرێ خُدێ (ژِ هَرْ تِشْتِی) مَزِنْتِرَه. خُدێ بِيَا كُو هُونْ دِكِنْ دِزَانَه.

**٤٦.** لِهَمْبَرْ اَهْلِيكِتِيبَانْ بِيَا هَرِی سِپَحِی تِێبكُوْشِنْ. لِێبَلێ اَوێنْ كُو ژِ وَانْ ظُلْمْ كِرِنْ، اَوْ جُدَا نَه. بِبێژِنْ: مَه بِيَا كُو ژِ مَه رَه هَاتِيَه هِنَارْتِنْ و بِيَا كُو ژِ وَه رَه ژِی هَاتِيَه هِنَارْتِنْ بَاوَرِی ئَانِيَه، خُدَايێ مَه و خُدَايێ وَه يَكَه و اَمْ ژێ رَه بَرْدَسْتْ بُونَه.[1]

**٤٧.** (چَاوَا مَه ژِ يێ بَرِيَا تَه رَه هِنَارْتِيَه) هَرْ وِسَا مَه ژِ تَه رَه ژِی كِتێبْ هِنَارْتِيَه. ڤێجَه اَوێنْ كُو مَه كِتێبْ ژِ وَانْ رَه هِنَارْتِيَه بَاوَرِی پێ تِينِنْ و ژِ ڤَانْ ژِی يێنْ كُو بَاوَرِی تِينِنْ هَنَه. ژِ كَافِرَانْ پێ ڤَه كَسْ ئَايَتێنْ مَه مَانْدَلَه نَاكَه.

**٤٨.** تَه بَرِيَا ڤێ قُرْئَانێ، نَه نِڤِيسَكْ دِخَوِنْدْ نَه ژِی بِدَسْتێ خَوه خَتَكْ دِنِڤِيسَانْدْ. اَگَرْ تَه خَونْدِنْ و نِڤِيسِينْ زَئَانِيبُويَا، وێ دَمێ كَافِرَانْ دَرْ بَارێ وێ دَه دێ گُمَانْ بِكِرَا.

---

١ لِهَمْبَرْ اَهْلِيكِتِيبَانْ بِيَا هَرِی سِپَحِی مُجَادَلَه بِكِنْ. خُدێ تَعَالٰی بِڤێ ئَايَتَا پِيرُوْزْ لِپێخَمْبَرێ خَوه فَرْمَانْ دِكَه كُو كُو بِدِژْبَرێ خَوه رَه بِرِيَكَا هَرِی سَهْلْ مُجَادَلَه بِكَه؛ دَمَا تَه حَقْ بَيَانْ كِرْ هێدِی و بِنَرْمِی اِفَادَه بِكێ و خَوه ژِ اَزِيتْدَانَا وَانْ دُورْ بِگِرَه. لِێبَلێ اَگَرْ كُو اَوْ لِهَمْبَرْ مُسلِمَانَانْ ئَالِيَا جَنْگێ بِچِكِينِنْ؛ وێ دَمێ تُو يێ بِوَانْ رَه مِينَا وَانْ مُجَادَلَه بِكێ هَيئَانِی كُو بَاوَرِی بِينِنْ ئَانْ بێ اِعْتِرَاظْ جِزِيێ بِدِنْ. ژِ سُورَەيێ نَملْ ئَايَتَا ١٢٥ێ «تُو بِحِكْمَتْ و بِشِيرَتَا سِپَحِی (مِرُوڤَانْ) ڤَخُوينَه رِيَا خُدَايێ خَوه و بِوَانْ رَه بِرِنْدْتِرِينْ ئَاوَايِی تِێبكُوشَه» و ژِ سُورَەيێ طٰهَ ئَايَتَا ٤٤ێ «هُونْ هَردُو گُوْتِنَكَه خُوَشْ ژێرَه بِبێژِنْ. بَلْكِی اَو ئَاقِلْ بِگِرَه، يَانْ ژِی (ژِ خُدێ) بِتِرْسَه» ژِی ڤێ رَوشێ اِفَادَه دِكَه. شَكْلێ گُوْتِنَا خَوشْ ژِی خُدێ ژِ سُورَەيێ نَازِيعَاتْ ئَايَتَا ١٨-١٩ێ دَه وِهَا فَرْمَانْ دِكَه: بِبێژَه: مَا تَه دِڤێ تُو خَوه (ژِ گُنَهَانْ) پَاقِژْ بِكِی و (تَه دِڤێ) اَزْ بَرێ تَه بِدِمَه بَالْ رَبِّێ تَه ڤَه، ڤێجَه تُو يێ (هَایْ ژِ فَرْمَانێنْ وِی هَبێ و تُو دِێ بِحَقِی ژێ) بِتِرْسِی.

٤٩. نَخيْرْ، بَلْكِى اَڤْ قُرْئَانْ دِسينْگا وَانيْنْ كُو ژِ وَانْ رَه زَئَانينْ هَاتيَه دَاينْ دَه نيشَانيْنْ اَشْكَرَا نَه. ژِ ييْنْ ظَالِمْ پىٚ ڤَه تُو كَسْ ئَايَتيْنْ مَه مَانْدَلَه نَاكَه.

٥٠. (ييْنْ كَافِرْ) گُوتِنْ: دَه بِلا ژِ خُدَايىٚ وِى هِنْ مُعْجِزَه ژِىٚ رَه بِهَاتِنَا. بِبيْژَه: مُعْجِزَه بَسْ لِجَمْ خُدِىٚ نَه. بيْگُمَانْ اَزْ تَنِىٚ هِشيَارْكَرَكى اَشْكَرَا مَه.

٥١. اَرِىٚ مَا (بِمُعْجِزَتِى) نَه بَسِى وَانَه كُو مَه اَڤْ كِتيْبْ ژِ تَه رَه هِنَارْتيَه كُو ژِ وَانْ رَه تِىٚ خَونْدِنْ؟ بيْگُمَانْ دِڤىٚ دَه ژِ بُوٚ مِلَّتَكى كُو بَاوَرِى بينَه رَحْمَتْ و بيرْئَانينْ هَيَه.

٥٢. (رَسُولىٚ مِنْ!) بِبيْژَه: دِنَڤبَا مِنْ و وَه دَه بِشَاهِدِى خُدِىٚ بَسَه. اَوْ، بِتِشْتىٚ كُو دِعَرْدُ و ئَاسيمَانَانْ دَه هَيَه دِزَانَه. اَويْنْ كُو بَاوَرِى بِيَا پُوچْ ئَانينَه و خُدَا مَانْدَلَه كِرِنَه، هَا اَوْ ييْنْ خَسرِينَه.

٥٣. اَوْ ژِ تَه لَزْكِرِنَا عَذَابْ دِخوازِنْ. اَگَرْ نَه ژِ بَرْ جِڤَانَكى بِنَاڤْكِرِى بُويَا دِىٚ عَذَابْ ژِ بُوٚ وَانْ بِهَاتَا. صُوٚنْدْ بَه، تَڤزْ عَذَابْ ژِ نِشْكَا ڤَه دِىٚ بِسَرْ وَانْ دَه بِىٚ و اَوْ لِخوه هَاىْ نَابِنْ.

٥٤. اَوْ ژِ تَه لَزْكِرِنَا عَذَابْ دِخوازِنْ، بيْگُمَانْ جَهْنَمِىٚ دُوٚرْ لِكَافِرَانْ گِرْتيَه.

٥٥. وِىٚ رُوٚژِىٚ عَذَابْ دِىٚ وَانْ (كَافِرَانْ) هَمْ ژِ سَرْ وَانْ ڤَه هَمْ ژِ بِنْ وَانْ ڤَه وَانْ بِگِرَه. خُدِىٚ ژِى دِىٚ ژِ وَانْ رَه بِبيْژَه: دَه (جَزَايىٚ) يَا كُو وَه كِريَه تَعْمْ بِكِنْ!

٥٦. گَلِى بَنْدَييْنْ مِنْ ييْنْ كُو بَاوَرِى ئَانينَه! بيْگُمَان عَرْدَا مِنْ فِرَهَه، ڤيْجَه بِبَالْ عَرْدَا مِنْ ڤَه هِجْرَتْ بِكِنْ و هَرْ ژِ مِنْ رَه عِبَادَتِىٚ بِكِنْ.

مُسلْمَانْ، دِڤىٚ لِوَلَاتَكى كُو نِكَارِبَه عِبَادَتِىٚ رَبِّىٚ خَوه بِكَه، نَمينَه. عَرْدَا خُدِىٚ فَرَهَه. اَڤْ ئَايَتَا پيرُوزْ دِدَه زَئَانينْ كُو لِسَرْ مِرُوٚڤىٚ مُسلْمَانْ فَرْزَه كُو هِجْرَتى وَلَاتىٚ اِسْلامىٚ بِكَه.

٥٧. هَرْ نَفسْ دِىٚ مِرِنِىٚ تَعْمْ بِكَه. پَاشىٚ هُونِىٚ لِمَه بيْنَه ڤَگَرَانْدِنْ.

٥٨. اَويْنْ كُو بَاوَرِى ئَانينْ و كَاريْنْ قَنْجْ كِرِنْ، اَمِىٚ وَانْ لِبِهِشْتىٚ دِكُوٚشْكيْنْ بِلِنْدْ دَه بِجِهْ

بِكِنْ كُو دِبِنْ وَانْ رَه چَمْ دِهَرِكِنْ و اَوْ هَرْ و هَرْ دِێ لِوَانْ بِمِينِنْ. چِه رِنْدْ خَلاتَه؛ خَلاتَا يێنْ كُو كَارێنْ قَنْجْ كِرِنْ!..

٥٩. (اَوْ)، يێنْ كُو صَبرْكێشِنْ و خَوه بَسْ دِسپێرِنْ خُدَايێ خَوه.

٦٠. گَلَكْ حَيْوَانْ هَنَه كُو رِزْقِێ وَانْ نَه لِسَرْ پِشْتَا وَانَه. خُدِێ رِزْقِێ وَانْ و يێ وَه ژِى دِدَه. اَوَه يێ بِهيزَرْ، يێ زَانَا.

٦١. صُوِنْدْ بَه، اَگَرْ تُو ژِ كَافِرَانْ بِپِرْسِى؛ يێ كُو عَرْدُ و ئَاسِيمَانْ ئَافِرَانْدِنَه، يێ كُو رُوِژْ و هَيْڤْ بَرْدَسْتْ كِرِنَه، كِيَه؟ تَقَزْ دِێ بِبێژِنْ: خُدِێ يَه. نَاخَوه اَوْ چِما بَرِێ خَوه (ژِ اِيمَانَا پِێ) ڤَدِگَرِينِنْ؟

٦٢. خُدِێ، ژِ بَنْدَيێنْ خَوه كِێ بِڤِێ (ژِ بُو جَرِبَانْدِنِێ) رِزْقِێ وِى فِرَهْ دِكَه، كِێ ژِى بِڤِێ رِزْقِێ وِى تَنْگ دِكَه. بێگُمَانْ خُدِێ بِهَرْ تِشْتِى زَانَا يَه.

٦٣. صُوِنْدْ بَه، اَگَرْ تُو ژِ كَافِرَانْ بِپِرْسِى؛ اَوِێ كُو ژِ عَوْرَانْ ئَاڤِێ دَادِخَه و عَرْدِێ -پِشْتِى هِشْكْبُونَا وِێ. پِێ هِێشِينْ دِكَه، كِيَه؟ تَقَزْ دِێ بِبێژِنْ: «خُدِێ يَه». (لِسَرْ ڤَانْ دَلِيلێنْ بِنبِرْ كُو مُشْرِكَانْ نَاچَارْ دِهێلَه) بِبێژَه: حَمْدْ ژِ خُدَايێ عَالَمِێ رَه بَه. دَڤْ ژِ ڤِێ ژِى بَرْدَه؛ پِرێنْ وَانْ ژِى تِێنَاگِهيژِنْ.

٦٤. اَڤْ ژِيَانَا جِيهَانِێ تَنِێ كِيفْ و لِيسْتِكَه. بێگُومَانْ حَچِى مَالا ئَاخْرَتِێ يَه، اَوْ ژِيَانَا رَاسْتَقِينَه يَه، خَوزِى وَانْ اَڤْ بِزَانِيَا.

٦٥. ڤێجَه دَمَا كُو اَوْ لِكَشْتِيِێ سُوَارْ دِبِنْ، بِدِلَكِى صَافِى اَوْ هَاوَارَا خَوه دِگِهينِنْ خُدِێ. ڤێجَه دَمَا خُدِێ بِسَلامَتِى وَانْ دَرْدِخَه بَژِێ، هَا تُو دِبِينِى كُو وَا يَه اَوْ ژِ خُدِێ رَه شَرِيكَانْ چێدِكِنْ.

٦٦. بِلا اَوْ دَرْحَقِى نِعْمَتێنْ مَه دَه نَانْكُورِيِێ بِكِنْ و بِلا خَوشْ بِژِينْ، پَاشِێ اَوِێ بِزَانِنْ!

٦٧. مَا اَوْ نَابِينِنْ كُو مه (وَلاتِىٚ وَانْ مَكَّهْ) كِرِيَه وَارَكِى رِيٚزْدَارْ و اَوْلَه؟ حَالْ اَڤْه كُو لِهَاوِرْدُوٚرَا وَانْ مِرُوٚڤ تِيٚنَه رَڤَانْدِنْ (تِيٚنَه كُشْتِنْ و دِيلْ تِيٚنَه گِرْتِنْ). اَرِىٚ مَا هِىٚ ژِى اَوْ بِبَاطِلِى بَاوَرْ دِكِنْ و دَرْ بَارِىٚ نِعْمَتِيٚنْ خُدِىٚ دَه نَانْكُوٚرِى دِكِنْ؟

٦٨. اَرِىٚ مَا ژِ وِى كَسِىٚ كُو لِسَرْ نَاڤِىٚ خُدِىٚ بِدَرَوِينْ خَبَرْ دِدَه، يَانْ ژِى بِوِىٚ وَحْيَا كُو ژِ پِيٚخَمْبَرِىٚ وِى رَه هَاتِيَه بَاوَرِى نَايِينَه ظَالِمْتِرْ كِى هَيَه؟ اَرِىٚ مَا دِجَهْنَمِىٚ دَه ژِ بُوٚ كَافِرَانْ جه تُنَه يَه؟!

٦٩. اَوِيٚنْ كُو ژِ بُوٚ مه جِهَادْ كِرِنْ، تَڤْزْ اَمِىٚ وَانْ لِسَرْ رِيٚكَيٚنْ خَوه رَاسْتَرِىٚ بِكِنْ. بِيٚگُمَانْ خُدِىٚ هَرْ بِڤَنْجِيكَارِيٚنْ رَاسْتْ و دُرِسْتْ رَه يَه.[١]

## ٣٠. سُورَه يِىٚ رُومْ

سُورَهِيِىٚ (رُومْ)، ٦٠ (شِيٚسْتْ) ئَايَتَه. لِمَكَّىٚ نَازِلْ بُويَه . ژِ بَرْ كُو سُورَهِيِى بَحْسَا رُومِيِيٚنْ كُو دِشَرِىٚ لِهَمْبَرِى مَجُوسِيَانْ كِرِبُونْ و تِىٚ دَه تِيٚكْچُوبُونْ دِكَه ژِىٚ رَه سُورَهِيِىٚ رُومْ هَاتِيَه گُوتِنْ.

**بِنَاڤِىٚ خُدَايِىٚ كُو رَحْمٰنَ رَحِيمَ**

١. اَلِفْ، لامْ، مِيمْ.

٢. رُومْ، هَاتَه شِكَانْدِنْ (بِدَسْتِىٚ فُرْسِىٚ/فَارِسَانْ).

٣. دِعَرْدَا هَرِى نِزْمْ دَه. اَوْ (رُومْ) پِشْتِى ڤِىٚ تِيٚكْچُونِىٚ دِىٚ بِسَرْكَڤِنْ.

١ خُدِىٚ تَعَالٰى دِ ڤِىٚ ئَايَتَا پِيرُوٚزْ دَه گُوٚتِيَه: اَوِىٚ كُو دِ رِيٚكَا دِينِىٚ مَه دَه، دِ رِيٚكَا رَازِيبُونَا مَه دَه جَهْدْ بِكِىٚ، بِصُوٚنْدْ اَمِىٚ ژِى رِيٚكَا خَوه ژِ وَانْ رَه دِيَارْ بِكِنْ و اَمِىٚ وَانْ لِسَرِىٚ رَاسْتْرِىٚ بِكِنْ. ژِ سُورَهِيِىٚ مُحَمَّدْ ئَايَتَا ١٧ىٚ ژِى «اَوِ يِنْ كُو لِسَرْ رِيَا رَاسْت رَاسْتَرِىٚ بُونَه، خُدِىٚ هِيدَايَتَا وَانْ زِيٚدَه دِكَه و رِيٚكَا تَڤْوَادَارِيَا وَانْ فِيٚرِى وَانْ دِكَه» ڤِىٚ وَاطِيِىٚ دِ تَكزِيٚنِىٚ.

٤. اَڤْ (سَرْكَفْتِنْ) ژِى دِنَاڤَا چَنْدْ صَالانْ دَه چێدِبَه. اَمْرُ و فَرْمَانْ دِسَرى و دَاوِى دَه هَرْ ژِ بُوٚ خُدِىٚ يَه. دِ وِىٚ رُوٚژِىٚ دَه بَاوَرْمَنْدْ ژِى دِلْشَادْ دِبِنْ..[1]

٥. بِئَارِيكَارِيَا خُدِىٚ. اَوْ كِىٚ بِڤِىٚ ئَارِيكَارِيَا وِى دِكَه. هَرْ خُدِىٚ يَه يىٚ سَرْدَسْتْ، يىٚ دِلُوٚڤَانْ.

٦. (اَڤْ سَرْكَفْتِنْ) پێيمَانَا خُدِىٚ يَه. خُدِىٚ ژِ پێيمَانَا خوه ڤَنَاگَرِه، لێبَلِىٚ پِرِێنْ مِرُوٚڤانْ نِزَانِنْ.[2]

٧. اَوْ ژِيَانَا جِيهَانِىٚ يَا لِبَرْ چَاڤَانْ دِزَانِنْ، اَوْ بِخَوه ژِ ژِيَانَا ئَاخْرَتِىٚ بِىٚ هَايِنْ.

٨. اَرِىٚ مَا اَوْ دِچێبُونَا خَوه دَه نَافِكرِنْ. خُدِىٚ عَرْدُ و ئَاسِيمَانْ و يێنْ كُو دِنَاڤْبَرَا وَانْ دَه هَنَه بَسْ بِحَقِى و ژِ بُوٚ دَمَكَه نَاڤْلێكرِى ئَافرَانْدِنَه؟ بێگُمَانْ ژِ مِرُوٚڤانْ پِرْ كَسْ هَنَه كُو بِچُونَا بَرْ دَسْتِىٚ خُدِىٚ بَاوَرى نَايينِنْ.

٩. مَا اَوْ لِسَرْ رُويىٚ عَرْدِىٚ نَگَرِيَانَه، ڤێجَه كُو بِنێرِنْ كَا اَنْجَامَا اُمَّتێنْ بَرِيَا وَانْ چَاوَا بُويَه؟ كُو اَوْ بِخَوه ژِى، ژِ وَانْ خُرْتْترْ بُونْ و وَانْ عَرْدْ بێهْترْ چَانْدبُونْ و بێهْترْ ئَاڤَسَازْ كِربُونْ. پێخَمْبَرێنْ وَانْ ژِى ژِ وَانْ رَه گَلَكْ دَلِيلْ و مُعْجِزَيێنْ اَشْكَرَا ئَانِيبُونْ. ڤێجَه نَه بَابَتِىٚ خُدِىٚ يَه كُو اَوْ ظُلْمِىٚ لِوَانْ بِكَه، لێبَلِىٚ وَانْ بِخَوه ظُلِمْ لِخَوه دِكرْ.

١٠. پَاشِىٚ دُومَاهِيكَا گُنَهْكَارَانْ ژِ بَرْ كُو وَانْ بِئَايَتێنْ خُدِىٚ بَاوَرى نَئَانِيبُونْ و پِىٚ طِنَازْ دِكرِنْ، بُوٚ پِيسْتِرِينْ دُومَاهِيكْ.

---

١ دِ وِىٚ رُوژِىٚ دَه بَاوَرْمَنْدْ ژِى دِلْشَادْ دِبِنْ.. بِسَدَمَا ئَارِيكَارِيَا خُدِىٚ (ژِ بُوٚ وَانْ). لگُوٚرِى لێكُولِينَا خَوه، بِڤَاسِى مِنْ ژِ تَفْسِيرَانْ فَهْمْ كِرِيَه مَعْنَى ئَايَتِىٚ وِهَا چێدِبَه: وِىٚ رُوٚژَا كُو رُومْ لِهَمْبَرْ فُرْسِىٚ بِسَرْ بِكَڤِنْ، بِئَارِيكَارِيَا خُدِىٚ مُؤْمِنْ ژِى لِهَمْبَرْ مُشْرِكێنْ مَكِّىٚ بِسَرْدِكَڤِنْ و بِڤِىٚ رَوْشِىٚ مُؤْمِنْ دِلْخُوَشْ دِبِنْ.

٢ اَڤْ سَرْكَفْتِنَا رُومِىٚ لِسَرْ فُرْسِىٚ و سَرْكَفْتِنَا مُؤْمِنَانْ لِهَمبَرْ مُشْرِكَانْ و بِسَدَمْ ئَارِيكَارِيَا خُدِىٚ دِلْشَادِيَا مُؤْمِنَانْ پێيمَانَكَه ژِ جَمْ خُدِىٚ يَه. خُدِىٚ ژِى ژِ پێيمَانَه خَوه ڤَنَاگَرِىٚ، لێبَلِىٚ پِرِىٚ مِرُوڤَانْ نِزَانِنْ. خُدِىٚ تَعَالَى دِ ڤِىٚ ئَايَتِىٚ دَه چَارْ رَوشْ بَيَانْ كِرِنْ: ١- خُدِىٚ تُو جَارْ ژِ پێيمَانَا خَوه نَادَه پَاشْ. ٢- پِرِىٚ مِرُوڤَانْ كُو اَوْ مُشْرِكِنْ نِزَانِنْ. ٣- اَوْ مُشْرِكْ ژِ ژِيَانَا دِنْيَايِىٚ بَسْ يَا لِبَرْ چَاڤْ دِزَانِنْ. ٤- اَو ژِ حَيَاتَا ئَاخْرَتِىٚ غَافِلِنْ.

١١. خُدِىٚ پِيْشِى دَسْتْ بِئَافِرَانْدِنِىٚ دِكَه، پِشْتْرَه وِى قَدِژِينَه، پَاشِىٚ هُونِىٚ بِبَالْ ڤَه بِيْنَه ڤَگَرَانْدِنْ.

١٢. رُوْژَا كُو قِيَامَتْ رَادِبَه، گُنَهْكَارْ بِيْهِيْڤِى و بِيْدَنْگْ دِمِينِنْ.

١٣. ژِ وَانْ هَڤْپِشْكِيْنْ (كُو ژِ بِلِى خُدِىٚ اَوْ دِحَبَانْدِنْ) تُو كَسْ ژِ بُوْ وَانْ نَابَه مَهْدَرْڤَانْ و اَوِىٚ هَڤْپِشْكِيْنْ خوه ژِى مَانْدَلَه بِكِنْ.

١٤. رُوْژَا قِيَامَتْ رَادِبَه، وِىٚ رُوْژِىٚ (مُومِنْ و كَافِرْ) ژِ هَڤْ ڤَدِقَتِنْ.

١٥. ڤِيْجَه هَرْچِى اَوِيْنْ كُو بَاوَرِى ئَانِينَه و كَارِيْنْ قَنْجْ كِرِنَه، اَوْ دِنَاڤْ بَاخْچَيِيْنْ بِهِشْتِىٚ دَه تِيْنْ دِلْخَوشْكِرِنْ.

١٦. هَرْچِى اَوِيْنْ كُو كَافِرْ بُونَه و وَانْ بِئَايَتِيْنْ مَه و بِرُوْژَا قِيَامَتِىٚ بَاوَرِى نَئَانِينَه، ڤِيْجَه هَا اَوْ دِعَذَابْ دَه تِيْنَه كُوْمْكِرِنْ.

١٧. اِيْدِى دَمَا لِوَه بُوْ اِيْڤَارْ و دَمَا لِوَه بُوْ سِبَهْ خُدِىٚ ژِ هَرْ كِيْمَاسِيِىٚ پَاكْ بِدِيْرِنْ.

١٨. لِعَرْدُ و ئَاسِيمَانَانْ پَسِنْ و شِيْكِرِى هَرْ ژِىٚ رَه يَه و پَاشِيَا رُوْژِىٚ و دَمَا كُو رُوْ لِوَه دِبَه رُوْ لِنِيڤْرُوْ.[١]

١٩. خُدِىٚ، يِىٚ سَاغْ ژِ يِىٚ مِرِى دَرْدِخَه و يِىٚ مِرِى ژِى ژِ يِىٚ سَاغْ دَرْدِخَه، اَوْ عَرْدِىٚ پِشْتِى مِرِنَا (هِشْكْبُونَا) وِىٚ زِنْدِى دِكَه و هَرْ وِسَا هُونْ ژِى دِىٚ (ژِ گُورِيْنْ خوه) بِيْنَه دَرَانِينْ.

٢٠. ژِ نِيشَانِيْنْ (قُدْرَتَا) خُدِىٚ يَه كُو هُونْ ژِ ئَاخِىٚ ئَافِرَانْدِنَه، پِشْتْرَه هُونْ بُونَه مِرُوْڤ و (لِسَرْ عَرْدِىٚ) بَلاڤْ دِبِنْ.

٢١. ژِ نِيشَانِيْنْ (قُدْرَتَا) خُدِىٚ يَه كُو ژِ بُوْ وَه، ژِ جِنْسِىٚ وَه ژِنْ ئَافِرَانْدِنَه دَا كُو صَبْرُ و

---

١ عَبْدُالله اِىٚ كُرِىٚ عَبَّاسْ گُوتِيَه: هَرْ پِيْنْجْ نِمِيْژِيْنْ فَرْظْ دِڤَانْ هَرْدُو ئَايَتَانْ دَه هَاتِنَه دِيَارْكِرِنْ، لَوْرَا؛ دِهَڤُوكَا «دَمَا لِوَه بُوْ اِيْڤَارْ دُو نِمِيْژْ؛ مَغْرَبْ و عِيشَا، دِه ئَايَتَا «لِوَه بُوْ سِبَهْ»دَه نِمِيْژَا سِبَهِىٚ هَيَه. دِيَا پَاشِيَا رُوْژِىٚ دَه، نِمِيْژَا عَصْرِىٚ هَيَه و دِيَا دَمَا نِيڤْرُو دَه ژِى نِمِيْژَا نِيڤْرُوِيِىٚ هَيَه.

هَدَانَا وَه بوَانْ بىَ، حَزْكِرِنْ و لِهَڤْبَئَانِينْ ژِى دِنَاڤْبَرَا وَه دَه پَيْدَا كِرِيَه. بێگُمَانْ دِڤِىَ دَه ژِ بُوّ مِلَّتَكِى كُو بِفِكرِنْ عِبْرَتْ هَنَه.

**٢٢.** ژ نِيشَانِێنْ (قُدْرَتَا) خُدِىَ يَه كُو عَرْدُ و ئَاسِيمَانْ ئَافِرَانْدِنَه، زِمَانِێنْ وَه و رَنْگێنْ وَه ژِ هَڤْ جُدَا چێكِرِنَه. بێگُمَانْ دِڤِىَ دَه ژِ بُوّ مرُوّڤِێنْ زَانَا دَرْسُ و عِبْرَتْ هَنَه.[1]

**٢٣.** ژ نِيشَانِێنْ (قُدْرَتَا) خُدِىَ يَه كُو هُونْ دشَڤْ و رُوّژِىَ دَه رَادِزِنْ و هُونْ دِ وَانْ دَه ژِ كَرَمَا خُدِىَ دَاخَوازَا رِزْقِىَ خَوه دِكِنْ. بێگُمَانْ دِڤِىَ دَه ژِ بُوّ مِلَّتَكِى كُو گُهْدَارِى بِكِنْ عِبْرَتْ هَنَه.

**٢٤.** ژ نِيشَانِێنْ (قُدْرَتَا) خُدِىَ يَه كُو بِرُوسْكِىَ بِتِرْسُ و بِهێڤِى نِيشَانِى وَه دِدَه. ژ عَوْرَانْ ئَاڤِىَ دِبَارِينَه و بِوِىَ پِشْتِى هِشْكُبُونَا عَرْدِىَ، وِىَ هێشِينْ دِكَه. بێگُمَانْ دِڤِىَ دَه ژِ بُوّ مِلَّتَكِى كُو تێبِگَهِيژِنْ عِبْرَتْ هَنَه.

**٢٥.** ژ نِيشَانِێنْ (قُدْرَتَا) خُدِىَ يَه كُو عَرْدُ و ئَاسِيمَانْ بِفَرْمَانَا وِى خَوه رَادِگِرِنْ. پَاشِىَ گَاڤَا (رُوّژَا قِيَامَتِىَ) بِيَكْ گَازِيَكِىَ گَازِى وَه بِكَه، دِجِهْ دَه هُونِىَ ژِ گُورێنْ خَوه بێنَه دَرْ.

**٢٦.** چِقَاسْ تِشْتێنْ لِعَرْدُ و ئَاسِيمَانَانْ هَنَه اَوْ تَڤْ يێنْ خُدِىَ نَه. تَڤْ لِبَرْ فَرْمَانَا وِى ئَامَادَه نَه.

**٢٧.** اَوْ خُدَا يَه يِىَ كُو ژِ نَبُونِىَ مَخْلُوقْ چێكِرِنَه و پَاشِىَ دِىَ وِى ڤَژِينَه. اَڤْ ڤَژَانْدِنْ ژِىَ

[1] نَەوَكْهَڤْبُونَا زِمَانِىَ مِرُوّڤَانْ دِدَه نِيشَانْ كُو خَالِقِىَ وَانْ چه قَاسْ مَزِنْ و حَكِيمَه. لَوْرَا دِگَلْ كُو اَصْلِىَ وَانْ يَكَه ژِى لِىَ دِيسَا زِمَانِىَ وَانْ و رَنْگِىَ وَانْ نَه يَكِنْ. بِرَاسْتِى اَڤْ ئَايَتْ، بِكُرْتِى رَامَانَا اسْلامِىَ يَا دِبَارَا زِمَانْ و رَنْگَانْ دَه اَشكَرَه دِكَه. هَرْ وِهَا دِدَه زَئَانِينْ كُو دِ اسْلامِىَ دَه زِمَانْ تَڤْ وَكْهَڤْ بنِرْخِنْ و نَاڤْگِينَا ژِ هَڤْ فِێمْكِرنِىَ نَه. لِگُورِى فَهْمَا ژِ ڤِىَ ئَايَتِىَ، اِنْسَانِىَ كُو اِنْكَارَا زِمَانَكِى بِكَه هَرْ وَكِى كُو اِنْكَارَا نِيشَانَكِىَ ژِ نِيشَانِێنْ قُدْرَتَا خُدِىَ بِكَه و لِبَرْ قَدرَا خُدِىَ رَابَه. مِرُوّڤِىَ كُو زِمَانَكِى قَدَخَه بِكَه و مِلَّتَكِى اَسِيمِيلَه بِكَه اَوْ هَرْ وَكِى كُو نِيشَانَكِى ژِ نِيشَانِێنْ خُدِىَ ژِ هُوّلِىَ رَادِكَه و حِكْمَتَا وِى قَبُولْ نَاكَه. هِيچْ مَافِىَ تُو كَسْ و چه سَازُومَانِىَ تُنَه كُو بِتُو بَهَانَيِىَ خَبَرْدَانَا مِلَّتَكِى بِزِمَانِىَ وِى و پَرْوَرْدَيَا وِى قَدَخَه بِكَه.

رَه ژِ يَا اَوِلْ هِێسَانْتِرَه. لِعَرْدُ و ئَاسِيمَانَانْ پَسْنِێنْ هَرِى بِلِنْدْ يِێنْ خُدِىٚ نَه. هَرْ اَوَه يِىٚ دَسْتْهِلاتْ، يِىٚ خَوِێحِكْمَتْ.

**٢٨.** (خُدِىٚ) ژِ بُوٚ وَه دَرْبُ و مَسَلَكِىٚ ژِ وَه تِينَه؛ مَا كِى ژِ وَه رَازِى دِبَه كُو كُوٚلَيِىٚ وَه دِ وِى مَالِىٚ كُو مَه دَايَه وَه دَه بِبَه هَڤْپِشْكِىٚ وَه؛ ڤێجَه كُو هُونْ و اَوْ تِىٚ دَه وَكْهَڤْ بِنْ و چَاوَا هُونْ ژِ هَڤْ دِتِرْسِنْ هُونْ ژِ وَانْ ژِى بِتِرْسِنْ. هَرْ وِسَا ژِ بُوٚ مِلَّتَكِى كُو تِێدِگَهِيژِنْ اَمْ ئَايَتِێنْ خَوه بَرْفِرَهْ اَشْكَرَا دِكِنْ.[١]

**٢٩.** نَخِێرْ، بَلْكِى اَوِێنْ كُو ظَالِمْ بُونَه؛ بِنَزَانِى دَانَه پَىْ اَرَزُوِيێنْ خَوه. ڤێجَه اَوْ كَسِىٚ كُو خُدِىٚ وِى ژِ رِىٚ بِخَه اَوْ كِيَه وِى رَاسْتَرِىٚ بِكَه؟ ژِ بُوٚ وَانْ تُو ئَارِيكَارْ ژِى تُنِنْ.

**٣٠.** تُو بَرِىٚ خَوه رَاسْتْ و دُرِسْتْ، بِىٚ فَتْلُ و ڤِيچْ بِدَه دِينِىٚ حَقْ؛ خَوه بِفِطْرَتَا ژِ جَمْ خُدِىٚ بِگِرَه. اَوْ فِطْرَتَا كُو خُدِىٚ اِنْسَانْ لِسَرِىٚ چێكِرِيَه. ژِ فِطْرَتَا (چێكِرِنَا) خُدِىٚ رَه گُهَارْتِنْ تُنَه. هَا اَڤْ، رِێكَا رَاسْتُ و دُرِسْتَه، لِێبَلِىٚ پِرِێنْ مِرُوٚڤَانْ (پِىٚ) نِزَانِنْ.[٢]

**٣١.** هُونْ تَڤْ (بِاِخْلاصْ و تُوٚبِىٚ) لِخُدَايِىٚ خَوه ڤَگَرِنْ، بِنَكِرِنَا گُنَهَانْ خَوه ژِىٚ بِپَارێزِنْ، بَئَاوَايِىٚ پێدِڤِى نِمێژْ بِكِنْ و نَبِنْ ژِ مُشْرِكَانْ...

---

١ اَڤْ ئَايَتَا پِيرُوزْ دِيمَنَكِى زِنْدِى ژِ بُومَه تِينَه دَا كُو رِنْدْ تِێبِگَهِژِنْ. مِرُوٚڤِىٚ ئَازَادْ، رَازِى نَابَه كُو دِڤَانْ چَنْدْ رُوٚژێنْ دِدِنْيَايِىٚ دَه مِرُوٚڤكِى كُولَه و خِزْمَتْكَارْ بِكَه شَرِيكْ و خُودِيِىٚ سَرْوَتَا خَوه. چِڤَاسْ كُو اَوْ ژِ جِنْسِىٚ وِى يَه ژِى. ڤێجَه اَوِێنْ كُو هُونْ وَانْ ژِ خُدِىٚ رَه دِكِنْ شَرِيكْ، دِگَلْ كُو اَوْ مَخْلُوقِىٚ خُدِىٚ نَه، خُدِىٚ دِىٚ چَاوَا رَازِى بِبَه كُو هُونْ ژِىٚ رَه بِكِنْ هَڤْپِشْكْ و هَڤْتَا. خُدَا قَبُولْ نَاكَه كُو چِه تِشْتْ ژِىٚ رَه بِبَه شَرِيكْ. خُدِىٚ دِسَالِخِێنْ خَوه يِىٚ اَلُوهِيَّتْ و رُبُوبِيَّتِىٚ دَه يَكَه، تَكَه، پێهِمْكُوفْ و پێهَڤْتَا يَه.

٢ خُدِىٚ، بِڤِىٚ ئَايَتِىٚ فِطْرَتَا بَشَرِى و فِطْرَتَا دِينِىٚ اِسْلامِىٚ بِهَڤْ ڤَه گِرِىٚ دِدَه؛ اَڤْ هَرْ دُو ژِى ژِ كَارِىٚ خُدِىٚ نَه. اَڤْ هَرْدُو مُوافِقِىٚ قَانُونَا هِيينِىٚ نَه و هَرْ دُو دِ سِرُشْتْ و بَرێدَانِىٚ دَه بِهَڤْ ڤَه گِرێدَايِى نَه. يِىٚ كُو دِلِىٚ اِنْسَانْ خُلِقَانْدِيَه، اَڤْ دِينْ ژِى خُلِقَانْدِيَه، دَا كُو دِينْ لِسَرْ دِلِىٚ اِنْسَانْ حُكِمْ بِكَه؛ ژِ نَبَاشِيِىٚ وِى دَاگِرِينَه، نَخوشِيَا وِى دَرْمَانْ بِكَه و وِى رَاسْتَرِىٚ بِكَه. لَوْرَا خُدِىٚ بێهْتِرْ بِمَخْلُوقِىٚ خَوه دِزَانَه. فِطْرَتْ و دِينْ هَرْدُو ژِى سَابِتِنْ؛ نَايێنْ گُهَرتِنْ. ڤێجَه دَمَا نَفْسَا اِنْسَانْ ژِ فِطْرَتَا خَوه دَرْكَتْ، ژِ بِلِى ڤِى دِنِىٚ كُو بِفِطْرَتِىٚ رَه گِرێدَايِيَه چُو تِشْتْ نَفْسِىٚ نَاڤَگَرِينَه سَرْ فِطْرَتَا وِىٚ يَا كُو خُدِىٚ اَو لِسَرِىٚ خُلِقَانْدِيَه.

**٣٢.** نَبِنْ ژِ وَانِيْنْ كُو دِينِىَ خَوه ژِ هَڤْ پَارْچه كِرِنْ و بُونَه بَنْدُ و جِڤَاتْ كُو هَرْ هَڤْبَنْدِيَكْ بِيَا لِجَمْ خَوه دِلْشَادْ دبَه.

**٣٣.** دَمَا تَنْگَزَارِيَكْ بِسَرْ مِرُوْڤانْ دَه وَرَه، لِخُدَايِىَ خَوه ڤَدِگَرِنْ و لاڤَه لاڤِىَ ژِىَ دِكِنْ. پِشْتْرَه دَمَا كُو خُدِىَ ژِ جَمْ خَوه نِعْمَتَكِى بِوَانْ بِدَه تَعِمْكِرِنْ، تُو دِنِيْرِى كُو بَرَكْ ژِ وَانْ ژِ خُدَايِىَ خَوه رَه شَرِيكَانْ چِيْدِكِنْ.

**٣٤.** دَه بِلَا اَوْ لِبِوَارَا نِعْمَتِيْنْ كُو مَه دَانَه وَانْ نَانْكُوْرِيِىَ بِكِنْ و ڤِيْجَه بِلا خَوشْ بِژِينْ، پَاشِىَ اَوِىَ بِزَانِنْ (يَا بِىَ سَرِىَ وَانْ).

**٣٥.** يَانْ ژِى مَا مَه دَلِيلَكْ ژِ وَانْ رَه ئَانِيَه خَوارِىَ، كُو اَوْ دَلِيلْ ژِ وَانْ رَه ژِ يَا كُو اَوْ ژِ خُدِىَ رَه دِكِنَه شَرِيكْ خَبَرْ دِدَه؟!

**٣٦.** دَمَا اَمْ خَوشِيَكِىَ بِمِرُوْڤانْ بِدِنْ چِيْژَانْدِنْ ژِ سَرْ خَوه ڤَه دِچِنْ و اَگَرْ بِسَدَمَا يَا كُو دَسْتِيْنْ وَانْ كِرِيَه بَلايَكْ وَرَه سَرِىَ وَانْ دِچِهْ دَه اَوْ بِيْهِيْڤِى دِبِنْ.

**٣٧.** مَا اَوْ بِخَوه نَابِينِنْ كُو خُدِىَ كِىَ بِڤِىَ رِزْقِىَ وِى فِرَهْ دِكَه، كِىَ ژِى بِڤِىَ رِزْقِىَ وِى تَنْگْ دِكَه. بِرَاسْتِى دِڤِىَ دَه ژِ بُوْ جِڤَاتَكَه كُو بَاوَرْ بِكِنْ، دَرْسُ و عِبْرَتْ هَنَه.

**٣٨.** نَاخَوه تُو، مَافِىَ خِزمَانْ، بَلَنگَازَانْ و رِيْوِيَانْ بِدَه وَانْ. ژِ بُوْ يِيْنْ كُو لِرِزَايَا خُدِىَ بِگَرِنْ اَڤْ يَا هَرِى رِنْدَه. هَا اَوِنْ يِيْنْ كُو (لِدِنْيَا و ئَاخْرَتِىَ) سَرْفِرَازِنْ.

**٣٩.** اَوْ مَالِىَ كُو وَه (بِسَلَفْ) دَايَه خَلْكِىَ دَا كُو ژِ مَالِىَ وَانْ مَالِىَ وَه زِيْدَه بِبَه، ڤِيْجَه اَوْ لِجَمْ خُدِىَ قَتْ زِيْدَه نَابَه. اَوَا كُو وَه بِزَكَاتْ دَايَه كُو هُونْ بِوِىَ رِزَايَا خُدِىَ دِڤِيْنْ، ڤِيْجَه هَا اَوِنْ يِيْنْ كُو خِيْرَا وَانْ قَاتْ بِقَاتْ زِيْدَه دِبَه.

**٤٠.** خُدِىَ يَه يِىَ كُو هُونْ ئَافِرَانْدِنَه، پِشْتْرَه رِزْقِىَ وَه دَايَه، پِشْتْرَه اَوِىَ وَه بِمِرِينَه، پِشْتْرَه اَوِىَ وَه ڤَژِينَه. اَرِىَ مَا ژِ نَاڤْ وَانِيْنْ كُو هُونْ پَرَسْتِنَا وَانْ دِكِنْ يَكِى كُو بِكَارِبَه تِشْتَكِى ژِ ڤَانْ بِكَه هَيَه؟ خُدِىَ ژِ يَا كُو هُونْ دِكِنَه شَرِيكْ، پَاكْ و بِلِنْدَه.

٤١. ژ بَرْ گُنَهێنْ كُو مرُۆڤانْ بِدَسْتێنْ خَوه كِرِنْ، خَرَابِى لِبَژْ و بَحْرىَ خُيَا بُويَه، ڤێجَه خُدِىَ دِىَ هِنَكِى ژ يَا كُو كِرِنْ بِوَانْ بِدَه تَعِمْكِرِنْ، دَا كُو اَوْ (ژ كِرِنێنْ خَوه) ڤَگَرِنْ.

٤٢. بِبێژَه: لِسَرْ رُويىَ عَرْدِىَ بِگَرِنْ، دَ بِنێرِنْ كَا دُومَاهِيكَا وَانْ مِلَّتێنْ بَرِىَ كُو پِرێنْ وَانْ مُشْرِكْ بُونْ چَاوَا بُوْ يَه؟!

٤٣. ڤێجَه بَرِىَ خَوه بِدَه دِينِىَ رَاسْتُ و دُرِسْتْ، بَرِيَا رُوژَكَه وِسَا وَرِىَ كُو لِجَمْ خُدِىَ ژِىَ رَه ڤَگَرْ تُنَه يَه! وِىَ رُوْژِىَ (مرُۆڤْ) كُوْمْ بِكُوْمْ دِىَ ژ هَڤْ بِقَتِنْ.[1]

٤٤. چه كَسِىَ كَافِرْ بِبَه وَبَالِىَ كَافِرِيَا وِى ژِىَ رَه يَه و چه كَسِىَ كَارْ و بَارِێنْ قَنْجْ بِكَه اَوْ (لِبِهِشْتِىَ) جِهِىَ خَوه بَسْ ژ خَوه رَه ئَامَادَه دِكَه.

٤٥. (اَوْ ژ هَڤْ دِقَتِنْ) دَا كُو خُدِىَ وَانێنْ كُو بَاوَرِى ئَانِينْ و كَارِێنْ قَنْجْ كِرِنْ، ژ قَنْجِيَا خَوه خَلاتْ بِكَه. بێگُمَانْ خُدِىَ ژ كَافِرَانْ حَزْ نَاكَه.

٤٦. (گَلِى مرُۆڤانْ!) ژ نِيشَانێنْ (قُدْرَتَا خُدِىَ) يَه كُو بَايِىَ وَكْ مِزْگِينْبَرْ دِشِينَه، دَا كُو هِنَكِى ژ دِلُوڤَانِيَا خَوه بِوَه بِدَه تَعِمْكِرِنْ، دَا كُو كَشْتِى بِفَرْمَانَا وِى بِكِشِنْ، ژ بُوْ هُونْ ژ كَرَمَا وِى لِرِزْقِىَ خَوه بِگَرِنْ و دَا كُو هُونْ وِى بِشێكِرِينِنْ.

٤٧. (رَسُولِىَ مِنْ!) صُوْنْدْ بَه كُو مَه بَرِيَا تَه ژِى گَلَكْ پێخَمْبَرْ ژ گَلێنْ وَانْ رَه شَانْدِنْ، ڤێجَه اَوْ بِمُعْجِزَه و بَلْگَه ژ گَلِىَ خَوه رَه هَاتِنْ. اِيجَارْ مَه اَوێنْ كُو گُنَهْ كِرِنْ (بِهَلاكَا وَانْ) تُوْلْ لِوَانْ ڤَكِرْ و لِسَرْ مَه مِسُوگَرْ بُويَه كُو اَمْ بَاوَرْمَنْدَانْ بِسَرْ بِخِنْ.

---

١ مَه دِ ڤِىَ ئَايَتِىَ «يَصَّدَّعُونْ» بِـ « ژ هَڤْ دِقَتِنْ؛ دِبِنْ دُو جَلَبْ (كُو يَكْ ژ وَانْ جَنَّتِى و يَا دِنْ ژِى جَهَنَّمِى نَه)» مَعْنَى كِرِيَه. چِما؟ لَوْرَا ژ كِتێبَا خُدِىَ ئَايَتێنْ كُو دِلالَتِى سَرْ ڤِىَ مَعْنَايِىَ دِكِنْ هَنَه: ژ وَانْ ئَايَتَانْ؛ يَكْ: ژ ڤِى سُورَهيِى ئَايَتَا ١٤-١٦ىَ «رُوْژَا قِيَامَتْ رَادِبَه، وِىَ رُوْژِىَ (مُؤْمِنْ و كَافِرْ) ژ هَڤْ ڤَدِقَتِنْ. ڤێجَه هَرْچِى اَوێنْ كُو بَاوَرِى ئَانِينَه و كَارێنْ قَنْجِى كِرِنَه، اَو دِ نَاڤْ بَاخْچێێنْ بِهِشْتِىَ دَه تێنْ دِلْخَوشْكِرِنْ. هَرْچِى اَوێنْ كُو كَافِرْ بُونَه و وَانْ بِئَايَتێنْ مَه و بِرُوْژَا قِيَامَتِىَ بَاوَرِى نَئَانِينَه، ڤێجَه هَا اَوْ دِ عَذَابْ دَه تێنَه كُومْكِرِنْ» و ژ سُورَهيِىَ شُورَا ئَايَتَا ٧ىَ «وِىَ رُوْژِىَ، هِنْ دِ بِهِشْتِىَ دَه نَه هِنْ ژِى دِ ئَاگِرِىَ بِپێتْ دَنَه».

٤٨. خُدىٚ يه، اَوىٚ كُو بَايىٚ دِشينَه، ڤێجه اَوْ بَا عَوْرَانْ رَادِكه و دِلِڤينَه. اَوْ چَاوَا بِڤىٚ وِسَا لِئَاسِيمَانَانْ بَلاڤْ دِكه، وَانْ پَارْچه پَارْچه دِگَرينَه؛ اِيْدى تُو دِبينى كُو وَا يه بَارَانْ ژِ نَاڤَا وَانْ دِبَارَه. ڤێجه دَمَا خُدىٚ ژِ بَنْدَييێنْ خَوه كِىٚ بِڤىٚ بَارَانىٚ لِىٚ بِبَارينَه، دِجهْ دَه كَيْفْخَوشْ دِبِنْ...

٤٩. چَنْدِى كُو اَوْ، بَرِيَا بَارَانْ لِسَرْ وَانْ بِبَارَه بێهێڤِى ژِى بُوبُونْ.

٥٠. ڤێجه دَه لِبَرْهَمێنْ رَحْمَا خُدىٚ بِنێرَه؛ پِشْتِى مِرِنَا (هِشْكْبُونَا) عَرْدِىٚ كَا چَاوَا وِىٚ ڤَدِژِينَه؟ بێگُمَانْ اَوىٚ كُو عَرْدِىٚ سَاغْ دِكَه تَقَزْ يىٚ مِرِى ژِى سَاغْ دِكَه. بێگُمَانْ اَوْ لِسَرْ هَرْ تِشْتِى قَادِرَه.

٥١. صُوْنْدْ به، اَگَرْ كُو اَمْ بَايَكِى (بِسَرْ چَانْدِنيَا وَانْ دَه) بِشينِنْ و اَوْ ژِى چَانْدِنيَا خَوه زَرْبُويِى بِبينِنْ، پِشْتِى وِىٚ زَرْبُونىٚ تَقَزْ دِىٚ نَانْكُوْرِيىٚ بِكِنْ.

٥٢. بێگُمَانْ تُو نِكَارى گُوتِنَا خَوه بِدِلْمِريَانْ بِدِى بِهيسْتِنْ و تُو دُوْزَا خَوه نِكَارِى بِيێنْ كَرْ بِدِى بِهيسْتِنْ دَمَا پِشْتَا خَوه بِدِنْ تَه و ژِ تَه بِرَڤِنْ.

٥٣. تُو نِكَارِى دِلْكُورَانْ ژِى ژِ رێشَاشِيَا وَانْ ڤَگَرێنى سَرْ رِيَا رَاسْتْ. بَسْ تُو دِكَارِى (دُوْزَا خَوه) بِگِهينى وَانێنْ كُو بَاوَرِى بِئَايَتێنْ مَه تينِنْ، ڤێجه اَوْ ژِ فَرْمَانَا مَه رَه بَرْدَسْتِنْ.

٥٤. خُدىٚ يه، اَوىٚ كُو هُونْ لَوَازْ ئَافِرَانْدِنَه، پِشْتِى لَوَازِيىٚ هُونْ بِهێزْ و خُرْتْ كِرِنَه، پِشْتِى خُرْتِيىٚ هُونْ لاوَازْ و كَالْ كِرِنْ. خُدىٚ چه بِڤىٚ وِىٚ دِخُلقينَه. اَوَه يىٚ عَليمْ يىٚ قَديرْ.

٥٥. رُوْژَا كُو قِيَامَتْ رَادِبَه، گُنَهْكَارْ صُوْنْدْ دِخُونْ كُو اَوْ ژِ دَمَكه پِرْ كِنْ پِىٚ ڤَه (لِدِنْيَايىٚ) نَمَانَه. هَا وَانْ (لِدِنْيَايىٚ) وِسَا بَرِىٚ خَوه (ژِ حَقِيىٚ) ڤَدِگَرَانْدِنْ.

٥٦. اَوێنْ كُو زَئَانينْ و اِيمَانْ ژِ وَانْ رَه هَاتِيَه دَاينْ (ژِ وَانْ مُنْكِرَانْ رَه) گُوتِنْ: صُوْنْدْ به؛ لِگُورِى نِڤيسَا خُدىٚ هُونْ حَتَا رُوْژَا ڤَژينىٚ مَانْ. ڤێجه هَا اَڤْ رُوْژْ رُوْژَا قِيَامَتىٚ يه، لێبَلِىٚ وَه نَدِزَانى.

٥٧. اِيْدِى وِىَ رُوْژِىَ لِيْبُورِينْخَوسْتِنَا وَانِيْنْ كُو ظَالِمِنْ تُو كَارِى نَادَه وَانْ و ژِ وَانْ نَايِىَ خَوهسْتِنْ كُو اَوْ خُدِىَ ژِى ژِ خَوه رَازِى بِكِنْ.

٥٨. صُوْنْدْ بَه؛ مَه دِقِىَ قُرْئَانِىَ دَه ژِ بُوْ مِرُوْڤَانْ هَرْ تَخْلِيتْ مِينَاكْ اَشْكَرَا كِرِنَه. (رَسُولِىَ مِنْ!) بِصُوْنْدْ؛ اَگَرْ تُو ژِ وَانْ رَه مُعْجِزَيكِىَ ژِى بِينِى تَقَزْ اَوِيْنْ كَافِرْبُونَه دِىَ بِبِيْژِنْ: هُونْ تَنِىَ پُوچِيِىَ ژِ بُوْ مَه تِينِنْ.

٥٩. بِڤِى ئَاوَايِى خُدِىَ مُوْرِىَ لِسَرْ دِلِيْنْ وَانِيْنْ نَزَانْ دِخَه.

٦٠. ڤِيْجَه تُو صَبْرِىَ بِكِيْشَه، لَوْرَا پِيْمَانَا خُدِىَ حَقَه. زِنْهَارْ بِلا اَوِيْنْ كُو (بِقِيَامَتِىَ) ژِ دِلْ بَاوَرِى نَايْينِنْ تَه سِسْتْ و بِيْتَبَاتْ مَكِنْ!

## ٣١. سُورَه يىَ لُقْمَانْ

سُورَه‌يىَ (لُقْمَانْ) ، ٣٤ (سِهْ و چَارْ) ئَايَتَه. ژِ ئَايَتِينْ ٢٧’اَمْ، ٢٨’اَمْ و ٢٩’اَمْ پِى ڤَه تَڤْ لِمَكِّىَ دَاكَتِنَه. ژِ بَرْ كُو تِىَ دَه قِصَيا لُقْمَانِىَ حَكِيمْ هَاتِيَه رَاگِهَانْدِنْ، ژِىَ رَه سُورَه‌يِىَ لُقْمَانْ هَاتِيَه گُوتِنْ.

بِنَاڤِىَ خُدَايِىَ كُو رَحْمٰنَ رَحِيمَ

١. اَلِفْ، لامْ، مِيمْ.

٢. هَا اَڤْ، ئَايَتِيْنْ كِتِيبَا خُدَانْحِكْمَتَه.

٣. اَوْ، ژِ بُوْ مِرُوْڤِيْنْ قَنْجِيكَارْ رِيْبَرْ و رَحْمَتَه..

٤. اَوِيْنْ كُو بَئَاوَايِىَ پِيْدِڤِى نِمِيْژْ دِكِنْ، زَكَاتَا مَالِىَ خَوه دِدِنْ و ژِ قِنْيَاتَا دِلِىَ خَوه بِئَاخْرَتِىَ بَاوَرِى تِينِنْ..

٥. هَا اَوْ لِسَرْ هِيدَئَايَتَكَه ژِ جَمْ خُدَايِىَ خَوه ڤَه نَه و هَا اَوِيْنْ كُو (لِدِنْيَايِىَ و ئَاخِرَتِىَ) سَرْفِرَازْ و رِزْگَارْ بُونَه.

٦. هِنْ ژ اِنْسَانَانْ هَنَه كُو گُوتِنَا كَلَقَاژِى و پُوچْ دِكِرِنْ دَا كُو بىَزَئَانِينْ مِرُوٚڤَانْ ژ رِيَا خُدِىٚ دَرْخِنْ و وِىٚ ژ خَوه رَه بِكِنْ طِنَازُوكْ. هَا اَوْ، عَذَابِىٚ رِسْواكَرْ هَرْ ژ وَانْ رَه يَه.

٧. دَمَا كُو ئَايَتێِنْ مَه ژِىٚ رَه تێِنْ خَونْدِنْ، ژ پُوزْبِلِنْدِيَا خَوه پِشْتَا خَوه دِدَه وَانْ، هَرْ وَكِى كُو وِى اَوْ نَه بِهِيسْتِبِنْ و هَرْ وَكِى كُو دِگُهێِنْ وِى دَه كَرِيتِى هَبَه. ڤێِجَه تُو مِزْگِينِيَا عَذَابَكِى جَانْسُوژْ بِدِيِىٚ!

٨. بێِگُمَانْ اَوێِنْ كُو بَاوَرِى ئَانِينْ و كَارێِنْ قَنْجْ كِرِنَه، ژ وَانْ رَه بِهِشْتێِنْ خَودِينِعْمَتْ هَنَه.

٩. اَوْ هَرْ و هَرْ تِىٚ دَه مَايِينْدَه نَه، اَڤْ سُوزَا خُدِىٚ يَه كُو تِىٚ دَه گُمَانْ تُنَه يَه و هَرْ اَوَه، يىٚ دَسْتْهِلاتْ، يىٚ كَارْبِنَجِهْ.

١٠. خُدَا اَڤْ ئَاسِيمَانِىٚ كُو هُونْ دِبِينِنْ، بىٚ سْتُونْ ئَافِرَانْدِيَه. چِيَايێِنْ ئَاصِىٚ و مِكُوٚمْ دِعَرْدِىٚ دَه دَئَانِينَه دَا كُو وَه نَهَژِينَه. هَرْ تَخْلِيتْ حَيوَانْ تِىٚ دَه ئَافِرَانْدِنَه و ژ هَڤْ زێِدَه كِرِنَه. مَه ژ عَورَانْ ئَاڤَكْ بَارَانْدِيَه، ڤێِجَه اَمْ تِىٚ دَه هَرْ تَخْلِيتْ گِيَايێِنْ بِفَيْدَه هێِشِينْ دِكِنْ.

١١. هَا اَڤْ تَڤْ مَخْلُوقێِنْ خُدِىٚ نَه. ڤێِجَه دَه كَا نِيشَانِى مِنْ بِدِنْ؛ اَوێِنْ كُو ژ بِلِى خُدِىٚ وَه اَوْ دِهَجَبَانْدِنْ كَا چِه ئَافِرَانْدِنَه؟ نَا، بَلْكِى يێِنْ سِتَمْكَارْ هَرْ دِرێِشَاشِيَكَه اَشْكَرَا دَه نَه.

١٢. صُوٚنْدْ بَه، بِرَاسْتِى مَه حِكْمَتْ دَا لُقْمَانْ؛ كُو شێِكِرِيَا خُدَايِىٚ خَوه بِكَه. چِه كَسِىٚ شێِكِرِيَا خُدِىٚ بِكَه اَوْ ژ بُوٚ خَوه دِكَه و كِى ژِى نَانْكُوٚرِيِىٚ بِكَه بِلا بِزَانَه كُو بێِگُمَانْ خُدِىٚ دَوْلَمَنْدَه، هێِژَايِىٚ پَسِنْدَايِينِىٚ يَه.

١٣. وِىٚ دَمِىٚ لُقْمَانْ شِيرَتْ لِكُرِىٚ خَوه كِرْ و ژِىٚ رَه گُوتْ: كُرْكِىٚ مِنُو! ژ خُدِىٚ رَه شَرِيكَانْ چێِنَكَه! بێِگُمَانْ شَرِيكْچێِكِرِنْ هَرْ ظُلْمَكَه مَزِنَه.

١٤. مَه ژ بُوٚ دِىٚ و بَاڤَانْ فَرْمَانْ لِمِرُوٚڤَانْ كِرْ -كُو دَايِيكَا وِى بِزُورْ و زَحْمَتِى اَوْ هِلْگِرْتِيَه

وِ دِ دُو صَالاَنْ دَه بِشِیرْ ڤَکِرِیَه-؛ کُو شِیْکِرِیَا مِنْ و شِیْکِرِیَا دِیێ و بَاڤِیْنْ خَوه بِکِنْ. ڤَگَرْ، تَنِیێ بِبَالْ مِنْ ڤَه یَه.

١٥. اَگَرْ دِیێ و بَاڤْ، بِتَه رَه تِیِبکُوشِنْ دَا کُو یَا تُو پِیێ نِزَانِی ژِ مِنْ رَه بِکِی شَرِیكْ، وِیێ چَاخِیێ بِگُوتِنَا وَانْ مَکَه! (لِبَیلِیێ دِیسَا ژِی) لِدِنْیَایِیێ بِوَانْ رَه خَوشْ دَرْبَاسْ بِکَه و بِدَه دُوڤْ رِیَا کَسِیێ کُو بِبَالْ مِنْ ڤَه تُوبَه کِرِیَه. پَاشِیێ ڤَگَرَا وَه بَسْ بِبَالْ مِنْ ڤَه یَه. وِیێ چَاخِیێ یَا کُو وَه دِکِرْ اَزِیێ وَه پِیێ ئَاگَاهْدَارْ بِکِمْ.

١٦. (لُقْمَانْ گُوتْ) کُرْکِیێ مِنُو! اَوْ تِشْتِیێ کُو تُو بِکِی (چِه خِیْرْ بَه چِه ژِی گُنَهْ) چَنْدِی بِقَاسِی گِرَانِیَا لِبَکَه خَردَلِیێ بَه و دِنَاڤَا زِنَارَکِی دَه بَه ژِی، یَانْ لِئَاسِیمَانَانْ بَه یَانْ ژِی لِعَرْدِیێ بَه، دِیسَا خُدِیێ دِیێ وِیێ بِینَه (پِیْشْبَرِی تَه و حَسَابِیێ وِیێ ژِ تَه بِپِرْسَه). بِیْگُمَانْ خُدِیێ، لُطْفْکَارَه، ئَاگَاهْدَارَه.

١٧. کُرْکِیێ مِنُو! بِئَاوَایِیێ پِیْدِڤِی نِمِیْژْ بِکَه، بِیَا قَنْجْ فَرْمَانْ بِکَه، ژِ یَا نَقَنْجْ پَاشْ ڤَه بِدَه و لِهَمْبَرِی (بَلا)یَا کُو وَرَه سَرِیێ تَه، خَوه رَاگِرَه. بِیْگُمَانْ اَڤْ ژِ کَارِیْنْ لازِمْ و پِیْدِڤِی نَه.

١٨. ژِ چَاڤْسُوْرِی بَرِیێ خَوه ژِ مِرُوْڤَانْ ڤَنَگَرِینَه و بِڤُرَّتِی لِسَرْ عَرْدِیێ نَمَشَه. بِیْگُمَانْ خُدِیێ، ژِ تُو ڤُرَیِیێ خَومَزِنْدِیْرْ حَزْ نَاکَه.

١٩. دِرِیْڤَچُونَا خَوه دَه ئَاسَایِی بَه. دَنْگِیێ خَوه نِزْمْ بِکَه. بِیْگُمَانْ دَنْگِیێ هَرِی کِرِیْتْ دَنْگِیێ کَرِیێ یَه.[1]

٢٠. (گَلِی مِرُوْڤَانْ!) مَا هُونْ نَابِینِنْ کُو خُدِیێ لِعَرْدِیێ و تِشْتِیْنْ لِئَاسِیمَانَانْ هَنَه ژِ بُو وَه

---

١ دِ رِیْڤَچُونَا خَوه دَه اَسَایِی بَه: ژِ سُورَهیێ فُرْقَانْ ئَایَتَا ٦٣یێ «بَنْدَیِیْنْ رَحْمَئَانِی، اَو یِنْ کُو لِسَرْ عَرْدِیێ بَنَفْسْبِچوکِی بِرِیێ ڤَه دِچِنْ و دَمَا کُو مِرُوْڤِیْنْ نَزَانْ ژِ وَانْ رَه پَیْڤِیْنْ نَه لِرِیێ دِبِیْژِنْ (ژِ وَانْ رَه دِبِیْژِنْ) سِلاڤْ لِوَه بَه (و ژِ وَانْ دَرْبَاسْ دِبِنْ)» و ژِ نَفْسَا ڤِی سُورَهیِی ئَایَتَا ١٨یێ «ژِ پِوزْبِلِنْدِی بَرِیێ خَوه ژِ مِرُوڤَانْ ڤَنَگَرِینَه و بِڤُرَّتِی لِسَرْ عَرْدِیێ نَمَشَه. بِیْگُمَانْ خُدِیێ، ژِ تُو ڤُرَیِیێ خَومَزِنْدِیْرْ حَزْ نَاکَه» ڤِیێ هَڤُوکِیێ زَلاَلْ و رُوْنَاكْ دِکِنْ.

ستُوخَوارْ کِرِنَه و نِعْمَتێنْ خَوه یێنْ خُیَایی و نَخُیَایی لِسَرْ وَه رَشَانْدِنَه. ژ مرُوْڤانْ هِنْ هَنَه کُو بێ زَئَانینْ، بێ رِێبَرْ و بێ بَلْگَیَکه رُونْکَرْ دَرْ بَارێ خُدِێ دَه خِرَه جِرْ و زِمَانْدرِێژییێ دِکِنْ.

٢١. دَمَا ژ وَانْ رَه بێ گُوتِنْ: بدِنْ پَیْ وَحْیَا کُو خُدِێ اَوْ هِنَارْتِیَه، دبێژِنْ: نَخێرْ، بَلْکی اَمِێ بدِنْ پَیْ یَا کُو مَه بَاڤَانێنْ خَوه لِسَرِێ دیتیَه. اَرِێ مَا کُو شَیْطَانْ وَانْ گَازی بَالْ ئَاگِرِێ بِپێتْ ڤَه ژی بکَه (اَوِێ بدِنْ پَیْ وِی)؟[1]

٢٢. کِی کُو خَوه بسپێرَه خُدِێ و رَاسْتُ و دُرِسْتْ بَه، ڤێجَه بِرَاسْتِی وِی خَوه بِقُلْپَا سَاغْلَمْ گِرْتیَه و اَنْجَامَا کَارْ و بَارَانْ هَرْ بِبَالْ خُدِێ ڤَه یَه.

٢٣. چه کَسِێ کُو کَافِرْ بِبَه، بلا کَافِرِیَا وِی تَه غَمْگینْ مَکَه! ڤَگَرَا وَانْ تَنِێ بِبَالْ مَه ڤَه یَه، ڤێجَه اَمِێ یَا کُو وَانْ کِرِیَه ژ وَانْ رَه بِبێژِنْ. بێگُمَانْ خُدِێ بِیَا دِدِلانْ دَه دِزَانَه.

٢٤. اَمْ (لِڤِێ دِنْیَایِێ) هِنْدِکی وَانْ دِچێژِینِنْ، پِشْتْرَه اَمِێ وَانْ بَاژُوْنَه بَرْ بِعَذَابَکی گِرَانْ و دِژْوارْ ڤَه.

٢٥. صُوْنْدْ بَه، اَگَرْ تُو ژ وَانْ بپِرْسِی کِێ عَرْدُ و ئَاسِیمَانْ ئَافِرَانْدِنَه؟ تَقَزْ دێ بِبێژِنْ، خُدِێ یَه. (لِسَرْ ڤِێ اِڤْرَارَا مُشْرِکَانْ کُو نَاچَارْ مَانَه) بِبێژَه: حَمْدْ ژ خُدِێ رَه بَه. دَڤْ ژ ڤِێ ژی بَرْدَه؛ پرِێنْ وَانْ نزَانِنْ (کَااَوْ چه دِبێژِنْ).

٢٦. هَرْ تِشْتێنْ کُو لِعَرْدُ و ئَاسِیمَانَانْ هَنَه اَوْ تَڤْ یێنْ خُدِێ نَه. بێگُمَانْ خُدِێ، دَوْلَمَنْدَه، هێژَایِێ پَسِنْدَایینێ یَه.

٢٧. اَگَرْ بِرَاسْتِی چِڤَاسْ دَارێنْ لِعَرْدِێ هَنَه قَلَمْ بِنْ، دَرْیَا و بِڤَاسِی وِێ حَفْتْ دَرْیَایێنْ دِنْ

---

[1] اَرِێ مَا کُو شَیْطَانْ وَانْ گَازی بَالْ ئَاگِرِێ بِپێتْ ڤَه ژی بکَه (اَوِێ بدِنْ پَیْ وِی)؟ ژ سُورَهیِێ حَجْ ئَایَتَا ٤ێ ڤِی جُمْلَیِێ بَرْفَرَهی بَیَانْ دکَه: «حُکمْ لِسَرْ شَیْطَێنْ هَاتیَه دَایینْ؛ چه کَسِێ کُو وِی ژ خَوه رَه بکَه دُوْسْتْ و ئَارِیکَارْ، مُحَقَقْ اَوِێ رِیَا رَاسْتْ لِبَرْ وِنْدَا بکَه و اَوِێ بَرِێ وِی بدَه رِیَا ئَاگِرِێ بِپێتْ».

ژِی حِبْرَا وَانْ بِنْ، (ڤێجه گُوتِنێنْ خُدیٚ بِوَانْ بِنِڤِیسِنْ) گُوتِنێنْ خُدیٚ دِیٚ خَلاصْ نَبِنْ. بێگُمَانْ خُدیٚ عَزِیزَه، حَکِیمَه.

٢٨. (گَلِی مِرُۆڤانْ!) ئَافِرَانْدِنَا وَه و سَاغْکِرِنَا وَه تَڤْکَانْ لِجَمْ خُدیٚ وَکِی ئَافِرَانْدِنْ و سَاغْکِرِنَا یَکْ مِرُۆڤَکِیَه. بێگُمَانْ خُدیٚ بِهِیزَرَه، بِینَرَه.

٢٩. مَا تُو نِزَانِی کُو خُدیٚ شَڤِیٚ دِخَه سَرْ رُۆژِیٚ و رُۆژِیٚ ژِی دِخَه سَرْ شَڤِیٚ، رُۆژْ و هَیْڤْ ژِ فَرْمَانَا خوه رَه سْتُوخَوارْ کِرِنَه و اَڤْ تَڤْ حَیَا دَمَکَه نَاڤْلێکِرِی دِگَرِنْ. بێگُمَانْ خُدیٚ ژِ یَا کُو هُونْ دِکِنْ، ئَاگَاهْدَارَه.

٣٠. اَڤْ رَوْشْ، ژِ بُۆ کُو هُونْ بِزَانِنْ و اِقْرَارْ بِکِنْ کُو خُدیٚ هَرْ حَقَه و بِرَاسْتِی اَوێنْ کُو ژِ بِلِی خُدیٚ تِێنْ حَبَانْدِنْ هَرْ بَاطِلْ و پُوچِنْ و بێگُمَانْ الله، اَوْ بِلِنْدَه، مَزِنَه.

٣١. مَا تُو نَابِینِی کُو کَشْتِی بِکَرَمَا خُدیٚ دِبَحْرِیٚ دَه دِکِشِنْ دَا کُو هِنَکْ ژِ نِیشَانێنْ قُدْرَتَا خَوه نِیشَانِی وَه بِدَه. بێگُمَانْ دِڤِیٚ دَه، ژِ بُۆ هَرْ کَسِیٚ زێدَه خَورَاگِرْ و سِپَاسْدَارْ دَرْسُ و نِیشَانْ هَنَه.

٣٢. دَمَا پێلێنْ بَحْرِیٚ یێنْ مِینَا چِیَانْ لِوَانْ هَاتِنْ هَڤْ، پێرَه پێرَه ژِ دِلَکِی خَالِصْ لِبَرْ خُدیٚ دِگَرِنْ. گَاڤَا کُو خُدیٚ اَوْ دَرَانِینَه بَژِیٚ و رِزْگَارْ کِرِنْ، ڤێجه هِنْ ژِ وَانْ کێمْ دِشێکِرێنِنْ. ژِ بِلِی یىٚ غَدَّارِیٚ نَانْکُۆرْ کَسْ ئَایَتێنْ مَه مَانْدَلَه نَاکَه.

٣٣. گَلِی مِرُۆڤانْ! هَایْ ژِ فَرْمَانێنْ پَرْوَرْدَگَارِیٚ خَوه هَبِنْ و ژِ رُوژَکَه وِسَا بِتِرْسِنْ کُو تُو بَاڤْ دِ بَرْ زَارُوکێنْ خَوه دَه تِشْتَکِی نَاکَه و تُو زَارُوکْ ژِی دِ بَرْ بَاڤِیٚ خَوه دَ تِشْتَکِی نَاکَه. بێگُمَانْ سُۆزَا کُو خُدیٚ دَایَه حَقَه. زِنْهَارْ بِلا ژِیَانَا جِیهَانِیٚ وَه نَخَاپِینَه و بِلا شَیْطَانِیٚ خَاپِینُوکْ ژِی وَه نَخَاپِینَه!

٣٤. بِرَاسْتِی زَانِینَا رَابُونَا قِیَامَتِیٚ لِجَمْ خُدیٚ یَه و بَارَانِیٚ اَوْ دِبَارِینَه، یَا کُو دِمَالْزَارُوکَانْ

دَه یَه ژی اَوْ پێ دِزَانَه، قَتْ تُو کَسْ نِزَانَه کَا سِبَهێ اَوێ چه قَزَنْج بِکَه و تُو کَسْ نِزَانَه اَوێ لِکیژَانْ عَرْدێ بِمِرَه. بێگُمَانْ خُدێ زَانَا و ئَاگَاهْدَارَه.[١]

## ٣٢. سُورَه یێ سَجْدَه

سُورَه‌یێ (سَجْدَه) ٣٠ (سِهْ) ئَایَتَه. لِمَکِّیێ نَازِلْ بُویَه . نَاڤێ وی ژ ئَایَتَا ١٥اَمْ تێ کُو تێ دَه خُدێ پَسْنێ بَاوَرْمَنْدَانْ دِدَه؛ دَمَا کُو ئَایَتێنْ قُرْئَانَا مَزِنْ دِبِهیزِنْ دِچِنْ سِجُودێ.

**بِنَاڤێ خُدَایێ کُو رَحْمٰنَ رَحِیمَ**

١. اَلِفْ، لامْ، مِیمْ.

٢. نَازِلْبُونَا کِتێبێ -کُو تێ دَه گُمَانْ نِینَه. ژ طَرَفێ پَرْوَرْدَگَارێ عَالَمێ ڤَه یَه.

٣. بَلْکِی اَوْ دِبێژِنْ وی اَوْ ژ جَمْ خَوه لێئَانیَه. نَخێرْ، بَلْکِی اَوْ حَقْ بِخَوه یَه، ژ جَمْ رَبِّێ تَه یَه، ژ بُو کُو تُو پێ مِلَّتَکِی هِشْیَارْ بِکِی کُو بَرِیَا تَه تُو هِشْیَارْکَرْ ژ وَانْ رَه نَهَاتِنَه، دَا کُو اَوْ بِێنَه سَرْ رِیَا رَاسْتْ.

٤. اَلله، اَوێ کُو عَرْدُ و ئَاسِیمَانْ و یێنْ کُو دِنَاڤْبَرَا وَانْ دَه هَنَه دِشَشْ رُوْژَا نْ دَه

---

١ اَڤْ ئَایَتَا پیرُوزْ تَفْسِیرَا ئَایَتَا ٥٩ێ ژ سُورَه‌یێ اَنْعَامَه؛ «کِلِیتێنْ جیهَانَا نَبَنْدی هَرْ لِجَمْ خُدێ نَه، ژ وی پێڤَه کَسْ بِوَانْ نِزَانَه ...» بَلێ، زَئَانِینَا بِغَیْبێ تَرْخَانێ بِخُدێ ڤَه یَه. ژ وی پێڤَه تُو کَسْ؛ چه مَلائِیکَتْ، چه جِنْ و چه اِنْسْ کَسْ پێ نِزَانَه. ژ اِنْسَانَانْ ژی، چه پێخَمْبَرْ، چه وَلِی و چه عَالِمْ بَه دِیسَا کَسْ پێ نِزَانَه. د ڤێ دَرْبَارێ دَه: خُدێ لِپێخَمْبَرێ خَوه فَرْمَانْ دِکَه کُو ژ اُمَّتَا خَوه رَه بِبێژَه: «بِبێژَه: اَزْ ژ وَه رَه نَابێژِمْ کُو خَزِینَیێنْ خُدێ لِجَمْ مِنِنْ، اَزْ بِغَیْبێ ژی نِزَانِمْ و اَزْ ژ وَه رَه نَابێژِمْ کُو اَزْ مَلَائِیکَتِمْ. بَسْ اَزْ دِدمَه پَیْ ئَاکُو ژ مِنْ رَه تێتَه وَحیکِرِنْ.» اَنعَامْ: ٥٠. لِێ بَلێ خُدێ اَگَرْ بِڤێ هِنَکی ژ غَیْبێ بِبَنْدیێ خَوه یێ اَوْ بِڤێ دِدَه اگَاهْدَارْکِرِنْ. مِینَاكْ: «خُدێ وَه بِسَرْ غَیْبێ ڤَه نَاکَه ژ بِلی یێ کُو ژ رَسُولێنْ خَوه اَو بِڤێ. الِ عِمْرَانْ:١٧٩ و ژ سُورَه‌یێ جِنْ ئَایَتَا ٢٦-٢٧ێ دَه ژی، «خُدێ زَانَایێ بِغَیْبێ یَه. اَوْ، ژ بِلی ژ رَسُولانْ یێ بِڤێ کَسِی بِسَرْ غَیْبَا خَوه ڤَه نَاکَه.» ڤێجَه چِقَاسْ خَبَرْدَانَا ژ غَیْبێ اَگَرْ کُو نَه بِرِیێَا وَحْیێ بَه اَوْ ژِرێکَتِنَه.

ئَافِرَانْدِنَه و پَاشێ لِسَرْ عَرْشْ رَاسَرْ بُويَه، ژ وی پێ ڤَه ژ بُۆ وَه تُو ئَارِيكَارْ و مَهْدَرْڤَانْ تُنِنْ. اَرێ مَا هِێ ژی هُونْ ئَاقِلْ نَاگِرِنْ؟

٥. خُدێ، ژ ئَاسْمێنْ حَيَانِی عَرْدِێ هَمُو كَارْ و بَارِی بِرێ ڤَه دِبَه. پَاشێ (اَوْ كَارْ و بَارْ) دِرُوژَكێ دَه بِبَالێ ڤَه بِلِنْدْ دِبِنْ كُو اَوْ رُۆژْ بِقَاسِی هَزَارْ صَالِی يَه ژِ رُۆژێنْ كُو هُونْ دِژمێرِنْ.

٦. هَا اَوْ، زَانَايێ يَا نَپێنْدِی و دَارِيچَاڤَه، يێ دَسْتهِلاتێ دِلُوڤِينَه.

٧. اَوْ خُدَايێ كُو هَرْ تِشْتْ مِكُوۆمْ چێكِرِيَه و دِسَرِێ پێشِينْ دَه اِنْسَانْ ژِ حَرِيێ ئَافِرَانْدِيَه.

٨. پِشْتْرَه زُرِيتَا اِنْسێنْ ژِ دِلُوپَكْ ئَاڤَا لاَوَازْ چێكِرِيَه.

٩. پِشْتْرَه دِرُوڤْ دَايێ؛ دُرِسْتْ كِرْ و ژِ رِحێ كُو مَخْلُوقێ وی يَه پِڤْ كِرِيێ و ژِ وَه رَه گُهْ، چَاڤْ و دِلْ چێكِرِنْ. هُونْ خُدَايێ خَوه چِقَاسْ هِنْدِكْ دِشێكِرِينِنْ!

١٠. اَوْ دِبێژِنْ: اَرێ مَا چَاخێ اَمْ دِنَاڤْ ئَاخێ دَه وِنْدَا بِبِنْ، اَرێ مَا دِيسَا اَمێ ژِ نُو ڤَه بێنَه خُلْقَانْدِنْ؟ نَخێرْ، بَلْكِی اَوْ چُونَا حِزُورَا خُدَايێ خَوه اِنْكَارْ دِكِنْ.

١١. (رَسُولێ مِنْ! ژِ وَانْ رَه) بِبێژَه: مَلَكێ مِرِنێ يێ كُو بُويَه كَارْسِپَارێ (سِتَانْدِنَا) رُوحێ وَه دێ وَه بِمِرِينَه، پَاشێ هُونێ لِخُدَايێ خَوه بێنَه ڤَگَرَانْدِنْ.

١٢. اَگَرْ، دَمَا گُنَهْكَارْ لِبَرْ خُدَايێ خَوه سَرْطَوَانْدِی (كُو دِبێژِنْ) خُدَايێ مَه! مَه دِيتْ و مَه بِهِيسْتْ، ڤێجَه مَه ڤَگَرِينَه (دِنْيَايێ) دَا كُو اَمْ كَارِێنْ قَنْجْ بِكِنْ و بێگُمَانْ اَمْ ژِ دِلْ بَاوَری تِينِنْ، تَه بِدِيتَا (تَه يێ دِيمَنَكِی عَجِێبْ بِدِيتَا).

١٣. اَگَرْ مَه بِڤْيَا؛ مَه دێ هِيدَئَايَتْ بِدَايَا هَرْ كَسِی. لێبَلِێ گُوتِنَا «صُۆنْدْ بَه؛ كُو اَزێ جَهَنَمێ ژِ تَڤْكێ (گُنَهْكَارْ و كَافِرێنْ) جِنْ و اِنْسَا دَاگِرِمْ» مِسُوگَرْ بُۆ.

١٤. (دَمَا كُو كَافِرْ دِچِنْ دُوژَهێ دَرْگَهْڤَانْ ژِ وَانْ رَه وِهَا دِبێژِنْ): بِسَدَمَا كُو هُونْ ژِ ڤێ

رُوْژِیَ غَافِلْ مَانْ، دَه ڤِیْجَه عَذَابْ بِچِیْژِنْ. بِرَاسْتِی اَمْ ژِی وَه دِعَذَابْ دَه دِهِیْلِنْ. دَه هَایْدِیَ بِسَدَمَا کِرِنیْنْ خوه عَذَابِیَ هَرْ و هَرِی بِچِیْژِنْ!

١٥. بِیْگُمَانْ بَسْ اَوْ کَسْ بَاوَرِی بِئَایَتیْنْ مَه تِینِنْ؛ اَویْنْ کُو دَمَا بِوَانْ ئَایَتَانْ شِیرَتْ لِوَانْ بیْنَه کِرِنْ دِچِنْ سِجُودِیَ و دِگَلْ حَمْدِیَ وِی خُدَایِیَ خَوه ژِ هَرْ کِیْمَاسِیِیَ پَاكْ دِدیْرِنْ و خَوه قُرَه ژِی نَاکِنْ..[1]

١٦. اَویْنْ کُو طَنِشْتیْنْ وَانْ ژِ نِڤِینیْنْ وَانْ دُورِنْ. بِطِرْسُ و بِهِیْڤِی لِبَرْ خُدَایِیَ خَوه دِگَرِنْ و ژِ رِزْقِیَ کُو مَه دَایَه وَانْ ژِی (دِرِیَا خُدِیَ دَه) خَرْجْ دِکِنْ.

١٧. ڤِیْجَه تُو کَسْ نِزَانَه کَا خُدِیَ ژِ بُوْ بَاوَرْمَنْدَانْ، بِسَدَمَا یَا کُو کِرِنْ، ژِ وَانْ تِشْتیْنْ کُو چَاڤْ پِیَ رُونِی دِبِنْ، چِه پَادَاشْ هِلاَنْدِیَه.

١٨. اَرِیَ مَا کَسِیَ کُو بَاوَرْمَنْدْ بَه مِینَا کَسِیَ ژِرِیْدَرْکَتِی یَه؟ تَقِزْ اَوْ نَه مِینَا هَڤِنْ.

١٩. حَچِی یِیْنْ کُو بَاوَرِی ئَانِینْ و عَمَلِیَ قَنْجْ کِرِنْ، ڤِیْجَه ژِ وَانْ رَه بِسَدَمَا عَمَلِیَ کُو کِرِنْ بِهِشْتیْنْ لِیْمَایِینِیَ هَنَه.

٢٠. لِیْبَلِیَ حَچِی یِیْنْ کُو ژِ رِیَ دَرْکَتِنَه، جِهِیَ وَانْ ئَاگِرَه. چِه دَمَا کُو اَوْ بِخَوازِنْ ژِیَ دَرْکَڤِنْ بِپَاشْ ڤَه تیْنَه ڤَگَرَانْدِنْ. ژِ وَانْ رَه تِیَ گُوتِنْ: دَه هَایْدِیَ عَذَابِیَ اِیْگِرْ اَوِیَ کُو وَه بَاوَرِی پِیَ نَدِئَانِی، بِچِیْژِنْ.

٢١. صُوْنْدْ بَه، بَرِیَا عَذَابِیَ هَرِی مَزِنْ، اَمِیَ وَانْ بِعَذَابِیَ نیْزِیكْ بِدِنْ چِیْژَانْدِنْ دَا کُو اَوْ لِخَوه ڤَگَرِنْ و بَاوَرِی بِینِنْ.

---

[1] اَڤْ ئَایَتَا سِجُودَا خَونْدِنِیَ یَه. دِڤِیَ بَابَتِیَ دَه پیْخَمْبَرْ ﷺ وِسَا فَرْمَانْ کِرِیَه: دَمَا ئَادَمِیكْ (ئَایَتَا) سِجُودِیَ خَونْدْ و هَرَه سِجُودِیَ، شَیْطَانْ دِگِرِی، خَوه ژِیَ دُورْ دِکَه و دِبیْژَه: هَیْ وَاخْ لِمِنْ! فَرْمَانَا سِجُودِیَ لِزَارُویِیَ ئَادَمْ هَاتْ کِرِنْ، اَوْ چُو سِجُودِیَ، ژِیَ رَه بِهِشْتْ هَیَه و فَرْمَانَا سِجُودِیَ لِمِنْ هَاتْ کِرِنْ، اَزْ نَچُومْ سِجُودِیَ، ڤِیْجَه دُوژَهْ ژِ مِنْ رَه یَه.

**٢٢.** مَا ژِ وِى كَسىٚ كُو بَئَايَتێنْ خُدَايىٚ خَوه وَرَه هِشيَارْكرِنْ و پَاشىٚ بَرىٚ خَوه ژِ وَانْ ڤَگَرينَه، ظَالِمْترْ كِى هَيَه؟ مُحَقَّقْ اَمىٚ ژِ سُوجْدَارَانْ تُولىٚ هِلينِنْ.

**٢٣.** صُوٚنْدْ بَه، مَه كِتێبْ دَايَه مُوسَا ڤێجَه تُو ژِ گِهَاشْتنَا وِىٚ (كِتێبىٚ) نَكَڤَه گُمَانىٚ و مَه اَوْ ژِ زَارُويێنْ اِسْرَائِيلْ رَه كِربُو رێبَرْ.

**٢٤.** چِه دَمَا وَانْ صَبرْ كِرْ و وَانْ ژِ دِلْ بَئَايَتێنْ مَه بَاوَرِى ئَانِى، مَه ژِ نَاڤْ وَانْ گَلَكْ رێبَرْ دَرْخِسْتِنْ كُو بِاَمْرىٚ مَه (خَلْكْ) رَاسْتَرىٚ دِكِرِنْ.

**٢٥.** بێگُمَانْ خُدَايىٚ تَه رُوٚژَا قِيَامَتىٚ دَرْبَارىٚ يَا كُو دِحَقىٚ وَانْ دَه اَوْ بِهَڤْ كَتبُونْ، دىٚ دِنَاڤْبَرَا وَانْ دَه دَارَازْ (حُكمْ) بِكَه.

**٢٦.** اَرىٚ مَا ژِ وَانْ رَه عَيَانْ نَبُويَه كُو بَرِيَا وَانْ مَه گَلَكْ اُمَّتْ بِرِنَه هَلَاكىٚ، كُو اَوْ ژِى لِشُونْوَارێنْ وَانْ دِگَرِنْ؟ بێگُمَانْ دِڤَانْ دَه گَلَكْ نِيشَانْ و دَلِيلْ هَنَه. مَا هِىٚ ژِى اَوْ گُهىٚ خَوه نَادِنىٚ؟

**٢٧.** اَرىٚ مَا اَوْ نَابِينِنْ كُو اَمْ ئَاڤىٚ دَاژُونَه سَرْ عَرْدَهِشْكَا بىٚ گِيَا، ڤێجَه اَمْ دَخِلْ و دَانىٚ پىٚ هێشِينْ دِكِنْ كُو هَمْ تَرْشْ (دَڤَه، دَوارْ و پَزْ)ێنْ وَانْ هَمْ ژِى اَوْ بِخَوه ژىٚ دِخُونْ؟ اَرىٚ مَا هِىٚ ژِى اَوْ لِىٚ نَافِكرِنْ؟[1]

**٢٨.** اَوْ دِبێژِنْ: اَگَرْ بِرَا هُونْ رَاسْتْ دِبێژِنْ، دَه كَا اَوْ سَرْكَفْتِنَا كُو هُونْ بَحْسىٚ ژىٚ دِكِنْ كَنْگىٚ يَه؟

---

١ ژ سُورَهيىٚ طَهَ ئَايَتَا ٥٣-٥٤ىٚ «اَو خُدَايىٚ كُو عَردْ ژ وَه رَه رَاسْت كِريَه و ژ وَه رَه تىٚ دَه رىٚ ڤَكرنَه (چُونْ و هَاتِنْ هێسَانْ كِريَه) و بَارَانْ ژ اَسْمێنْ (عَوْرَانْ) ژ وَه رَه بَارَانْدِيَه. ڤێجَا بوىٚ، مَه تَخْلِيتێنْ گِيَا و شِينْكَاتِيَانْ جُرْ بجُرْ و جُوتْ دَرئَانِينَه. ژىٚ بخُونْ و تَرْشێنْ خَوه لِىٚ بِچێرِينِنْ. بێگُمَانْ دِ ڤىٚ دَه ژ بُو عَاقِلْمَنْدَانْ نيشَانْ هَنَه» ڤىٚ ئَايَتَا ٢٧ىٚ خَوشْ رَاڤَه دِكَه.

**٢٩.** بِبێژَه: رُوٚژَا سَرْکَفْتِنِیٚ اَوْ رُوٚژَا کُو بَاوَرِیَا کَافِرَانْ تُو فَیْدِیٚ نَادَه وَانْ و ژِ وَانْ رَه دِیٚ مُهْلَتْ ژِی نَیِیٚ دَاینْ![1]

**٣٠.** ڤێجَه تُو دَڤْ ژِ وَانْ بَرْدَه و چَاڤْ لِرِیٚ بَه، بێگُمَانْ اَوْ ژِی چَاڤْ لِرِیٚ نَه.

## ٣٣. سُورَه یِیٚ اَحْزَابْ

سُورَه‌یِیٚ (اَحْزَابْ)٧٣ (حَفْتِیٚ و سِیٚ) ئَایَتَه. لِمَدِینِیٚ نَازِلْ بُویَه . سُورَه، نَاڤِیٚ خَوه ژِ ئَایَتَا ٢٠'اَمْ گِرْتِیَه کُو تِیٚ دَه پَیڤَا اَحْزَابْ دَرْبَاسْ بُویَه و پِرْژِمَارِیَا «حِزْبَه «کُو اَوْ ژِی بِمَعْنَیَا پَارْتْ، جِڤَاتْ، ئَاژَالْ و قَافِیلَه تِیٚ.

**بِنَاڤِیٚ خُدَایِیٚ کُو رَحْمَنَ رَحِیمَ**

١. اَیْ پێخَمْبَرْ! هَایْ ژِ اَمْرُ و نَهْیِیٚ خُدِیٚ هَبَه و بِگُوتِنَا کَافِرْ و مُنَافِقَانْ مَکَه. بێگُمَانْ خُدِیٚ زَانَا یَه، خَویْحِکْمَتَه.

٢. بِدَه پَیْ وَحْیَا کُو ژِ جَمْ خُدَایِیٚ تَه ژِ تَه رَه هَاتِیَه. بێگُمَانْ خُدِیٚ ژِ یَا کُو هُونْ دِکِنْ ئَاگَاهْدَارَه.

٣. خَوه بِسْپێرَه خُدِیٚ، ژِ کَارْسِپَارِی ڤَه خُدَا تَڤِرْ بَسِی تَه یَه.

٤. خُدِیٚ، دُو حَبْ دِلْ نَخِسْتِنَه سِینْگَا تُو زِلَامَانْ، ژِنێنْ وَه ژِی اَوێنْ کُو وَه ظِهَارْ بِوَانْ رَه کِرِیَه نَخِسْتِیَه شُونَا دَایِیکێنْ وَه و زِرْکُرێنْ وَه ژِی ژِ وَه رَه نَکِرِنَه وَکِی کُرێنْ وَه

[1] مُفَسِّرِیٚ نَاڤْدَارْ شَنْقِیطِی دِبێژَه: لِجَمْ مِنْ گُوتِنَا مُفَسِّرَانْ یَا دَرْحَقِی «یَوْمُ الْفَتْحْ»ی دَه یَا هَرِی اَشْکَرَه کُو بوَاطَیَا رُوٚژَا حُکمْدَایِنِیٚ یَه. دَلِیلَا لِسَرْ ڤِیٚ وَاطَیِیٚ ژِ سُورَه‌یِیٚ اَعْرَافْ ئَایَتَا ٨٩یٚ «..مَه خَوه هَرْ سِپَارْتِیَه خُدِیٚ. خُدێیو، دِ نَاڤْبَرَا مَه و گَلِیٚ مَه دَه (دِ وِی تِشْتِیٚ کُو اَمْ تِیٚ دَه تێکُوشِینِیٚ بِهَڤْ رَه دِکِنْ) بِعَدَالَتِی حُکمْ بِکَه. تَڤِرْ تُو چێتِرِینِیٚ حُکمْدَارَانِی» و ژِ سُورَه‌یِیٚ شُعَرَاء ئَایَتَا ١١٧-١١٨یٚ «نُوحْ گُوتْ: خُدَایِیٚ مِن! گَلِیٚ مِنْ، بَاوَرِی بِمِنْ نَئَانِی.اَیْدِی دِ نَاڤْبَرَا مِنْ و وَانْ دَه حُکْمِیٚ خَوه بِکَه، مِنْ و بَاوَرْمَنْدێنْ دِگَلْ مِنْ رِزْگَارْ بِکَه » و ژِ سُورَه‌یِیٚ سَبَأْ ئَایَتَا ٢٦یٚ «بِبێژَه: خُدَایِیٚ مَه دِیٚ (رُوٚژَا قِیَامَتِیٚ) مَه و وَه لِهَڤْ بِجِڤِینَه، پِشْتْرَه دِیٚ دِ نَاڤْبَرَا مَه دَه بِعَدَالَتِی حُکمْ بِکَه. هَرْ اَوَه یِیٚ فَتَّاحْ یِیٚ عَلِیمْ.» ڤِیٚ وَاطَیِیٚ تَکَزْ دِکَه.

يێنْ ژِ وَه! اَڤْ گُوتِنێنْ وَه نَه، كُو هُونْ ژِ خَوه رَه دِبێژِنْ. خُدِیٚ گُوْتِنَا رَاسْتْ دِبێژَه و رِیَا رَاسْتْ دِدَه بَرْ وَه.[۱]

۵. (اَوْ زَارُوكێنْ كُو وَه بعِيَالِی ژِ خَوه رَه وَرْگِرْتِيَه ) بِبَاڤِێنْ وَانْ گَازِی وَانْ بِكِنْ، اَڤْ لِجَمْ خُدِیٚ دَادْمَنْدْتِرْ و رَاسْتِرَه. ڤێجَه كُو هُونْ نزَانِبِنْ بَاڤێنْ وَانْ كِيَه، اَوْ دِ دِينْ دَه بِرَا و ئَارِيكَارێنْ وَه نَه. دِيَا كُو هُونْ شَاشْ بِبِنْ دَه (كُو هُونْ نَه بِبَاڤِێنْ وَانْ گَازِی وَانْ بِكِنْ) ژِ وَه رَه گُنَهْ نُنَه. لِێبَلِیٚ دِيَا كُو دِلێنْ وَه قَصْدْ بِكَه دَه ژِ وَه رَه وَبَالْ هَيَه. خُدِیٚ تَقَزْ گُنَهْڤَشێرَه، دِلُوْڤَانَه.

٦. پێخَمْبَرْ ژِ بُوْ بَاوَرْمَنْدَانْ ژِ نَفْسَا وَانْ بِخَوه ژِی چێتِرْ و لِپێشْتِرَه. خَانِمێنْ وِی ژِی دَايِكێنْ بَاوَرْمَنْدَانِنْ. يێنْ كُو خِزْمێنْ هَڤِنْ لِگُورِی كِتێبَا خُدِیٚ ژِ بَاوَرْمَنْدێن اَنْصَارْ و مُهَاجِرَانْ لِپێشْتِرْ و نێزِيكْتِرِیٚ هَڤِنْ. لِێبَلِیٚ كُو هُونْ بِدُوسْتێنْ خَوه قَنْجِيكِیٚ بِكِنْ اَوْ جُدَا يَه. اَڤَا مَه گُوتِی دِكِتێبِیٚ دَه نِڤِيسَانْدِی يَه.

۷. بِێنَه بِيرَا خَوه؛ وِیٚ دَمَا مَه ژِ پێخَمْبَرَانْ پێمَانْ وَرْگِرتْ و (مَه پێمَانْ) ژِ تَه، ژِ نُوحْ، ژِ اِبْرَاهِيمْ، ژِ مُوسَا و ژِ عِيسَايِیٚ كُرِیٚ مَرْيَمِیٚ ژِی و مَه سُوْزَكَه مِكُوْمْ و گِرَانْ ژِ وَانْ وَرْگِرتْ..[۲]

---

۱ ظِهَارْ، اَوَه كُو زِلَامْ ژِ پِيرَكَا خَوه رَه بِبێژَه: «تُو، ژِ مِنْ رَه وَكِی پِشْتَا دِيَا مِنْ بِی.» يَعْنِی چَاوَا دِيَا مِنْ ژِ مِنْ رَه حَرَامَه تُو ژِی وِسَا ژِ مِنْ رَه حَرَامْ بِی. بَرِیَا اِسْلَامِیٚ گَاڤَا زِلَامَكِی اَڤْ گُوتِنَا هَا ژِ پِيرَكَا خَوه رَه بِگُوْتَا، اَوْ پِيرَكْ دَڤْ ژِیٚ دِهَاتْ بَرْدَانْ، وَكَه دِيَا وِی دِهَاتْ دِيتِنْ و وِی نِكَارْبُو نێزِيكِی نِڤِينَا وِیٚ بِبَه. خُدِیٚ بِڤِیٚ ئَايَتِیٚ اَڤْ عَادَتْ بِمِينَاكَكَه عَجِيبْ ژِ هُوْلِیٚ رَاكِرْ؛ كَا چَاوَا دِنَاڤَا مِرُوْڤَكِی دَه دُو دِلْ نَابِنْ، هَرْ وِهَا نَه مُمْكِنَه كُو پِيرَكَكْ هَمْ ژِنْ بَه هَمْ ژِی دَايِكْ بَه. بِرَاسْتِی اَڤْ دَابَاشْ بِدُورْفَرِهِی دِیٚ دِسُورَهِیٚ مُجَادَلَه دَه وَرَه.

۲ اَڤْ ئَايَتَا پِيرُوْزْ بَيَانْ دِكَه كُو خُدِیٚ ژِ پێخَمْبَرَانْ پێمَانَا وَانْ وَرْگِرتِيَه، پَاشِیٚ پێنجْ ژِ وَانْ تَرْخَانْ كِرِنَه؛ مُحَمَّدْ، نُوحْ، اِبْرَاهِيمْ، مُوسَا و عِيسَا كُو اَوْ ژِ رَسُولَانْ يێنْ اُولُو الْعَزْمِنْ. دِ ڤِیٚ ئَايَتِیٚ دَه اَوْ مِيسَاقَا (پێمَانَا) كُو خُدِیٚ ژِ وَانْ سِتَانْدِيَه اَشْكَرَا نَكِرِيَه. لِێبَلِیٚ خُدِیٚ اَوْ مِيسَاقْ، ژِ سُورَهِیٚ ال عِمْرَانْ دِ ئَايَتَا ۸۱ِیٚ دَه بَيَانْ كِرِيَه: بِێنَه بِيرَا خَوه؛ وِیٚ دَمِیٚ كُو خُدِیٚ پێمَانْ ژِ پێخَمْبَرَانْ وَرْگِرتْ و گُوْتْ: «دَمَا مِنْ كِتێبْ و حِكْمَتْ دَا وَه، پَاشِیٚ قَاصِدَكْ ژِ وَه رَه بِیٚ و يَا كُو بِوَه رَه يَه ژِی رَاسْت بِدێرَه، تَقَزْ دِڤِیٚ هُونْ بَاوَرِيِیٚ بِوِی بِينِنْ و

زِنْدِیكْ نَهِشْتِبُویَا. لِیْبَلِیْ خُدِیْ جَزَایِیْ وَانْ هَیَا دَمَکَه نَاڤْلِیْکِرِی دِدَه پَاشْ. ڤێجَه دَمَا جِڤَانِیْ وَانْ وَرِیْ، بێگُمَانْ خُدِیْ بِینَرِیْ بِعَقْدێنْ خوه یَه.

## ٣٦. سُورَه یِیْ یَاسِینْ

سُورَه یِیْ (یَاسِینْ)، ٨٣ (هَشْتِیْ و سِیْ) ئَایَتَه. لِمَکّیْ نَازِلْ بُویَه. سُورَه نَاڤِیْ خوه ژِ ئَایَتَا ١'اَمْ گِرْتِیَه.

سُورَه یِیْ یَاسِینْ، بِپِرَانِی لِسَرْ بَاوَرِیَا بِسَاغْبُونَا پِشْتِی مِرِنِیْ و حَشْرُ و نَشْرِیْ، قِصَیَا خَلْکِیْ گُنْدَکِی و دَلِیلێنْ کُو یَکِیتِیَا خُدِیْ نِیشَانْ دِدِنْ دِسَکِنَه.

سُورَه، هَلْوَسْتَا دُوزْڤَانِیْ بَاوَرْمَنْدْ «حَبِیبِیْ نَجَّار» بِبِیرْ تِینَه کُو شِیرَتْ لِمِلَّتِیْ خوه کِرِبُو و ژِ لُومَا اَوْ کُشْتِبُونْ. سُورَه، بَحْسَا دَلِیلێنْ یَکِیتِی و قُدْرَتَا خُدِیْ دِکَه اَوێنْ کُو دِڤِیْ کَائِنَاتَا عَجێبْ دَه قَومِینَه و دِقَومِنْ. پێشِی، ژِ تَمَاشَکَهَا عَرْدَا هِشْكْ و ژِ تَمَاشَکَهَا شَڤِیْ یَا کُو اَوْ رَشْطَارِی یَه و رُوْ ژِیْ ڤَدِقَتَه، ژِ تَمَاشَکَهَا رُوْژَا رُوْنَاكْ ئَا کُو بِقُدْرَتَا خُدِیْ کُو دِ رێکَهَا خوه دَه دِگَرَه و هِیچْ خَالَکِیْ ژِی شَاشْ نَاکَه، ژِ تَمَاشَکَهَا هِیڤِیْ کُو دِکَڤَه رێگَهێنْ خوه و ژِ تَمَاشَکَهَا کَشْتِیَا تژَه یَا کُو کِنِیْسَا پێشِیَانْ هِلْدِگْرَه بَحْسْ کِرِیَه کُو اَڤْ هَمُو دَلِیلێنْ اَشکَرَه نَه و قُدْرَتَا خُدِیْ نِیشَانِی خَوێعَقْلانْ دِدِنْ.

سُورَه، دَاوِیِیْ بَحْسَا سَاغْبُونَا پِشْتِی مِرِنِیْ و پَادَاشْ و سَزَایِیْ دِکَه و ژِ ڤِیْ رَه دَلِیلانْ تِینَه.

بِنَاڤِیْ خُدَایِیْ کُو رَحْمَنَ رَحِیمَ

١. یَاسِینْ.

٢. قَسَمْ بِقُرْئَانَا حَکِیمْ بَه.

٣. بێگُمَانْ تُو (اَیْ مُحَمَّدْ) ژِ پێخَمْبَرَانِی.

٤. لِسَرْ رِیکَه رَاسْتُ و دُرِسْتِی.

٥. (اَڤْ قُرْئَانْ)، ژِ جَمْ خُدَایِیْ عَزِیزْ یِیْ رَحِیمْ ڤَه هَاتِیَه هِنَارْتِنْ...

٦. دَا كُو تُو قَوْمَكى هِشْيَارْ بكى كُو بَاڤْ و كَالِيْنْ وَانْ نَهَاتِبُونْ هِشْيَارْكِرِنْ، ڤِيْجَه هَايَا وَانْ (ژ ايمَانْ و حَقِيقَتيىَ) تُنَه.

٧. ضُوْنْدْ بَه، لِسَرْ پرِيْنْ وَانْ عَذَابْ پِيْويسْتْ بُويَه، ڤِيْجَه اَوْ بَاوَرِى نَايينِنْ.

٨. بِيْگُمَانْ مَه قَيْدُ و زِنْجيرْ خِسْتِنَه ستُويِيْنْ وَانْ، ايْدِى اَوْ قَيْدْ گِهيشْتِنَه حَيَا چِنَيَا وَانْ، ڤِيْجَه سَرْرَاكِرِى مَانَه.

٩. مَه لِپِيْشِيَا وَانْ بَنْدَكْ و لِپشْتْ وَانْ ژِى بَنْدَكْ دَانِيَه و مَه پَرْدَيَكْ خِسْتِيَه سَرْ چَاڤِيْنْ وَانْ، ايْدِى اَوْ (حَقِيىَ) نَابِينِنْ.

١٠. ژِ وَانْ رَه وَكْهَڤَه، چِه تُو وَانْ (ژِ عَذَابِىَ خُدِىَ) هِشِيَارْ بِكِى، چِه تُو وَانْ هِشِيَارْ نَكِى، هَرْ اَوْ بَاوَرِى نَايينِنْ.

١١. بِيْگُمَانْ بَسْ تُو، وِى يىَ كُو دِدَه پَىْ قُرْئَانِىَ و دِحَالِىَ نَپَنْدِيىَ دَه ژِى ژِ خُدَايِىَ رَحْمٰنْ بِترْسَه، دِكَارِى (بِڤِىَ قُرْئَانِىَ) هِشِيَارْ بِكِى. ڤِيْجَه تُو مِزْگِينَا لِيْبُورِينْ و خَلاتَكَه هِيْژَا بِدِيىَ.

١٢. بِيْگُمَانْ بَسْ اَمِنْ يِيْنْ مِريَانْ سَاغْ دِكِنْ. اَمْ كَارْ و بَارِيْنْ كُو وَانْ لِپِيْشِيَا خَوه شَانْدِنَه (ئَاخِرَتِىَ) و بَرْهَمِيْنْ كُو لِدُوڤْ خَوه هِشْتِنَه ژِى دِنِڤِيسِنْ و هَرْ تِشْتْ دِكِتِيْبَكَه دِيَارْكَرْ دَه نِڤِيسَانْدِى يَه؟

١٣. (هَىْ مُحَمَّد) ژِ بُوْ وَانْ مِينَاكَا خَلْكِىَ وِى بَاژَارِى بِينَه، وِىَ دَمَا ژِ وَانْ رَه رَسُولْ هَاتِنْ شَانْدِنْ.

١٤. وِىَ دَمِىَ مَه ژِ بُوْ وَانْ دُو پِيْخَمْبَرْ شَانْدِنْ، ڤِيْجَه وَانْ بَاوَرِى بِوَانْ نَئَانِى. مَه ژِى بِپِيْخَمْبَرِىَ سِيْيَمْ پِشْتْگِرِيَا وَانْ كِرْ. وَانْ (هَرْ سِىَ پِيْخَمْبَرَانْ) بِهَڤْ رَه (ژِ وَانْ رَه) گُوْتْ: بِيْگُمَانْ اَمْ قَاصِدِيْنْ خُدِىَ نَه، ژِ بُوْ وَه هَاتِنَه شَانْدِنْ!

**١٥.** گُوٚتِنْ: هُونْ بَسْ مِرُوٚڤێنْ مِینَا مَه نَه. خُدَایِیٚ رَحْمٰنْ ژِ بُوٚ مَه تِشْتَكْ نَشَانْدِیَه. بَسْ هُونْ هَرْ دَرَوَانْ دِكِنْ.

**١٦.** (رَسُولَانْ) گُوٚتِنْ: خُدَایِیٚ مَه دِزَانَه كُو بِرَاسْتِی اَمْ ژِ بُوٚ وَه بِرَسُولِی هَاتِنَه شَانْدِنْ.

**١٧.** هَمْ ژِ بِلِی تَبْلِیغَا اَشْكَرَا اَمْ بِتُو تِشْتِی نَه بَرْپِرْسِنْ.

**١٨.** گُوٚتِنْ: بِرَاسْتِی ژِ رُوِیِیٚ وَه دَه بێقُدُوشِی بِسَرْ مَه دَه هَاتْ. صُوٚنْدْ بَه، اَگَرْ هُونْ ژِ ڤِیٚ دُوٚزَا خوه ڤَنَگَرِنْ اَمِیٚ هَرْ وَه بِكَڤِرَانْ بِرَجِمِینِنْ و ژِ جَمْ مَه ڤَه تَقَزْ اِیشْكَنْجَیَکه اَرْژَنْگْ دِیٚ بِهِنْگَڤَه وَه.

**١٩.** (پێخَمْبَرَانْ) گُوٚتْ: بێقُدُوسِیَا وَه (ژِ بَرْ كُفْرَا وَه) لِگَلْ وَه یَه. اَرِیٚ مَا ژِ بُوٚ كُو شِیرَتْ لِوَه هَاتِیَه كِرِنْ (بێقُدُوشِی بِسَرْ وَه دَه هَاتْ)؟ نَخێرْ، نَه وِسَانَه! بَلْكِی هُونْ مِلَّتَكِی كُو زێدَه سَرْخوڤَچُویِی نَه.

**٢٠.** دِڤِیٚ نَاڤِیٚ دَه، ژِ دُورِی وِی بَاژَارِی زِلاَمَكْ بِبَزْ هَاتْ و گُوٚتْ: هَیْ قَومِیٚ مِنْ! بِدِنْ پَیْ ڤَانْ رَسُولاَنْ!

**٢١.** بِدِنْ پَیْ ڤَانێنْ كُو ژِ وَه تُو حَقْدَسْتِی (اُجْرَتِیٚ) نَاخَوازِنْ، بێگُمَانْ اَوْ لِسَرْ رِیێکَه رَاسْتِنْ.

**٢٢.** زِلاَمْ گُوٚتْ: مَا چِه لِمِنْ قَومِیَه كُو اَزْ عِبَادَتِیٚ خُدِیٚ نَكِمْ، اَوِیٚ كُو اَزْ خُلِقَانْدِمَه و اَوِیٚ كُو هُونِیٚ بِبَالْ ڤَه بِێنْ ڤَگَرَانْدِنْ.

**٢٣.** اَرِیٚ مَا اَزِیٚ ژِ بِلِی خُدِیٚ (ژِ خَوه رَه) اِلٰهَكِی دِنْ بِگِرِمْ؟ اَگَرْ اَوْ خُدَا یِیٚ رَحْمٰنْ، ژِ بُوٚ مِنْ زَرَارَكِیٚ بِخَوازَه مَهْدَرَا وَانْ (پُوتێنْ وَه) دِیٚ فَیْدَیَا تِشْتَكِی نَدَه مِنْ. اَوْ قَتْ نَكَارِنْ مِنْ (ژِ عَذَابِیٚ خُدِیٚ) رِزْگَارْ بِكِنْ.

**٢٤.** (اَگَرْ اَزْ ژِ بِلِی اللّٰه لِخُدَایَكِی دِنْ بِگَرِمْ)، وِیٚ چَاخِیٚ تَقَزْ اَزْ دِرێشَاشِیکَه اَشْكَرَا دَه مَه.

**٢٥.** بێگُمَانْ مِنْ بَاوَرِی بِخُدَایِیٚ وَه ئَانِیَه؛ ڤێجَه لِمِنْ گُهْدَارِی بِكِنْ.

۲٦. (پِشْتِى ڤِىَ ئَاخَافْتِنِىَ اَوْ كُشْتِنْ، ڤِيَجه) ژِىَ رَه هَاتْ گُوتِنْ: تِيَكَڤَه بِهِشْتِىَ! (پِشْتِى وِى كَرَمَا خُدَايِىَ خَوه دِيتْ) گُوتْ: خَوزِى گَلِىَ مِنْ ژِى اَڤْ بِزَانِيَا...

۲۷. بِيَا كُو خُدَايِىَ مِنْ اَزْ غَفِرَانْدِمَه و اَزْ كَرَانْدِمَه ژِ يِيْنْ كُو قَنْجِى لِوَانْ بُويَه.

۲۸. مَه پِشْتِى (شَهِيدْبُونَا) وِى ژِ بُوْ (هَلاكَا) گَلِىَ وِى، ژِ ئَاسْمِيْنْ تُو لَشْكَرَكْ دَانَخِسْتِيَه و اَمْ دَانَاخِنْ ژِى.

۲۹. بَسْ اَوْ يَكْ قِيرَكَه دِژْوَارْ بُوْ، ڤِيَجه دِجِهْ دَه مِرِنْ.

۳۰. هَىْ وَاخْ لِرَوْشَا عِبَادَانْ! چِقَاسْ پِيَخَمْبَرَكْ ژِ وَانْ رَه هَاتِبَه، هَرْ وَانْ طِنَازْ پِىَ كِرِنَه.

۳۱. مَا اَوْ نَابِينِنْ كُو مَه بَرِيَا وَانْ چَنْدْ قَومْ بِرِنَه هَلاكِىَ كُو بِرَاسْتِى ژِى اَوْ جَارَكَه دِنْ لِوَانْ نَازِيڤِرِنْ.

۳۲. هَلْبَتْ اَوْ هَمُو (ژِ بُوْ حَسَابِىَ خَوه) دِىَ لِحِزُورَا مَه بِيْنَه كُومْ كِرِنْ.

۳۳. عَرْدَا مِرِى (يَا هِشْكْ و هُولَا) كُو اَمْ وِىَ سَاغْ (و هِيْشِينْ) دِكِنْ و اَمْ ژِىَ حَبْ و تَنَه دَرْدِخِنْ، ڤِيَجه اَوْ ژِىَ دِخُونْ (و پِىَ دِژِينْ)، ژِ بُوْ وَانْ نِيشَانْ و دَلِيلَه (كُو خُدِىَ دِكَارَه ژِ گُورَانْ ژِى مِرِيَانْ سَاغْ رَاكَه).

۳٤. مَه تِىَ دَه گَلَكْ بَخْچِيْنْ خُرْمَا و رَزِيْنْ تِرِى دَانِينَه و مَه تِىَ دَه گَلَكْ كَانِى ژِىَ پِژِقَانْدِنْ و هَرِكَانْدِنَه.

۳٥. دَا كُو اَوْ ژِ فِيْكِيْنْ وَانْ بِخُونْ و اَوْ نَه بِدَسْتِيْنْ وَانْ هَاتِيَه چِيْكِرِنْ. اَرِىَ مَا هِىَ ژِى شُكْرِىَ خُدِىَ نَاكِنْ؟

۳٦. اَوْ خُدَايِىَ كُو ژِ تِشْتِيْن عَرْدْ هِيْشِينْ دِكَه و ژِ مِرُوْڤَانْ و ژِ مَخْلُوقِيْنْ كُو هِىَ ژِى اِنْسَانْ رَاسْتِيَا وَانْ نِزَانَه، هَرْ تِشْتْ جُوتْ (نِيْرْ و مِىَ) ئَافِرَانْدِنَه (ژِ هَرْ كِيْمَاسِى و ژِ يَا نَهِيْژَا) پَاكْ و پَاقِژَه.

**٣٧.** شَڤْ ژِى ژِ بُوّ وَانْ نِيشَانْ و دَلِيلَه (لِسَرْ قُدْرَتَا خُدێ). اَمْ رُوّژێ ژِ سَرْ وِێ رَادِكێشِنْ، ڤێجَه دِ وِێ دَمێ دَه اَوْ دِطَارِيێ دَه دِمِينِنْ.

**٣٨.** رُوّژْ ژِى ژِ بُوّ وَانْ نِيشَانَه، اَوْ دِرێگَهَا خَوه دَه دِگَرَه. هَا اَڤْ تَقْدِيرَا خُدَايێ دَسْتهِلَاتْ اِێ زَانَا يَه.

**٣٩.** هَيْڤْ ژِى ژِ بُوّ وَانْ نِيشَانْ و دَلِيلَه، مَه ژِ بُوّ هِيڤێ ژِى هِنْ قُوّنَاخْ (رێگَهْ) تَرْخَانْ كِرِنَه، حَيَانِى پَاشێ اَوْ وَكِى چِقْلێ دَارَا خُرْمێ خَوارْ دِبَه (دِبَه هِيلَالْ) و ڤَدِگَرَه.

**٤٠.** نَه ژِ رُوّژێ رَه دُرِسْتَه كُو بِگَهِيژَه هِيڤێ نَه ژِى شَڤْ دِكَارَه بِدَه پێشِيَا رُوّژێ. هَرْ يَكْ ژِ وَانْ دِ رِێگَهْ و چَرْخَكێ دَه مَلَڤَانِى دِكِنْ و چَرْخْ دِبِنْ.

**٤١.** ژِ بُوّ وَانْ نِيشَانْ و دَلِيلَه كُو مَه كِنێسَا مِرُوّڤَانْ دِكَشْتِيَا تژَه دَه هِلْگِرْتِيَه.

**٤٢.** مَه ژِ بُوّ وَانْ گَلَكْ تِشْتێنْ وَكِى كَشْتِيێ كُو اَوْ لِێ سُوَارْ بِبِنْ چێكِرِنْ.

**٤٣.** اَگَرْ اَمْ بِخَوازِنْ (دِگَلْ كَشْتِيَانْ ژِى) اَمێ وَانْ بِنْئَاڤْ بِكِنْ و بِخَنِقِينِنْ، وِێ چَاخێ ژِ وَانْ رَه نَه هَوارْ دِێ هَبَه نَه ژِى اَوێ بِێنَه رِزْگَارْكِرِنْ.

**٤٤.** ژِ بِلِى كُو اَمْ حَتَا دَمَكَه نَاڤْلێكِرِى ژِ جَمْ خَوه دِلُوڤَانِى و پێخَوشْبُونَكێ بِدِنْ وَانْ.

**٤٥.** دَمَا ژِ وَانْ رَه بِێ گُوّتِنْ: ژِ عَذَابێ دِنْيَايێ و يێ ئَاخِرَتێ خَوه بِپَارِێزِنْ، دَا كُو رَحْمَتْ لِوَه بِێ كِرِنْ (اَوْ دَنْگْ نَابِنْ خَوه).

**٤٦.** چِقَاسْ ئَايَتَكْ ژِ ئَايَتێنْ خُدَايێ وَانْ ژِ وَانْ رَه هَاتِبَه هَرْ وَانْ بَرِێ خَوه ژِێ گُهَارْتِنَه.

**٤٧.** دَمَا كُو ژِ وَانْ رَه بِێ گُوّتِنْ؛ ژِ وِى رِزْقێ كُو خُدێ دَايَه وَه دِخێرِێ دَه خَرْجْ بِكِنْ؛ اَوێنْ كُو كَافِرْ بُونَه ژِ يێنْ بَاوَرْمَنْدْ رَه دِبێژِنْ: اَرِێ مَا اَمێ خَوارِنێ بِدِنْ وَانێنْ كُو اَگَرْ خُدێ بِخَوسْتَه دِێ خَوارِنْ بِدَا وَانْ؟ بێگُمَانْ هُونْ بَسْ دِرێشَاشِيَكَه اَشْكَرَا دَه نَه.

٤٨. دِبێژِنْ: اَگَرْ بِرَاسْتِی هُونْ رَاسْتْگُو نَه (دَه کَا بِبێژِنْ)؛ مَا اَڤْ پَیْمَانْ (ئَا سَاغْبُونَا پِشْتِی مِرِنِیْ) کَنْگِیْ یَه؟

٤٩. اَوْ تَنِیْ چَاڤْنێرِیَا قِیرَکِیْ دِکِنْ کُو ژِ نِشْکَا ڤَه اَوْ وَانْ بِگِرَه و بِهِنْگێڤَه و کُو اَوْ هێژْ بِهَڤْ رَه دِنِیقَاشِیْ دَه نَه.

٥٠. وِیْ دَمِیْ اَوْ نَه دِکَارِنْ وَسِیَتَکِیْ بِکِنْ نَه ژِی دِکَارِنْ لِمَالْبَاتێنْ خوه ڤَگَرِنْ.

٥١. دِصُورِیْ (بُوقِیْ) دَه تِیْ پِفْکِرِنْ، هَا (تُو دِبِینِی کُو وَا یَه) اَوْ ژِ گُوْرَانْ رَادِبِنْ، بِلَزْ و بَزْ تێنَه حِزُورَا خُدَایِیْ خوه.

٥٢. هَا وِیْ چَاخِیْ (یێنْ کَافِرْ) دِبێژِنْ؛ هَیْ وَاخْ لِحَالِیْ مَه بَه! کِیْ ژِ تِرْبێنْ مَه اَمْ ڤَژَانْدِنَه؟ (ژِ وَانْ رَه تِیْ گُوْتِنْ) اَڤْ، یَا کُو خُدَا یِیْ رَحْمٰنْ سُوْزْ پِیْ دَابُو و پێخَمْبَرَانْ ژِی ژِیْ رَاسْتْ خَبَرْ دَابُو!

٥٣. اَڤْ رُودَانْ بَسْ یَكْ قِیرَکَه، وِیْ هِنْگِیْ اَوْ هَمُو لِحِزُورَا مَه ئَامَادَه دِبِنْ.

٥٤. اِیرُو بِتُو تِشْتِی نَحَقِی لِتُو کَسِی نَایِیْ کِرِنْ و ژِ بِلِی یَا وَه کِرِی پِیْ ڤَه هُونْ نَایێنَه جَزَاکِرِنْ.

٥٥. بێگُمَانْ اِیرُو بِهِشْتِی بِدِلْخوشِی دِنَاڤْ خوشِیَانْ دَه مِژُولِنْ.

٥٦. اَوْ و ژِنێنْ خوه دِبِنِیْ سِیَانْ دَه لِسَرْ تَخْتَانْ پَالْدَایِی نَه.

٥٧. تِیْ دَه هَرْ تَخْلِیتْ مِیْوَه و چِه تِشْتِیْ اَوْ بِخوازِنْ ژِ بُوْ وَانْ هَیَه.

٥٨. ژِ جَمْ خُدَایِیْ رَحْمٰنْ، ژِ وَانْ رَه «سِلاڤْ»تِیْ گُوْتِنْ.

٥٩. اِیرُو، گَلِی گُنَهْکَارَانْ (ژِ بَاوَرْمَنْدَانْ) ڤَقَتِنْ!

٦٠. گَلِی زَارُوکێنْ ئَادَمْ! اَرِیْ مَا (بِنَاڤْگِینَا پێخَمْبَرَانْ) مَه قَوِیْتِی لِوَه نَکِرِبُو کُو هُونْ شَیْطێن نَحَبِینِنْ. بێگُمَانْ اَوْ ژِ بُوْ وَه نَیَارَکِی اَشْکَرَا یَه!

٦١. (مَا مَه قَوِیتِی نَکِربُو کُو) هُونْ بَسْ مِنْ بِحَبِینِنْ. هَا اَڤْ رِیَا رَاسْتُ و دُرِسْتَه!؟

٦٢. شَیْطَانْ ژِ وَه، پِرْ کَسْ ژِ رِیێ خِسْتِنْ. اَرِیێ مَا هُونْ تێنَاگِهیژِنْ؟

٦٣. (ژِ وَانْ رَه لِئَاخْرَتِیێ وِهَا تێ گُوتِنْ): هَا اَڤْه، اَوْ دُوژَهَا کُو سُوزَا وِیێ ژِ وَه رَه هَاتِبُو دَاینْ.

٦٤. ژِ بَرْ کَافِرِیَا کُو وَه دِکِرْ، اِیرُو دَه بِکَڤِنِیێ!

٦٥. اِیرُو اَمِیێ دَڤێنْ وَانْ مُوْرْ بِکِنْ و دَسْتێنْ وَانْ دِیێ بِمَه رَه بِئَاخِڤِنْ و لِنْگێنْ وَانْ دِیێ
شَادَهِیِیێ بِدِنْ بِیَا کُو کِرِنَه.

٦٦. اَگَرْ مَه خَوسْتِبُویَا مَه دِیێ چَاڤێنْ وَانْ کُوْرْ و خِتِمْ بِکِرِنَا، اِیْدِی بِلَزْ و بَزْ بِکَتِنَا سَرْ
رِیێ، ڤێجَه کَا چَاوَا اَوِیێ رِیێ بِبِینِنْ؟

٦٧. اَگَرْ مَه خَوسْتِبُویَا مَه دِیێ اَوْ دِجِهِیێ وَانْ دَه بِگُهَارْتَا، ڤێجَه وَانْ دِیێ نَکَارِبُویَا بِپێشْ
ڤَه هَرِنْ و نَه ژِی بِپَاشْ ڤَه ڤَگَرِنْ.

٦٨. چِه کَسِیێ کُو اَمْ تَمَنِیێ وِی دِرێژْ بِکِنْ، اَمْ دِخُلْقِیتَا وِی دَه وِی دِگُهَرِینِنْ (اِیْدِی بێهێزْ
و پِشْتْخُوزْ دِبَه). اَرِیێ مَا اَوْ ژِ ڤِیێ ژِی ئَاقِلْ نَاگِرِنْ؟

٦٩. مَه سِرْ فێرِی پێخَمْبَرْ نَکِرِیَه و اَڤْ نَه بَابَتِیێ وِی یَه ژِی. یَا کُو مَه فێرِی وِی کِرِیَه،
بَسْ هَایْدَارِی و قُرْئَانَا رُوْنَاکَه.

٧٠. دَا کُو اَوْ بِڤِیێ قُرْئَانِیێ کَسِیێ زِنْدِی هِشْیَارْ بِکَه و دَا کُو لِسَرْ کَافِرَانْ ژِی عَذَابْ
مِسُوْگَرْ بِبَه.

٧١. اَرِیێ مَا اَوْ کَافِرْ نَابِینِنْ کُو مَه ژِ کَارِیێ دَسْتِیێ خَوه ژِ بُوْ وَانْ تَرْشْ ئَافِرَانْدِنَه، ڤێجَه
اَوْ ژِ وَانْ رَه خَودِی نَه؟!

٧٢. مَه اَوْ تَرْشْ ژِ وَانْ رَه سَرْنَرْمْ کِرِنَه، ڤێجَه هِنْ ژِ وَانْ لِیێسوَارکێنْ وَانِنْ و هِنْ ژِ وَانْ
ژِی گُوْشْتِیێ وَانْ دِخُونْ.

٧٣. ژِ بُۆ وَانْ، دِڤَانْ دَه گَلَكْ بَرْژَوَنْدِی و گَلَكْ ڤَخوارِنْ هَنَه. اَرِێ مَا هِیْ ژِی اَوْ شُکرْ نَاکِنْ؟

٧٤. دِیسَا وَانْ بِهێڤِیَا کُو دِێ ئَاریکَاریَا وَانْ بِکِنْ، ژِ بِلِی خُدِێ ژِ بُۆ خَوه هِنْ اِلٰهْ گِرْتِنْ.

٧٥. اَوْ قَتْ نِکَارِنْ ئَاریکَارِیَا وَانْ بِکِنْ، لِێبَلِێ اَوْ بِخَوه دِخزْمَتَا وَانْ دَه ئَامَادَه نَه.

٧٦. (یَا مُحَمَّدْ!) بِلا گُۆتِنَا وَانْ تَه غَمْگِینْ نَکَه. بێگُمَانْ اَمْ بِیَا کُو اَوْ ڤَدشێرِنْ و بیَا کُو اَشْکَرَا ژِی دِکِنْ، دِزَانِنْ.

٧٧. مَا اِنْسَانْ نَابِینَه کُو مَه اَوْ ژِ دِلُوپَكْ ئَاڤْ ئَافِرَانْدِیَه، لِێ تُو دِبِینِی وَا یَه اَوْ بُویَه دِژْمِنَکِی اَشْکَرَا.

٧٨. دَرْ حَقِێ مَه دَه دَرْبُ و مَسَلَانْ لِدَارْ دِخَه و خُلْقِیتَا خَوه ژِ بِیرْ کِرِیَه، دِبێژَه؛ مَا کِی یِێ ڤِی حَسْتِیِێ رِزِیَایِی سَاغْ بِکَه؟!

٧٩. بِبێژَه: اَوْ خُدَایِێ کُو جَارَا پێشِینْ اَوْ ئَافِرَانْدِیَه دِێ وَانْ سَاغْ ژِی بِکَه. اَوْ بِهَرْ مَخْلُوقِی زَانَا یَه.

٨٠. اَوِێ کُو ژِ دَارَا هێشِینْ ژِ وَه رَه ئَاگِرْ دِرَانِی، ڤێجَه هُونْ پِێ اِێگِرْ ڤێدِخِنْ.

٨١. اَوِێ کُو عَرْدُ و ئَاسِیَمَانْ ئَافِرَانْدْ اَرِێ مَا نِکَارَه یێنْ مِینَا وَانْ بِئَافِرِینَه؟ بَلِێ، هَلْبَتْ دِکَارَه. هَرْ اَوْه یِێ خَلّاقْ یِێ عَلِیمْ.

٨٢. فَرْمَانَا خُدِێ -دَمَا کُو اَوْ تِشْتَکِی بِخوازَه- تَنِێ اَڤَه کُو ژِێ رَه بِبێژَه «بِبَه». ڤێجَه اَوْ ژِی چێدِبَه.

٨٣. اَوِێ کُو مِلْكْ و حُکمْرَانِییَا هَرْ تِشْتِی دِدَسْتِێ وِی دَه یَه (ژِ هَرْ کِیمَاسِیِێ) پَاكْ و پَاقژَه و هُونِێ هَرْ بِبَالْ وِی ڤَه ڤَگَرِنْ.

# ٣٧. سُورَه يِيٚ صَافَّاتْ

سُورَه يِيٚ (صَافَّاتْ)١٨٢ (سَدْ و هَشْتِيٚ و دُو) ئَايَتَه. لِمَكِّيٚ نَازِلْ بُويَه . سُورَه نَاڤِيٚ خَوه ژ ئَايَتَا پێشِينْ گِرْتِيَه كُو تِيٚ دَه بێژَيا صَافَّاتْ دَرْبَاسْ بُويَه و بِمَعْنَيا وَانێنْ كُو صَفْ گِرْتِنَ/ڤَوَسْتَانَه.

بِنَاڤِيٚ خُدَايِيٚ كُو رَحْمٰنَ رَحِيمَ

١. صُوٚنْدْ بِوَانێنْ كُو رِيزْ بِرِيٚزْ صَفْ گِرْتِنَه..

٢. بِوَانێنْ كُو دَاژُونْ..

٣. بِوَانێنْ كُو زِكرْ دِخُوِينِنْ..

٤. بێگُمَانْ خُدَايِيٚ وَه هَرْ يَكَه.

٥. اَوْ پَرْوَرْدَگَارِيٚ عَرْدُ و اسْمَانَانْ و چِڤَاسْ تِشْتِيٚ دِنَاڤْبَرَا وَانْ دَه و پَرْوَرْدَگَارِيٚ رُوٚژْهِلاتَانَه.

٦. بێگُمَانْ مَه ئَاسِيمَانِيٚ جِيهَانِيٚ بِخَوشِكَاهِيَا سِتێرَانْ خَمِلانْدِيَه.

٧. مَه (بِستێرَانْ) ئَاسِيمَانْ ژِ هَرْ شَيْطَانِيٚ سَرْهِلْدێرْ پَارَاسْتِيَه.

٨. اَوْ (شَيْطَانْ) نِكَارِنْ لِجڤَاتَا بِلِنْدْ (ئَا فِرِيشْتَيَانْ) گُهْدَارِى بِكِنْ و ژِ هَرْ ئَالِيى ڤَه (بِستێرَانْ) تێنَه رَجمَانْدِنْ.

٩. دَا كُو وَانْ بِڤَورِينِنْ و ژِ بُوٚ وَانْ عَذَابَكِى سَرَاڤَتِى هَيَه.

١٠. لِيٚبَلِيٚ يِيٚ كُو (ژِ گُوٚتِنێنْ فِرِيشْتَيَانْ) تِشْتَكِى بِدَسْتْخَه بِزُوٚتِينْ شَوَاطُوٚكْ و قُلْكَرْ وِى دِشُوٚپِينِنْ.

١١. ڤێجَه ژِ وَانْ (مُشْرِكَانْ) بِپِرْسَه؛ مَا چێكرِنَا وَانْ ژِ خُدِيٚ رَه زُوٚرَه، يَانْ چێكرِنَا تِشْتێنْ دِيتِرْ؟ بێگُمَانْ مَه اَوْ ژِ حَرِيَكَه زَلْقِينُوكْ ئَافِرَانْدِنَه.

١٢. نَا، بَلْكِى تُو (ژِانْكَارْكِرنَا وَانْ) شَاشْ دِمِينِى، دِگَلْ كُو اَوْ ژِى طِنَازِىٚ خَوه دِكِنْ.

١٣. دَمَا كُو (بِقُرْئَانِىٚ) بِيٚنَه شِيرَتْكِرِنْ ژِى؛ نَافِكِرِنْ و شِيرَتْ نَاگِرِنْ.

١٤. دَمَا كُو مُعْجِزَيَكِىٚ بِبِينِنْ؛ طِنَازِيٚنْ خَوه پِىٚ دِكِنْ.

١٥. دِبيٚژِنْ: اَڤْ، تَنِىٚ سِيٚرْبَازِيَكَه اَشْكَرَا يَه.

١٦. اَرِىٚ دَمَا اَمْ مِرِنْ، بُونَه ئَاخْ و حَسْتِى، مَا (دِيسَا) اَمِىٚ بِيٚنَه سَاغْكِرِنْ؟!

١٧. اَرِىٚ مَا بَاڤِيٚنْ مَه يِيٚنْ پِيٚشِينْ ژِى (دِىٚ بِيٚنَه سَاغْكِرِنْ)؟

١٨. بِبيٚژَه: بَلِىٚ، هَمْ ژِى هُونِىٚ شَرْپَزَه و رَبَنْ بِنْ.

١٩. ڤِيٚجه بِرَاسْتِى اَوْ (سَاغْكِرِنْ) تَنِىٚ يَكْ قِيرَكَه، ژِ نِشْكَا ڤَه اَوْ (رَادِبِنْ و لِدَهْشَتَا قِيَامَتِىٚ) دِنيٚرِنْ.

٢٠. كَافِرْ دِبيٚژِنْ: هَىْ وَاخْ لِمَه! اَڤْ رُوٚژَا حَسَابْ و جَزَايِىٚ يَه.

٢١. هَا اَڤْ، رُوٚژَا حُكِمْبِرِينِىٚ يَه، يَا كُو وَه بَاوَرِى پِىٚ نَدِئَانِى.

٢٢. (خُدِىٚ لِمَلَائِيكَتَانْ فَرْمَانْ دِكَه): سِتَمْكَارَانْ و هَڤَالِيٚنْ وَانْ لِهَڤْ بِجِڤِينِنْ و اَوِيٚنْ كُو عِبَادَتِىٚ وَانْ دِكِرِنْ...

٢٣. ژِ بِلِى خُدِىٚ. ڤِيٚجَه بَرِىٚ وَانْ بِدِنْ رِيٚكَا دُوژَهِىٚ.

٢٤. وَانْ (سِتَمْكَارَانْ) بِدِنْ سَكِنَانْدِنْ، بِيٚگُمَانْ اَوِىٚ بِيٚنَه پِرْسِيَارْكِرِنْ.

٢٥. (ژِ وَانْ رَه تِىٚ گُوٚتِنْ): اَرِىٚ مَا چِه ژِ وَه بُويَه كُو هُونْ ئَارِيكَارِيَا هَڤْ نَاكِنْ؟

٢٦. نَخيٚرْ! اَوْ اِيرُو (بِرَبَنِى) رَادَسْتْ بُونَه.

٢٧. هِنْ ژِ وَانْ بَرِىٚ خَوه دِدِنْ هِنَكَانْ و هَڤْ سُوجْدَارْ دِكِنْ.

٢٨. دِبيٚژِنْ: بِرَاسْتِى هُونْ بِهِيٚزْ دِهَاتِنْ مَه (وَ بِظُوٚرِىٚ اَمْ ژِ رِىٚ خِسْتِنْ).

**٢٩.** (پێشْرَوْ ژی ژِ پَیْرَوَانْ رَه وِهَا) دِبێژِنْ: نَا، بَلْكی وَه بَاوَری نَئَانیبُو..

**٣٠.** تُو هِیْزَا مَه یَا کُو اَمْ زُوْرِیٚ لِوَه بِکِنْ ژی نَبُو. لِێبَلِیٚ هُونْ بِخَوه جِقَاتَکه ژِرِیْدَرْکَتِی بُونْ.

**٣١.** ڤِێجَه عَذَابِیٚ خُدَایِیٚ مَه لِسَرْ مَه و لِسَرْ وَه پِێوِیسْتْ بُوّ. بێگُمَانْ اَمِیٚ ژی (وِی جَزَایِی) طَعْمْ بِکِنْ.

**٣٢.** ڤِێجَه مَه هُونْ ژِ رِیٚ خِسْتِنْ، لَوْرَا اَمْ بِخَوه ژی دِرێشَاشِیِیٚ دَه بُونْ.

**٣٣.** بێگُمَانْ وِیٚ رُوْژِیٚ دِعَذَابِیٚ دَه اَوْ هَڤْپَارِنْ.

**٣٤.** بِرَاسْتِی اَمْ، هَا بِڤِی ئَاوَایِی لِگُنَهْکَارَانْ دِکِنْ.

**٣٥.** بِرَاسْتِی اَوْ، دَمَا کُو ژِ وَانْ رَه دِهَاتْ گُوْتِنْ «ژِ خُدِیٚ پِیٚ ڤَه تُو اِلٰهْ تُنِنْ» وَانْ خَوه مَزِنْ دِدِیْرَانْ (قَبُولْ نَدِکِرِنْ).

**٣٦.** دِگُوْتِنْ: اَرِیٚ مَا اَمِیٚ ژِ بُوّ شَاعِرَکی دِینْ دَڤْ ژِ اِلٰهێنْ خَوه بَردِنْ؟

**٣٧.** نَخێرْ، وِی رَاسْتِی ئَانِیَه و ڤَاصِدێنْ (بَرِیَا خَوه) ژی رَاسْتْ دِیْرَانَه.

**٣٨.** بِرَاسْتِی هُونِیٚ (بِسَدَمَا کُفْرَا خَوه) عَذَابِیٚ دِژْوَارْ تَعْمْ بِکِنْ.

**٣٩.** بِتَنِیٚ هُونِیٚ بِیَا کُو وَه کِرِیَه بِێنَه جَزَاکِرِنْ.

**٤٠.** (ژِ ڤِی عَذَابِی) تَنِیٚ عَڤْدِێنْ خُدِیٚ یێنْ مُخْلِصْ دِیٚ مُعافْ بِێنَه کِرْتِنْ.

**٤١.** اَوِێنْ هَا، ژِ بُوّ وَانْ رِزْڤَکی ڤَبِرِی هَیَه.

**٤٢.** هَمُو تَخْلِیتێنْ فِێکیَانْ دِخُونْ و ڤَدْرِیٚ وَانْ تِیٚ گِرْتِنْ.

**٤٣.** دِبِهِشْتێنْ خَودِینِعْمَتْ دَه..

**٤٤.** لِسَرْ تَخْتَانْ، لِپێشْبَرِی هَڤْ رُونِشْتِی نَه.

**٤٥.** ژِ کَانِیێنْ هَرَكْ کَئَاسِێنْ مَیِیٚ لِسَرْ وَانْ رَه تێنْ گَرَانْدِنْ.

٤٦. شَرَابَكَه سِپِی يَه، لَزَّتِیێ دِدَه ڤَخورَانْ.

٤٧. نَه تِیێ دَه سَرْسَمْكِرِنْ هَيَه نَه ژِی پِیێ سَرْخَوشْ دِبِنْ.

٤٨. لِجَمْ وَانْ، ژِنێِنْ چَاڤِرِنْدْ و چَاڤْمَزِنْ هَنَه كُو تَنِیێ لِوَانْ (مێرِێنْ خَوه) دِنێرِنْ.

٤٩. هَرْ وَكِی اَوْ هێكێنْ ڤَشَارْتِيِنَه.

٥٠. هَا وِیێ چَاخِیێ، هِنْ خَلْكِیێ بِهِشْتِیێ بَرِیێ خَوه دِدِنْ هَڤْ؛ لِهَڤْ دِپرْسِنْ.

٥١. ژِ نَاڤْ وَانْ يَكْ دِبێژَه: بِرَاسْتِی هَڤَالَكِی مِنْ (لِدِنْيَايِیێ) هَبُو...

٥٢. (ژِ طِنَازْ ڤَه ژِ مِنْ رَه) دِگُوتْ: اَرِیێ مَا تُو ژِی ژِ وَانێِنْ كُو (بِسَاغْبُونَا پِشْتِی مِرِنِیێ) بَاوَرِی تێنِنْ؟

٥٣. اَرِیێ مَا دَمَا كُو اَمْ بِبِنْ ئَاخْ و حَسْتِی اَمِیێ بێنَه جِزَاكِرِنْ؟

٥٤. (وِی ژِ بِهِشْتِيَانْ رَه) گُوتْ: مَا هُونْ ژِی لِیێ نَانِهێرِنْ.

٥٥. ڤێجَه وِی چَاڤِیێ خَوه لِدُوژَهِیێ گَرَانْدْ، وِی دِيتْ كُو (هَڤَالِیێ وِی) دِنيڤِیێ دُوژَهِیێ دَه يَه.

٥٦. ژِیێ رَه گُوتْ: اَزْ بِخُدِیێ كِمْ، هِنْدِكْ مَابُو تُو مِنْ ژِی ژِ رِیێ بِبِی.

٥٧. اَگَرْ نَه ژِ قَنْجِيَا خُدَايِیێ مِنْ بُويَا، تَقَزْ اَزْ ژِی دِبُومْ ژِ دُوژَهِيَانْ.

٥٨. (دُوژَهِی گُوتْ): اَرِیێ مَا ڤێجَه اَمْ هَوْ دِمِرِنْ؟

٥٩. (جَنَّتِی گُوتْ): اَمْ ژِ مِرنَا خَوه يَا پێشِينْ پِیێ ڤَه نَامِرِنْ و اَمْ نَايێنَه عَذَابْدَايِنْ؟

٦٠. بێگُمَانْ اَڤَا كُو اَمْ گِهَانِیێ بِرَاسْتِی ژِی اَوْ رِزْگَارِيَا مَزِنَه.

٦١. ژِ بُوْ سَرْفِرَازِيَكَه وِسَا بِلا يێنْ كَارْكَرْ كَارْ بِكِنْ.

٦٢. (خُدىَ دبێژَه): مَا ژِ ئَاليىَ مێڤَانْدَارى ڤَه اَڤْ نِعْمَتێنْ مَه گُوٚتِى چێترِنْ يَانْ ژِى دَارَا رُولِىَ (زَقُّومىَ)؟

٦٣. بێگُمَانْ مَه اَوْ (دَارَا رُولِىَ) ژِ ظَالِمَانْ رَه كِرِيَه اِمْتِيحَانْ و جَرِبَانْدِنْ.

٦٤. بێگُمَانْ اَوْ دَارَكَه وِسَا يَه كُو ژِ بِنىَ دُوژَهِىَ هێشِينْ دِبَه.

٦٥. فێكيێنْ وِىَ هَرْ وَكِى كُو اَوْ سَرێنْ شَيطَانَانَه.

٦٦. بێگُمَانْ (دُوژَهِى) ژِىَ دِخُونْ، ڤێجَه اَوْ زِكێنْ خَوه ژِ وِىَ تِژِى دِكِنْ.

٦٧. پِشْتْرَه بِسَرْ خَوارِنَا زَقُّومىَ دَه ژِ وَانْ رَه ڤَخَوارِنَكَه (ژِ عَدَابْ و خُوِينىَ) تێكِلْهَڤْ هَيَه.

٦٨. پَاشىَ بِرَاسْتِى ڤَگَرَا وَانْ بِبَالْ دُوژَهِىَ ڤَه يَه.

٦٩. بێگُمَانْ وَانْ بَاڤْ و كَالێنْ خَوه دِنَاڤَا رِێشَاشِيىَ دَه دِيتِنْ.

٧٠. ڤێجَه وَانْ ژِى دِشُوٚپَا بَاڤْ و كَالێنْ خَوه دَه دِلَزَانْدْ.

٧١. صُوٚنْدْ بَه، (رَسُولىَ منْ!) گَلَكْ قَومێنْ بَرى وَانْ ژِى كَتِبُونْ ضَلالَتِىَ.

٧٢. بِصُوٚنْدْ، مَه ژِ نَاڤْ وَانْ، ژِ وَانْ رَه پێخَمْبَرْ شَانْدِنْ دَا كُو وَانْ هِشْيَارْ بِكِنْ.

٧٣. دَه بِنێرَه، كَا اَنْجَامَا وَانێنْ هَاتِنَه هِشْيَارْكِرِنْ چَاوَا بُويَه؟!

٧٤. ژِ بِلِى بَنْدَيێنْ خُدىَ يێنْ دِلْصَافِى (يێنْ كُو بَاوَرى ئَانِينْ اَوْ ژِ عَذَابْ خِلَاصْبُونَه).

٧٥. صُوٚنْدْ بَه، نُوحْ هَاوَارَا خَوه گِهَانْدَه مَه، ڤێجَه اَمْ چه خَوشْ بَرْسِڤْدَارِنْ.

٧٦. مَه نُوحْ و مَالْبَاتَا وِى ژِ تَنْگَاسِيَا مَزِنْ خَلاصْ كِرْ.

٧٧. مَه زُرِيتَا وِى تَنىَ لِسَرْ رُوِيىَ عَرْدَىَ هِشْتْ.

٧٨. مَه دِنَاڤْ يێنْ كُو دِپِشْتِى وِى (نُوحْ) دَه تِێنْ نَاڤىَ وِى بِقَنْجِى هێلَا.

٧٩. دِنَاڤْ تَمَامىَ عَالَمىَ دَه اِيمِنَاهِيَا ژِ كِرِێتِيَانْ ژِ نُوحْ رَه بَه!

٨٠. مُحَقَّقْ اَمْ بِڤِى ئَاوَايِى ڤَنْجِيكَارِێنْ رَاسْتْ و دُرِسْتْ خَلاتْ دِكِنْ.

٨١. بِرَاسْتِى نُوحْ، ژِ بَنْدَيێنْ مَه يێنْ بَاوَرْمَنْدْ بُوْ.

٨٢. پَاشِێ مَه يێنْ دِنْ (يێنْ كُو بَاوَرِى نَئَانِيبُونْ) بِنْئَاڤْ كِرِنْ و خَنِقَانْدِنْ.

٨٣. بێگُمَانْ يێنْ كُو لِسَرْ رِێكْ و رِێبَازَا نُوحْ دِچِنْ يَكْ ژِ وَانْ ژِى اِبْرَاهِيمَه.

٨٤. دَمَا (اِبْرَاهِيمْ) بِدِلَكِى پَاكْ و صَافِي هَاتَه جَمْ خُدَايِێ خوه..

٨٥. گَاڤَا كُو ژِ بَاڤِێ خوه و گَلِێ خوه رَه گُوْتْ: هُونْ عِبَادَتِێ چه دِكِنْ؟

٨٦. مَا هُونْ بِدَرَوَانْ هِنْ اِلٰهێنْ ژِ بِلِى خُدِێ دِخَوازِنْ؟

٨٧. نَاخوه دَرْ بَارِێ پَرْوَرْدَگَارِێ عَالَمِێ دَه حِزرْ و دِيتِنَا وَه چِى يَه؟

٨٨. ڤێجَه اِبْرَاهِيمْ بَرِێ خوه دَا سِتێرَانْ.

٨٩. (ژِ وَانْ رَه) گُوْتْ: بِرَاسْتِى اَزْ نَخُوشِمْ (نِكَارِمْ دَرْكَڤِمْ جَژْنِێ).

٩٠. پَاشِێ پِشْتَا خوه دَانَه اِبْرَاهِيمْ و چُونْ.

٩١. اِيجَارْ (اِبْرَاهِيمْ) بِدِزِيكَا بَرِێ خوه دَا بَالْ پُوتێنْ وَانْ و ژِ وَانْ رَه گُوْتْ: اَرِێ مَا چِمَا
هُونْ خَوارِنِێ نَاخُونْ؟!

٩٢. مَا ژِ بُوْ چِه هُونْ نَاپَێڤِنْ؟

٩٣. بِسَرْ پُوتَانْ ڤَه چُو و بِهێزْ اَوْ شِكَانْدِنْ.

٩٤. (گَاڤَا دِيتِنْ كُو پُوتێنْ وَانْ هَاتِنَه شِكَانْدِنْ) بِبَزْ بَرْ بِاِبْرَاهِيمْ ڤَه چُونْ.

٩٥. اِبْرَاهِيمْ گُوْتْ: مَا هُونْ عِبَادَتِێ تِشْتێنْ كُو وَه اَوْ چێكِرِنَه، دِكِنْ؟

٩٦. خُدِێ هُونْ ژِى و يَا كُو هُونْ دِكِنْ ژِى ئَافِرَانْدِيَه.

٩٧. (پُوتْپَرَسْتَانْ ژِ هَڤْ رَه) گُوتِنْ: ژِ بُوَ وِى ئَاڤَاهِيَكِىَ سَازْ بِكِنْ و دِجِهْ دَه وِى بَاڤِيْژِنْ اِيْگِرْ دَه!

٩٨. وَانْ خَوسْتْ لِابْرَاهِيمْ كَمِينِىَ چِيْكِنْ، ڤِيْجَه مَه اَوْ رَزِيلْ و رِسْوَا كِرِنْ.

٩٩. اِبْرَاهِيمْ گُوَتْ: اَزْ دِچِمْ بَالْ خُدَايِىَ خوه ڤَه، اَوِىَ مِنْ رَاسْتَرِىَ بِكَه.

١٠٠. گُوَتْ: خُدَايِىَ مِنْ! زَارُوكَكِى قَنْجِيكَارْ بِدَه مِنْ.

١٠١. پِشْتِى ڤِىَ مَه مِزْگِينَا كُرَكِى مُلائِيمْ و اِطَاعَتْكَارْ دَا اِبْرَاهِيمْ.

١٠٢. چه دَمَا كُرِىَ وِى گِهِيشْتَه چَاخَا كُو بِبَاڤِىَ خوه رَه بِگَرَه و دِگَلْ وِى كَارْ بِكَه، اِبْرَاهِيمْ ژِىَ رَه وِهَا گُوَتْ: كُرْكِىَ مِنُوَ! مِنْ دِخَوْنِىَ دَه دِيتِيَه كُو مِنْ تُو شَرْژِىَ دِكِرْ. ڤِيْجَه تُو چه دِبِيْژِى؟ وِى ژِى بَرْسِڤْ دَا و ژِىَ رَه گُوَتْ: بَاڤُو فَرْمَانَا كُو لِتَه هَاتِيَه كِرِنْ، بِجِهْ بِينَه. خُدِىَ حَزْكَه، تُو دِىَ مِنْ ژِ صَبِرْكِيْشَانْ بِبِينِى.

١٠٣. ڤِيْجَه دَمَا كُو هَرْدُو (ژِ اَمْرِىَ خُدِىَ رَه) تَسْلِيمْ بُونْ؛ اَوْ لِسَرْ ئَانِيَا وِى گِيْرْ كِرْ.

١٠٤. مَه بَانْگِى وِى كِرْ؛ اَىْ اِبْرَاهِيمْ!

١٠٥. بِرَاسْتِى تَه خَونْ بِجِهْ ئَانِى. بِيْگُمَانْ اَمْ بِڤِى ئَاوَايِى قَنْجِيكَارِيْنْ رَاسْتْ و دُرِسْتْ خَلاتْ دِكِنْ.

١٠٦. بِيْگُمَانْ اَڤَا هَا، هَرْ اِمْتِيحَانَكَه اَشْكَرَا يَه.

١٠٧. مَه قُرْبَانَكَه مَزِنْ كِرَه گُورِيَا وِى.

١٠٨. مَه دِنَاڤْ يِيْنْ كُو دِپِشْتِى وِى (اِبْرَاهِيمْ) دَه تِيْنْ نَاڤِىَ وِى بِقَنْجِى هِيْلا.

١٠٩. سِلاڤْ لِابْرَاهِيمْ بَه!

١١٠. هَا اَمْ بِڤِى ئَاوَايِى قَنْجِيكَارِيْنْ رَاسْتْ و دُرِسْتْ خَلاتْ دِكِنْ.

١١١. بِيْگُمَانْ اَوْ ژِ بَنْدِيِيْنْ مَه يِيْنْ بَاوَرْمَنْدْ بُوَ.

١١٢. مَه بِچِێبُونَا اِسْحَاقْ مِزْگِينْ دَايىَ كُو اَوْ پێِخَمْبَرَكِى ژِ صَالِحَانَه.

١١٣. مَه بَرَكَتَا خَوه دَا سَرْ وِى و دَا سَرْ اِسْحَاقْ. ژِ كِنِێسَا وَانْ هِنَكْ بَاشْ بُونْ و هِنَكْ ژِى ژِ بُوّ خَوه سِتَمْكَارِێنْ اَشْكَرَه بُونْ.

١١٤. صُوْنْدْ بَه، مَه قَنْجِيَا خَوه لِمُوسَا و هَارُونْ ژِى كِرْ.

١١٥. مَه اَوْ هَرْدُو و گَلِێنْ وَانْ ژِى ژِ تَنْگَاسِيَا مَزِنْ رِزْگَارْ كِرِنْ.

١١٦. مَه ئَارِيكَارِيَا وَانْ كِرْ، ڤِێجَه اَوْ هَرْ يِێنْ سَرْكَفْتِى بُونْ.

١١٧. مَه كِتِێبَا رُوّنَاكْ و اَشْكَرَا دَايَه وَانْ.

١١٨. مَه هَرْدُو لِسَرْ رِيَا رَاسْتْ رَاسْتَرِىْ كِرِنْ.

١١٩. مَه دِنَاڤْ يِێنْ كُو دِپِشْتِى هَرْدِيَانْ (مُوسَا و هَارُونْ) دَه تِێنْ نَاڤِىْ وَانْ بِقَنْجِى هِێلا.

١٢٠. سِلاڤْ لِمُوسَا و هَارُونْ بَه!

١٢١. بێِگُمَانْ اَمْ بِڤِى ئَاوَايِى قَنْجِيكَارِێنْ رَاسْتْ و دُرِسْتْ خَلاتْ دِكِنْ.

١٢٢. بِرَاسْتِى هَرْ دُو ژِى ژِ بَنْدَيِێنْ مَه يِێنْ بَاوَرْمَنْدْ بُونْ.

١٢٣. مُحَقَّقْ اِلْيَاسْ ژِى ژِ پێِخَمْبَرَانَه.

١٢٤. وِىْ دَمَا ژِ گَلِىْ خَوه رَه گُوّتْ، مَا هُونْ (ژِ خُدِىْ) نَاطِرْسِنْ؟

١٢٥. مَا هُونْ چِێتِرِينِىْ ئَافِرِينَرَانْ دِهێِلِنْ و هُونْ ژِ بَعْلِىْ رَه عِبَادَتِىْ دِكِنْ؟

١٢٦. كُو اَوْ پَرْوَرْدَگَارِىْ وَه و پَرْوَرْدَگَارِىْ بَاپِيرِێنْ وَه يِێنْ پێِشِينَه ژِى.

١٢٧. ڤِێجَه وَانْ بَاوَرِى پِىْ نَئَانِى و بێِگُمَانْ اَوِىْ (دِدُوژَهِىْ دَه) بێِنَه بَرْهَڤْكِرِنْ.

١٢٨. ژِ بِلِى بَنْدَيِێنْ خُدِىْ يِێنْ دِلْصَافْ (اَوْ ژِ ڤِىْ جُدَا نَه).

١٢٩. مَه دِنَاڤْ يِێنْ كُو دِپِشْتِى وِى (اِلْيَاسْ) دَه تِێنْ نَاڤِىْ وِى بِقَنْجِى هِێلا.

١٣٠. سِلاڤْ لِسَرْ اِلْيَاسِينْ به!

١٣١. بێگُمَانْ اَمْ بِڤِى ئَاوَايِى ڤَنْجِيكَارِێنْ رَاسْتْ و دُرِسْتْ خَلاتْ دِكِنْ.

١٣٢. بِرَاسْتِى اَوْ ژِى ژ بَنْدَيێنْ مه يێنْ بَاوَرْمَنْدْ بُوْ.

١٣٣. بێگُمَانْ لُوطْ ژِى ژ پێخَمْبَرَانَه.

١٣٤. وِىَ دَمِىَ مَه لُوطْ و مَالْبَاتَا وِى تَڤْ رِزْگَارْ كِرِنْ..

١٣٥. ژ بِلِى پِيرَژِنَكِىَ؛ اَوْ دِگَلْ يێنْ لِپَاشْ، مَا.

١٣٦. پِشْتْرَه مَه يێنْ دِنْ بِرِنْ هَلاكِىَ.

١٣٧. بێگُمَانْ هُونْ سِبَهَانْ دِبَرْ (جِهْ و وَارِێنْ) وَانْ رَه دِبهُرِنْ...

١٣٨. اِيڤَارَانْ ژِى. مَا هِىَ ژِى هُونْ ئَاقِلْ نَاگِرِنْ؟

١٣٩. بێگُمَانْ يُونُسْ ژِى ژ پێخَمْبَرَانَه.

١٤٠. دَمَا (ژ گَلِىَ خَوه) رَڤِيَا چُوبُو كَشْتِيَا بَارْكِرِى.

١٤١. ڤێجَه يێنْ دِكَشْتِيِىَ دَه پِشْكْ ئَاڤِێتِنْ، اِيجَارْ يُونُسْ بُوْ ژ يێنْ كُو پِشِكْلِێكَتِى.

١٤٢. پَاشِىَ (پِشْتِى يُونُسْ ئَاڤێتِنْ بَحْرِىَ) مَاصِى يُونُسْ دَابَلانْدْ و اَوْ بُوْ ژ يێنْ كُو لُوْمَه
لِوَانْ بُويَه.

١٤٣. بِرَاسْتِى، اَگَرْ اَوْ نَه ژ وَانِێنْ كُو خُدِىَ پَاكْ دِدێرَانْ بُويَا..

١٤٤. دِىَ حَيَانِى رُوْژَا ڤِيَامَتِىَ دِ زِكِىَ مَاصِى دَه بِمَايَا.

١٤٥. پَاشِىَ مَه اَوْ (ژ زِكِىَ مَاصِى) ئَاڤێتْ بَژَاهِيِىَ و اَوْ نَخوشْحَالْ بُوْ.

١٤٦. مَه دَارَكَه ژ كُنْدِرَانْ لِسَرْ وِى هێشِينْ كِرْ (دَا كُو سِيَا خَوه بِدَه سَرْ وِى).

١٤٧. (پِشْتِى كُو سِحَّتَا وِى هَاتَه جِهْ) مَه اَوْ (بِيِێخَمْبَرِى) ژِ سَدْ هَزَارَانْ و هِىٚ بێهتِرِى رَه شَانْدْ.

١٤٨. ڤێجه وَانْ بَاوَرِى بِيُونُسْ ئَانِينْ، اِيجَارْ مَه حَيَا دَمَكِىٚ ژِيَانَكه خَوشْ دَا وَانْ.

١٤٩. ژِ وَانْ بِپِرْسَه: اَرِىٚ مَا كَچْ يێنْ خُدَايىٚ تَه نَه و كُرْ ژِى يێنْ وَانِنْ؟

١٥٠. يَانْ ژِى، دَمَا كُو مَه مَلائِيكَتْ كَچْ ئَافِرَانْدِنْ، اَوْ لِورْ حَازِرْ بُونْ؟

١٥١. ئَاگَاهدَارْ بِنْ! بِرَاسْتِى اَوْ بِدَرَوْ و بێبَخْتِى دِبێژِنْ...

١٥٢. كُو خُدِىٚ (فِرِيشْتَه) وَلِدَانْدِنَه. بێگُمَانْ اَوْ هَرْ دَرَوَانْ دِكِنْ.

١٥٣. ڤَىْ خُدِىٚ، كَچْ دِسَرْ كُرَانْ رَه گِرْتِنَه؟!

١٥٤. چِه بوَه هَاتِيَه، هُونْ چَاوَا حُكِمْ دِدِنْ؟

١٥٥. مَا هُونْ ڤَتْ نَافِكِرِنْ؟

١٥٦. يَانْ ژِى دَلِيلَكه وَه يَا اَشْكَرَا هَيَه؟

١٥٧. ڤێجه اَگَرْ بِرَا هُونْ رَاسْتْ دِبێژِنْ، دَه كَا كِتێبَا خَوه بِينِنْ!

١٥٨. وَانْ دِنَقَبَا خُدِىٚ و جِنَانْ دَه خِزمْتِى دَئَانِينَه. صُوْنْدْ بَه، جِنْ ژِى دِزَانِنْ كُو بِرَاسْتِى اَوێنْ بێنَه بَرْهَڤْكِرِنْ.

١٥٩. خُدِىٚ ژِ يَا كُو اَوْ وِى پِىٚ دوَصِفِينِنْ پَاكْ و بِلِنْدَه.

١٦٠. ژِ بِلِى بَنْدَيێنْ خُدِىٚ يێنْ مُخْلِصْ (اَوْ ژِ ڤِىٚ جُدَا نَه).

١٦١. بِرَاسْتِى هُونْ و اَوێنْ كُو هُونْ پَرْسْتِنَا وَانْ دِكِنْ...

١٦٢. هُونْ نِكَارِنْ تُو كَسِى ژِ رِىٚ بِخِنْ.

١٦٣. ژِ بِلِى كَسِىٚ كُو دِىٚ بِچه دُوژَهِىٚ.

١٦٤. (مَلَائِیکَتْانْ گُوٚتْ): ژِ بُوٚ هَرْ یَکِی ژِ مه مَقَامَکِی کِفْشْکِرِی هَیَه.

١٦٥. بێگُمَانْ اَمْ، هَرْ اَوێنْ کُو صَفْ دِگِرِنْ...

١٦٦. بِرَاسْتِی ژِی اَمْ هَرْ اَوێنْ کُو خُدِیٚ ژِ هَرْ پُوچِیِیٚ پَاكْ دِدێرِنْ.

١٦٧. هَرْ چِقَاسْ وَانْ دِگُوٚتْ...

١٦٨. اَگَرْ کِتێبَكْ ژِ کِتێبێنْ پێشیَانْ لِجَمْ مَه هَبُویَا..

١٦٩. تَقَزْ اَمِیٚ ژِی بِبُونَا بَنْدَیێنْ خُدِیٚ یێنْ دِلْصَافْ!

١٧٠. ڤێجَه (دَمَا کِتێبْ ژِ بُوٚ وَانْ هَاتْ) وَانْ بَاوَرِی پِیٚ نَئَانِی. پَاشِیٚ اَوِیٚ بِزَانِنْ کَا دُومَاهِیکَا وَانْ دِیٚ بِبَه چه.

١٧١. صُوٚنْدْ بَه، مَه ژِ بَنْدَیێنْ خَوه یێنْ پێخَمْبَرْ رَه سُوٚزْ دَابُو..

١٧٢. بِرَاسْتِی سَرْکَفْتِنْ هَرْ ژِ وَانْ رَه یَه.

١٧٣. بێگُمَانْ لَشْکَرێنْ مَه ژِی تَقَزْ دِیٚ بِسَرْ کَڤِنْ.

١٧٤. (یَا مُحَمَّدْ!) ڤێجَه حَتَا دَمَکِیٚ تُو بَرِیٚ خَوه ژِ وَانْ ڤَگَرِینَه.

١٧٥. تُو چَاڤْنێرِیَا وَانْ بِکَه، اَوْ ژِی دِیٚ بِبِینِنْ.

١٧٦. اَرِیٚ مَا ڤێگَا اَوْ بِلَزْ عَذَابْ ژِ مَه دِخَوازِنْ؟

١٧٧. ڤێجَه دَمَا کُو دَاکَڤَه قَادَا وَانْ، سِبَهَا وَانێنْ کُو هَاتِنَه هِشْیَارْکِرِنْ، چِقَاسْ پِیسْ دِبَه!

١٧٨. تُو حَتَا دَمَکِیٚ بَرِیٚ خَوه ژِ وَانْ ڤَگَرِینَه.

١٧٩. چَاڤْنێرِیِیٚ بِکَه، اَوِیٚ ژِی دِیٚ بِبِینِنْ.

١٨٠. پَرْوَرْدَگَارِیٚ تَه، اَوِیٚ کُو خَودِیِیٚ عِزَّتْ و رُومَتِیٚ یَه، ژِ یَا کُو اَوْ وِی پِیٚ دوَصِفِینِنْ پَاکَه، بِلِنْدَه.

١٨١. سِلاڤْ لِهَمُو پِيٚخَمْبَرَانْ بِنْ!

١٨٢. حَمْدْ (پَسْنْ و سِپَاسِى) ژِ پَرْوَرْدَگَارِىٚ عَالَمِىٚ رَه بَه.

# ٣٨. سُورَه يِىٚ صَادْ

سُورَه يِىٚ (صَادْ)، ٨٨ (هَشْتِىٚ و هَشْتْ) ئَايَتَه. پِشْتِى سُورَه يِىٚ قَمَرِىٚ لِمَكَّىٚ نَازِلْ بُويَه.

بِنَاڤِىٚ خُدَايِىٚ كُو رَحْمَنَ رَحِيمَ

١. صَادْ! صُوٚنْدْ بَه، بِڤِىٚ قُرْئَانَا كُو خُدَانْ پَنْدُ و شِيرَتَه.

٢. نَخِيٚرْ، بَلْكِى اَوِيٚنْ كُو كَافِرْ بُونَه دِنَاڤْ قُرَتِى و دِژْبَرِيَكِىٚ دَه نَه.

٣. بَرِيَا وَانْ مَه گَلَكْ مِلَّتْ بِرِنَه هَلَاكِىٚ. ڤِيٚجَه وَانْ (دَمَا عَذَابْ دِدِيتِنْ) گَازِى و هَاوَارْ
دِكِرْ، (لِيٚبَلِىٚ) دَمْ نَه دَمَا خَلاسِى و رَڤِىٚ بُوٚ.

٤. اَوْ (يِيٚنْ كُو كَافِرْ بُونَه) عَجِيٚبْ دِيتِنْ كُو ژِ نَاڤْ وَانْ پِيٚخَمْبَرَكْ ژِ وَانْ رَه بِىٚ. كَافِرَانْ
دِگُوٚتْ: اَڤْ، سِيٚرْبَازَكِى پِرْ دَرَوْكَارَه!

٥. اَرِىٚ مَا اَوْ تَڤِكِى اِلٰهانْ دِكَه يَكْ اِلٰهْ، بِرَاسْتِى ژِى اَڤْ تِشْتَكِى پِرْ عَجِيٚبَه!

٦. گِرَه گِرْ و مَزِنِيٚنْ وَانْ دَرْكَتِنْ و (ژِ هَڤْ رَه) گُوٚتِنْ: لِسَرْ يَا خَوه بَرْدَوَامْ بِنْ، لِسَرْ پَرَسْتِنَا
پُوتِيٚنْ خَوه صَبْرُ و سَبَاتْ بِكِنْ. بِيٚشِكْ اَڤَا كُو ژِ وَه تِىٚ خَوهسْتِنْ تِشْتَكِى مَزِنَه.

٧. مَه تِشْتَكِى وِسَا دِ دِينِىٚ ڤِىٚ دَاوِيِىٚ دَه ژِى نَبِهِيسْتِيَه. بَسْ اَڤْ تِشْتَكَه كُو وِى ژِ جَمْ
خَوه دَرْخِسْتِيَه.

٨. اَرِىٚ مَا ژِ نَاڤْ مَه هَمُويَانْ اَڤْ قُرْئَانْ، بِتَنِىٚ ژِىٚ رَه هَاتْ؟ (خُدِىٚ گُوٚتْ): بَلْكِى اَوْ
دَرْحَقِىٚ قُرْئَانَا مِنْ دَه دِ گُمَانِىٚ دَه نَه. نَخِيٚرْ! بَلْكِى وَانْ هِيٚژْ عَذَابِىٚ مِنْ تَعْمْ نَكِرِيَه.

٩. یَانْ ژِی، مَا خَزِینَیێنْ قَنْجِیَا خُدَایێ تَه لِجَمْ وَانِنْ، اَوێ کُو دَسْتْهِلاتێ دَایَنْدَه یَه؟!

١٠. یَانْ ژِی، مَا خُدَانِییَا عَرْدُ و ئَاسمَانَانْ و یێنْ دِنَاڤْبَرَا وَانْ دَه ژ وَانْ رَه یَه؟ ڤێجَه (کُو وِسَا بَه) دَه بِلا بِهَمُو نَاڤگِینَانْ هِلْکِشِنْ ئَاسِیمَانَانْ (و اَوْ کِێ بِڤێنْ بِلا وَحْیێ بِدِنِێ)!.

١١. اَوْ ئَارْتێشَکَه بێخِێرَه کُو ژِ چَنْدْ قَفِیلانْ پێکْ تِێ، لِورْ تێکچُویی یَه.

١٢. بَرِیَا وَانْ، گَلِێ نُوحْ، گَلِێ عَادْ و فِرْعَونِێ کُو خُدَانْ هێزْ و سَلطَنَتْ بُوْ، بِپێخَمْبَرێنْ خَوه بَاوَرِی نَئَانِیبُونْ.

١٣. قَوْمِێ سَمُودْ، قَوْمِێ لُوطْ و خَلْکِێ اَیْکَتِێ ژِی (بِپێخَمْبَرێنْ خَوه بَاوَرِی نَئَانِیبُونْ). هَا اَڤْ تَڤْ هَڤَالْبَنْدێنْ هَڤِنْ.

١٤. تَڤْکِێ وَانْ بِپێخَمْبَرێنْ خَوه بَاوَرِی نَئَانِینْ، ڤێجَه عَذَابْ لِسَرْ وَانْ مِسُوگَرْ بُوْ.

١٥. اَڤِێ هَانْ ژِی، بَسْ چَاڤنێرِیَا یَکْ قِیرَکِێ دِکِنْ، (گَاڤَا کُو اَوْ بِێ) ژِێ رَه ڤَگَرْ و رَاوَسْتَانْ تُنَه یَه.

١٦. (کَافِرَانْ ) گُوتِنْ: خُدَایێ مَه! بَرِیَا رُوْژَا حَسَابْدِیتِنِێ، پَارَا مَه (ژِ جَزَا) زُو بِدَه مَه.

١٧. (یَا مُحَمَّدْ!) خَوه لِهَمْبَرِی یَا کُو اَوْ دِبێژِنْ رَاگَرَه و عَڤْدِێ مَه دَاوُدْ دِبِیرَا خَوه بِینَه کُو اَوْ خُدَانْهێزْ بُوْ. بِرَاسْتِی ژِی بَرِێ وِی هَرْ بِبَالْ خُدِێ ڤَه بُوْ.

١٨. بِرَاسْتِی مَه چِیَا مِسخُرْ کِرِنْ، هَمُویَانْ، سِبَهْ و اِیڤَارِێ لِگَلْ وِی تَسْبِیحْ دِدَانْ.

١٩. هَمْ (مَه) طَیْرْ ژِی (ژِێ رَه مِسخُرْ کِرِبُونْ کُو ژِ هَرْ ئَالِیێ ڤَه لِێ) کُومْ دِبُونْ؛ هَمِیَانْ تَسْبِیحْ لِێ ڤَدِگَرَانْدِنْ.

٢٠. مَه حُکِمْرَانِیَا وِی خُرْتْ کِرْ، مَه حِکْمَتْ و قَابِلِیتَا ئَاخَافْتِنَکَه خَوشْ و زَلالْ دَابُویێ.

٢١. مَا خَبَرَا هَرْ دُو دَاعْوَدَارَانْ دَمَا بِسَرْ دِیوَارِێ مِحْرَابِێ کَتِنْ ژِ تَه رَه نَهَاتْ؟

٢٢. وِێ دَمَا (هَرْ دُو دَاعْوَدَارْ)کَتِنْ جَمْ دَاوْدْ، ڤێجَه ژِ وَانْ طِرْسِیَا. ژِێ رَه گُوتِنْ: مَطِرْسَه،

اَمْ دُو دَاعْوَدَارِنْ؛ يَكى ژِ مه نَحَقِى لِيىٚ دِنْ كِرِيَه، دَه دِنَاڤْبَرَا مه دَه تُو بِعَدَالَتِى حُكِمْ بِكَه، نَحَقِيىٚ نَكَه و مَه لِسَرْ رِيَا رَاسْتْ رَاسْتَرِىٚ بِكَه.

**٢٣.** (يَكى ژِ وَانْ گُوٚتْ): اَڤْ بِرَايِىٚ مِنَه، نُوٚتْ و نَه مِيٚشِنيٚنْ وِى هَنَه و يِىٚ مِنْ ژِى يَكْ مِيٚشِنَكَه بِتَنِىٚ يَه. ژِ مِنْ رَه دِبيٚژَه: وِىٚ ژِى بِدَه مِنْ و بِخَبَرْدَانِىٚ ظُوٚرَا مِنْ بِرِيَه.

**٢٤.** دَاوُدْ ژِىٚ رَه وِهَا گُوتْ: صُوٚنْدْ بَه؛ وِى بِخوسْتِنَا مِيٚشِنَا تَه، ژِ بُوٚ بِخَه نَاڤْ مِيٚشِنيٚنْ خوه نَحَقِى لِتَه كِرِيَه. بِيٚگُمَانْ پِرِيٚنْ شَرِيكَانْ، تَجَاوزِى مَافِىٚ هَڤْ دِكِنْ. لِيٚبَلِىٚ شَرِيكيٚنْ كُو بَاوَرِى بِينِنْ و كَارِيٚنْ قَنْجْ بِكِنْ اَوْ جُدَا نَه، اَوْ ژِى پِرْ پِرْ هِنْدِكِنْ! دَاوُدْ بَاوَرْ كِرْ كُو مَه اَوْ اِمْتِيحَانْ كِرِيَه. ڤِيٚجَه ژِ خُدَايِىٚ خوه لِيٚبُورِينْ خَوسْتْ، چُو سِجُودِىٚ و تُوٚبَه كِرْ.

**٢٥.** (خُدِىٚ گُوٚتْ) ڤِيٚجَه اَمْ ژِى لِىٚ بُورِينْ. بِيٚگُمَانْ لِجَمْ مَه ژِىٚ رَه مَقَامَكى بِلِنْدْ و لِيٚڤَگَرَكَه سِپَحِى هَيَه.

**٢٦.** اَىْ دَاوُدْ! مَه تُو لِسَرْ عَرْدِىٚ كِرِى شُونگِرْ. ڤِيٚجَه دِنَاڤْبَرَا مِرُوٚڤَانْ دَه بِعَدَالَتِى حُكِمْ بِكَه و نَدَه دُوڤْ نَفْسِىٚ، ڤِيٚجَه اَوِىٚ تَه ژِ رِيَا خُدِىٚ شَاشْ بِكَه. بِيٚگُمَانْ اَوِيٚنْ كُو ژِ رِيَا خُدِىٚ شَاشْ بِبِنْ، بِسَدَمْ كُو وَانْ رُوٚژَا حَسَابِىٚ ژِبِيرْ كِرِيَه ژِ وَانْ رَه عَذَابَكى دِژْوَارْ هَيَه.

**٢٧.** مَه عَرْدُ و ئَاسِيمَانْ و يِيٚنْ دِنَاڤْبَرَا وَانْ دَه مِشِيٚيَا چِيٚنَكِرِيَه. اَڤْ (ئَا كُو دِبيٚژِنْ اَوْ مِشِيٚيَا يَه) گُمَانَا وَانِيٚنْ كُو كَافِرْ بُونَه. ڤِيٚجَه هَىْ وَاخْ لِحَالِىٚ كَافِرَانْ بَه، ژِ بَرْ كُو دِىٚ بِكَڤِنْ اِيٚگِرْ!

**٢٨.** اَرِىٚ مَا اَمِىٚ وَانِيٚنْ كُو بَاوَرِى ئَانِينْ و كَارِيٚنْ قَنْجْ كِرِنْ و وَانِيٚنْ كُو لِسَرْ اَرْدِىٚ فَسَادِيِىٚ دِكِنْ وَكْ هَڤْ بِگِرِنْ. يَانْ ژِى اَمِىٚ وَانَيٚنْ كُو خَوه ژِ عَذَابِىٚ خُدِىٚ بِپَارِيٚزِنْ و وَانِيٚنْ كُو ژِ رِيَا رَاسْتِى دَرْكَتِنَه وَكْ هَڤْ بِگِرِنْ؟

**٢٩.** مَه اَڤْ قُرْئَانْ ژِ بُوٚ تَه نَازِلْ كِرْ كُو اَوْ پِيرُوزَه، دَا كُو دِ ئَايَتيٚنْ وِىٚ دَه بِفِكِرِنْ و ئَاقِلْمَنْدْ ژِىٚ شِيرَتِىٚ بِگِرِنْ.

**٣٠.** مَه (کُرَكْ بِنَاڤێ) سُلَیْمَانْ دَایَه دَاوُدْ. سُلَیْمَانْ چِه خَوشْ بَنْدَه بُوّ! بِرَاسْتِی ژی اَوْ پِرْ تُوّبَکَارْ بُوّ.

**٣١.** دِبیرْ بینَه؛ دَمَا دچَاخێ اِیْڤَارێ دَه ژێ رَه هَسْپێنْ رَوَانْ هَاتِنْ رَاپێشْکِرِنْ.

**٣٢.** سُلَیمَانْ گُوّتْ: بێگُمَانْ ژِ بُوّ کُو اَزْ خُدَایێ خَوه دِبیرْ بینِمْ (و دِینێ وی بِهێزْ بِکِمْ) مِنْ ژِ هَسْپَانْ حَزْکِرِیَه. (هَسْپْ دَانَه بَزَانْدِنْ) حَیَانِی ژِ بَرْ چَاڤَانْ وِنْدَا بُونْ.

**٣٣.** (پَاشێ گُوّتْ) وَانْ ژِ مِنْ رَه بینِنْ، (پِشْتِی ئَانینْ) پِی و سِتُوییْنْ وَانْ مِزْدَانْ (دَا کُو بِزَانَه کَا دِوَانْ دَه نَخَوشِی هَیَه یَانْ نَا).

**٣٤.** صُوّنْدْ بَه؛ مَه سُلَیْمَانْ اِمْتِیحَانْ کِرْ؛ مَه جَسَدَكْ ئَاڤێتْ سَرْ تَخْتِێ وِی. پِشْتْرَه وِی تُوّبَه کِرْ و لِخُدَایێ خَوه ڤَگَرِیَا.

**٣٥.** وِهَا دُعَا کِرْ: خُدَایێ مِنْ! لِمِنْ بِبُورَه، حُکِمْدَارِیَکَه وِسَا بِدَه مِنْ کُو پِشْتِی مِنْ تُو کَسْ نَگِهیژَه وِێ. بێگُمَانْ هَرْ تُویِی یێ دَایَنْدَه.

**٣٦.** ڤێجَه مَه ژێ رَه بَا سْتُوخُوارْ کِرْ کُو دَڤَرَا اَوْ بِخَوازَه دێ بِفَرْمَانَا وی بِنَرْمَاهِی بِگَرَه.

**٣٧.** (مَه ژێ رَه) شَیْطَانْ ژی (مِسخُرْ کِرِنْ)؛ چِڤَاسْ یێنْ کُو هُوّسْتَا و غَوَّاصْ بُونْ (کُو ژێ رَه قَصرْ لِێ دِکِرِنْ و ژِ بَحْرِێ جَوْهَرْ دَرْتَانینْ)..

**٣٨.** هِنَکَه دِنْ ژی کُو بِقَیْدَانْ گِرێدَایِی بُونْ.

**٣٩.** (مَه ژێ رَه) گُوّتْ: هَا دَانَا مَه اَڤَه. ڤێجَه تُو دخَوازِی بِدَه ئَانْ ژی دِخَوازِی نَدَه، تُو ژێ نَایێ پِرْسیَارْکِرِنْ.

**٤٠.** بێگُمَانْ لِنِكْ مَه، مَڤَامَکِی وِی یِی بِلِنْدْ و لِێڤَگَرَکَه رِنْدْ هَیَه.

**٤١.** (هَێ مُحَمَّدْ) بَحْسَا بَنْدَیێ مَه اَیُوبْ بِکَه، وِێ دَمَا گَازِی خُدَایێ خَوه کِرْ: بێگُمَانْ شَیْطِێنْ مَشَقَتْ و ئَازَارْ گِهَانْدِیَه مِنْ.

٤٢. (مَه ژِىَ رَه گُوْتْ): لِنْگِىَ خَوه لِعَرْدِىَ بِخَه. اَڤْ ئَاڤَكَه سَارَه ژِ بُوْ ڤَخْوارِنْ و شُوشْتِنِىَ يَه.

٤٣. مَه ژِنْ و زَارُوكِيْنْ وِى و بِقَاسِى وَانْ ژِى هِنَكِى دِنْ لِىَ ڤَگَرَانْدِنْ، اَڤْ دِلُوڤَانِيكَه ژِ جَمْ مَه بُوْ يَه و ژِ بُوْ ئَاقِلْدَارَانْ بِيرْئَانِينَكَه.

٤٤. (مَه ژِ اَيوبْ رَه گُوْتْ): رَاهِيْژَه بَاقَكِى بِدَسْتْ خَوه بِگِرَه، ڤِيْجَه بِوَانْ لِىَ بِدَه و نَكَڤَه گُنَهِىَ. بِيْگُمَانْ مَه اَيُّوبْ عَقْدَكِى صَبِرْكِيْشْ دِيتْ؛ چِه خَوشْ عَقْدَه اَوْ! بِيْگُمَانْ اَوْ پِرْ تُوبَكَارْ بُوْ.

٤٥. بَحْسَا بَنْدَيِيْنْ مَه اِبْرَاهِيمْ، اِسْحَاقْ و يعْقُوبْ ژِى بِكَه، اَوِيْنْ كُو خُدَانْهِيْزْ، شَارَزَا و خَودَانْ بَصِيرَتْ بُونْ.

٤٦. بِيْگُمَانْ مَه اَوْ ژِ بُوْ خَوه بِخَصْلَتِيْنْ پَاقِژْ بِژَارْتِنْ كُو اَوْ هَرْتِمْ لِئَاخْرَتِىَ دِفِكرِينْ.

٤٧. بِيْگُمَانْ اَوْ لِجَمْ مَه ژِ قَنْجِيكَارِيْنْ بِژَارْتَه نَه.

٤٨. بَحْسَا اِسْمَاعِيلْ، اَلِيَسَعِى و زُولْكِفِلْ ژِى بِكَه. هَمُو ژِى ژِ بِژَارْتِيَانِنْ.

٤٩. هَا اَڤْ (بَحْسَا ڤَانْ پِيْخَمْبَرَانْ) بِبِيرْئَانِينَكَه. بِيْگُمَانْ ژِ بُوْ يىَ مُتَّقِى تَڤَزْ لِيْڤَگَرَكَه رِنْدْ هَيَه..

٥٠. كُو بِهِشْتِيْنْ لِيْمَايِنِىَ نَه، دَرگَهِيْنْ وَانْ لِتَاڤِىَ (ژِ وَانْ رَه) ڤَكِرِى نَه.

٥١. اَوْ تِىَ دَه (لِسَرْ تَخْتَانْ) پَالْدَايِى نَه، اَوْ تِىَ دَه گَلَكْ فِيْكِى و ڤَخْوارِنَانْ دَاخْوازْ دِكِنْ.

٥٢. لِجَمْ وَانْ دِيلْبَرْ هَنَه كُو چَاڤِيْنْ وَانْ تَنِىَ لِمِيْرِىَ وَانِنْ كُو ژِ هَڤْ رَه هَڤْسَالِنْ.

٥٣. هَا اَڤِنْ، تِشْتِيْنْ كُو ژِ بُوْ رُوْژَا حَسَابْدِيتِنِىَ سُوْزَا وَانْ ژِ وَه رَه هَاتِيَه دَايِنْ.

٥٤. بِيْگُمَانْ اَڤْ، دَايِنَا مَه يَه كُو ژِىَ رَه هِيچْ ڤَدَانْدِنْ نِينَه.

٥٥. اَڤْ وِسَا يَه، بِرَاسْتِى ژِ كَافِرِيْنْ سَرْخَوڤَچُويِى رَه عَاقِيبَتَكَه پِرْ خَرَابْ هَيَه..

**٥٦.** عَاقِیبَتَا وَانْ دُوژَهه. اَوْ دُوژَه چه پیسْ لِڤینَه.

**٥٧.** هَا اَوْ جزَا، ئَاڤَکَه کَلی، سِژْ و عَدَابَه، اِیْدِی بِلا وِی عَذَابی تَعْمْ بِکِنْ.

**٥٨.** مِینَا ڤِی عَذَابی (ژِ بُوٚ وَانْ) هِنْ عَذَابێنْ دِنْ ژِی هَنَه.

**٥٩.** (ژِ گرَه گِرْ و سَرُوکێنْ کَافرَانْ رَه دِیٚ بێگُوٚتِنْ): هَا اَڤْ جِڤَاتْ (لِدِنْیَاییٚ دُوڤْکَتِیێنْ وَه بُونْ) دِگَلْ وَه نُوڤِی دُوژَهیٚ دِبِنْ. (گِرَه گِرْ و سَرُوکْ دِیٚ بێژِنْ): هُونْ نَه بِخێرْ و نَه بِسَلامَتِی هَاتِنْ! بێگُمَانْ اَویٚ بِکَڤِنْ ئَاگِریٚ جهَنَّمِیٚ.

**٦٠.** (دُوڤْکَتِی ژِی ژِ سَرُوکێنْ خَوه رَه) دِبێژِنْ: نَخێرْ، بَلْکِی هُونْ نَه بِخێرْ و نَه بِسَلامَتِی هَاتِنْ! وَه اَڤْ ئَانِی پێشِیَا مَه. ڤێجه اَڤْ چه پیسْ وَارْگَهه!

**٦١.** دیسَا اَوْ دِبێژِنْ: خُدَاییٚ مَه! کِی اَڤْ ئَانِیبَه پێشِیَا مَه، تُو عَذَابیٚ وِی دِجَهْنَمِیٚ دَه قَاتْ قَاتْ زێدَه بِکَه!

**٦٢.** (سَرُوکْ و گِرَه گِرێنْ کَافِرْ) دِبێژِنْ: اَریٚ مَا ژِ بُوٚ چه اَمْ وَانْ زِلامێنْ کُو مَه اَوْ ژِ خَرَابَانْ دِحَسِبَانْدِنْ لِڤِرْ نَابِینِنْ؟

**٦٣.** یَانْ مَه بِخَلَتِی طِنَازێنْ خَوه بِوَانْ دِکِرْ (ڤێجه اَوْ بَاشْ بُونْ) یَانْ ژِی اَوْ دِ اِیْگِرْ دَه نَه، ژِ بَرْ چَاڤێنْ مَه وِنْدَا بُونَه؟

**٦٤.** بێگُمَانْ اَڤْ هَڤْرکِیَا دُوژَهیَانْ (دِڤِی شَکْلِی دَه) رَاسْتَه و تَقَزْ دِیٚ مِسُوگَرْ بِبَه.

**٦٥.** (هَیْ مُحَمَّدْ) بِبێژَه: اَزْ بَسْ هِشیَارکَرکِمْ، ژِ خُدِیٚ پِیٚ ڤَه تُو مَعْبُودیٚ حَقْ تُنَه، اَوْ خُدَاییٚ کُو هَرْ یَکَه و هێزْشکێنیٚ هَرْ هێزیٚ یَه.

**٦٦.** (اَوْ) پَرْوَرْدَگَاریٚ عَرْدُ و ئَاسِیمَانَانَه و پَرْوَرْدَگَاریٚ چِڤَاسْ تِشْتیٚ دِنَاڤْبَرَا وَانْ دَه یَه، اَویٚ کُو دَسْتْهِلاتَه ایٚ گُنَهْژێبرَه.

**٦٧.** بِبێژَه: اَڤْ قُرْئَانْ خَبرَکَه گَلَکْ مَزِنَه.

٦٨. هُونْ ژِی بَرِیْ خَوه ژِیْ ڤَدگَرِینِنْ.

٦٩. تُو زَانَبُونَا مِنْ، بِحِڤَاتَا بِلِنْدْ (ئَا مَلَائِیکَتَانْ) دَمَا کُو وَانْ (دَرْ بَارِیْ چێکِرِنَا ئَادَمْ دَه) دِنَاڤْ خَوه دَه مُنَاقَشَه دِکِرْ تُنَه بُوْ (اَگَرْ کُو نَه ژِ وَحْیِیْ بُویَا).

٧٠. ژِ بُوْ مِنْ وَحِی تِیْ کُو اَزْ بَسْ هِشِیَارْکَرَکِی اَشْکَرَا مَه.

٧١. وِیْ دَمِیْ خُدَایِیْ تَه ژِ مَلَائِیکَتَانْ رَه گُوْتْ؛ بێگُمَانْ اَزِیْ ژِ حَرِیِیْ مِرُوْڤِکِی بَئَافِرِینِمْ.

٧٢. ڤێجَه دَمَا مِنْ اَوْ تَمَامْ کِرْ و مِنْ ژِ جَمْ خَوه رُحْ بَرْدَایِیْ، ڤێجَه هَمَنْ ژِیْ رَه هَرِنْ سِجُودِیْ.

٧٣. اِیجَارْ هَمُو مَلَائِیکَتْ ژِیْ رَه چُونَه سِجُودِیْ.

٧٤. لِێبَلِیْ اِبْلِیسْ نَچُو سِجُودِیْ؛ وِی خَوه مَزِنْ دِێرَا و اَوْ بُوْ ژِ کَافِرَانْ.

٧٥. خُدِیْ ژِیْ رَه گُوْتْ: اَیْ اِبْلِیسْ! اَوْ چِه تِشْتْ بُوْ نَهێلا کُو تُو ژِ بُوْ وِی هَرِی سِجُودِیْ، اَوِیْ کُو مِنْ اَوْ بِدَسْتێنْ خَوه ئَافِرَانْدِی؟ اَرِیْ مَا تَه خَوه مَزِنْ دِێرَا یَانْ ژِی تُو بُویِی ژِ یێنْ کُو بِلِنْدِنْ؟

٧٦. اِبْلِیسْ گُوْتْ: اَزْ ژِ وِی چێتِرِمْ، تَه اَزْ ژِ اِێگِرْ ئَافِرَانْدِمَه و تَه اَوْ ژِ حَرِیِیْ ئَافِرَانْدِیَه.

٧٧. خُدَا گُوْتْ: نَاخَوه ژِ وِیْ دَرْکَڤَه، هَرَه! اِیدِی بێگُمَانْ تُو (ژِ رَحْمَا مِنْ) هَاتِی قَورَانْدِنْ!

٧٨. بێگُمَانْ حَیَا رُوْژَا قِیَامَتِیْ لَعْنَتَا مِنْ لِسَرْ تَه یَه!

٧٩. اِبْلِیسْ گُوْتْ: خُدَایِیْ مِنْ! نَاخَوه حَتَا رُوْژَا قِیَامَتِیْ مُهْلَتِیْ (دَرْفَتِیْ) بِدَه مِنْ.

٨٠. خُدِیْ ژِیْ رَه گُوْتْ: مُهْلَتْ ژِ تَه رَه هَاتْ دَاینْ..

٨١. (مُهْلَتْ ژِ تَه رَه یَه) حَیَا رُوْژَا دِیَارْکِرِی.

٨٢. اِبْلِیسْ گُوْتْ: بِعِزَّتْ و عَظَمَتَا تَه صُوْنْدْ بَه، تَڤِزْ اَزِیْ وَانْ تَڤَانْ ژِ رِیَا رَاسْتِیِیْ دَرِینِمْ!

٨٣. لِیٚبَلِی، عَقْدِیٚنْ تَه یِیٚنْ بَاوَرْمَنْدْ یِیٚنْ دِلْپَاكْ اَوْ جُدَا نَه (اَزْ نِكَارِمْ وَانْ ژِ رِیٚ دَرِینِمْ).

٨٤. (خُدِیٚ) گُوٚتْ: رَاسْتِی (ژِ ئَالِییٚ مِنْ ڤَه یَه) و اَزْ ژِ رَاسْتِییٚ پِیٚ ڤَه تِشْتَكِی نَابِیٚژِمْ.

٨٥. صُوٚنْدْ بَه اَزِیٚ دُوژَهِیٚ ژِ (شَیْطَانِیٚ مِینَا) تَه و ژِ وَانِیٚنْ كُو لِپَیٚ تَه بِیٚنْ، دَاگِرِمْ.

٨٦. بِیٚژَه: اَزْ لِسَرْ رَاگِهَانْدِنِیٚ تُو حَقَكِی ژِ وَه نَاخوازِمْ و اَزْ لِسَرْ وَه نَه زُوٚرْدَارِمْ.

٨٧. اَڤْ (قُرْئَانْ)، ژِ بُوٚ تَڤَكِیٚ عَالَمِیٚ بَسْ دَرْسُ و شِیرَتَه.

٨٨. صُوٚنْدْ بَه هُونِیٚ تَڤَزْ خَبَرِیٚنْ وِیٚ پِشْتِی دَمَكِیٚ بِزَانِنْ و فَهِمْ بِكِنْ.

## ٣٩. سُورَە یِیٚ زُمَرْ

سُورَە یِیٚ (زُمَرْ)، ٧٥ (حَفْتِی و پِیٚنْجْ) ئَایَتَه. لِمَكَّیٚ نَازِلْ بُویَه . نَاڤِیٚ سُورَە ژِ ئَایَتِیٚنْ ٧١ ’اَمْ و ٧٣ ’اَمْ تِیٚ كُو دِوَانْ دَه بِیٚژِیَا زُمَرْ دَرْبَاسْ بُویَه و بِمَعْنَیَا جِڤَاتِیٚنْ جُرْ بِجُرَه.

بِنَاڤِیٚ خُدَایِیٚ كُو رَحْمٰنَ رَحِیمَ

١. اَڤْ كِتِیٚبْ، ژِ جَمْ خُدِیٚ ڤَه هَاتِیَه هِنَارْتِنْ، اَوِیٚ كُو عَزِیزَه، حَكِیمَه.

٢. بِیٚگُمَانْ مَه اَڤْ قُرْئَانْ بِدُرِسْتِی ژِ تَه رَه هِنَارْتِیَه، ڤِیٚجَه تُو ژِی ژِ بُوٚ خُدِیٚ ژِ دِلْ عِبَادَتْ بِكَه.

٣. ئَاگَاهدَارْ بِنْ! دِینِیٚ خَالِصْ و دُرِسْتْ ژِ بُوٚ خُدِیٚ یَه. اَوِیٚنْ كُو ژِ بِلِی خُدِیٚ ژِ خَوه رَه دُوٚسْتُ و ئَارِیكَارَانْ دِگِرِنْ –دِبِیٚژِنْ؛ اَمْ بَسْ دَا كُو اَوْ مَه نِیٚزِیكِی خُدِیٚ بِكِنْ اَمْ پَرَسْتِنَا وَانْ دِكِن- بِیٚگُمَانْ خُدِیٚ، دِیٚ دِنَاڤْبَرَا وَانْ دَه، دَرْ بَارِیٚ یَا كُو اَوْ تِیٚ دَه كَتِنَه اِخْتِلافِیٚ حُكِمْ بِكَه. بِیٚگُمَانْ خُدِیٚ، یِیٚ كُو زِیٚدَه دَرَوٚكَارْ و كَافِرَه، رَاسْتَرِیٚ نَاكَه.

٤. اَگَرْ خُدِیٚ بِخوەسْتَا كُو ژِ خَوه رَه زَارُوكْ بِگِرْتَا، هَلْبَتْ ژِ مَخْلُوقِیٚنْ خَوه وِی كِی

بخَوەسْتَا دِێ اَوْ ژِ خَوە رَە بِگِرْتَا. خُدِێ پَاكْ و بِلِنْدَە. خُدِێ هَرْ يَكَە و هِێزْشِكێنِێ هَرْ هِێزِێ يَە.

٥. خُدِێ عَرْدْ و ئَاسِيمَانْ بِدُرِسْتِی و بِحِكْمَتْ ئَافِرَانْدِنَە. اَوْ شَڤِێ لِسَرْ رُۆژِێ دِپێچَە، رُۆژِێ ژِی لِسَرْ شَڤِێ دِپێچَە. رُۆژْ و هَیْڤْ ژِ فَرْمَانَا خَوە رَە طَوَانْدِنَە. هَرْ يَكْ ژِ وَانْ حَتَا دَمَكَە دِيَارْكِرِی دِێ (دِرِێگَها خَوە دَە) بِگَرِنْ. ئَاگَاهدَارْ بِنْ! هَرْ خُدِێ يَە يێ دَسْتْهِلَاتْ، يێ گُنَهْژِێبِرْ.

٦. خُدِێ، هُونْ ژِ يَكْ نَفْسِێ ئَافِرَانْدِنَە. پَاشِێ ژِ وِێ ژِی هَڤْژِينَا وِێ ئَافِرَانْدِيَە (دَا كُو ذُرِيتْ ژِ وَانْ زِێدَە بِبَە). ژِ بُۆ وَە ژِ تَرْشَانْ (دَڤَهْ، دَوَارْ و پَزْ) هَشْتْ زُۆ خُلِقَانْدِنَە. دِزِكِێ دَايِكێنْ وَە دَە، دِنَاڤْ سِێ طَارِيتِيَانْ (زِكْ، مَلْزَارُۆكْ و رَحْمَا دَايِكِێ) دَە، بِچێكِرِنَكَە دِپێ چێكِرِنَكِێ دَە هُونْ ئَافِرَانْدِنْ. هَا اَوْ، پَرْوَرْدَگَارِێ وَە خُدِێ يَە. خُدَانِی و حُكْمْرَانِی هَرْ ژِ بُۆ وِی يَە. ژِ وِی پێ ڤَە تُو اِلٰهْ تُنِنْ. ڤێجَە چَاوَا هُونْ ژِ رَاسْتِيێ تێنْ ڤَگَرَانْدِنْ؟!

٧. اَگَرْ (پِشْتِی بَاوَرِيێ) هُونْ كَافِرْ بِبِنْ، ڤێجَە بِرَاسْتِی حَوْجَدَارِيَا خُدِێ بِوَە تُنَە و اَوْ بِكُفْرَا وَە ژِی نَقَايِلَە. اَگَرْ هُونْ شُكْرِێ وِی بِكِنْ اَوْ بِڤِێ ژِ وَە قَايِلْ دِبَە. قَتْ تُو گُنَهْكَارَكْ گُنَهِێ تُو كَسِی هِلْنَاگِرَە. پَاشِێ (لِئَاخْرَتِێ) ڤَگَرَا وَە بَسْ بِبَالْ خُدَايِێ وَە ڤَە يَە، ڤێجَە يَا كُو وَە (لِدِنْيَايِێ) كِرِی دِێ ژِ وَە رَە بِبێژَە. بِرَاسْتِی خُدِێ، بِيَا دِلَانْ دَە ڤَشَارْتِی دِزَانَە.

٨. دَمَا كُو مِرُۆڤ دِكَڤَە تَنْگَزَارِيێ، لِخُدَايِێ خَوە ڤَدِگَرَە و ژِێ لَاڤَە لَاڤِێ دِكَە. پَاشِێ دَمَا خُدِێ ڤَنْجِيَكِێ ژِ جَمْ خَوە پێ بِكَە، اَوْ وِێ لَاڤَە لَاڤَا كُو بَرِێ ژِ خُدِێ دِكِرْ، ژِ بِيرْ دِكَە و ژِێ رَە هَڤْپِشْكَانْ چێدِكَە دَا كُو مِرُۆڤَانْ ژِ رِيَا وِی بِخَە. بِبێژَە: بِڤِێ كُفْرُ و نَانْكُۆرِيَا خَوە هِنَكِی خَوشْ بِژِی، بِرَاسْتِی تُو هَرْ ژِ خَلْكێنْ دُوژَهِێ يِی!

٩. اَرِێ مَا اَوِێ طَاعَتْكَارْ كُو دِدَمێنْ شَڤِێ دَە، دِسُجُودْ و لِسَرْ پِيَانْ، ژِ (عَذَابِێ) ئَاخْرَتِێ دِتِرْسَە و دِلُوڤَانِيَا خُدَايِێ خَوە هِێڤِی دِكَە، چێتِرْ و بِرُومَتِرَە (يَانْ اَوِێ كُو كَافِرْ بُويَە)؟

بِبێژَه: مَا اَوێنْ كُو دِزَانِنْ و اَوێنْ كُو نِزَانِنْ ڤَتْ دِبِنْ وَكهَڤْ؟ بِرَاسْتِى تَنىَ يێنْ عَاقِلْمَنْدْ دَرْسْ و عِبْرَتْ وَرْدِگرِنْ.

١٠. بِبێژَه: گَلِى بَنْدَيێنْ كُو بَاوَرِى ئَانِينَه! خَوه ژِ عَذَابِىَ خُدَايىَ خَوه بپَارێزِنْ. ژِ بُوّ يێنْ كُو لِڤىَ دِنْيَايىَ ڤَنْجِيىَ دِكِنْ بِهِشْتْ هَيَه. عَرْدَا خُدِىَ فِرَهَه. بێگُمَانْ مُكَافَاتَا صَبِرْكێشَانْ بێحَسَابْ تِىَ دَايِنْ.[1]

١١. (يَا مُحَمَّدْ!) بِبێژَه: بێگُمَانْ فَرْمَانْ لِمِنْ هَاتِيَه كِرِنْ كُو اَزْ ژِ دِلَكِى صَافْ بَسْ ژِ بُوّ خُدِىَ عِبَادَتْ و طَاعَتِىَ بِكِمْ.

١٢. فَرْمَانْ لِمِنْ هَاتِيَه كِرِنْ كُو (ژِ ڤِىَ اُمَّتِىَ) اَزْ بِبِمْ ژِ پێشِيَكِىَ مُسِلْمَانَانْ.

١٣. بِبێژَه: اَگَرْ اَزْ بێاَمْرِيَا خُدَايىَ خَوه بِكِمْ، بِرَاسْتِى اَزْ ژِ عَذَابِىَ رُوّژَكَه مَزِنْ دِطِرْسِمْ.

١٤. بِبێژَه: اَزْ هَرْ ژِ خُدِىَ رَه عِبَادَتِىَ دِكِمْ، عِبَادَتِىَ مِنْ بَسْ ژِ بُوّ وِى يَه.

١٥. (گَلِى پُوتْپَرَسْتَانْ!) ڤێجه هُونْ ژِ بِلِى خُدِىَ كِىَ دِڤێنْ ژِىَ رَه عِبَادَتْ بِكِنْ! بِبێژَه: بِرَاسْتِى يێنْ خَسرِينَه اَونْ كُو رُوّژَا قِيَامَتِىَ خَوه و مَالْبَاتَا خَوه لِزَرَارِىَ دَانَه. ئَاگَاهدَارْ بِنْ! هَا خَسَارْكِرِنَا اَشْكَرَا اَڤْ بِخَوه يَه.

١٦. ژِ بُوّ وَانْ (كَافِرَانْ) دِسَرْ وَانْ رَه تَبقَيێنْ ژِ اِيگرْ هَنَه و دِبِنْ وَانْ دَه ژِى تَبقَيێنْ ژِ اِيگرْ

١ ژِ ڤِىَ ئَايَتِىَ تِىَ فَهْمكِرِنْ؛ مِرُوڤْ دَمَا لِجهَكِى كُو نِكَارَه لِگُورِى بَاوَرِيَا خَوه بژِى و نِكَارَه يَا خُدِىَ ژِىَ دِخَوازَه بكَه لاَزمَه كُو ژِ وِى جِهِى كُوچْبَرْ ببَه هَرَه جِهَكِى كُو بكَارَه دِينِىَ خَوه ژِ پِيَا بگرَه و بگُوّرِى وِى بژِى. خُدِىَ اَڤْ رَوشْ دِ هِنْ مِژَارێنْ دِنْ دَه ژِى بَيَانْ كِريَه. مِينَاك؛ ژِ سُورَه‌يىَ نِسَاءْ ئَايَتَا ٩٧ىَ «بێگُمَانْ اَوێنْ كُو ظِلمْ لِخُوَه كِرِنْ (؛هِجْرَتْ نَكِرِنْ و دِ نَاڤْ گَاورَانْ دَه مَانْ) مَلاَئِيكَتْ جَانىَ وَانْ دِسْتِينِنْ و دِبێژِنَه وَانْ: هُونْ (دِ بَارَا دِينِىَ خَوه دَه) دِ چه كَارِى دَه بُونْ؟ دِبێژِنْ: اَمْ لِعَرْدِىَ بێچَارَه و بِندَسْتْ بُونْ. مَلاَئِيكَتْ دِبێژِنْ: ڤَىْ عَرْدَا خُدِىَ نَه فِرَه بُو كُو هُونْ ژِىَ كُوچْبَرْ ببُونَا!؟..» و ژِ سُورَه‌يىَ عَنْكَبُوتْ ئَايَتَا ٥٦ىَ «گَلِى بَنْدَيێنْ مِنْ يێنْ كُو بَاوَرِى ئَانِينَه! بێگُمَانْ عَرْدَا مِنْ فِرَهَه، ڤێجه بِبَالْ عَرْدَا مِنْ ڤَه هِجْرَتْ بِكِنْ و هَرْ ژِ مِنْ رَه عِبَادَتِىَ بِكِنْ» ڤِىَ رَوْشِىَ تَكزْ دِكَه.

هَنَه. هَا خُدِىَ بَنْدَيێنْ خَوه ژِ ڤِىَ دِطِرْسِينَه. هَىْ بَنْدَيێنْ مِنْ! نَاخَوه هَاىْ ژِ اَمرْ و نَهييێنْ مِنْ هَبِنْ.

١٧. اَوێنْ كُو خَوه ژِ عِبَادَتْكِرنَا بُوٚ شَيْطَانْ و طَاغُوتِى دُوٚرْ دِگِرِنْ و (بِتُوٚبِىَ) لِخُدِىَ ڤَدِگَرِنْ؛ هَرْ ژِ وَانْ رَه مِزْگِينِى هَيَه. ڤێجَه مِزْگِينِىَ بِدَه بَنْدَيێنْ مِنْ.

١٨. اَوْ بَنْدَيێنْ كُو لِگُوٚتِنَانْ گُهْدَارِى دِكِنْ و لِدُوڤْ ئَا هَرِى بَاشْ دِچِنْ. هَا اَوِنْ يێنْ كُو خُدِىَ اَوْ رَاسْتَرِىَ كِرِنَه و اَوْ بِخَوه نَه يێنْ خُدَانْهِشْ و بِئَاقِلْ.

١٩. اَرِىَ مَا ڤێجَه اَوِىَ كُو حُكْمِىَ عَذَابْ لِسَرْ هَاتِيَه مِسُوگَرْكِرِنْ اِيْدِى تُو يِىَ وِى ژِ اِيْگِرْ خَلاصْ بِكِى؟

٢٠. لِێبَلِىَ اَوێنْ كُو (اَمْرْ و نَهْييێنْ) خُدَايِىَ خَوه پَارَاسْتِنَه، ژِ بُوٚ وَانْ اُوٚدَه لِسَرْ اُوٚدِىَ رَاكِرِى هَاتِنَه ئَاڤَاكِرِنْ كُو دِبِنِىَ وَانْ دَه چَمْ دِهَرِكِنْ. هَا اَڤْ سُوٚزَا خُدِىَ يَه كُو ژِ بَنْدَيِىَ خَوه يِىَ تَقْوَادَارْ رَه دَايَه. بێگُمَانْ خُدِىَ سُوٚزَا كُو دَايَه ژِىَ ڤَنَاگَرَه.

٢١. (اَىْ اِنْسَانْ!) مَا تُو نَابِينِى كُو خُدِىَ ژِ عَوْرَانْ ئَاڤْ بَارَانْدِيَه، وِىَ ئَاڤِىَ دِخَه سَرْ كَانِيێنْ لِسَرْ عَرْدِىَ، پِشْتْرَه بِوِىَ چَانْدِنِيێنْ رَنْگَه رَنْگْ هێشِينْ دِكَه. پِشْتْرَه اَوْ هِشْكْ دِبَه تُو دِبِينِى كُو اَوْ زَرْ بُويَه پِشْتْرَه وِىَ دِكَه كَواشَه. بێگُمَانْ دِڤِىَ دَه ژِ بُوٚ ئَاقِلْمَنْدَانْ عِبْرَتْ و شِيرَتْ هَنَه.

٢٢. اَرِىَ مَا كَسِىَ كُو خُدِىَ دِلِىَ وِى ژِ بُوٚ اِسْلامِىَ ڤَكِرِبَه، ڤێجَه اَوْ ژِ جَمْ خُدَايِىَ خَوه لِسَرْ رُونَاهِيَكِىَ بَه (مَا دِبَه مِينَا وِى كَسِىَ كُو دِلِىَ وِى ژِ پَێيمَانِى هِشْكْ بُوبَه)؟ ڤێجَه وَاخْ لِحَالِىَ وَانْ كَسَانْ بَه كُو دِلێنْ وَانْ ژِ بِىَ ذِكْرِى هِشْكْ بُويَه! هَا اَوْ، دِنَاڤْ رِێشَاشِيكَه اَشْكَرَا دَه نَه.

٢٣. خُدِىَ سِپَحِيتِرِينِىَ پَێڤَانْ هِنَارْتِيَه، كِتێبَكَه كُو ئَايَتێنْ وِىَ مِينَا هَڤْ و لِهَڤْهَاتِى كُو تێنَه دُبَارَكِرِنْ. ژِ خَونْدِنَا وِىَ چَرمِىَ وَانێنْ كُو ژِ خُدَايِىَ خَوه دِطِرْسِنْ پِرْچُوٚسِنْگِى دِبَه،

پَاشِێ چَرْمێنْ وَانْ و دِلێنْ وَانْ بِبَالْ ذِكْرِێ خُدِێ ڤَه ئَارَامْ و نَرْمْ دِبَه. هَا اَڤْ (كِتێبْ)، هِيدَئَايَتَا خُدِێ يَه. خُدِێ كِی بِڤِێ پِێ تِينَه سَرْ رِيَا رَاسْتْ. چِه كَسِێ كُو خُدِێ وِی ژ رِێ بِخَه اِێدِی تُو كَسْ نِينَه كُو وِی رَاسْتَرِێ بِكَه.

٢٤. اَرِێ مَا اَوِێ كُو رُۆژَا قِيَامَتِێ بِرُوِيِێ خَوه ژ عَذَابِێ پِيسْ و دِژْوَارْ خَوه دِپَارِێزَه (دِبَه مِينَا يِێ كُو ژ اِێگِرْ رِزْگَارْبُويِی)؟ ژ ظَالِمَانْ رَه تِێ گُوتِنْ: دَه هَايْدِێ جَزَايِێ گُنَهێنْ كُو وَه بِكَدَا خَوه قَازَانْجْ كِرِيَه بِچێژِنْ!

٢٥. يێنْ بَرِيَا وَانْ بَاوَرِی (بِپێخَمْبَرِێ خَوه) نَئَانِی، ڤێجَه عَذَابِێ خُدِێ ژ جِهَكِی كُو وَانْ حِزِرْ نَدِكِرْ، بِسَرْ وَانْ دَه هَاتْ.

٢٦. ڤێجَه خُدِێ لِدِنْيَايِێ رِسْواتِی بِوَانْ دَا تَعِمْكِرِنْ. بِرَاسْتِی عَذَابِێ ئَاخِرَتِێ مَزِنْتِرَه، كَا كُو وَانْ اَڤْ زَئَانِيبُويَا.

٢٧. صُۆنْدْ بَه، مَه دِڤِێ قُرْئَانِێ دَه ژ بُۆ مِرُۆڤَانْ هَرْ مِژَارێنْ مِينَاكَانْ دَانَه، دَا كُو اَوْ ژێ عِبْرَتْ بِگِرِنْ.

٢٨. مَه اَڤْ قُرْئَانْ بێيِی كُو خَوارِی و شَاشِی تِێ دَه هَبَه بِزِمَانِێ عَرَبِی هِنَارْتِيَه، دَا كُو مِرُۆڤ (ژ كُفْرِێ) خَوه پِێ بِپَارێزِنْ.

٢٩. خُدِێ ژ بُۆ وَه مِينَاكَكِێ تِينَه؛ كُۆلَيَكِی كُو چَنْدْ كَسێنْ سَرْهِشْكْ و بِهَڤْ نَه خَوشْ تِێ دَه هَڤْپِشْكِنْ و كُۆلَيَكِی كُو تَنِێ يِێ يَكْ زِلاَمَكِی بَه، اَرِێ مَا رَوْشَا ڤَانْ هَرْ دِيَانْ وَكْهَڤَه؟ مَدْحُ وسَنَايێنْ تَكُوزْ هَرْ ژ بُۆ خُدِێ بِنْ. لێبَلِێ پِرێنْ وَانْ ڤِێ نِزَانِنْ (كُو هَڤْپِشْكَانْ ژ خُدِێ رَه چێدِكِنْ).

٣٠. (يَا مُحَمَّدْ!) تَقَزْ تُو ژِی دِێ بِمِرِی و اَوْ ژِی دِێ بِمِرِنْ.

٣١. پَاشِێ، (گَلِی مِرُۆڤَانْ!) بێگُمَانْ هُونِێ رُۆژَا قِيَامَتِێ لِجَمْ رَبِّێ خَوه بِهَڤْ رَه نِيقَاشِێ بِكِنْ.

بِسَرْ وَانْ دَه وَرَه. اَوێنْ كُو بَاوَرِى ئَانِينْ و كَارێنْ قَنْجْ كِرِنَه، اَوْ دِبَخْچَيێنْ بِهِشْتِێ دَه نَه. لِجَمْ خُدَايِێ وَانْ، ژِ وَانْ رَه يَا كُو بِخَوَازِنْ هَيَه. هَا اَڤْ، كَرَمْ و قَنْجِيَا مَزِنْ بِخوه يَه.

**٢٣.** هَا اَڤْ (كَرَمْ و قَنْجِى) يَا كُو خُدِێ مِزْگِينِيَا وِێ دِدَه بَنْدَيێنْ خوه يێنْ كُو بَاوَرِى ئَانِينَه و كَارێنْ قَنْجْ كِرِنَه. (رَسُولِێ مِنْ! ژِ وَانْ رَه) بِبێژَه: اَزْ ژِ بِلِى پَارَاسْتِنَا (حِقُوقِێ) اَقرَبَاتِيِێ تُو حَقَكِى (لِسَرْ تَبْلِيغِێ) ژِ وَه نَاخَوَازِمْ. چِه كَسِێ كُو قَنْجِيَكِێ بِكَه اَمْ پَادَاشَا وِى زێدَه دِكِنْ. بێگُمَانْ خُدِێ گُنَهْژێبِرَه، شُكرْوَرْگِرَه.

**٢٤.** يَانْ مَا اَوْ دِبێژِنْ: وِى لِسَرْ (نَاڤِێ) خُدِێ دَرَوْ لێئَانِيَه؟ اَگَرْ خُدَا (هَتِيكَتِيَا تَه) بِخوهسْتَا دِێ سَرْ دِلِێ تَه مُورْ بِكرَا (و بِتَه بِدَانَا ژِبيرْكِرِنْ). خُدِێ پُوچِى (يَا كُو اَوْ دِبێژِنْ) ژِ هُوْلِێ رَادِكَه و بِئَايَتێنْ خوه، حَقِيِێ بِجهْ دِكَه. بێگُمَانْ خُدِێ بِيَا دِدِلْ و سِينْگَانْ دَه ڤَشَارْتِى دِزَانَه.

**٢٥.** اَوَه يِێ كُو ژِ بَنْدِيێنْ خوه تُوبِێ قَبُولْ دِكَه و لِنَقَنْجِيێنْ وَانْ دِبُورَه و بِيَا كُو هُونْ دِكِنْ دِزَانَه.

**٢٦.** خُدِێ بَرْسِڤَا (بَرْگَرِينَا) وَانێنْ كُو بَاوَرِى ئَانِينْ و كَارێنْ قَنْجْ كِرِنَه دِدَه و ژِ قَنْجِيَا خوه زێدَهيِى يَا كُو كِرِنْ ژِى دِدَه وَانْ. هَرْچِى كُو كَافِرِنْ، ژِ وَانْ رَه ژِى عَذَابَكِى دِژْوَارْ هَيَه.

**٢٧.** اَگَرْ خُدِێ ژِ عَڤْدێنْ خوه رَه رِزِقْ فِرَهْ بِكرَا دِێ لِسَرْ رُويِێ عَرْدِێ ژِ سَرْ خوه ڤَه بِچُونَا. لێبَلِێ خُدَا، بِقَاسِى كُو دِڤِێ رِزْقِێ وَانْ دِشِينَه. بێگُمَانْ خُدِێ بِبَنْدَيێنْ خوه ئَاگَاهْدَارَه بِينَرَه.

**٢٨.** اَوَه يِێ كُو بَارَانِێ پِشْتِى كُو مرُوْڤ (ژِ هَاتِنَا وِێ) بێهێڤِى بُونْ، دِبَارِينَه. رَحْمَتَا خوه لِهَرْ ئَالِيِى بَلاَڤْ دِكَه. اَوَه، يِێ دُوسْتُ و ئَارِيكَارْ، يِێ بَابَتِێ پَسِنْدَايينِێ.

**٢٩.** ژِ نِيشَانێنْ (قُدْرَتْ و يَكِيتِيَا) خُدِێ يَه كُو عَرْدُ و ئَاسِيمَانْ و رِێڤَهرێنْ كُو دِنَاڤَا وَانْ دَه بَلاَڤْ كِرِنْ ژِى خُلِقَانْدِنَه و خُدَا دَمَا بِخَوَازَه لِسَرْ لِهَڤْكُومْكِرِنَا وَانْ قَادِرَه.

٣٠. چِه مُصِيبَتَكَه كُو وَرَه سَرِیٚ وَه هَرْ اَوْ بِسَبُونَتْ گُنَهِیٚنْ كُو وَه كِرِنَه و خُدِیٚ لِپِرِیٚنْ وَانْ ژِی دِبُورَه.

٣١. هُونِیٚ (خُدِیٚ) لِسَرْ عَرْدِیٚ نَچَارْ نَهِیٚلِنْ و ژِ بِلِی خُدِیٚ، ژِ بُوٚ وَه تُو دُوٚسْتُ و ئَارِيكَارَكْ ژِی تُنَه.

٣٢. ژِ نِيشَانِیٚنْ خُدِیٚ نَه؛ اَوْ كَشْتِيِیٚنْ كُو مِينَا چِيَانْ دِبَحْرِیٚ دَه دِكِشِنْ.

٣٣. اَگَرْ خُدَا بِخُوَازَه دِیٚ بَا رَاوَسْتِينَه، ڤِیٚجَه كَشْتِی ژِی دِیٚ لِسَرْ رُویِیٚ بَحْرِیٚ سَكِنَانْدِی بِمِينِنْ. بِیٚگُمَانْ دِڤِیٚ دَه، ژِ بُوٚ هَرْ كَسِیٚ صَبرْكِیٚشْ و شُكِرْدَارْ رَه نِيشَانْ هَنَه.

٣٤. يَانْ ژِی بِسَبُونَتْ كِرِنِیٚنْ وَانْ دِیٚ وَانْ هَلاكْ بِكَه، (لِیٚبَلِیٚ اَوْ) لِپِرِیٚ تِشْتَانْ دِبُورَه.

٣٥. (بِڤِی ئَاوَايِی) دَا كُو اَوِیٚنْ دَرْ بَارِیٚ ئَايَتِیٚنْ مَه دَه تِیٚدِكُوشِنْ بِزَانِنْ كُو ژِ وَانْ رَه تُو جِهِیٚ رَڤِیٚ تُنَه يَه.

٣٦. اِیٚدِی چِه تِشْتِیٚ كُو ژِ وَه رَه هَاتِيَه دَاينْ، ڤِیٚجَه اَوْ پَرْتَالِیٚ ژِيَانَا ڤِیٚ دِنْيَايِیٚ يَه و ژِ بُوٚ يِیٚنْ كُو بَاوَرِی ئَانِينَه و خَوه دِسِپِیٚرِنْ پَرْوَرْدَگَارِیٚ خَوه، يَا لِجَمْ خُدِیٚ چِیٚتِرْ و مَايِينْدَتِرَه.

٣٧. اَوْ بَاوَرْمَنْدِیٚنْ كُو ژِ گُنَهِیٚنْ مَزِنْ و ژِ فَحْشِيتِيَانْ (بِیٚتُورِيِيَانْ) خَوه دِپَارِیٚزِنْ و دَمَا كُو اَوْ هِیٚرْسْ دِبِنْ ژِی عَفُو دِكِنْ.

٣٨. اَوِیٚنْ كُو بَرْسِڤَا بَانْگَا خُدَايِیٚ خَوه دَانَه، نِمِیٚژْ كِرِنَه، دِنَاڤْبَرَا وَانْ دَه كَارِیٚنْ وَانْ بِشِیٚورِیٚ يَه و ژِ وِی رِزْقِیٚ كُو مَه دَايَه وَانْ ژِی (دِجِهِیٚ وِیٚ دَه) خَرْجْ دِكِنْ.

٣٩. اَوِیٚنْ كُو دَمَا نَحَقِی لِوَانْ دِبَه (ژِ يِیٚ نَحَقْ) حَقِیٚ خَوه دِسْتِينِنْ و تَعْدَهِيِیٚ نَاكِنْ.

٤٠. جَزَايِیٚ نَقَنْجِيَكِیٚ بِنَقَنْجِيَكَه عَيْنِی مِينَا وِیٚ يَه. لِیٚبَلِیٚ كِی كُو لِیٚ بِبُورَه؛ اَشْتِيِیٚ سَازْ بِكَه تَقَزْ خَلاتَا وِی لِسَرْ خُدِیٚ يَه. بِیٚگُمَانْ خُدِیٚ ژِ ظَالِمَانْ حَزْ نَاكَه.

٤١. كِی پِشْتِی كُو نَحَقِی لِیٚ هَاتَه كِرِنْ حَقِیٚ خَوه سِتَانْدْ، ڤِیٚجَه تُو رِیٚيَكْ (ژِیٚ رَه) لِسَرْ يِیٚ ظَالِمْ تُنَه (كُو وِی جَزَا و شَرْمَزَارْ بِكَه).

٤٢. رِیَا (جَزَاکِرِنێ) تَنێ لِهَمْبَری وَانْ کَسَانَه کُو لِمرُۆڤَانْ ظُلْمێ بِکِنْ و لِسَرْ عَرْدێ بنَحَقی تَڤْدَانێ دَرْخِنْ. هَا ژ کَسێنْ وِهَا رَه عَذَابَکی جَانْسُوژْ هَیَه.

٤٣. کِی کُو (لِهَمْبَری ئَازَارَا خَلْکێ) خوه رَاگِرَه و وَانْ بِبَخْشِینَه، بێگُمَانْ اَڤْ ژ کَارێنْ هێژَا و پَسْنَانْدَه یَه.

٤٤. خُدێ کِێ ژ رێ بِخَه؛ ڤێجَه پِشْتی خُدێ ژ بُۆ وی تُو خَودی و ئَاریکَارْ تُنِنْ. دَمَا ظَالِمْ عَذَابْ دِبِینِنْ؛ تُو یێ وَانْ بِبِینِی کُو دِبێژِنْ: «اَرێ مَا ژ بُۆ گُوَاَمْ ڤَگَرِنْ دِنْیَایێ تُو رِیێکْ نِینَه»؟

٤٥. دَمَا اَوْ ژ ئَاگِرێ دُۆژَهێ رَه تێنَه رَاپێشْکِرِنْ، تُو وَانْ دِبِینِی کُو ژ رَبِنی و رِسْوَایی بترْسنْ کُو دِبِنْ چَاڤێنْ خَوه دَه بِهێدی و دِزی (لِعَذَابێ خَوه) دِنێرِنْ. اَوێنْ کُو بَاوَری ئَانِینَه دِبێژِنْ: بِرَاسْتی یێنْ کُو خَسرینَه، اَوێنْ کُو رُۆژَا قِیَامَتێ خَوه و خَلْکێ خَوه خِسْتِنَه خَسَارێ. گُهْدَارْ بِنْ! بێگُمَانْ یێنْ ظَالِمْ دِنَاڤْ عَذَابَکی سَرَاقَتی دَه نَه.

٤٦. ژ بُۆ وَانْ لِهَمْبَری عَذَابێ خُدێ تُو خَودی و ئَاریکَارْ نِینِنْ کُو وَانْ رِزْگَارْ بِکِنْ. خُدێ (بِسَبُونَتْ کُفْرُ و ظُلْمَا وَانْ) کِێ ژ رێ بِخَه اِیْدی ژێ رَه تُو رێ(یێنْ رِزْگَاربُونێ) نِینِنْ.

٤٧. بَرْسِڤَا (گَازِیَا) خُدَایێ خَوه بدِنْ بَرِیَا کُو ژ طَرَفْ خُدێ ڤَه رُۆژَکْ وَرَه (کُو قِیَامَتَه)، کُو اِیْدی نَه پێکَانَه تُو کَسْ وێ (رُۆژێ) ڤَگَرینَه. لَوْرَا وێ رُۆژێ ژ بُۆ وَه تُو ئَاصێگَهَکَه کُو ژ عَذَابْ وَه خَلاصْ بِکَه و تُو چَارَیَا مَانْدَلکِرنَا گُنَهَانْ ژی تُنَه یَه.

٤٨. اَگَرْ اَوْ بَرێ خَوه (ژ حَقیێ) ڤَگَرِینِنْ، بِزَانَه کُو مَه تُو لِسَرْ وَانْ وَکْ چَاڤْدێرْ نَشَانْدیَه، بَس اَرکَا تَه رَاگِهَانْدنَه. بِرَاسْتی چه دَمَا کُو اَمْ ژ جَمْ خَوه ڤَنْجِیَکێ بِانْسێنْ بِدِنْ چێژَانْدِنْ، بِوێ دِلْشَادْ دِبَه. لێبَلێ اَگَرْ ژ بَرْ سُوجێنْ کُو وَانْ کِرِنْ بَلایَکْ وَرَه سَرێ وَانْ، ڤێجَه اِنْسَانْ بِرَاسْتی ژی پِرْ نَانْکُۆرَه!

٤٩. خُدَانِی و رێڤَبَرِیَا عَرْدُ و ئَاسِیمَانَانْ هَرْ ژ خُدێ رَه یَه. اَوْ چه بِڤێ وێ دِئَافِرِینَه. اَوْ کِێ بِڤێ کَچَانْ و کِێ ژی بِڤێ کُرَانْ دِدِیێ...

٥٠. يَانْ ژِى كُرْ و كَچَانْ بِهَڤْ رَه دِدَه وَانْ. كِىَ ژِى بِڤِىَ بَرْنَگَرْ دِهِێلَه (نَه كُرْ ژِىَ رَه چِێدِبِنْ نَه ژِى كَچْ). بێگُمَانْ خُدِىَ زَانَا و كَارَا يَه.

٥١. ژِ تُو كَسِى رَه نَه مِمْكُنَه كُو خُدِىَ پِىَ رَه بِئَاخِڤَه، ژِ بِلِى كُو برِێكا وَحْيِىَ بَه يَانْ ژِ پِشْتْ پَرْدِىَ يَانْ ژِى قَاصِدَكِى ژِىَ رَه بِشِينَه، ڤِێجَه بِدَسْتُورَا خُدِىَ يَا كُو خُدِىَ بِڤِىَ ژِىَ رَه وَحِى بِكَه. بِرَاسْتِى ژِى خُدِىَ بِلِنْدَه، كَارْبِنَجِهَه.

٥٢. (يَا مُحَمَّدْ!) هَا بِڤِى ئَاوَايِى مَه بِفَرْمَانَا خَوه پِيَامَا قُرْئَانِىَ دَايَه تَه. تَه نِزَئَانِيبُو كِتێبْ چِه يَه، اِيمَانْ چِه يَه. لِێبَلِىَ مَه كِتێبْ كِرَه رُونَاهِيَكَه وِسَا كُو ژِ بَنْدَيێنْ خَوه اَمْ كِىَ بِڤێنْ بِوِىَ تِينِنْ رِيَا رَاسْتُ و دُرِسْتْ. بێگُمَانْ تُو مِرُوڤانْ لِسَرْ رِيَكَه رَاسْتْ و دُرِسْتْ رَاسْتَرِىَ دِكِى.

٥٣. كُو اَوْ رِيَا خُدِىَ يَه. اَوْ خُدَايِىَ كُو يێنْ لِعَرْدِىَ و ئَاسِيمَانَانْ تَڤْ يێنْ وِى نَه. گُهْدَارْ بِنْ! هَرْ كَارْ و بَارْ بِبَالْ خُدِىَ ڤَه ڤَدِگَرِنْ.

## ٤٣. سُورَه يِىَ زُخْرُفْ

سُورَهيِىَ (زُخْرُفْ)،٨٩ (هَشْتِىَ و نَهْ) ئَايَتَه و لِمَكّىَ نَازِلْ بُويَه . سُورَه نَاڤِىَ خَوه ژِ ئَايَتَا ٣٥’اَمْ گِرْتِيَه كُو تِىَ دَه كَلِيمَا زُخْرُفْ هَاتِيَه، كُو اَوْ بِمَعْنَا زێرْ، خِشِرْ و گَوْهَرَه.

بِنَاڤِىَ خُدَايِىَ كُو رَحْمَنَ رَحِيمَ

١. حَا، مِيمْ.

٢. صُوْنْدْ بَه، بِكِتێبَا رُوْنكَرْ...

٣. بِرَاسْتِى مَه اَڤْ قُرْئَانْ بِزِمَانِىَ عَرَبِى نَازِلْ كِرِيَه دَا كُو هُونْ تێبِگِهِيژِنْ.

٤. بێگُمَانْ اَڤْ قُرْئَانْ لِنِكْ مَه دِ لَوْحُ المَحْفُوظِىَ دَه قَدِرْبِلِنْدَه، تِژِى حِكْمَتَه.

٥. اَرىَ مَا ژِ بَرْ كُو هُونْ مِلَّتَكى تِخُوبْبِهِيْرْ (و نَكُهْدَارِ)نْ اَمْ قُرْئَانِىَ ژِ سَرْ وَه رَاوَسْتِينِنْ؛ وَه پِىَ هِشِيَارْ نَكِنْ؟!

٦. مَه ژِ بُوّ پِيْشِيِيانْ پِرْ پِيْخَمْبَرْ شَانْدِنَه.

٧. چِقَاسْ كُو پِيْخَمْبَرَكْ ژِ وَانْ رَه هَاتِيَه، هَرْ وَانْ طِنَازِيْنْ خوه پِىَ كِرِنَه.

٨. ڤِيْجَه مَه ژِى يِيْنْ ژِ وَانْ هِيْزْدَارْتِرْ و خُرْتِرْ بِرِنَه هَلاكِىَ و سَرْپِيْهَاتِيَا وَانْ ژِى (دِقُرْئَانِىَ دَه) دَرْبَاسْ بُويَه.

٩. صُوّنْدْ بَه، اَگَرْ تُو ژِ وَانْ بِپِرْسِى كِىَ عَرْدُ و ئَاسِيمَانْ ئَافِرَانْدِنَه، تَقَزْ دِىَ بِبِيْژِنْ: اَوِىَ دَسْتْهِلَاتْ اِىَ زَانَا اَوْ ئَافِرَانْدِنَه.

١٠. اَوِىَ كُو عَرْدْ ژِ بُوّ وَه رَاخِسْتِيَه و دِ عَرْدِىَ دَه رِىَ چِيْكِرِنَه دَا كُو هُونْ رَاسْتَرِىَ بِبِنْ.

١١. اَوِىَ كُو ژِ عَوْرَانْ، بِاَنْدَازْ (و پِيِڤَانْ) ئَاڤْ دَاخِسْتِيَه. ڤِيْجَه مَه بوِىَ ئَاڤِىَ وَلاتَكى هِشْكُ و مِرى هِيْشِينْ و سَاغْ كِرِيَه. هَا هُونْ ژِى دِىَ وِسَا (ژِ گُورِيْنْ خَوه) بِيْنَه دَرَانِينْ و سَاغْكِرِنْ.

١٢. اَوِىَ كُو ژِ هَرْ تَخْلِيتِى جُوتْ ئَافِرَانْدِنَه و ژِ كَشْتِى و حَيْوَانَانْ ژِى يِيْنْ كُو هُونْ لِوَانْ سُوَارْ بِبِنْ چِيْكِرِنَه.

١٣. دَا كُو هُونْ لِسَرْ پِشْتَا وَانْ رَاوَسْتِنْ. پِشْتِى كُو هُونْ لِسَرْ پِشْتَا وَانْ سُوَارْ بُونْ دَا كُو هُونْ قَنْجِيَا خُدَايِىَ خوه دِبِيرْ بِينِنْ و بِبِيْژِنْ «اَمْ وِى (خُدَا)يِىَ كُو اَڤْ ژِ خِزْمَتَا مَه رَه بَرْدَسْتْ كِرِنَه پَاكْ دِدِيْرِنْ». (اَگَرْ خُدَا اَوْ بَرْدَسْتْ نَكِرِبُونَا) اَمِىَ لِسَرْ ڤِىَ نَه خُدَانْهِيْزْ بُونَا.

١٤. بِيْگُمَانْ اَمِىَ هَرْ لِخُدَايِىَ خوه ڤَگَرِنْ.

١٥. وَانْ مُشْرِكَانْ، هِنْ ژِ بَنْدَيِيْنْ خُدِىَ كِرِنَه پَارْچَيَكْ ژِىَ. بِيْگُمَانْ اِنْسَانْ نَانْكُوّرَكى اَشْكَرَا يَه.

**١٦.** اَرێ مَا خُدێ ژِ مَخْلُوقێنْ خَوه، ژِ بُۆ خَوه کَچْ گِرْتنَه و ژِ بُۆ وَه ژِی کُرْ تَرْخَانْ کِرنَه؟!

**١٧.** چه دَمَا یَكْ ژِ وَانْ (مُشْرِکَانْ) بِیَا کُو ژِ خُدَایێ رَحْمٰنْ رَه اِسْنَادْ کِرِیَه پێ مِزْگِینْدَاینْ، ژِ هێرْسَانْ رُویێ وِی رَشْ و طَارِی دِبَه.

**١٨.** یَانْ ژِی، مَا هُونْ اَوْ کَچَا کُو دِنَاڤَا خَمْلا خَوه دَه تێ خَودِیکِرِنْ و دِ دَمَا تێکُوشِینێ دَه نِکَارَه لِبَرْ خَوه بِدَه، بِئَالِیێ خُدێ ڤَه دِدِنْ؟

**١٩.** اَوْ (پُوتْپَرَسْتْ) بَاوَرْ دِکِنْ کُو اَوْ مَلائیکَتێنْ کُو بَنْدَیێنْ رَحْمٰنِنْ مێ نَه. گَلُو (دَمَا خُدێ مَلائیکَتْ خُلِقَانْدِنْ) اَوْ حَازِرِی سَرْ خُلِقَانْدِنْ وَانْ بُونَه؟ اَوْ شَاهِدِیَا وَانْ دێ وَرَه نِقِیسَانْدِنْ و اَوێ ژِ وِێ بێنَه پِرْسْکِرِنْ.

**٢٠.** گُۆتِنْ: اَگَرْ خُدَا یێ رَحْمٰنْ بِخَوهسْتَا دێ مَه عِبَادَتێ وَانْ نَکِرِبُویَا. دِڤێ مِژَارێ دَه تُو زَانِینَا وَانْ تُنَه. بَسْ اَوْ دَرَوَانْ دِکِنْ.

**٢١.** یَانْ ژِی مَا بَرِیَا ڤێ (قُرْئَانێ) مَه کِتێبَكْ دَایَه وَانْ، ڤێجَه اَوْ خَوه بِوێ دِگِرِنْ؟

**٢٢.** نَا! وَانْ گُوتِیَه، مَه بَاڤێنْ خَوه لِسَرْ ڤێ اُوْلێ دِیتِیَه و بێگُمَانْ اَمْ ژِی لِدُوڤْ شُۆپَا وَانْ دِچِنْ.

**٢٣.** هَرْ وِهَا مَه بَرِیَا تَه ژِ خَلْکێ وَلاتَکِی رَه چِقَاسْ پێخَمْبَرَكْ شَانْدِبَه، دَوْلَمَنْدُ و گِرَه گِرێنْ وِی وَلاتِی اَڤْ گُوتِنَه: بِرَاسْتِی مَه بَاڤێنْ خَوه لِسَرْ اُوْلَکێ دِیتِیَه و بێگُمَانْ اَمێ لِپێ شُۆپَا وَانْ هَرِنْ.

**٢٤.** پێخَمْبَرێ وَانْ ژِ وَانْ رَه گُۆتْ: مَا اَگَرْ مِنْ ژِ بُۆ وَه، ژِ اُوْلا کُو وَه بَاڤێنْ خَوه لِسَرێ دِیتِیَه دِینَکِی رَاسْتِرْ ئَانِیبَه ژِی (دِیسَا هُونێ لِپێ مِنْ نَیێنْ؟) گُۆتِنْ: اَمْ دِینێ کُو هُونْ بِوی هَاتِنَه هِنَارْتِنْ، اِنْکَارْ دِکِنْ.

**٢٥.** ڤێجَه مَه ژِی جَزَایێ وَانْ دَا وَانْ، دَه تُو بِنێرَه کَا اَنْجَامَا بێبَاوَرَانْ چَاوَا بُویَه؟!

**٢٦.** دِ بِیرْ بِینَه؛ وێ دَمَا اِبْرَاهِیمْ ژِ بَاڤێ خَوه و گَلێ خَوه رَه گُۆتْ: بِرَاسْتِی اَزْ ژِ وَانێنْ کُو هُونْ عِبَادَتێ وَانْ دِکِنْ دُورْ و بێرِی مَه..

**٢٧.** ژ بلِی وِی خُدَایێ کُو اَزْ افرَانْدِمَه، لَوْرَا اَوێ مِنْ رَاسْتَرِێ بکَه.

**٢٨.** ابْرَاهیمْ اَڤْ کَلیمَه (یَا تَوْحِیدِێ) ژ زُرِیتَا خَوه رَه وَكْ میرَاسَکَه سَرَاقَتِی هِشْتْ دَا کُو اَوْ (لِدِینِێ حَقْ) ڤَگَرِنْ.

**٢٩.** نَخیِّرْ؛ اَوْ ژ سَرْ یَا خَوه نَهَاتِنْ خَوارْ. مِنْ اَڤْ (مُشْرِكْ) و بَاڤْ و کَالیّنْ وَانْ چیّژَانْدِنْ حَتَا کُو حَقْ (قُرْئَانْ) و قَاصِدَکِی اَشْکَرَاکَرْ ژ وَانْ رَه هَاتَه شَانْدِنْ.

**٣٠.** (لِیّبَلِیّ) چه دَمَا حَقْ ژ وَانْ رَه هَاتْ، گُوّتِنْ: اَڤْ سِیّرْبَازِیکَه و بِرَاسْتِی اَمْ ایمَانِێ پِێ نَایینِنْ.

**٣١.** گُوّتِنْ: دَه بِلا اَڤْ قُرْئَانْ ژ مَزنِێ یَکِی ژ ڤَانْ هَرْدُو بَاژَارَانْ رَه دَاکَتِبُویَا!

مُشْرکَانْ ژ چَاڤْنَبَارِی نَدخَوسْتِنْ کُو قُرْئَانْ ژ پێخَمْبَرْ رَه هَاتِیَه. دِگُوّتِنْ بِلا ژ یَکِی هَرْدُو مَزنیّنْ وَانْ رَه بِهَاتَا. ژ مَزنِێ مَکِّێ وَلِیدِێ کُرِێ مُغیرَه یَانْ ژِی ژ مَزنِێ طَایِفِێ عُرْوَه یێ کُرِێ مَسْعُودْ رَه بِلا هَاتِبُویَا.

**٣٢.** اَرِێ مَا قَنْجیَا خُدَایێ تَه (کُو پێخَمْبَرِی یَه) اَوْ پَارْ ڤَدِکِنْ؟ دِژیَانَا جیهَانِێ دَه مَه رِزْقِێ وَانْ دِنَقِبَا وَانْ دَه پَارْ ڤَکِرِیَه. مَه هِنْ ژ وَانْ دِسَرْ هِنَانْ رَه گِرْتِنَه دَا کُو هِنْ ژ وَانْ هِنَکَانْ بِدِنْ خَبَاتِێ. قَنْجیَا خُدَایێ تَه (رُوّژَا قِیَامَتِێ) ژ یَا کُو اَوْ کُوّمْ دِکِنْ گَلَكْ چێترَه.

**٣٣.** اَگَرْ ژ بَرْ هیّنْجَتَا کُو اِنْسَانْ هَمُو (لِسَرْ کُفْرِێ) یَكْ مِلَّتْ بِمِینِنْ نَبُویَا، مَه دِێ ژ بُوّ وَانیّنْ کُو خُدِێ اِنْکَارْ دِکِنْ، بَانِێ خَانِییّنْ وَانْ و پیلِکیّنْ کُو بِوَانْ هِلْدِکِشِنْ ژُوّرِێ ژ زیڤْ چێکِرِبُونَا..

**٣٤.** مَه دِێ ژ خَانِییّنْ وَانْ رَه ژِی دَرْگَهْ و تَخْتیّنْ کُو اَوْ لِسَرْ وَانْ پَالْ دِدِنْ (ژ زیڤْ) چێکِرِبُونَا..

**٣٥.** مَه دِێ اَوْ دِنَاڤَا خَملیّنْ زیّرْ دَه نُوقْ بِکِرَانَا. اَڤْ هَمُو تنِێ پَرْتَالیّنْ ژیَانَا جیهَانِێ

يێنْ بوَخْتِنْ (كُو دَمَكَه وَانْ ئَا مُوَقَتْ هَيَه). قَنْجِيَا ئَاخْرَتِىَ ژِى لِجَمْ خُدَايىَ تَه تَنِىَ ژِ بُوّ مُتَّقِيَانَه.

٣٦. چه كَسِىَ كُو بَرِىَ خوه ژِ قُرْئَانَا خُدَايىَ رَحْمٰنْ بِگُهَرِينَه، اَمِىَ ژِىَ رَه شَيْطَانَكِى قَبُوهْتِى (حَازِرْ) بِكِنْ، اِيْدِى اَوْ شَيْطَانْ هَڤَالِىَ وِى يَه.

٣٧. بێگُمَانْ اَڤْ شَيْطَانْ وَانْ ژِ رِيَا رَاسْتْ دَرْدِخِنْ و ژِ وَانْ (كَافِرَانْ) وَه يَه كُو بِرَاسْتِى اَوْ دِرِيَا رَاسْتْ دَه نَه.

٣٨. پَاشِىَ حَيَانِى كُو اَوْ وَرَه بَرْ دَسْتِىَ مَه، (ژِ شَيْطَانِى رَه وِهَا) دبێژَه: هَىْ، خَوزِى دِنَقَبَا مِنْ و تَه دَه بِقَاسِى رُوّژْهِلاتْ و رُوّژَاڤَا دُورَاهِى هَبُويَا. ڤێجَه تُو چه هَڤَالَكِى پِيسِى!

٣٩. (خُدِىَ دبێژَه): ژِ بَرْ كُو هُونْ هَرْ دُو ژِى ظَالِمْ بُونْ، اِيرُو پُوّشْمَانِيَا وَه دِىَ تُو فَيْدَيَكِىَ نَدَه وَه. بێگُمَانْ هُونْ دِعَذَابْ دَه هَڤْپِشْكِنْ.

٤٠. اَرِىَ مَا تُو يىَ بِكَرَانْ بِدِى بِهِيسْتِنْ، يَانْ ژِى تُو يىَ كُوّرْ و يێنْ كُو دِرێشَاشِيكَه اَشْكَرَا دَه نَه، رَاسْتَرِىَ بِكِى؟

٤١. اَگَرْ (بَرِيَا عَذَابَكِى بِدِنْ وَانْ) اَمْ تَه بِمِرِينِنْ، ڤێجَه تَقَزْ اَمِىَ وَانْ جَزَا بِكِنْ.

٤٢. يَانْ ژِى اَمِىَ وِى عَذَابِىَ كُو مَه ژِ وَانْ رَه سُوّزْ دَايَه نِيشَانِى تَه بِدِنْ، ڤێجَه بِرَاسْتِى اَمْ لِسَرْ وَانْ كَارَا نَه.

٤٣. ڤێجَه تُو خوه بِيَا كُو ژِ تَه رَه هَاتِيَه وَحِيكِرِنْ بِگِرَه. بێگُمَانْ تُو لِسَرْ رِيَا رَاسْتُ و دُرِسْتِى.

٤٤. بێگُمَانْ اَڤْ قُرْئَانْ ژِ بُوّ تَه و قَومِىَ تَه شِيرَتْ و بِيرْئَانِينَه؛ پَاشِىَ هُونِىَ ژِىَ بێنَه پِرْسِيَارْكِرِنْ.

٤٥. تُو ژِ پێرَوێنْ وَانْ پێخَمْبَرێنْ كُو مَه بَرِيَا تَه اَوْ شَانْدِنَه، بِپِرْسَه: مَا ژِ بِلِى خُدَا يىَ رَحْمٰنْ مَه هِنْ اِلٰهێنْ دِنْ چێكِرِنَه كُو پَرَسْتِنَا وَانْ وَرَه كِرِنْ؟

**٤٦.** صُۆنْدْ بَه، مَه مُوسَا بَئَایَتێنْ خَوه بِبَالْ فِرْعَونْ و گِرَه گِرێنْ وِی ڤَه شَانْدْ، مُوسَا گُۆتْ: بێگُمَانْ اَزْ قَاصِدیێ پَرْوَرْدَگَارێ عَالَمیێ مَه (کُو بِبَالْ وَه ڤَه هَاتِمَه شَانْدِنْ).

**٤٧.** اِیْدِی دَمَا کُو مُوسَا ئَایَتێنْ مَه ژِ وَانْ رَه ئَانینْ، دِجِهْ دَه بِوَانْ کَنِیَانْ (و طِنَازیێ خَوه بِوَانْ کِرِنْ).

**٤٨.** اَمْ چِقَاسْ نِیشَانَکیێ بِوَانْ دِدِنْ دِیتِنْ هَرْ اَوْ ژِ یَا بَرِیَا خَوه مَزِنْتِرَه و مَه اَوْ بِعَذَابْ هِنْگَافْتِنْ دَا کُو اَوْ (ژِ کُفْرِیێ) ڤَگَرِنْ.

**٤٩.** گُۆتِنْ: اَیْ زَانَایێ سێریێ! اَوْ سُۆزَا خُدیێ دَایَه تَه، ژِ بُۆ مَه ژِ خُدیێ بِخَوازَه، بێگُمَانْ اَمیێ بێنَه سَرْ رِیَا رَاسْتْ (اَمیێ اِیمَانیێ بِینِنْ).

**٥٠.** ڤێجَه دَمَا مَه (بِدُعَایا مُوسَا) عَذَابْ ژِ سَرْ وَانْ رَاکِرْ، وَانْ دِجِهْ دَه پَیْمَانَا خَوه شِکَانْدِنْ.

**٥١.** فِرْعَونْ، گَازِی لِقَومیێ خَوه کِرْ و گُۆتْ: گَلِی مِلَّتیێ مِنْ! مَا دَسْتْهِلاتِیَا مِصْریێ نَه یَا مِنَه، مَا اَڤْ چَمْ نَه دِبِنْ سَرَایێنْ مِنْ دَه دِهَرِکِنْ؟ اَریێ مَا هُونْ (هێزَا مِنْ و لَوَازِیَا مُوسَا) نَابِینِنْ؟

**٥٢.** بَلْکِی اَزْ ژِ ڤِی زِلامیێ (مُوسَایێ) رَبَنْ و کُو نِکَارَه (مَبَسْتَا خَوه) بِبێژَه چێتِرِمْ.

**٥٣.** دَه بِلا لِسَرْ مُوسَا بَازِنێنْ زێرْ بِهَاتِنَا ئَاڤێتِنْ یَانْ ژِی دِگَلْ وِی مَلائِیکَتْ بِهَاتِنَا کُو ئَارِیکَارِیَا وِی بِکِرَانَا!

**٥٤.** ڤێجَه فِرْعَونْ (ئَاقِلیێ) گَلیێ خَوه سِڤِكْ دِیْرَا، اِیْدِی وَانْ ژِی بِگُوتِنَا وِی کِرْ، لَوْرَا؛ بِرَاسْتِی اَوْ قَوْمَکی فَاسِقْ بُونْ.

**٥٥.** اِیْدِی دَمَا وَانْ هێرسَا مَه ئَانِی، مَه (بِعَذَابْ) تُولْ ژِ وَانْ هِلانِی؛ مَه اَوْ تَڤْ دِ ئَاڤیێ دَه خَنِقَانْدِنْ.

**٥٦.** اِیْدِی مَه (بِڤیێ جَزَادَانیێ) اَوْ کِرِنْ پێشِیكْ و مِینَاكْ ژِ بُۆ یێنْ دِپَیْ وَانْ رَه بێنْ.

**٥٧.** (يَا مُحَمَّدْ!) چه دَمَا مه ژِ عِيسَايێ كُرێ مَرْيَمێ دَرْبُ و مَسَلْ ئَانِى، قَومێ تَه (اَوێ كُو بَاوَرِى نَئَانِينْ) دِجِهْ دَه ژِ كێفَا دَانْ قِيرَا.

**٥٨.** گُوتِنْ: مَا اِلٰهێنْ مَه چێترِنْ يَانْ عِيسَا چێترَه؟ اَڤْ گَنْگَشِيَا وَانْ، بَسْ دَا كُو نِيقَاشێ بِكِنْ. بَلْكِى اَوْ قَوْمَكِى زێدَه نِيقَاشْكَرَه.

**٥٩.** عِيسَا بَسْ عَڤْدێ مَه يَه، مَه قَنْجِى لِێ كِرِيَه و مَه اَوْ ژِ بَنِى اِسْرَائيلِيِيانْ رَه كِرِيَه نِمُونَه.

**٦٠.** اَگَرْ مَه بِخوەسْتَا، مَه دِێ ژِ وَه لِسَرْ عَرْدێ مَلائِيكَتْ بَئَافِرَانْدِنَا كُو اَوێ بِبُونَا شُونْگرێنْ هَڤْ.

**٦١.** بێگُمَانْ نُزُولَا عِيسَى ژِ بُو قِيَامَتێ نِيشَانَكَه، ڤێجَه دَرْ بَارێ قِيَامَتێ دَه نَكَڤِنْ گُمَانێ. بِدِنْ پَێ (وَحْيَا) مِنْ ،هَا اَڤْ رِيَا رَاسْتُ و دُرِسْتَه.

**٦٢.** زِنْهَارْ، بِلا شَيْطَانْ وَه (ژِ دِينێ خُدێ) ڤَنَگَرِينَه! بێگُمَانْ اَوْ ژِ وَه رَه نَيَارَكِى اَشْكَرَا يَه.

**٦٣.** چه گَاڤَا عِيسَا دَلِيلْ و مُعْجِزَه ئَانِينْ، ژِ وَانْ رَه گُوتْ: بێگُمَانْ اَزْ بِحِكْمَتێ ژِ وَه رَه هَاتِمَه، دَا كُو هِنَكِى ژِ يێنْ كُو هُونْ تێ دَه بِهَڤْ كَتِنْ ژِ وَه رَه اَشْكَرَا بِكِمْ. ڤێجَه هَاێ (ژِ حَلالْ و حَرَامێ) خُدێ هَبِنْ و بِگُوتِنَا مِنْ بِكِنْ.

**٦٤.** بێگُمَانْ خُدَا پَرْوَرْدَگَارێ مِنْ و پَرْوَرْدَگَارێ وَه يَه، ڤێجَه عِبَادَتێ وِى بِكِنْ. هَا اَڤْ رِێكَه رَاسْتُ و دُرِسْتَه.

**٦٥.** پِشْتِى ڤێ، دَسْتَه و كُومێنْ اِسْرَائيلِيَانْ (دَرْ بَارێ عِيسَا دَه) دِنَاڤَا خوه دَه بِهَڤْ كَتِنْ. اِێدِى ژِ بَرْ عَذَابێ رُوژَكَه جَانْسُوژْ وَاخْ لِحَالێ ظَالِمَانْ!

**٦٦.** مَا اَوْ ژِ بِلِى كُو ژِ نِشْكَا ڤَه قِيَامَتْ بِسَرْ وَانْ دَه وَرَه پێ ڤَه -دِگَلْ كُو اَوْ ژێ بێ هَاێن- اَوْ چَاڤنێرِيَا چه دِكِنْ؟

**٦٧.** وِێ رُوژێ، ژِ بِلِى يێنْ تَقْوَادَارْ، هَمُو دُوسْتُ و هُوگرْ ژِ هَڤْ رَه دِژْمِنْ و نَيَارِنْ.

٦٨. (خُدێ دِبێژَه): گَلی بَنْدَیێنْ مِنْ! ایرُو لِسَرْ وَه تِرْسْ تُنَه یَه و هُونِێ غَمْگینْ ژی نَبِنْ.

٦٩. اَوێنْ کُو بَئَایَتێنْ مَه بَاوَری ئَانینَه و ژِ خُدَا رَه بَرْدَسْتْ بُونَه...

٧٠. هُونْ و هَڤژِینێنْ خوه بِقَدْرُ و دِلْشَادی تێکَڤِنْ بِهِشْتێ!

٧١. لِبَرْ وَانْ (خَوارِنْ و ڤَخَوارِنْ) بِفِرَاقْ و قَدَهێنْ زێرینْ تێنْ گَرَانْدِنْ. ژِ بُوْ وَانْ ئَا کُو دِلێنْ وَانْ دِخَوازَه و چَاڤێنْ وَانْ پێ زَوْقێ دِبینَه هَیَه. هُونِێ هَرْ و هَرْ لِوِرْ بِمِینِنْ.

٧٢. هَا اَڤْ بِهِشْتَا کُو وَه مِیرَاسْ وَرْگِرْتیَه، خَلاتَا عَمَلێ وَه یَه.

٧٣. ژِ بُوْ وَه پِرْ پِرْ فێکی تێ دَه هَنَه کُو هُونِێ ژِ وَانْ بِخُونْ.

٧٤. بێگُمَانْ سُوجْدَارْ هَرْ و هَرْ دِێ دِعَزَبێ دُوژَهێ دَه بِنْ.

٧٥. عَذَابْ لِسَرْ وَانْ دِێ قَتْ نَیێ سِڤِکْکِرِنْ، اَوْ دِنَاڤْ عَذَابْ دَه دِێ هێڤِیَا خوه ژِ خَلاصْبُونێ بِبِرِنْ.

٧٦. مَه لِوَانْ ظُلمْ نَکِریَه. لێبَلێ اَوْ بِخوه ظَالِمِنْ.

٧٧. اَوْ گَازی دَرْگَهْڤَانێ دُوژَهێ دِکِنْ: اَیْ مَالِكْ! بِلا خُدَایێ تَه حُکْمێ مِرِنێ لِمَه بِبِرَه! مَالِكْ ژی دِێ ژِ وَانْ رَه بِبێژَه: بێگُمَانْ هُونِێ وِهَا بِمِینِنْ!

٧٨. صُوْنْدْ بَه، مَه حَقی ژِ وَه رَه شَانْدْ. لێبَلێ پِرێنْ وَه ژِ حَقِیێ حَزْ نَاکِنْ.

٧٩. نَا، بَلْکی وَانْ بِرْیَارَكْ دَایَه. ڤێجَه بِرَاسْتی مَه ژی بِرِیَارْ دَایَه.

٨٠. یَانْ ژی، ژِ وَانْ وَه یَه کُو اَمْ پێڤَا وَانْ یَا بِدِزی و اَشْکَرَا نَابِهِیزِنْ؟ نَاخێرْ، اَمْ وِێ دِبِهِیزِنْ و قَاصِدێنْ مَه یێنْ کُو لِجَمْ وَانِنْ، وِێ دِنِڤِیسِنْ.

٨١. بِبێژَه: اَگَرْ ژِ خُدَایێ رَحْمنْ رَه زَارُوكْ هَبُونَا، تَڤَزْ اَزێ بِبُومَا پێشییێ پَرَسْتکَارَانْ.

٨٢. خُدَایێ عَرْدُ و ئَاسِیمَانَانْ و خُدَایێ عَرْشْ ژِ سَالُوخْدَایینَا مُشْرِکَانْ تَڤَزْ پَاكْ و دُورَه.

**٨٣.** اِیْدِی تُو وَانْ دِرَوْشَا وَانْ دَه بهێلَه، بلا خَوه دِپُوچِییێ دَه بَرْدِنْ و بِدِنْیَایَا خَوه دِلْخَوشْ بِینْ، حَیَانِی کُو پێرْگِی وِێ رُۆژَا کُو سُۆزَا وِێ ژِ وَانْ رَه هَاتِیَه دَایِینْ بێنْ.

**٨٤.** هَرْ اَوَه یِێ کُو لِئَاسِیمَانَانْ خُدَا و یِێ کُو لِعَرْدِێ ژِی خُدَا و اَوَه یِێ کَارْبِنَجِهْ یِێ زَانَا.

**٨٥.** اَوْ خُدَایِێ کُو خُدَانِی و رِیْقَبَرِیَا عَرْدُ و ئَاسِیمَانَانْ و یِێنْ دِنَاڤْبَرَا وَانْ دَه ژِ بُۆ وِی یَه چِقَاسْ پِیرُوزْ و بِلِنْدَه. هَرْ لِجَمْ وِی یَه زَانِینَا (بِرُۆژَا) قِیَامَتِێ و هُونِێ هَرْ لِێ بێنَه ڤَگَرَانْدِنْ.

**٨٦.** اَوێنْ کُو دِشُونَا خُدِێ دَه عِبَادَتِێ وَانْ تِێ کِرِنْ اَوْ نِکَارِنْ مَهْدَرْڤَانِیَا تُو کَسِی بِکِنْ. لِێبَلِێ یِێ کُو بزَانَبُونْ بَاوَرِی بِدِینِێ حَقْ بِینَه و شَاهِدِییێ ژِێ رَه بِدَه، اَوْ جُدَا یَه.

**٨٧.** صُۆنْدْ بَه، اَگَرْ تُو ژِ وَانْ بِپِرْسِی کِێ اَوْ ئَافِرَانْدِنَه؟ تَقَزْ دِێ بِبێژِنْ: خُدِێ یَه. ڤێجَه مَا چَاوَا بَرِێ وَه ژِێ تِێ زِیڤِرَانْدِنْ؟

**٨٨.** پێخَمْبَرْ گُوتْ: خُدَایِێ مِنْ! بێگُمَانْ اَڤْ مِلَّتَکِی وِسَا یَه کُو بَاوَرِی نَایِینِنْ.

**٨٩.** ڤێجَه تُو دَڤْ ژِ وَانْ بَرْدَه و بِبێژَه: بِرِێکَا خَوه ڤَه هَرِنْ. پَاشِێ اَوِێ بِزَانِنْ (یَا کُو مِنْ نَازِلْکِرِی حَقَه)!

## ٤٤. سُورَه یِێ دُخَانْ

سُورَه‌یِێ (دُخَانْ)،٥٩ (پێنْجِی و نَهْ) ئَایَتَه و لِمَکِّییێ نَازِلْ بُویَه . نَاڤِێ سُورَه ژِ کَلِیمَیَا دُخَانْ هَاتِیَه کُو دِ ئَایَتَا ١٠'اَمْ دَه دَرْبَاسْ بُویَه و بِمَعْنَیَا دُومَانَه.

**بِنَاڤِێ خُدَایِێ کُو رَحْمٰنَ رَحِیمَ**

١. حَا، مِیمْ.

٢. صُۆنْدْ بَه، بِکِتێبَا رُۆنْکَرْ.

٣. بِرَاسْتِی مَه اَوْ دِشَقَکه پیرُوّزْ دَه نَازِلْ کِرِیَه. بێگُمَانْ اَمْ بوِیْ (مِرُوّڤانْ) هِشْیَارْ دِکِنْ و دِطِرْسِینِنْ.

٤. دِ وِیْ شَڤِیْ دَه، هَرْ کَارْ و بَارِیْنْ خُدَانْحِکْمَتْ تێنْ ڤَقَتَانْدِنْ..

٥. اَڤْ فَرْمَانِنْ ژِ جَمْ مَه ڤَه. بێگُمَانْ اَمْ وَانْ دِشِینِنْ..

٦. کُو اَوْ رَحْمَتَکه ژِ جَمْ خُدَایێ تَه. بێگُمَانْ، هَرْ اَوَه یێ بِهیزَرْ، یێ زَانَا.

٧. اَوْ، پَرْوَرْدَگَارِیْ عَرْدُ و ئَاسِیمَانَانْ و پَرْوَرْدَگَارِیْ یێنْ دِ نَاڤْبَرَا وَانْ دَه یَه. اَگَرْ هُونْ ژِ دِلْ بَاوَرْ دِکِنْ (بَسْ ژِ خُدِیْ رَه عِبَادَتِیْ بِکِنْ).

٨. ژِ بلِی وِی تُو اِلٰه نینِنْ. اَوْ سَاغْ دِکَه و دِمرِینَه. اَوْ پَرْوَرْدَگَارِیْ وَه و پَرْوَرْدَگَارِیْ بَاڤْ و بَاپیرێنْ وَه یێنْ پێشی یَه.

٩. بَلْکِی اَوْ (مُشْرِكْ) دِگُمَانِیْ دَه ژِ خَوه رَه دِلیزِنْ (و بَاوَرِی نَاینِنْ).

١٠. ڤێجَه تُو چَاڤنێرِیِیْ بِکَه، وِیْ رُوّژَا کُو ئَاسِیمَانْ دُومَانَکَه اَشْکَرَا تینَه..

١١. اَوْ مِرُوّڤانْ دِدَه نَاڤْ خَوه (و لِوَانْ تێ هَڤْ). هَا اَڤْ عَذَابَکِی دِژْوَارْ و بِژَانَه.

١٢. (هِنْگِیْ اَوْ دِیْ بێژِنْ): خُدَایێ مَه! عَذَابْ ژِ سَرْ مَه بِدَه ئَالِی، بِرَاسْتِی مَه اِیمَانْ ئَانیَه.

١٣. اَرِیْ مَا پِشْتِی کُو عَذَابْ ژِ وَانْ رَه هَاتْ اَوِیْ چَاوَا شِیرَتِیْ وَرْگِرِنْ؟ رَوْشْ اَڤَه کُو ژِ بُوّ وَانْ پێخَمْبَرَکِی رُوّنَاكْ هَاتبُو (و وَانْ بَاوَرِی پێ نَه ئَانیبُو).

١٤. پِشْتْرَه وَانْ بَرِیْ خَوه ژِ پێخَمْبَرْ گُهرَانْدْ و گُوّتِنْ: اَوْ ژِ طَرَفْ هِنَکَانْ ڤَه هَاتیَه پَرْوَرْدَکِرِنْ، اَوْ دینَه.

١٥. بِرَاسْتِی اَمِیْ دَمَکَه کُرْتْ عَذَابْ ژِ سَرْ وَه رَاکِنْ، لِیْبَلِیْ هُونِیْ دیسَا (لِحَالِیْ خَوه یێ بَرِیْ) ڤَگَرِنْ.

١٦. رُوّژَا کُو اَمْ وَانْ بِهِنْگَافْتِنَکَه تُوژْ و مَزِنْ بِهِنْگێڤِنْ. تَڤَزْ اَمِیْ تُوّلِیْ لِوَانْ ڤَکِنْ.

١٧. صُوْنْدْ بَه، مَه بَرِيَا وَانْ (مُشْرِكَانْ) گَلِێ فِرْعَونْ ژِی جَرِبَانْدْ و ژِ وَانْ رَه پێخَمْبَرَكِی بِرُومَتْ هَاتْ.

١٨. (ژِ وَانْ رَه وِهَا گُوْتْ): بَنْدَيێنْ خُدَا (بَنِی اِسْرَائِيلِيیَانْ) تَسْلِيمِی مِنْ بِكِنْ، لَوْرَا اَزْ ژِ بُوْ وَه پێخَمْبَرَكِی ژِێ بَاوَرِمْ.

١٩. خَوه لِهَمْبَرِی خُدَا مَزِنْ نَدِێرِنْ، بِرَاسْتِی ژِی مِنْ ژِ بُوْ وَه دَلِيلْ و بَلْگَيَكَه اَشْكَرَا ئَانِيَه.

٢٠. اَزْ خَوه دَاڤێژِمْ بَرْ حَفْظَا خُدَايێ خَوه و خُدَايێ وَه دَا كُو هُونْ مِنْ بِكَڤِرَانْ نَكُژِنْ.

٢١. اَگَرْ هُونْ ژِ مِنْ بَاوَرْ نَاكِنْ، نَاخَوه ژِ مِنْ دُورْ بِبِنْ.

٢٢. اِێدِی لِهَمْبَرِی ڤِێ، مُوسَا گَازِی خُدَايێ خَوه كِرْ، گُوْتْ: بِرَاسْتِی اَڤێنْ هَا قَوْمَكِی سُوجْدَارِنْ.

٢٣. (خُدێ ژِێ رَه گُوْتْ): نَاخَوه بَنْدَيێنْ مِنْ بِشَڤْ (ژِ مِصْرِێ) دَرِينَه، بێگُمَانْ اَوِێ بِدُوڤْ وَه بِكَڤِنْ.

٢٤. دَرْيَايێ دِرَوْشَا وِێ دَه ئَارَامْ بِهێلَه، بِرَاسْتِی اَوِێ دِ ئَاڤِێ دَه بێنْ خَنِقَانْدِنْ.

٢٥. وَانْ لِدُوڤْ خَوه گَلَكْ بَاخْچَه و كَانِيێنْ (بێخَودِی) هِشْتِنْ...

٢٦. زَڤِيێنْ چَانْدِی و كُوْشْكێنْ خَوشْكْ...

٢٧. پِرْ نِعْمَتێنْ كُو دِنَاڤْ وَانْ دَه كێفْ و شَاهِی دِكِرِنْ (هِشْتِنْ)!

٢٨. رَوشْ وِهَا يَا و مَه مِلَّتَكِی دِنْ كِرَه وَارِثِێ وَانْ.

٢٩. عَرْدُ و ئَاسِيمَانْ ژِ بُوْ وَانْ نَگِرِيَانْ و مُهْلَتْ ژِی ژِ وَانْ رَه نَهَاتَه دَايِنْ.

٣٠. صُوْنْدْ بَه، مَه زَارُويێنْ اِسْرَائِيلْ ژِ وِی عَذَابِێ رِسْوَاكَرْ خَلَاصْ كِرِنْ...

٣١. ژِ فِرْعَونْ. لَوْرَا اَوْ زُوْرْدَارَكِی تِخُوبْبِهێرْ بُوْ.

**٣٢.** صُۆنْدْ بَه، مَه زَارُوِيێنْ اِسْرَائِيلْ بزَێَانِينْ دِسَرْ خَلْكِێ (دَمَا وَانْ) رَه كِرْتِنْ.

**٣٣.** مَه هِنْ نِيشَانْ دَانَه وَانْ كُو دِ وَانْ دَه جَرِبَانْدِنَكَه اَشْكَرَه هَبُو.

**٣٤.** بِرَاسْتِى اَڤِێنْ هَانْ دِبێژِنْ:

**٣٥.** ژِ مِرِنَا مَه يَا پێشِينْ پِێ ڤَه تِشْتَكِى دِنْ نِينَه و اَمِێ نِێێنَه سَاغْكِرِنْ.

**٣٦.** (كُۆتِنْ): ڤێجَه اَگَرْ هُونْ رَاسْتْ دِبێژِنْ، دَه كَا بَاڤْ و بَاپِيرێنْ مَه بِينِنْ.

**٣٧.** مَا اَڤْ (مُشْرِكْ) خُرْتِرِنْ، ئَانْ ژِى گَلِێ «تُبَّعِ»ێ و يێنْ بَرِيَا وَانْ ژِى؟ ژِ بَرْ كُو اَوْ گُنَهْكَارْ بُونْ، بِرَاسْتِى مَه اَوْ تَڤْ بِرِنْ هَلاكِێ.

**٣٨.** مَه عَرْدْ، ئَاسِيمَانْ و يێنْ دِنَاڤْبَرَا وَانْ دَه مِشێيَا نَئَافِرَانْدِنَه.

**٣٩.** مَه اَوْ هَرْ بِحَقِيِێ ئَافِرَانْدِنَه، لِێبَلِێ پِرێنْ وَانْ (ڤِێ رَاسْتِيِێ) نِزَانِنْ.

**٤٠.** بێگُمَانْ رُۆژَا ژِهَڤْجُدَابُونِێ (رُۆژَا قِيَامَتِێ) جِڤَانِێ وَانْ هَمُويَانَه.

**٤١.** وِێ رُۆژِێ، تُو دُۆسْتْ نِكَارَه بِتِشْتَكِى فَيْدِێ بِدَه دُۆسْتَكِى، ئَارِيكَارِيَا وَانْ ژِى دِێ نَيِێ كِرِنْ.

**٤٢.** ژِ بِلِى يێنْ كُو خُدِێ لِوَانْ هَاتِيَه رَحْمِێ. بێگُمَانْ هَرْ اَوَه يِێ دَسْتْهِلاتْ يِێ دِلُۆڤَانْ.،

**٤٣.** بِرَاسْتِى دَارَا زَقُومِێ..

**٤٤.** خَوَارِنَا گُنَهْكَارَانَه.

**٤٥.** عَيْنِى وَكِى هَسِنِێ حَلاَنْدِى دِزِكێنْ وَانْ دَه دِكَلَه.

**٤٦.** هَرْ وِهَا وَكِى كَلَا ئَاڤَا كَلِى يَه.

**٤٧.** (خُدَا فَرْمَانْ لِزَبَانِيَانْ دِكَه): وِى بِگِرِنْ و بِكێشِنْ نِيڤِێ دُۆژَهِێ!

**٤٨.** پِشْتْرَه ژِ عَذَابِێ دُۆژَهِێ (ئَاڤَا كَلِى) بِسَرْ وِى دَه بِرِژِينِنْ.

**٤٩.** (ژِىَ رَه دِبێژِنْ): دَه هَايْدِىَ (عَذَابْ) تَعِمْ بِكَه! لَوْرَا تُو (لِدِنْيَايِىَ) دَسْتْهِلاتْ و بِرُومَتْ بُويِى!

**٥٠.** بِرَاسْتِى اَڤْ عَذَابْ، اَوِىَ كُو وَه دَرْ بَارِىَ وِى دَه گُمَانْ دِكِرْ.

**٥١.** هَرْ چِى كُو مُتَّقِى نَه، بِرَاسْتِى اَوْ لِجهَكِى اَوْلَه نَه.

**٥٢.** دِنَاڤْ بَخْچَانْ دَه و لِسَرْ كَانِيَانِنْ...

**٥٣.** جِلێنْ هَڤْرِيشْمِىَ تَنِكْ و اَطْلَسِىَ بَرْقُوكْ لِخَوه دِكِنْ و لِپێشْبَرِى هَڤْ رُودِنِنْ.

**٥٤.** هَرْ وِهَا مَه اَوْ بِحُوْرِيێنْ چَاڤْگِرْ يێنْ چَاڤْبَلَكْ رَه كِرِنْ هَڤْژِينْ.

**٥٥.** تِىَ دَه هَرْ تَخْلِيتێنْ فێكِى بَاَوْلَهِى دِخَوَازِنْ.

**٥٦.** ژِ مِرنَا پێشِينْ پِىَ ڤَه اَوِىَ مِرِنَكَه دِنْ نَچێژِنْ و خُدِىَ اَوْ ژِ عَذَابِىَ دُوْژَهِىَ پَارَاسْتِنَه.

**٥٧.** اَڤْ دَايِينَا هَانْ قَنْجِيكَه ژِ خُدَايِىَ تَه يَه و تَڤْزْ اَوَه خَلاَسِيَا مَزِنْ.

**٥٨.** ڤێجَه بِرَاسْتِى مَه اَڤْ قُرْئَانْ بِزِمَانِىَ تَه هِيسَانْ كِرِيَه دَا كُو اَوْ شِيرَتْ وَرْگِرِنْ.

**٥٩.** ڤێجَه تُو چَاڤْنێرِيِىَ بِكَه (يَا كُو بِىَ سَرِىَ وَانْ)، بێگُمَانْ اَوْ ژِى چَاڤْنێرِيِىَ دِكِنْ.

## ٤٥. سُورَه يِىَ جَاثِيَه

سُورَهيِىَ (جَاثِيَه)،٣٧ (سِهْ و حَفْتْ) ئَايَتَه. لِمَكِّىَ پِشْتِى سُورَيِىَ دُوخَانْ نَازِلْ بُويَه . سُورَه، نَاڤِىَ خَوه ژِ بێژَيَا جَاثِيَه گِرْتِيَه كُو دَئَايَتَا ٢٨'اَمْ دَه دَرْبَاسْ بُويَه و بِمَعْنَيَا «چُوكْدَايِينْ، كُومبُويِينَ»ه.

**بِنَاڤِىَ خُدَايِىَ كُو رَحْمَنَ رَحِيمَ**

١. حَا، مِيمْ.

٢. اَڤْ كِتێبْ ژِ جَمْ خُدِىَ ڤَه هَاتِيَه هِنَارْتِنْ، اَوِىَ كُو دَسْتْهِلاتَه، كَارْبِنَجِهَه.

٣. بێگُمَانْ دِعَرْدُ و ئَاسِیمَانَانْ دَه، ژِ بُوّ بَاوَرْمَنْدَانْ گَلَكْ ئَایَتْ هَنَه.

٤. بِرَاسْتِی دِ خُلِقَانْدِنا وَه دَه و دِ خُلِقَانْدِنَا زِنْدِییێنْ كُو لِسَرْ عَرْدِێ بَلَاڤْ بُونَه دَه، ژِ بُوّ مِلَّتَكِی كُو ژِ دِلْ بَاوَرْ بِكَه گَلَكْ عِبْرَتْ هَنَه.

٥. بێگُمَانْ دِگُهَرتِنَا شَڤْ و رُوّژِێ دَه، دِ وِێ بَارَانَا كُو خُدِێ اَوْ ژِ ئَاسْمِێنْ دَاخِسْتِی دَه، ڤِێجَه كُو بِوِێ بَارَانِێ عَرْدَا مِرِی سَاغْ و هِێشِینْ دِكَه و دِئَانِینَا بَایِێ ژِ هَمُو ئَالِیَانْ ڤَه، ژِ بُوّ مِلَّتَكِی كُو فَهِمْ بِكَه پِرْ ئَایَتْ هَنَه.

٦. هَا اَڤْ ئَایَتِێنْ خُدِێ نَه. اَمْ وَانْ بِحَقِی و رَاسْتِی ژِ تَه رَه دِخُوِینِنْ. اِیْدِی اَوْ (مُشْرِكْ) پِشْتِی كُو بَاوَرِی بِخُدِێ و ئَایَتِێنْ وِی نَیینِنْ، اَوِێ بِكِیژَانْ گُوتِنِێ بَاوَرِی بِینِنْ؟

٧. وَاخْ لِحَالِێ هَرْ دَرَوْبِێژِێ گُنَهْكَارْ بَه!

٨. كُو اَوْ ئَایَتِێنْ خُدِێ یِێنْ كُو ژِێ رَه تِێنَه خَوِنْدِنْ سَحْ دِكَه، پِشْتْرَه خَوه مَزِنْ دِدِێرَه هَرْ وَكِی كُو اَوْ نَبِهِیسْتِنَه ئَاصِێ دِبَه، ڤِێجَه مِزْگِینِیَا عَذَابَكِی دِژْوَارْ بِدِیِێ!

٩. دَمَا ژِ ئَایَتِێنْ مَه تِشْتَكِی فِێرْ دِبَه حَنَكِێ خَوه بِوَانْ دِكَه. هَا ژِ بُوّ وَانْ عَذَابَكِی رِسْوَاكَرْ هَیَه.

١٠. جَهَنَمْ لِپِیِّشِیَا وَانَه. تِشْتِێنْ كُو وَانْ بِدَسْتْ خِسْتِنْ و اَوِێنْ كُو وَانْ دِشُونَا خُدِێ دَه ژِ خَوه رَه كِرِنَه پِشْتَڤَانْ ژِی نِكَارِنْ تُو فَیْدَیَكِێ بِدِنْ وَانْ و ژِ بُوّ وَانْ هَرْ عَذَابَكِی مَزِنْ هَیَه.

١١. هَا اَڤْ، سَرْكَانِیَا هِیدَئَایَتِێ یَه. هَرْچِی اَوِێنْ كُو ئَایَتِێنْ خُدَایِێ خَوه اِنْكَارْ كِرِنْ، ژِ وَانْ رَه عَذَابَكِی بِئێشْ و دِژْوَارْ هَیَه.

١٢. خُدِێ یَه، یِێ كُو دَرْیَا ژِ بُوّ وَه مِسخُرْ كِرِیَه دَا كُو كَشْتِی بِدَسْتُورَا وِی تِێ دَه بِكِشْنْ و كُو هُونْ ژِ كَرَمَا وِی لِرِزْقِێ خَوه بِگَرِنْ و دَا كُو هُونْ وِی بِشِێكِرِینِنْ.

١٣. خُدِێ ژِ كَرَمَا خَوه چِه لِعَرْدُ و لِئَاسِیمَانَانْ هَنَه تَڤْ ژِ بُوّ وَه بَرْدَسْتْ كِرِنَه. تَڤْزْ دِڤِێ دَه ژِ بُوّ مِلَّتَكِی كُو بِفِكِرِنْ پِرْ ئَایَتْ هَنَه.

١٤. ژِ بَاوَرْمَنْدَانْ رَه بِبِيژَه: (ژِ بَرْ ئَازَارَا كُو دَانَه وَه) وَانِيْنْ كُو ژِ رُوٚژِيْنْ خُدِىٚ (يِيْنْ كَارَسَاتْ) نَاتِرْسِنْ بِبَخْشِينِنْ دَا كُو خُدِىٚ قَوْمَكِى (كُو بِينَا خَوه فَرَهْ كِرِيَه) خَلاتْ بِكَه بِسَدَمْ كُو كَارْ و بَارِيْنْ قَنْجْ كِرِنَه.

١٥. چِه كَسِىٚ كُو كَارَكِى قَنْجْ بِكَه اَوْ ژِ خَوه رَه دِكَه و چِه كَسِىٚ كَارَكِى خَرَابْ بِكَه اَوْ لِخَوه دِكَه. پِشْتْرَه هُونِىٚ لِخُدَايِىٚ خَوه بِيْنْ ڤَگَرَانْدِنْ.

١٦. ضُوٚنْدْ بَه مَه كِتِيْبْ، دَسْتْهِلاتِى و پِيْخَمْبَرِى دَايَه زَارُوِيِيْنْ اِسْرَائِيلْ و مَه اَوْ بِتِشْتِىٚ پَاكْ و حَلَالْ رِزِقْدَارْ كِرِنْ و مَه اَوْ دِسَرْ خَلْكِىٚ (هَيَامَا وَانْ) رَه گِرْتِنْ.

١٧. مَه دَرْ بَارِىٚ دِينْ دَه دَلِيلِيْنْ اَشْكَرَا دَانَه وَانْ. لِيْبَلِىٚ اَوْ، پِشْتِى كُو زَانِينْ ژِ وَانْ رَه هَاتْ، ژِ چَاڤْنَبَارِيَا خَوه بِهَڤْ كَتِنْ. بِيْگُمَانْ خُدَايِىٚ تَه رُوٚژَا قِيَامَتِىٚ دِىٚ دِنَاڤْبَرَا وَانْ دَه دَرْ بَارِىٚ يَا كُو اَوْ تِىٚ دَه بِهَڤْ كَتِنْ حُكِمْ بِكَه.

١٨. پِشْتْرَه مَه تُو دَرْ بَارِىٚ دِينْ دَه لِسَرْ شَرِيعَتَكَه (رِيْبَازَكَه) اَشْكَرَا دَانِى. ڤِيْجَه وِىٚ رِىٚ يِىٚ بِگِرَه و بِدُو هَوَسِيْنْ نَزَانَانْ نَكَڤَه.

١٩. بِيْگُمَانْ اَوْ (نَزَانْ)، ژِ عَذَابِىٚ خُدَايِىٚ تَه نِكَارِنْ تِشْتَكِى ژِ تَه بِدِنْ ئَالِى. بِيْگُمَانْ ظَالِمْ دُوٚسْتْ و پِشْتَڤَانِىٚ هَڤِنْ. خُدَا ژِى هَڤَالْ و ئَارِيكَارِىٚ مُتَّقِيَانَه.

٢٠. اَڤْ (قُرْئَانْ)تِيْگِهِينِنْ ژِ بُوٚ مِرُوٚڤَانْ و سَرْوَخْتِى و دِلُوٚڤَانِى يَه ژِ بُوٚ جِڤَاتَكَه كُو ژِ دِلْ بَاوَرِى تِينِنْ.

٢١. اَرِىٚ مَا اَوِيْنْ كُو گُنَهْ كِرِنْ، گُمَانْ دِكِنْ كُو اَمِىٚ وَانْ و يِيْنْ كُو بَاوَرِى ئَانِينْ و كَارِيْنْ قَنْجْ كِرِنْ، دِسَاغِى و مِرِنِىٚ دَه وَكْهَڤْ بِگِرِنْ؟ چِه پِيسْ حُكْمَه يَا اَوْ دِدِنْ!

٢٢. خُدِىٚ عَرْدْ و ئَاسِيمَانْ بِحَقِى خُلِقَانْدِنَه. بِڤِى ئَاوَايِى هَرْ كَسْ دِىٚ لِگُوٚرِى قَازَانْجَا خَوه بِيْتَه خَلاتْ و جَلاتْكِرِنْ، تُو زُوٚرْدَارِى ژِى لِوَانْ نَايِىٚ كِرِنْ.

٢٣. اَرێ مَاتَه نَديتْ، اَوێ كُو هَوَسَا خوه ژِ خَوه رَه كِرَه اِلٰهْ؟ پِشْتِى كُو زَانِينْ گِهَاشْتِێ خُدێ اَوْ گُمْرَاه كِرْ، گُهْ و دِلِێ وِى مُورْ كِرْ و پَرْدَه بِسَرْ چَاڤێ وِى دَه ئَانِى. اِيْدِى ژِ خُدێ پِێ ڤَه كِى هَيَه كُو وِى بِينَه سَرْ رِيَا رَاسْتْ؟ مَا هِێ ژِى هُونْ تێنَاگِهيژِنْ؟!

٢٤. (مُشْرِكَانْ) گُوتِنْ: ژِيَانْ تَنێ ژِيَانَا ڤِێ دِنْيَايێ يَه؛ اَمْ تێ دَه دِمِرِنْ و دِژِينْ و بَسْ پێشْدَچُونَا زَمَانِى مَه دِبَه هَلاكِێ. دِڤِێ دَابَاشێ دَه تُو زَانِينَا وَانْ تُنَه. گُوتِنَا وَانْ بَسْ گُمَانَه.

٢٥. دَمَا ئَايَتێنْ مَه يێنْ رُونْكَارْ ژِ وَانْ رَه تێنْ خَونْدِنْ، ژِ بِلِى كُو بێژِنْ «اَگَرْ هُونْ رَاسْتْبێژِنْ دَه كَا بَاڤْ و بَاپِيرێنْ مَه سَاغْ بِكِن»پێ ڤَه تُو مَهْنَا وَانْ تُنَه.

٢٦. بێژَه: خُدێ دِێ وَه سَاغْ بِكَه، پِشْتْرَه دِێ وَه بِمِرِينَه. پِشْتْرَه دِێ وَه دِ رُوژَا ڤِيَامَتێ دَه يَا كُو ڤَتْ تێ دَه گُمَانْ تُنَه وَه لِهَڤْ بِجِڤِينَه، لێبَلِێ پِرێنْ مِرُوڤَانْ (ڤِێ) نِزَانِنْ.

٢٧. خُدَانِيَا عَرْدْ و ئَاسِيمَانَانْ ژِ خُدێ رَه يَه. رُوژَا ڤِيَامَتْ رَابَه، هَا وِێ رُوژێ اَوێنْ كُو گُهِێ خَوه دَانَه يَا پُوچْ و بَتَالْ، دِێ زِيَانْ بِكِنْ.

٢٨. (رُوژَا ڤِيَامَتێ) تُو دِێ هَرْ اُمَّتِى بِبِينِى كُو (ژِ تِرْسَا حَسَابێ خَوه) چُوكْدَايِى نَه. هَرْ اُمَّتْ بِبَالْ دَفْتَرَا عَمَلێ خَوه ڤَه تێنْ گَازِيكِرِنْ (و ژِ وَانْ رَه تێ گُوتِنْ): اِيرُو هُونێ لِگُورِى كِرِنێنْ خَوه بێنَه خَلاتْ و جَلاتْكِرِنْ!

٢٩. اَڤْ كِتێبَا مَه يَه، دَرْبَارێ وَه دَه بِرَاسْتِى دِئَاخِڤَه. بێگُمَانْ مَه كِرِنێنْ وَه دِ دَانْ نِڤِيسَانْدِنْ.

٣٠. اِيْدِى هَچِى اَوێنْ كُو بَاوَرِى ئَانِينْ و كَارێنْ ڤَنْجْ كِرِنْ، خُدَايێ وَانْ، وَانْ دِخَه نَاڤْ رَحْمَا خَوه. هَا اَڤْ، اَوْ سَرْكَفْتِنْ و سَرْفِرَازِيَا اَشْكَرَا بِخَوه يَه.

٣١. (لێبَلِێ) هَچِى اَوێنْ كُو كَافِرْ بُونَه (ژِ وَانْ رَه دِێ بێ گُوتِنْ): اَرێ مَا ئَايَتێنْ مِنْ ژِ وَه رَه نَدِهَاتِنْ خَونْدِنْ، ڤێجَه وَه ژِى خَوه مَزِنْ دِ دِيْرَا و هُونْ بُونَه جِڤَاتَكَه گُنَهْكَارْ؟!

**٣٢.** دَمَا تِیَ گُوتِنْ؛ بِرَاسْتِی پَیْمَانَا خُدِیَ حَقَه و دِ رُوْژَا قِیَامَتِیَ دَه تُو گُمَانْ تُنَه، هُونْ دِبیْژِنْ: اَمْ نِزَانِنْ قِیَامَتْ چِی یَه. لِیْبَلِیَ بَسْ اَمْ گُمَانَکِیَ دِکِنْ و اَمْ ژِ هَاتِنَا وِیَ نَه پِشْتْرَاسْتِنْ.

**٣٣.** جَزَایِیَ نَقَنْجِیێنْ کُو وَانْ کِرِی ژِ وَانْ رَه خُیَا بُویَه و عَذَابِیَ کُو وَانْ پِیَ طِنَازْ دِکِرْ دُوْرْ لِوَانْ گِرْتِیَه.

**٣٤.** (ژِ وَانْ رَه) تِیَ گُوتِنْ: وَه چَاوَا کِهشْتِنَا ڤِیَ رُوْژَا خوه ژِ بیرْ کِربُو، عَیْنِی وِسَا اَمِیَ ژِی ایرُو وَه دِ عَذَابْ دَه بِهیْلِنْ! هیِورْگِهَا وَه ئَاگِرَه و تُو ئَارِیکَارِیَ وَه ژِی تُنِنْ!

**٣٥.** سَدَمَا ڤِی عَذَابِی اَڤَه کُو وَه طِنَازِیْنْ خوه بِئَایِتێنْ خُدِیَ کِرِیَه و ژِیَانَا جِیهَانِیَ هُونْ خَاپَانْدِنَه. اِیْدِی ایرُو اَوِیَ ژِ اِیْکَرْ نَئِیْنَه دَرَانِینْ و (رَازِیکِرِنَا خُدِیَ ژِی) دِیَ ژِ وَانْ نَیِیَ خوسْتِنْ.

**٣٦.** ڤِیْجَه هَرْ سَالُوخِیْنْ بَاشْ و تِیْکُوزْ ژِ بُوْ خُدِیَ نَه، اَوِیَ کُو پَرْوَرْدَگَارِیَ عَرْدُ و ئَاسِیمَانَانْ و پَرْوَرْدَگَارِیَ عَالَمِیَ یَه.

**٣٧.** هَمْ دِ عَرْدُ و ئَاسِیمَانَانْ دَه، مَزِنَاهِی و کُبَارِی هَرْ ژِیَ رَه یَه و اَوْه یِیَ سَرْدَسْتْ، یِیَ کَارْبِنَجِهْ.

## ٤٦. سُورَه یِیَ اَحْقَافْ

سُورَه‌یِیَ (اَحْقَافْ) ، ٣٥ (سِهْ و پێنْجْ) ئَایِتَه. لِمَکِّیَ نَازِلْ بُویَه. سُورَه‌یِی، نَاڤِیَ خوه ژِ بیْژَیَا اَحْقَافْ گِرْتِیَه کُو دِ ئَایِتَا ٢١»مْ دَه دَرْبَاسْ بُویَه.

**بِنَاڤِیَ خُدَایِیَ کُو رَحْمَنَ رَحِیمَ**

١. حَا، مِیمْ.

٢. اَڤْ کِتیْبْ، ژِ جَمْ خُدَایِیَ دَسْتْهِلَاتْ اِیَ خودَانْحِکْمَتْ ڤَه هَاتِیَه شَانْدِنْ.

٣. مَه ئَاسِیمَانْ، عَرْدُ و یێنْ دِ نَاڤْبَرَا وَانْ دَه، هَرْ بِحَقِی و حَتَا دَمَکَه دِیَارْکِرِی ئَافَرَانْدِنَه. اَوێنْ کُو کَافِرْ بُونَه، پِشْتَا خَوه دِدِنَه وِی تِشْتِیٚ کُو پِیٚ هَاتِنَه هِشْیَارْکِرِنْ.

٤. بِبێژَه: دَه کَا ژِ مِنْ رَه بِبێژِنْ؛ اَوێنْ کُو ژِ بِلِی خُدێ هُونْ عِبَادَتِیٚ وَانْ دِکِنْ نِیشَانِی مِنْ بِدِنْ؛ کَا دِ عَرْدێ دَه چه خُلِقَانْدِنْ! یَانْ ژِی چه هَڤْکَارِیکَه وَانْ دِ (ئَافَرَانْدِنَا) ئَاسِیمَانَانْ دَه هَیَه؟ اَگَرْ هُونْ رَاسْتْگُونَه، دَه کَا کِتێبَکێ کُو بَرِیَا ڤِیٚ (قُرْئَانِیٚ) هَاتِبَه، یَانْ ژِی بَرْهَمَکِیٚ ژِ زَانِینَا (پێشِیَانْ) ژِ مِنْ رَه بِینِنْ.

٥. مَا ژِ وِی یێ کُو ژِ بِلِی خُدێ، ژِ یَکِی دَاخَوازْ دِکَه کُو حَیَانِی رُوژَا قِیَامَتِیٚ اَوْ نَشِیٚ بَرْسِڤَا بَرْگَرِینَا وِی بِدَه رێشَاشْتِرْ کِی هَیَه؟ رَوْشْ اَڤَه کُو اَوْ ژِی ژِ بَرْگَرِینَا وَانْ غَافِلِنْ.

٦. دَمَا مِرُوڤْ (دِ مَحْشَرێ دَه) لِهَڤْ بێنَه جِڤَانْدِنْ، اَوێ ژِ وَانْ (عَابِدێنْ خَوه) رَه بِبِنْ دِژْمِنْ و وِیٚ ژِ پَرَسْتِنَا وَانْ خَوه بێرِی بِکِنْ.

٧. دَمَا ئَایَتێنْ مَه یێنْ رُونْکَرْ ژِ وَانْ رَه دِهَاتِنْ خَوهنْدِنْ؛ اَوێنْ کُو کَافِرْ بُونَه پِشْتِی کُو حَقِی ژِ وَانْ رَه هَاتْ، گُوتِنْ: «اَڤْ سێحْرَکَه اَشْکَرَایَه.»

٨. یَانْ ژِی اَوْ (مُشْرِکْ) دِبێژِنْ: وِی، اَوْ قُرْئَانْ ژِ جَمْ خَوه لێئَانِیَه؟ بِبێژَه: اَگَرْ مِنْ اَوْ لێئَانِیبَه، هُونْ دِیٚ نِکَارِبِنْ تِشْتَکِی ژِ (عَذَابِیٚ) خُدێ ژِ سَرْ مِنْ بِدِنْ ئَالِی. خُدَا، بێهْتِرْ بِیَا کُو هُونْ خَوه تِیٚ دَه بَرْدِدِنْ دِزَانَه. دِ نَاڤْبَرَا مِنْ و وَه دَه بِشَاهِدِی خُدێ بَسَه و اَوْ، گُنَهْڤَشێرْ و دِلُوڤَانَه.

٩. بِبێژَه: اَزْ نَه پێشِیڤَانِیٚ پێخَمْبَرَانِمْ و اَزْ نِزَانِمْ دِیٚ چه ژِ مِنْ و چه ژِ وَه ژِی بێکِرِنْ. اَزْ تَنێ دِدِمْ پِیٚ وَحْیَا کُو ژِ مِنْ رَه هَاتِیَه و اَزْ بَسْ هِشْیَارْکَرَکِی اَشْکَرَا مَه.

١٠. بِبێژَه: دَه کَا ژِ مِنْ رَه بِبێژِنْ؛ اَگَرْ دِیَارْ بُو کُو اَڤْ قُرْئَانْ ژِ جَمْ خُدێ یَه و وَه ژِی اَوْ اِنْکَارْ کِرِیَه و ژِ زَارُویێنْ اِسْرَائِیلْ ژِی یکِی شَهْدَیِی لِسَرْ دَابَه کُو اَوْ مِسلِیٚ تَورَاتِیٚ یَه، ڤێجَه وِی بَاوَرِی ئَانِی و وَه ژِی خَوه مَزِنْ دِیْرَا (کَا ژِ وَه ظَالِمْتِرْ کِی هَیَه)؟ بێگُمَانْ خُدێ قَوْمِیٚ ظَالِمْ نَایێنَه سَرْ رِیَا رَاسْتْ.

١١. اَوِيْنْ كُو كَافِرِنْ، دِ بَارَا بَاوَرْمَنْدَانْ دَه گُوْتِنْ: اَگَرْ اَڤْ (دِينِىَ اِسْلامِىَ) چِيْتِرِيَكْ بُويَا، وَانْ بَرِى مَه بَاوَرِى پِىَ نَدِئَانِينْ و دِىَ نَكِتَانَا پِيْشِيَا مَه. لِيْبَلِىَ ژِ بَرْ كُو اَوْ بِڤِىَ (قُرْئَانِىَ) نَاخَوازِنْ بِيْنَه سَرْ رِيْيَا رَاسْتْ، دِىَ بِبِيْژِنْ: «اَڤْ، دَرَوَكَه كَڤْنَارَه يَه.»

١٢. بَرِيَا ڤِىَ ژِى، كِتِيْبَا مُوسَا رِيْبَرْ و رَحْمتْ بُوْ. اَڤْ كِتِيْبْ ژِى، ژِ كِتِيْبِيْنْ بَرِيَا خَوه رَه رَاسْتْدِيْرَه، بِزِمَانِىَ عَرَبِى يَه، (نَازِلْ بُويَه) دَا كُو يِيْنْ ظُلِمْ كِرِنَه هِشْيَارْ بِكَه و اَوْ ژِ بُوْ قَنْجِيكَارَانْ رَه مِزْگِينِى يَه.

١٣. بِيْگُمَانْ اَوِيْنْ كُو گُوْتِنْ: «خُدَايِىَ مَه اَللهَ يَاشِىَ خَوه (لِسَرْ رِيْكَا اِسْلامِىَ) رَاسْتْ و دُرِسْتْ كِرِنْ، ڤِيْجَه ژِ بُوْ وَانْ (رُوْژَا قِيَامْتِىَ) تُو طِرْسْ تُنَه و اَوِىَ غَمْگِينْ ژِى نَبِنْ.

١٤. هَا اَوْ خَلْكِىَ بِهِشْتِىَ نَه، اَوْ دِىَ هَرْ و هَرْ لِىَ بِمِينِنْ، اَڤْ خَلاتَا كِرِنْيْنْ وَانَه.

١٥. مَه، لِانْسَانِى قَوِيْتِى كِرْ كُو قَنْجِيِىَ لِدِىَ و بَاڤِىَ خَوه بِكَه. دَايِكَا وِى بِزَحْمَتِى اَوْ هِلْگِرْتِيَه و بِزَحْمَتِى اَوْ وَلِدَانْدِيَه. هِلْگِرْتِنَا وِى و ژِشِيرْڤَكِرِنَا وِى سِهْ مَهِى دَوَامْ دِكَه. يَاشِىَ اِنْسَانْ، چِه دَمَا كُو بِگَهِيژَه تَمَنِىَ خُوْرْتَانِيَا خَوه و چِلْ صَالِيَا خَوه، دِبِيْژَه: خُدَايِىَ مِنْ! اِلْهَامِىَ بِدَه مِنْ، مِنْ مُوَفَقْ بِكَه، دَا كُو اَزْ شْكِرِىَ قَنْجِيَا تَه بِكِمْ، اَوْ قَنْجِيَا كُو تَه لِمِنْ و لِدِىَ و بَاڤِىَ مِنْ كِرِى و دَا كُو اَزْ كَارَكِى قَنْجْ بِكِمْ كُو تَه رَازِى بِكَه و زُرِّيَتَا مِنْ ژِى ژِ بُوْ مِنْ بَاشْ بِكَه. بِرَاسْتِى مِنْ بِبَالْ تَه ڤَه تُوبه كِرْ و تَقَزْ اَزْ ژِ مُسلمَانَانِمْ.

١٦. هَا اَوِنْ، يِيْنْ كُو اَمِىَ سِپَحِيتِرِىَ يَا كُو كِرِنَه ژِ وَانْ قَبُولْ بِكِنْ، اَمِىَ لِگُنَهِيْنْ وَانْ بِبُرِنْ و اَوْ دِ نَاڤَا خَلْكِىَ بِهِشْتِىَ دَه نَه. اَڤَه، پِيمَانَا رَاسْتَه ئَا كُو ژِ وَانْ رَه هَاتِيَه دَايِينْ.

١٧. اَوِىَ كُو ژِ دِىَ و بَاڤِىَ خَوه رَه دِبِيْژَه: وِفْ ژِ وَه رَه بَه، مَا هُونْ سُوْزِىَ دِدِنْ مِنْ كُو اَزِىَ (ژِ گُوْرِىَ) بِيْمَه دَرْ. حَالْ اَڤَه كُو بَرِيَا مِنْ پِرْ اُمَّتْ دَرْبَاسْ بُونَه، چُونَه (و تُو كَسْ ژِ وَانْ ژِ گُوْرِىَ دَرْنَهَاتِنَه). دِىَ و بَاڤِىَ وِى هَاوَارَا خَوه دِگَهَانْدِنْ خُدِىَ (دَا كُو وِى ڤَگَرِينَه سَرْ رِيْيَا رَاسْتْ) و ژِىَ رَه دِگُوْتِنْ: خَوهِلِى لِسَرِىَ تَه بَه، اِيمَانِىَ بِينَه،

بێگُمَانْ سُوْزَا خُدێ حَقَه، رَاسْتَه. ڤێجَه اَوْ ژِی دبێژَه: اَڤْ (سَاغْبُونَا پِشْتِی مِرِنێ) ژِ چِیرُوكْ و چِیڤَانُوكێنْ پێشِیَانْ پِێ ڤَه نَه تِشْتَكِی دِنَه.

١٨. اَڤێنْ هَا، اَوِێنْ كُو وَكِی اُمَّتێنْ بَرِیَا خَوه؛ ژِ جِنْ و مِرُوْڤَانْ عَذَابْ لِسَرْ وَانْ پێوِسْتْ بُویَه. بِرَاسْتِی وَانْ تَقَزْ خَسَارْ كِرِیَه.

١٩. ژِ بُوْ هَرْ كَسِی لِهَمْبَرِی كَارْ و كِرْیَارِێنْ وَانْ كِرِی مَرْتَبَێنْ وَانْ هَنَه. خُدِێ دێ بَدێلِیَا كِرِنێنْ وَانْ بِتَمَامِی بِدَه وَانْ و قَتْ نَحَقِی دێ لِوَانْ نَیێ كِرِنْ.

٢٠. وێ رُوْژَا كُو یێنْ كَافِرْ لِسَرْ اِیْگِرْ بێنَه رَاپێشْكِرِنْ، (ژِ وَانْ رَه دێ بێ گُوْتِنْ): وَه، دِ ژِیَانَا خَوه یَا جِیهَانِیێ دَه هَمُو لَزَّتْ و خَوهشِیێنْ خَوه بِرِنْ، وَه بِوَانْ كێفْ كِرْ. ڤێجَه اِیرُو ژِ بَرْ كُو وَه لِعَرْدێ بِنَحَقِی خَوه مَزِنْ دِدێرَا و ژِ بَرْ كُو هُونْ ژِ رِێ دَرْكَتِنَه، هُونێ بِعَذَابَكِی رِسْوَاكَرْ بێنَه جِزَاكِرِنْ!

٢١. بِرَایێ عَادْ (هُودْ) ژِی بینَه بیرَا خَوه؛ دَمَا قَوْمِێ خَوه لِعَرْدَا اَحْقَافِێ (ژِ عَذَابێ خُدێ) هِشْیَارْ كِرْ -بَرِیَا هُودْ و پِشْتِی وِی ژِی پِرْ پێخَمْبَرْ (ژِ بُوْ گَلێنْ خَوه) هَاتِنَه (شَانْدِنْ) و چُونَه- كُو (هُودْ ژِ گَلِێ خَوه رَه گُوْتْ): ژِ خُدێ پِێ ڤَه عِبَادَتِێ (تُو كَسِی دِنْ) نَكِنْ. بێگُمَانْ اَزْ لِسَرْ وَه ژِ عَذَابِێ رُوْژَكَه مَزِنْ دِطِرْسِمْ.

٢٢. گَلِێ هُودْ گُوْتِنْ: (یَا هُود)! مَا تُو ژِ مَه رَه هَاتِی ژِ بُوْ كُو مَه ژِ عِبَادَتْكِرِنَا پُوتێنْ مَه ڤَگَرێنِی؟ دَه هێدِێ، اَگَرْ تُو ژِ رَاسْتِبێژَانِی دَه عَذَابِێ كُو تُو پِێ گَفَانْ لِمَه دِكِی ژِ بُوْ مَه بینَه.

٢٣. هُودْ، ژِ وَانْ رَه گُوْتْ: زَانینْ بَسْ لِجَمْ خُدێ یَه (كَا كَنْگِی عَذَابِێ وِی تێ). اَزْ یَا كُو پِێ هَاتِمَه شَانْدِنْ ژِ وَه رَه رَادِگَهینِمْ. لێ بَلێ اَزْ وَه مِلَّتَكِی كُو خَوه لِنَزَانینِێ دَاتینَه دِبینِمْ.

٢٤. چِه دَمَا وَانْ اَوْ (عَذَابْ) دِ شَكْلِێ عَوْرَكِی دَه دیتْ كُو بَرْ بِنَوَالێنْ وَانْ ڤَه تێ، گُوْتِنْ: اَڤْ عَوْرَكَه دێ بَارَانِێ لِسَرْ مَه بِبَارِینَه.(هُودْ، ژِ وَانْ رَه گُوْتْ): نَخێرْ (اَوْ نَه عَوْرِێ

بَارَانِیٛ یَه)! اَوْ، اَوْ عَذَابَه یێ وَه لَزْ لِهَاتِنَا وِی دِکِرْ؛ اَوْ بَایَکِی وِسَا یَه کُو دِ نَاڤْ دَه عَذَابَکِی دِژْوَارْ هَیَه!

**٢٥.** اَوْ (بَا)، بِفَرْمَانَا خُدَایێ خوه هَرْ تِشْتِی تَارُومَارْ دِکَه، هِلْدِوَشِینَه.(عَذَابێ خُدَا بِسَرْ وَانْ دَه هَاتْ) اِیْدِی ژِ جِهْ و وَارێنْ وَانْ پێ ڤَه تِشْتَکْ نَمَا تێ دِیتِنْ (لَوْرَا اَوْ، دِگَلْ مَالْ و سَوَالێنْ خوه تَڤْ چُونَه هَلَاکێ). هَا بِڤِی ئَاوَایِی اَمْ قَوْمێ گُنَهْکَارْ جزَا دِکِنْ.

**٢٦.** صُوٚنْدْ بَه، هێزْ و دَرْفَتێنْ کُو مَه نَدَایِی وَه، مَه دَابُو وَانْ. مَه، گُه، چَاڤْ و دِلْ ژِی دَابُونَه وَانْ لِیٚبَلێ؛ گُهێنْ وَانْ، چَاڤێنْ وَانْ و دِلێنْ وَانْ تُو فَیْدَه نَدَانَه وَانْ. لَوْرَا وَانْ ئَایَتێنْ خُدێ اِنْکَارْ دِکِرِنْ. عَذَابێ کُو وَانْ پێ طَنَازْ دِکِرْ بِسَرْ وَانْ دَه هَاتْ و اَوْ خِسْتِنْ نَاڤْ خَوه.

**٢٧.** صُوٚنْدْ بَه، مَه خَلْکێنْ وَلاتێنْ هَاوِیرْدُوٚرَا وَه ژِی بِرِنْ هَلاکێ. مَه دَلِیلْ و بَلْگَه پِرْ جَارَانْ ئَانِینْ دَا کُو اَوْ ڤَگَرِنْ سَرْ رِیَا رَاسْتْ.

**٢٨.** دَه بِلا اَوْ پُوتێنْ کُو دِ شُونَا خُدێ دَه ژِ بُوٚ خَوه اِلٰه گِرْتِبُونْ -ژِ بُوٚ کُو وَانْ نێزِیکِی خُدێ بِکِنْ هَاتِبُونْ پَرَسْتِنْ- ئَارِیکَارِیَا وَانْ کِرِبُونَا؟ نَخێرْ، اَوْ ژِ بَرْ وَانْ وِنْدَا بُونْ و اَڤْ دَرَوْ و بێبَخْتِیَا وَانَه.

**٢٩.** وێ دَمَا مَه بَرێ چَنْدْ کَسێنْ جِنِی دَابُو تَه دَا کُو لِقُرْئَانێ گُهْدَارِی بِکِنْ. ڤێجَه دَمَا ژِ بُوٚ کُو لِقُرْئَانێ گُهْدَارِی بِکِنْ ئَامَادَه بُونْ؛ (ژِ هَڤْ رَه) گُوٚتِنْ: هُشْ بِبِنْ، لِقُرْئَانێ گُهْدَارِی بِکِنْ! چه دَمَا (خَوهنْدِنَا) قُرْئَانێ تَمَامْ بُوٚ؛ لِگَلێ خَوه ڤَگَرِیَانْ و اَوْ پێ ئَاگَاهْدَارْ کِرِنْ.

**٣٠.** (وَانْ جِنَانْ ژِ گَلێ خَوه رَه) گُوٚتِنْ: گَلِی مِلَّتێ مَه! بێگُمَانْ مَه لِکِتێبَکَه وِسَا گُهْدَارِی کِرْ کُو اَوْ پِشْتِی مُوسٰی هَاتِیَه هِنَارْتِنْ، اَوْ کِتێبێنْ بَرِیَا خَوه رَاسْتْ دِدێرَه، مِرُوٚڤَانْ گَازِی حَقِیێ دِکَه و بِبَالْ رێیکَه رَاسْتْ ڤَه رَاسْتَرێ دِکَه.

**٣١.** اَیْ قَومێ مَه! بَرْسِڤَا دُوٚزْدَارێ (دِینێ) خُدێ بِدِنْ، بَاوَرِیێ پێ بِینِنْ، خُدێ ژِی دێ لِگُنَهێنْ وَه بِبُورَه و ژِ عَذَابَکِی دِژْوَارْ وَه بِپَارێزَه.

**٣٢.** چه كَسِىَ كُو بَرْسِڤَا دُوْزْڤَانِىَ (دِينِىَ) خُدِىَ نَدَه، لِسَرْ عَرْدِىَ اَوِىَ خُدِىَ نَاچَارْ نَهِيْلَه و زُوْرَا وِى نَبَه. اَوِىَ ژِ خُدِىَ پِىَ ڤَه ژِ بُوْ خوه تُو خَودِى و پِشْتڤَانَكِى نَبِينَه. هَا اَوْ دِ نَاڤْ رِيْشَاشِيكَه اَشْكَرَا دَه نَه.

**٣٣.** مَا اَوْ نَابِينِنْ، اَوْ خُدَايِىَ كُو عَرْدُ و ئَاسِيمَانْ ئَافِرَانْدِنْ و دِ بَرْ ئَافِرَانْدِنَا وَانْ دَه نَوَسْطِيَايَه، اَوْ دِكَارَه مِرِيَانْ ژِى سَاغْ بِكَه؟ بَلِىَ، رَاسْتَه؛ بِرَاسْتِى خُدِىَ لِسَرْ هَرْ تِشْتِى قَادِرَه.

**٣٤.** وِىَ رُوْژَا كُو يِيْنْ كَافِرْ لِسَرْ اِيْگِرْ تِيْنَه رَاپِيْشْكِرِنْ (كُو ژِ وَانْ رَه تِىَ گُوْتِنْ): مَا اَڤْ (عَذَابْ)، نَه رَاسْتُ و حَقَه؟ اَوْ دِىَ بِيِيْژِنْ: بَلِىَ، اَمْ بِرَبِّىَ خَوه صُوْنْدْ دِخوِنْ كُو رَاسْتَه. ژِ وَانْ رَه تِىَ گُوْتِنْ: نَاخَوه ژِ بَرْ كَافِرْبُونَا خَوه دَه عَذَابْ تَعْمْ بِكِنْ!

**٣٥.** نَاخَوه تُو ژِى وَكِى وَانْ پِيْخَمْبَرِيْنْ لِهَمْبَرْ ظُوْرِىَ خَورَاگِرْ «اُولُ الْعَزِمْ» صَبْرِىَ بِكِيْشْ و ژِ بُوْ (هَاتِنَا عَذَابِىَ) وَانْ عَجَلَه مَكَه. رُوْژَا كُو اَوْ، وِى عَذَابِىَ كُو پَيْمَانَا وِى ژِ وَانْ رَه هَاتِيَه دَايِنْ، بِبِينِنْ؛ (وِىَ چَاخِىَ) ژِ وَانْ وَيَه كُو اَوْ تَنِىَ بِقَانْدِى سَعَتَكَه رُوْژِىَ (لِدِنْيَايِىَ) مَانَه. اَڤَا هَاتِيَه گُوْتِنْ (ژِ بُوْ وَه) دَازَانِينَكَه. اَرِىَ مَا ژِ جِڤَاتَا زِرِيْدَرْكَتِى پِىَ ڤَه كِى ژِ هُوْلِىَ تِىَ رَاكِرِنْ؟

## ٤٧. سُورَه يىَ مُحَمَّدْ

سُورَه‌يىَ (مُحَمَّدْ)، ٣٨(سِهْ و هَشْتْ) ئَايَتَه و لِمَدِينِىَ دَاكَتِيَه. نَاڤِىَ سُورَه ژِ ئَايَتَا ٢ىَ هَاتِيَه كُو تِيدَه نَاڤِىَ پِيْخَمْبَرِىَ اِسْلَامِىَ مُحَمَّدْ ﷺ دَرْبَاسْ بُويَه. نَاڤَكِى دِنْ ژِى ژِ ڤِى سُورَه‌يِى رَه هَيَه كُو «ڤِتَالَه» كُو اَوْ ژِى بِمَعْنَا شَرَه.

**بِنَاڤِىَ خُدَايِىَ كُو رَحْمٰنَ رَحِيمَ**

١. اَوِيْنْ كُو كَافِرْ بُونَه و رِيْيَا خُدِىَ لِبَرْ خَلْكِىَ گِرْتِنَه، خُدِىَ كِرِنِيْنْ وَانْ پُوچْ كِرِيَه.

٢. هَمْ اَوِيْنْ كُو بَاوَرِى ئَانِينَه و كَارِيْنْ ڤَنْجْ كِرِنَه و بِيَا كُو ژِ خُدَايِىَ وَانْ ژِ مُحَمَّدْ رَه

هَاتیَه هِنَارْتِنْ -کُو بێگُمَانْ اَوْ حَقَه- ژِ دِلْ بَاوَرِی ئَانینَه، خُدێ لِگُنَهێنْ وَانْ دِبُورَه و رَوْشَا وَانْ سَرَرَاسْتْ دِکَه.

٣. اَوْ یَكْ ژِی، ژِ بَرْ ڤێ یَه کُو اَوێنْ کُو بَاوَرِی نَئَانینَه دَانَه پَیْ بَاطِلی و اَوێنْ کُو بَاوَرِی ئَانینَه دَانَه پَیْ حَقیَا کُو ژِ جَمْ خُدَاییێ وَانْ هَاتیَه. بِڤی ئَاوَایی خُدێ ژِ مِرُوّڤَانْ رَه اَنْجَامَا کِرنێنْ وَانْ بِمینَاکَانْ اَشْکَرَا دِکَه.

٤. (گَلی مُوْمِنَانْ) گَاڤَا (دِ شَرْ دَه) هُونْ رَاسْتی کَافِرَانْ بێنْ لِستُوییێنْ وَانْ بِخِنْ (و وَانْ بکُژِنْ). پَاشێ گَاڤَا وَه بَرْخودَانَا وَانْ شکَانْدْ، ڤێجَه (وَانْ اَسیرْ بِگرِنْ و) قَیْدێنْ وَانْ بِشْدینِنْ. پَاشێ یَانْ لِسَرْ وَانْ مِنَّتْ بِکِنْ (بێگَرَوْ وَانْ بَرْدِنْ)، ئَانْ ژِی بِگَرَوْ (بِبَدێلْ) وَانْ بَرْدِنْ، حَتَا کُو گِرَانیَا جَنْگێ بِقَدَه. اَڤْ حُکْمێ خُدێ یَه، اَگَرْ خُدێ بِخوەسْتَا دێ (بێ یی وَه ژِی) تُوّلْ ژِ وَانْ ڤَکرَا (و اَوێ هَلاكْ بِبُونَا). لێ دَا کُو هِنَکَانْ ژِ وَه بِهِنَکَانْ بِجَرِبینَه، ڤێ دِکَه. اَوێنْ کُو دِ رِیَا خُدێ دَه هَاتِنَه کُشْتنْ، خُدێ کِرنێنْ وَانْ دێ وِنْدَا نَکَه.

٥. خُدێ دێ وَانْ لِسَرْ رِیَا رَاسْتْ رَاسْتَرێ بِکَه و دێ رَوْشَا وَانْ سَرَرَاسْتْ بِکَه.

٦. خُدێ دێ وَانْ بِخَه وێ بِهِشْتَا کُو (لِدِنْیَاییێ) بوَانْ دَابُو نَاسْکِرنْ.

٧. گَلی یێنْ کُو بَاوَرِی ئَانینَه! اَگَرْ هُونْ ئَارِیکَارِیَا (دِینێ) خُدێ بِکِنْ، خُدێ ژِی دێ ئَارِیکَارِیَا وَه بِکَه و دێ وَه لِهَمْبَرْ دِژْمِنْ بِدَه رَاگِرْتِنْ و لِنْگێنْ وَه دێ مِکُوْمْ بِگرَه.

٨. هَرْچی اَوێنْ کُو ایمَانْ نَئَانینَه، رِسْوَاتی و شَرْمَزَارِی ژِ وَانْ رَه بَه. خُدێ کِرنێنْ وَانْ پُوچْ کِرنَه.

٩. اَڤْ ژِی ژِ بَرْ کُو وَانْ ژِ قُرْئَانَا کُو خُدێ (اَوْ) نَازِلْ کِریَه حَزْ نَکرِنَه. خُدێ ژِی عَمَلێنْ وَانْ پُوچْ کِریَه.

١٠. مَا اَوْ لِسَرْ عَرْدِێ نَگَرِیَانَه کُو بِبینِنْ کَا اَنْجَامَا وَانێنْ کُو بَرِیَا وَانْ چُونَه چَاوَا بُویَه؟

خُدِىَ اَوْ تَارْ و مَارْ كِرِنْ. ژِ ڤَانْ كَافِرَانْ رَه ژِى اَنجَامَكَه وَكِى وِىَ (اَنْجَامَا وَانْ قَومێنْ كُو بِهُرِينَه) هَيَه.

١١. اَڤْ ژِى، ژِ بَرْ كُو خُدِىَ پِشْتْگِرِىَ بَاوَرْمَنْدَانَه. بِرَاسْتِى ژِ بُوّ يێنْ كَافِرْ، تُو پِشْتْگِرْ و ئَارِيكَارْ تُنِنْ.

١٢. بێگُمَانْ خُدِىَ اَوێنْ كُو بَاوَرِى ئَانِينْ و كَارێنْ قَنْجْ كِرِنْ دِىَ بِخَه بِهِشْتێنْ كُو دِ بِنِىَ وَانْ دَه چَمْ دِهَرِكِنْ. اَوێنْ كُو بَاوَرِى نَئَانِينْ (بِژِيَانَا دِنْيَايِىَ) خَوشْ دِبِنْ، مِينَا حَيْوَانَانْ دِخُونْ، جِهِىَ وَانْ (لِئَاخِرَتِىَ) هَرْ ئَاگِرَه.

١٣. (يَا مُحَمَّدْ)! مَه گَلَكْ خَلْكێنْ وَلاتَانْ هَلاكْ كِرِنَه كُو اَوْ ژِ خَلْكِىَ وَلاتِىَ تَه، اَوِىَ كُو تَه ژِىَ دَرئَانِينَه، خُرْتترْ و بِهێزْتِرْ بُونْ. ڤێجَه ژِ بُوّ وَانْ تُو ئَارِيكَارْ ژِى نَبُونْ.

١٤. مَا اَوْ كَسِىَ كُو ژِ خُدَايِىَ خَوه لِسَرْ دَلِيلَكَه اَشْكَرَا يَه، دِبَه وَكِى كَسِىَ كُو كَارِىَ وِى يِىَ نَبَاشْ ژِىَ رَه هَاتِيَه خَمِلانْدِنْ و دَايَه پَىْ دِلْخَوازِيێنْ خَوه؟

١٥. سَالِخْ و رَوْشَا وِىَ بِهِشْتَا كُو پَيْمَانَا وِىَ ژِ مْتَّقِيَانْ رَه هَاتِيَه دَايِنْ وِهَا يَه: دِ نَاڤْ دَه چَمێنْ ژِ ئَاڤِىَ هَنَه كُو خَرَابْ نَابَه، تِى دَه چَمێنْ ژِ شِيرْ هَنَه كُو تَعْمَا وِى نَايِىَ گُهَارْتِنْ، تِى دَه چَمێنْ ژِ شَرَابَانْ هَنَه كُو ژِ يێنْ ڤَدِخُونْ رَه لَزِيزَه، تِى دَه چَمێنْ ژِ هِنْگِڤِىَ حَلانْدِى يێنْ صَفَانْدِى هَنَه و تِى دَه ژِ بُوّ وَانْ ژِ هَرْ فێكِيى هَنَه و ژِ جَمْ خُدَايِىَ وَانْ ژِ بُوّ وَانْ لێبُورِينْ هَيَه. مَا اَڤْ (اِىَ كُو دِ نَاڤَا ڤَانْ نِعْمَتَانْ دَه بِژِى) دِبَه وَكِى وِى كَسِىَ كُو هَرْ و هَرْ دِىَ دِ ئَاگِرِىَ دُوژَهِىَ دَه بِمِينَه و ژِ ئَاڤَكَه كَلِژِى بێنَه ئَاڤْدَانْ كُو رُوّڤِيێنْ وِى كَرْ كَرْ بِكَه؟

١٦. ژِ وَانْ (مِنَافِقَانْ) هِنْ هَنَه لِتَه گُهْدَارِى دِكِنْ حَيَانِى ژِ جَمْ تَه دَرْتێنْ، ژِ يێنْ خَودِى زَئَانِينْ رَه دِبێژِنْ؛ مَا بَرِى نِهَا وِى چِه گُوتْ؟ هَا اَڤێنْ هَانِىَ، اَوْ كَسِنْ كُو خُدِىَ دِلێنْ وَانْ مُورْ كِرِيَه و وَانْ دَانَه پَىْ هَوَسێنْ خَوه.

١٧. اَوێنْ کُو لِسَرْ رِیَا رَاسْتْ رَاسْتَرِێ بُونَه، خُدِێ هِیدَایتَا وَانْ زێدَه دِکَه و رێکَا تَقوَادَارِیَا وَانْ فێری وَانْ دِکَه.

١٨. اَوْ (مُشْرِكْ)، بَسْ لِوِێ هێڤِیێ نَه کُو ژ نشْکَا ڤَه قِیَامْتْ بسَرْ وَانْ دَه وَرَه. ڤێجَه برَاسْتِی نِیشَانێنْ قِیَامَتِێ هَاتنَه و خُویَا بُونَه. اَرِێ دَمَا کُو قِیَامْتْ لِوَانْ رَابُو، مَا اِیْدِی اَوِێ چَاوَا تُوبه بِکِنْ و چَاوَا ژِێ شِیرَتِێ وَرْگِرِنْ؟

١٩. ڤێجَه تُو بزَانَه کُو ژ بِلِی خُدِێ تُو مَعْبُودْ نِینِنْ. دَاخَوازَا لێبُورِینَا گُنَهێنْ خَوه و گُنَهێنْ ژنْ و مێرێنْ بَاوَرْمَنْدْ بِکَه. خُدِێ، بِگَرْ و فَرَا وَه و بِلێڤَهحَوِینَا وَه دِزَانَه.

٢٠. اَوێنْ کُو بَاوَرِی ئَانِینَه، دِبێژِنْ: دَه بِلا (دَرْ بَارِێ فَرْزْبُونَا جِهَادِێ دَه) سُورَهیكْ بِهَاتَا هِنَارْتِنْ؟ لِێ بَلِێ چه گَاڤَا سُورَهیکی حُکْمِێ وِی اَشْکَرَا دَاکَڤَه و تِی دَه بَحْسَا شَرْ (جِهَادِێ) بێکرِنْ، اَوِێنْ کُو دِ دِلێنْ وَانْ دَه نَخوشِی (یَا نِفَاقِێ) هَیَه، تُو دِێ بِبِینِی کُو وَکِی نێرِینَا کَسِێ کُو سَرْخَوشِیَا مِرنِێ اَوْ گِرْتِبَه لِتَه دِنێرِنْ. ژ وَانْ رَه یَا چێترْ و خێرْترْ اَڤْ بُو:

٢١. بگُوتِنَا پێخَمْبَرْ کِرِبُونَا و بگُوتِنَا خێرِێ ئَاخَافْتِبُونَا. ڤێجَه گَاڤَا فَرْمَانَا جِهَادِێ مِسُوگَرْ بُو، اِیْدِی هَکَه اَوْ بِخُدِێ رَه رَاسْتْ بُونَا، تَقَزْ ژ وَانْ رَه چێترْ بُو.

٢٢. مُحَقَّقْ کُو هُونْ بِێنَه سَرْ کَارْ، هُونِێ لِسَرْ اَعَرْدِێ فَسَادِیێ بِکِنْ و بَنِێ خَودِتِیێ ژِی بِبرِنْ؟!

٢٣. هَا اَڤْ، اَوِێنْ کُو خُدِێ لَعْنَتْ لِوَانْ بَارَانْدِیَه، ڤێجَه اَوْ کَرْ کِرْنَه و چَاڤێنْ وَانْ کُوْرْ کِرِیَه.

٢٤. اَرِێ مَا اَوْ لِقُرْئَانِێ نَافِکرِنْ یَانْ مَا لِسَرْ دِلێنْ وَانْ کِلِیتْ هَنَه؟

٢٥. بێگُمَانْ اَوێنْ کُو پشْتِی رِیَا رَاسْتْ ژ وَانْ رَه دِیَارْ بُو بَرِێ خَوه ژ اِسْلامِێ ڤَگَرَانْدِنَه، شَیْطِێنْ ژ وَانْ رَه (کُفْرْ و نَقَنْجِی) شِیرِینْ نِیشَانْ دَایَه و گَلَكْ هێڤِی دَایَه وَانْ.

خِیٚرْ دِ وَانْ دَه نِینَه). ژِ وَانْ وَه یَه هَرْ گَازِیَکَه کُو هَبَه لِدِژی وَانَه. اَوْ نَیَارِنْ، خَوه ژِ وَانْ بپَارِیٚزَه. خُدِیٚ لَعْنَتَا خَوه لِوَانْ کَه! چَاوَا اَوْ (ژِ حَقِیِیٚ) بَرِیٚ خَوه ڤَدِگَرِینِنْ؟

٥. گَاڤَا ژِ وَانْ رَه بِیٚ گُوٚتِنْ: ورِنْ، بِلا پِیٚخَمْبَرِیٚ خُدِیٚ ژِ بُوٚ وَه لِیٚبُورِینِیٚ بِخَوازَه، سَرِیٚ خَوه دِزِیڤِرِینِنْ و تُو وَانْ دِبِینِی کُو بَرِیٚ خَوه (ژِ حَقِیِیٚ) ڤَدِگَرِینِنْ و خَوه مَزِنْ دِدِیٚرِنْ.

٦. تُو ژِ بُوٚ وَانْ لِیٚبُورِنِیٚ بِخَوازِی و نَخَوازِی، ژِ وَانْ رَه وَکْهَڤَه؛ خُدِیٚ دِیٚ هِیچْ لِوَانْ نَبُورَه. بِرَاسْتِی خُدِیٚ دَسْتَیَا ژِرِیٚدَرْکَتِیَانْ نَاینَه رِیَا رَاسْتْ و دُرِسْتْ.

٧. هَرْ اَونْ یِیٚنْ کُو (ژِ اَنصَارِیَانْ رَه) دِبِیٚژِنْ: تُو تِشْتِی نَدِنْ یِیٚنْ (مُهَاجِرِیٚنْ) کُو لِجَمْ پِیٚخَمْبَرِیٚ خُدِیٚ نَه، دَا کُو ژِ هَڤْ بَلاڤْ بِبِنْ و هَرِنْ. حَالْ اَڤَه کُو گَنْجِینَیِیٚنْ ئَاسِیمَانَانْ و عَرْدِیٚ یِیٚنْ خُدِیٚ نَه. لِیٚبَلِیٚ مُنَافِقْ دِ ڤِیٚ نَاگَهِیژِنْ.

٨. مُنَافِقَانْ دِگُوٚتْ: صُوٚنْدْ بَه، اَگَرْ کُو اَمْ ڤَگَرِنْ مَدِینِیٚ ، اَوِیٚنْ دَسْتْهِلاتْدَارْ اِیٚ خُوٚشْ اَڤِیسْتْ (کُو اَوْ بِخَوه نَه) دِیٚ یِیٚنْ بِیٚرُومَتْ و رَبَّنْ (کُو پِیٚخَمْبَرْ و مُهَاجِرِنْ) ژِ مَدِینِیٚ دَرْخِنْ. رَوْشْ اَڤَه؛ سَرْکَفْتِنْ و رُومَتْ هَرْ ژِ بُوٚ خُدِیٚ، پِیٚخَمْبَرِیٚ وِی و ژِ بُوٚ بَاوَرْمَنْدَانَه، لِیٚبَلِیٚ مُنَافِقْ تِیٚنَاگَهِیژِنْ.

٩. گَلِی یِیٚنْ کُو بَاوَرِی ئَانِینْ! بِلا مَالْ و زَارُوکِیٚنْ وَه، وَه ژِ زِکْرِیٚ خُدِیٚ مَشْغُولْ نَکِنْ. کِی ڤِیٚ بِکَه هَا اَوْ یِیٚنْ کُو خَسِرِینَه.

١٠. ژِ وِی رِزْقِیٚ کُو مَه دَایَه وَه (دِ رِیَا خُدِیٚ دَه) خَرْجْ بِکِنْ، بَرِیَا کُو مْرِنَا یکِی ژِ وَه بِیٚ و کُو بِبِیٚژَه: خُدَایِیٚ مِنْ! بِلا تَه مْرِنَا مِنْ بِدَایَا پَاشْ دَا مِنْ صَدَقَه بِدَایَا و اَزْ بِبُومَا ژِ قَنْجِیکَارَانْ!

١١. خُدِیٚ تُو جَارْ مِرِنَا تُو کَسِی، دَمَا کُو مِرِنَا وِی وَرَه بِپَاشْ دَه نَادَه و خُدِیٚ بِیَا هُونْ دِکِنْ ئَاگَاهْدَارَه.

# ٦٤. سُورَه يىَ تَغَابُنْ

سُورَەيىَ (تَغَابُنْ)، هِژْدَهْ (١٨) ئَايەتە. لِمَدينىَ نَازِلْ بُويَە . سُورَه نَاڤىَ خَوه ژِ ئَايێتَا ٩ٰ'اَمْ گِرْتيَە كُو تِى دَه پَيْڤَا تَغَابُنْ دَرْبَاسْ بُويَه و بِمَعْنَا «خَاپِيَايى و زِيَانـ»ـه.

**بِنَاڤىَ خُدَايىَ كُو رَحْمٰنَ رَحِيمَ**

١. چِقَاسْ تِشْتێنْ كُو لِعَرْدُ و ئَاسِيمَانَانْ هَنَه ژِ بُوْ خُدِىَ تَسْبِيحْ دِكِنْ، خُودَانِى و فَرْمَانْدَارِى، پَسِنْ و شِێكِرِى هَرْ ژِىَ رَه نَه و اَوْ لِسَرْ هَرْ تِشْتِى قَادِرَه.

٢. خُدِىَ يَه، يىَ كُو (بِڤِى شَكْلِىَ خَوشِكْ) هُونْ ئَافِرَانَدِنْ، ڤێجَه هِنَكْ ژِ وَه اِنْكَارْ دِكِنْ و هِنَكْ ژِ وَه ژِى بَاوَرِى تِينِنْ. خُدِىَ بِيَا هُونْ دِكِنْ بِينَرَه.

٣. خُدِىَ عَرْدْ و ئَاسِيمَانْ بِحَقِى (و حِكْمَتْ) ئَافِرَانْدِنْ. شَكِلْ و دِرُوڤْ دَانَا وَه، ڤێجَه بِدُرُوڤِىَ هَرِى خَوشِكْ هُونْ بِشَكِلْ و شَمَالْ كِرِنْ. ڤَگَرَا وَه هَرْ بِبَالْ وِى ڤَه يَه.

٤. خُدِىَ بِيَا دِ عَرْدْ و ئَاسِيمَانَانْ دَه دِزَانَه، بِيَا هُونْ دِزِى و اَشْكَرَا دِكِنْ ژِى دِزَانَه و خُدِىَ بِيَا دِ دِلانْ دَه ڤَشَارْتِى ژِى دِزَانَه.

٥. اَرِىَ مَا خَبَرَا وَانێنْ بَرِىَ كَافِرْ بُونَه نَگِهِيشْتِيَه وَه؟ ڤێجَه وَانْ جَزَايىَ كُفْرَا خَوه تَعْمْ كِرْ و (لِئَاخْرَتِىَ ژِى) ژِ وَانْ رَه عَذَابَكِى دِژْوَارْ هَيَه.

٦. اَڤْ (عَذَابْ) بِسَدَمَا كُو پێخَمْبَرێنْ وَانْ بِدَلِيلْ و مُعْجِزَيێنْ اَشْكَرَا ژِ بُوْ وَانْ دِهَاتِنْ، ڤێجَه دِگُوْتِنْ: اَرِىَ مَا چَاوَا اِنْسَانَكْ دِىَ (بِبَه پێخَمْبَرْ و) مَه بِينَه رِيَا رَاسْتْ؟ ڤێجَه اَوْ كَافِرْ بُونْ و بَرِىَ خَوه (ژِ حَقِيىَ) ڤَگَرَانَدِنْ. خُدِىَ ژِى نَه حَوْجِيى بَاوَرِيَا وَانْ بُوْ. خُدِىَ، دَوْلَمَنْدُ و پَسِنَانْدَه يَه.

٧. يێنْ كَافِرْ حِزِرْ كِرِنْ كُو اَوِىَ پِشْتِى مِرِنىَ دِيسَا نَيێنَه سَاغْكِرِنْ و ڤَژَانَدِنْ. بِبێژَه: نَخێرْ!

صُوْنْدْ بِخُدَايِێ مِنْ بَه؛ تَقَزْ هُونِێ بِێنَه قَژَانَدِنْ و هُونِێ تَقَزْ بِكَارْ و كِرْيَارِێنْ خَوه بِێنَه ئَاگَاهْدَارْكِرِنْ. اَڤْ رَوْشْ لِبَرْ خُدِێ پِرْ هِێسَانَه.

٨. ڤِێجَه بِخُدِێ و پِێخَمْبَرِێ وِی و بِوِێ رُوْنَاهِيَا (قُرْئَانَا) كُو مَه هِنَارْتِيَه اِيمَانِێ بِينِنْ. خُدِێ بِكَارْ و كِريَارِێنْ كُو هُونْ دِكِنْ ئَاگَاهْدَارَه.

٩. رُوْژَا كُو خُدِێ ژِ بُوْ رُوْژَا جِڤِينِێ (ژِ بُوْ حَسَابْ وَرْگِرْتِنِێ) وَه بَرْهَڤْ بِكَه، هَا اَوَه رُوْژَا كُو يِێ خَاپِيَايِى (و خَسرِى) دَرْكَڤَه رَاسْتِێ. كِى بِخُدِێ اِيمَانْ بِينَه و كَارِێ قَنْجْ بِكَه، خُدِێ دِێ گُنَهِێنْ وِی ژِێ بِبَه، دِێ لِێ بِبُورَه و دِێ وِی بِخَه بِهِشْتِێنْ كُو دِ بِنْ وَانْ دَه چَمْ دِهَرِكِنْ و اَوْ دِێ هَرْ و هَرْ دِ وَانْ دَه بِمِينِنْ. هَا اَڤَه سَرْكَفْتِنْ و رِزْگَارِيَا مَزِنْ.

١٠. اَوِێنْ كُو كَافِرْ بُونَه و بِئَايِتِێنْ مَه بَاوَرِى نَئَانِينَه، هَا اَوْ خَلْكِێ دُوژَهِێ نَه، اَوْ سَرَاقَتِى تِى دَه نَه. اَوْ چِه پِيسْ لِێڤَگَرْگَهَه!

١١. چِه بَلَا و نَخوشِيَكْ كُو بِسَرْ مِرُوْڤَانْ دَه بِێ، هَرْ اَوْ بِدَسْتُورَا خُدِێ يَه. كِى بِخُدِێ بَاوَرِى بِينَه، خُدِێ دِێ دِلِێ وِی ژِ يَا رَاسْتْ رَه ڤَكَه. خُدِێ بِهَرْ تِشْتِى زَانَا يَه.

١٢. گُهْدَارِيَا خُدِێ و پِێخَمْبَرِى وِی بِكِنْ. اَگَرْ هُونْ بَرِێ خَوه (ژِ اِيمَانِێ) ڤَگَرِينِنْ،اِێدِى بِزَانِنْ كُو بَسْ وَظِيفَيَا پِێخَمْبَرِێ مَه، رَاگِهَانَدِنَكَه رُوْنَاكْ و اَشْكَرَا يَه.

١٣. اَلله، ژِ وِی پِێ ڤَه تُو اِلٰه تُنِنْ، ڤِێجَه بِلا بَاوَرْمَنْدْ بَسْ خَوه بِسْپِێرِنْ اَلله.

١٤. گَلِى يِێنْ كُو بَاوَرِى ئَانِينَه! ژِ ژِنْ و زَارُوكِێنْ وَه هِنْ ژِ بُوْ وَه نَيَارِنْ، ڤِێجَه لِوَانْ هِشيَارْ بِنْ و خَوه ژِ وَانْ بِپَارِێزِنْ. اَگَرْ هُونْ عَفُو بِكِنْ و لِكِێمَاسِيَانْ بِبُورِنْ و وَانْ بِبَخْشِينِنْ، ڤِێجَه بِرَاسْتِى خُدِێ گُنَهْڤَشِێرْ و دِلُوڤِينَه.

١٥. بِرَاسْتِى مَالِێ وَه و زَارُوكِێنْ وَه ژِ بُوْ وَه اِمْتِحَانِنْ. خَلاتَا مَزِنْ ژِى لِجَمْ خُدِێ يَه.

١٦. نَاخَوه حَيَا كُو هُونْ دِكَارِنْ ژِ خُدِێ بِتِرْسِنْ، گُهْدَارِى (يَا شِيرَتِێنْ وِی) بِكِنْ، بِگُوْتِنَا

وِی بِکِنْ و ژِ بُوّ قَنْجِیَا خَوه خِیّرَانْ بِکِنْ. کِی ژِ طَمَاعِیَا نَفْسَا خَوه، خَوه بپَارِیّزَه، هَا اَونْ یِیّنْ سَرْفِرَازْ و رِزْگَارْبُویِی.

١٧. اَگَرْ هُونْ ژِ دِلْ مَالِیَ خَوه دِ رِیَا خُدِیَ دَه خَرْجْ بِکِنْ، خُدَا دِیَ ژِ وَه رَه وِی (مَالِی) قَاتْ بِقَاتْ زِیّدَه بِکَه و لِگُنَهِیّنْ وَه بِبُورَه. خُدِیَ شُکِرْدَارْ و بِیّهْنْفِرَهَه.

١٨. خُدِیَ، زَانَایِیَ نَپَنَدِی و دَارِیچَاڤَه، اَوَه یِیَ سَرْدَسْتِیَ کَارْبِنَجِهْ.

## ٦٥. سُورَه یِیَ طَلاقْ

سُورَه‌یِیَ (طَلاقْ)، دُوزْدَهْ (١٢) ئَایَتَه و لِمَدِینِیَ نَازِلْ بُویَه . نَاڤِیَ سُورَه ژِ ئَایَتَا پِیّشِینْ هَاتِیَه کُو تِی دَه پِیڤَا طَلاقْ دَرْبَاسْ بُویَه و بِمَعْنَا «ژِنْبَرْدَانـ»ـه.

بِنَاڤِیَ خُدَایِیَ کُو رَحْمَنَ رَحِیمَ

١. هَیْ پِیّخَمْبَرْ! گَاڤَا هُونْ بِخَوازِنْ ژِنَانْ بَرْدِنْ، وَانْ دِ دَمَا پَاڤژِیَا وَانْ دَه بَرْدِنْ، (پِشْتِی وَه اَوْ بَرْدَانْ) عِدَیِیَ وَانْ بِژمِیّرِنْ (و تُومَارْ بِکِنْ). ژِ خُدَایِیَ خَوه یِیَ پَرْوَرْدَگَارْ بِترْسِنْ (کُو عِدَیِیَ وَانْ نَه کِیّمْ نَه ژِی زِیّدَه بِحَسِیّبِنِنْ). وَانْ ژِ خَانِیِیّنْ وَانْ دَرْنَخِنْ و بِلَا اَوْ بِخَوه ژِی (حَتَا دِ عِدَیِیَ خَوه دَه نَه، ژِ خَانِیِیّنْ خَوه) دَرْنَکَڤِنْ؛ ژِ بِلِی کُو اَوْ فَحْشِیتِیَکَه اَشْکَرَا بِکِنْ (بِگُوّتِنْ و بِزَاڤِیّنْ خَوه خَلْکِیَ مَالِیَ تَنْگَزَارْ بِکِنْ). اَڤْ تِخُوبِیّنْ خُدِیَ نَه. کِی بِدَه سَرْ تِخُوبْ و اَحْکَامِیّنْ خُدِیَ، بِرَاسْتِی وِی لِخَوه سِتَمْکَارِی کِرِیَه. تُو نِزَانِی؛ دِبَه کُو خُدِیَ پِشْتِی بَرْدَانَا ژِنَانْ رَوْشْکَه دِنْ دَرِینَه هُوّلِیَ (اَگَرْ کُو ژِ مَالا خَوه دَرْنَکَڤِنْ و تِی دَه بِمِینِنْ دِبَه کُو لِهَڤْ ژِی بِزڤِرِنْ).

٢. دَمَا وَانْ عِدَیِیَ خَوه تَمَامْ کِرْ، ڤِیّجَه یَا بِرنْدِی لِوَانْ ڤَگَرِنْ ئَانْ ژِی بِرنْدِی ژِ وَانْ جُدَا بِبِنْ (وَانْ بَرْدِنْ). ژِ نَاڤْ خَوه دُو مِیّرِیّنْ عَادِلْ (لِسَرْ بَرْدَانَا وَانْ ئَانْ لِسَرْ زِڤِرَانْدِنَا وَانْ) بِکِنْ شَاهِدْ و بِلا ژِ بُوّ خُدِیَ (بِدُرِسْتِی) شَهْدَیِی بِدِنْ. هَا اَڤْ بِرْیَارْ و شِیرَتَه

ژِ بُوٚ وِى كَسِىَ كُو بِخُدِىَ و رُوٚژَا ئَاخْرَتِىَ بَاوَرِى تِينَه. كِى بِرْيَارْ و حُكْمِيٚنْ خُدِىَ بِپَارِيٚزَه، خُدِىَ دِىَ رِيَكِىَ ژِىَ رَه ڤَكَه..

٣. بِئَاوَايَكِى كُو حِزرْ نَدِكِرْ دِىَ رِزْقِىَ وِى بِدِىَ. كِى خَوه بِسْپِيٚرَه خُدِىَ ڤِيٚجَه اَوْ بَسِى وِى يَه. بِيٚگُمَانْ خُودِىَ فَرْمَانَا خَوه بِجِهْ تِينَه،(لِيٚبَلِىَ) خُدِىَ ژِ بُوٚ هَرْ تِشْتِى مِقْدَارْ (و اَنْدَازَكْ) دَانِيَه.

٤. اَوْ ژِنيٚنْ كُو ژِ خوِينَا حَيزِطِىَ بِيٚهِيٚڤِى بُونَه (كُو تَمَنْ مَزِنِنْ) و اَوِيٚنْ كُو نَاكَڤِنِىَ، اَگَرْ هُونْ (دِ عِدَيِىَ وَانْ دَه) كَتِنْ گُمَانِىَ، جِڤَانِىَ (بَنْدَمَايِينَا) وَانْ سِىَ مَهَه. اَوِيٚنْ كُو لِحَالَكِى نَه دَمَا لِهِيٚڤِيَايِينَا وَانْ دَانِينَا بَارِىَ وَانَه (چِيٚبُونَا زَارُوكِىَ يَه). كِى بِرْيَارْ و حُكْمِيٚنْ خُدِىَ بِپَارِيٚزَه، خُدِىَ دِىَ كَارِىَ وِى ژِىَ رَه هِيٚسَانْ بِكَه.

٥. هَا اَڤِيٚنْ هَاتِنْ گُوٚتِنْ، حُكْمُ و بِرْيَارِيٚنْ خُدِىَ نَه كُو ژِ وَه رَه شَانَدِنَه. كِى بِرْيَارُ و حُكْمِيٚنْ خُدِىَ بِپَارِيٚزَه، خُدِىَ دِىَ گُنَهِيٚنْ وِى ڤَشِيٚرَه و پَرُو يَا وِى مَزِنْ بِكَه.

٦. ژِنيٚنْ بَرْدَايِى لِگُوٚرِى طَاقَتَا خَوه لِجِهِىَ كُو هُونْ لِىَ بِجِهْ بِنْ (وَانْ ژِى) بِجِهْ بِكِنْ. ظِرَارِىَ نَگَهِيژِنْ وَانْ؛ ژِ بُوٚ كُو هُونْ (بِدَرْكَتِنْ و گَرَوْدَايِينِىَ)وَانْ تَنْگَزَارْ بِكِنْ. اَگَرْ اَوْ حَامِلَه (بَارْدَار) بِنْ، حَتَا بَارِىَ خَوه دَينِنْ نَفَقِيٚنْ وَانْ بِدِنْ. هَكَه اَوْ ژِ وَه رَه زَارُوٚكِىَ شِيرْ بِدِنْ اُجْرَتَا وَانْ بِدِنْ و دِ نَقَبَا خَوه دَه بِرِنْدِى (و بِئَاوَايَكِى مُنَاسِبْ) لِهَڤْ بِيٚنْ. اَگَرْ وَه لِهَڤْ نَكِرْ، بِلا بَاڤِىَ (زَارُوٚكِى) ژِ زَارُوٚكِى رَه شِيرْدَايَنَكَه دِنْ بِگْرَه.

٧. يىَ دَسْتْفِرَهْ بِلا نَفَقِىَ لِگُوٚرِى دَسْتْفِرَهِيَا خَوه بِدَه. كَسِىَ دَسْتْتَنْگْ ژِى ژِ مَالِىَ كُو خُدِىَ دَايَه وِى، بِلا نَفَقِىَ بِدَه. خُدِىَ لِتُو كَسِى زِيٚدَتِرِى يَا كُو دَايِىَ بَارْ لِىَ نَاكَه. خُدِىَ دِىَ پِشْتِى دَسْتَنْگِيِىَ دَسْتْفِرَهِيِىَ بِينَه.

٨. گَلَكْ ژِ خَلْكِىَ وَلَاتَانْ ژِ فَرْمَانَا خُدَايِىَ خَوه و پَيخَمْبَرِىَ وِى دَرْكَتِنْ، ڤِيٚجَه مَه اَوْ كِشَانَدِنْ حَسَابَكِى دِژْوَارْ و مَه اَوْ بِعَذَابَكِى كَسْنَدِيتِى جَزَا كِرِنْ.

٩. وَانْ جَزَایِیّ کَارْ و کِرِیَارِیّنْ خوه تَعْمْ کِرِنْ و دَاوِیَا رَوْشَا وَانْ ژِی زِیَانَه.

١٠. خُدِیّ ژِ وَانْ رَه عَذَابَکی دِژْوَارْ ئَامَادَه کِرِیَه. ڤِیّجَه گَلی ئَاقِلْمَنَدِیّنْ کُو وَه بَاوَرِی ئَانِیَه، ژِ خُدِیّ بِتِرْسِنْ. مَا نَه خُدِیّ بِرَاسْتِی ژِی ژِ بُوّ وَه کِتِیّبَکْ شَانَدِیَه (ڤِیّجَه ژِ وَه رَه هِیّنْجَتْ نِینَه).

١١. (خُدِیّ ژِ بُوّ وَه) پِیّخَمْبَرَکْ ژِی شَانْدْ کُو ئَایَتِیّنْ خُدِیّ یِیّنْ رُوّنْکَرْ ژِ وَه رَه دِخْوِینَه، دَا کُو یِیّنْ بَاوَرِی ئَانِینْ و کَارِیّ قَنْجْ کِرِنْ ژِ طَارِیتِیِیّنْ (نَزَئَانِینْ و کَافِرِیِیّ) دَرِینَه رُونَاهِیَا (بَاوَرِی و زَانِینِیّ). کِی بِخُدِیّ بَاوَرِی بِینَه و کَارِیّ بِفَیْدَه بِکَه، خُدِیّ دِیّ وِی بِخَه بِهِشْتِیّنْ وِسَا کُو دِ بِنِیّ وَانْ رَه چَمْ دِهَرِکِنْ و اَوِیّ حَتَا حَتَایِیّ تِی دَه بِنْ. بِرَاسْتِی ژِی خُدِیّ رِزْقَکی پَاکْ و پَاقِژْ دَایَه وِی.

١٢. خُدِیّ یَه یِیّ کُو حَفْتْ ئَاسِیمَانْ ئَافِرَانَدِنْ و ژِ عَرْدِیّ ژِی اَوْ قَاسْ ئَافِرَانَدِنْ. پَیْغَامْ و فَرْمَانَا خُدِیّ دِ نَاڤْبَرَا قَانْ دَه تِیّ و دِچَه، دَا کُو هُونْ بِزَانِنْ کُو بِرَاسْتِی خُدِیّ لِسَرْ هَرْ تِشْتِی قَادِرَه و بِرَاسْتِی زَانِینَا خُدِیّ دُوّرْ لِهَرْ تِشْتِی گِرْتِیَه.

## ٦٦. سُورَه یِیّ تَحْرِیمْ

سُورَه‌یِیّ تَحْرِیمْ ، دُوَازْدَهْ (١٢) ئَایَتَه. لِمَدِینِیّ نَازِلْ بُویَه ، نَاڤِیّ خوه ژِ ئَایَتَا پِیّشِینْ هَاتِیَه کُو تِی دَه پَیْڤَا حَرَامْ دَرْبَاسْ بُویَه، بِمَعْنَا «قَدَخَه‌کِرِنَـه.

**بِنَاڤِیّ خُدَایِیّ کُو رَحْمَنَ رَحِیمْ**

١. هَیْ پِیّخَمْبَرْ! ژِ بُوّ چِه یَا خُدِیّ ژِ تَه رَه حَلالْ کِرِیَه، ژِ بُوّ رَازِیکِرِنَا خَانِمِیّنْ خوه، تُو لِخوه حَرَامْ دِکِی؟ خُدِیّ گُنَهْژِیّبِرْ و دِلُوّڤَانَه.

٢. بِیّگُمَانْ خُدِیّ، ژِ بُوّ وَه حُکمْ دَانِی کُو (بِدَایِنَا کَفَارَتِیّ) هُونْ ژِ صُوّنَدِیّنْ خوه ڤَگَرِنْ. خُدِیّ دُوسْتُ و ئَارِیکَارِیّ وَه یَه و اَوَه یِیّ عَلِیمْ یِیّ حَکِیمْ.

٣. وِىٚ چَاخِىٚ پِيٚخَمْبَرْ پَيْڤَكَه دِزِى ژِ يكِىٚ ژِ خَانِمِيٚنْ خوه رَه كِرْ. ڤِيٚجَه گَاڤَا وِىٚ اَوْ پَيڤْ اَشْكَرَا كِرْ؛ خُدِىٚ ژِى اَڤْ يَكْ ژِ پِيٚخَمْبَرْ رَه رَاگِهَانْدْ. پِيٚخَمْبَرْ ژِى هِنَكْ ژِ وِىٚ پَيْڤِىٚ ژِىٚ رَه اَشْكَرَا كِرْ و هِنَكْ ژِى هِشْتْ. گَاڤَا كُو پِيٚخَمْبَرْ اَوْ پَيڤْ ژِىٚ رَه دِيَارْ كِرْ، گُوٚتْ: كِىٚ اَڤْ ژِ تَه رَه گُوٚتْ؟ پِيٚخَمْبَرْ گُوٚتْ: خُدَايِىٚ (بِهَرْ تِشْتِى) زَانَا و هَايْدَارْ ژِ مِنْ رَه گُوٚتْ.

٤. اَگَرْ هُونْ هَرْدُو تُوٚبه بِكِنْ، ڤِيٚجَه بِرَاسْتِى دِلِىٚ وَه بَرْ بِبَاشِيىٚ چَرْخْ بُويَه. اَگَرْ هُونْ لِدِژِى پِيٚخَمْبَرْ ژِ هَڤْ رَه بِبِنْ پِشْتَڤَانْ، ڤِيٚجَه بِرَاسْتِى (هُونْ بِزَانِنْ) كُو خُدِىٚ جِبْرِيلْ و قَنْجِيٚنْ بَاوَرْمَنْدْ دُوٚسْتُ و ئَارِيكَارِىٚ وِى نَه. پِشْتِى ڤِىٚ مِلائِيكَتْ هَمُو ژِى ئَارِيكَارِيٚنْ وِى نَه.

٥. اَگَرْ پِيٚخَمْبَرْ وَه بَرْدَه (اَى ژِنِيٚنْ پِيٚخَمْبَرْ)، خُدَايِىٚ وِى دِ شُونَا وَه دَه -ژِ ژِنَبِى و كَچَانْ- هِنَكْ ژِنِيٚنْ ژِ وَه چِيٚتِرْ دِىٚ بِدِيِىٚ كُو اَوِىٚ مُسِلْمَانْ بِنْ، بَاوَرْمَنْدْ بِنْ، اِيطَاعَتْكَارْ بِنْ، تُوٚبهدَارْ بِنْ، عِبَادَتْكَارْ بِنْ، ژِ بُوٚ خُدِىٚ لِسَرْ رِيٚكَا بِنْ.

٦. گَلِى يِيٚنْ كُو بَاوَرِى ئَانِينَه! خوه و مَالْبَاتَا خوه ژِ ئَاگِرَكِى بِپَارِيٚزِنْ كُو سُخْتَنِى (ئَارْدُوِيِىٚ) وِى مِرُوڤْ و كَڤِرِنْ. لِسَرْ وِى (ئَاگِرِى) مَلائِيكَتِيٚنْ دِلْسِتُورْ و دِژْوَارْ هَنَه. لِبَرْ فَرْمَانَا خُدِىٚ رَانَابِنْ و يَا كُو فَرْمَانَا وَانْ پِىٚ هَاتِى كِرِنْ دِكِنْ.

٧. گَلِى يِيٚنْ كَافِرْ بُونَه! اِيرُو لِيٚبُورِينَا خوه نَخوازِنْ. هُونْ دِىٚ تَنِىٚ جَزَايِىٚ كِرِنِيٚنْ خوه بِكِشِينِنْ.

٨. گَلِى بَاوَرْمَنْدَانْ! بَرِىٚ خوه بِدِنْ خُدِىٚ و بِتُوٚبَيَكَه ژِ دِلْ و جَانْ تُوٚبه بِكِنْ.(اَگَرْ هُونْ ژِ دِلْ و جَانْ تُوٚبه بِكِنْ) هِيٚڤِى هَيَه كُو رَبِّىٚ وَه لِگُنَهِيٚنْ وَه بِبُورَه و وَه بِخَه بِهِشْتِيٚنْ كُو دِ بِنِىٚ وَانْ رَه چَمْ دِهَرِكِنْ. اَوْ رُوٚژَا كُو خُدِىٚ پِيٚخَمْبَرْ و بَاوَرْمَنْدِيٚنْ لِگَلْ وِى رِسْوَا نَاكَه و نَادَه شَرْمِىٚ،(وِىٚ رُوٚژِىٚ) رُوٚنَاهِيَا وَانْ دِىٚ لِپِيٚشِى و رَخِىٚ وَانْ يِىٚ رَاسْتِىٚ

بِچه. دِبێژِنْ: خُدَايىٚ مه! رُوٚنَاهِيَا مَه تَمَامْ بِكَه و مَه بِبَخْشِينَه، بِرَاسْتِى ژِى تُو لِسَرْ هَرْ تِشْتِى خودَانْهێزِى.

٩. هَىْ پێخَمْبَرْ! لِهَمْبَرْ كَافِرْ و مُنَافِقَانْ جِهَادِىٚ بِكَه و لِسَرْ وَانْ دِژْوَارْ ببَه. جِهىٚ وَانْ جَهَنَّمَه. اَوْ چه پِيسَه جِهَه!

١٠. خُدِىٚ ژِ يێنْ كَافِرْ رَه ژِنَا نُوحْ و ژِنَا لُوطْ نِمُونَه ئَانِينَه. اَڤْ هَرْدُو ژِنْ دِ بِنْ مَهْرَا دُو بَنْدَيێنْ مَه يێنْ صَالِحْ دَه بُونْ و (بِكَافِرْبُونَا خوه) هَرْدُو ژِنَانْ بوَانْ رَه خَايِنْتِى كِرِنْ (نَه خِيَانَتَا نَامُوسِىٚ). ڤێجه مِيرێنْ وَانْ (دِگَلْ كُو پێخَمْبَرْ بُونْ) نِكَارِينْ عَذَابِىٚ خُدِىٚ ژِ سَرْ وَانْ بِدِنْ ئَالِى. ژِ هَرْدُو ژِنَانْ رَه هَاتَه گُوٚتِنْ: دَه هَايْدِىٚ دِگَلْ يێنْ كُو دِچِنْ اِيْگِرْ دَه هُونْ ژِى بِچِنْ![1]

١١. خُدِىٚ ژِ يێنْ بَاوَرْمَنْدْ رَه نِمُونَه ژِ ژِنَا فِرْعَونْ ئَانِيَه. دَمَا گُوٚتِبُو: خُدَايىٚ مِنْ! ژِ بُوٚ مِنْ لِجَمْ خوه لِبِهِشْتِىٚ مَالَكِىٚ چێكَه، مِنْ ژِ فِرْعَوْنُ و كَارِىٚ وِى خَلَاسْ بِكَه و مِنْ ژِ وِىٚ جِڤَاتَا ظَالِمْ رِزْگَارْ بِكَه!

١٢. ژِ مَرْيَمَا كَچَا عِمْرَانِى ژِى نِمُونَه تِينَه، اَوَا كُو نَامُوسَا خوه پَارَاسْتِى. ڤێجه جِبْرِيلْ قَاصِدِىٚ مَه، بِاَمْرِىٚ مَه پُڤْكِرَه بَرْ خَاڤِكَا وِىٚ. وِىٚ بَاوَرِى بِشَرِيعَتَا خُدَايىٚ خوه و كِتێبێنْ وِى ئَانِى و اَوْ ژِ اِطَاعَتْكَارَانْ بُوٚ.

١ اَڤْ ئَايَتْ بَيَانْ دِكَه كُو گرێدَانێنْ بِژِنْ و مێرتِيىٚ بِسَدَمْ كُفْرِىٚ تُو فَيْدِىٚ نَادَه هَڤْ. يَعْنِى ژِنْكَه كُو لِسَرْ كُفْرِىٚ بِمرَه مێرِىٚ وِىٚ پێخَمْبَرْبَه ژِى تُو فَيْدِىٚ نَادِيىٚ. خُدِىٚ ژِ ڤِىٚ عَلَاقَيَا ژِنيتيىٚ مُهمْتِرْ ژِى پێوَنْدِيێنْ لِيْزِمْتِتِى و خُودَتِيىٚ بَيَانْ كِرِيَه «اَوْ رُوٚژَا كُو مَالْ و زَارُوٚ تُو فَيْدِىٚ نَادِنْ كَسِى» شُعَرَاء:٨٨ و ژِ سُورَهيىٚ عَبَسَ ئَايَتَا ٣٤-٣٥ىٚ «رُوٚژَا كُو مَرْڤْ ژِ بِرَايىٚ خوه، ژِ دَايكْ و بَئَاڤِىٚ خوه ..دِرَڤِه«. خُدِىٚ ژِ ڤَانْ هَرْدُو ژِنَانْ مِينَاكْ ئَانِيَه. اَڤْ ژِى شَامِلِى سَرْ تَڤْكِىٚ اَقْرَبَانْ تِىٚ. خُدِىٚ بِڤِىٚ يَكِىٚ بِمُسلمَانَانْ دِدَه زَئَانِينْ كُو نَه بِنَاڤْگِينَا اِيمَانِىٚ بَه كَسْ نِكَارَه تُو فَيْدِىٚ بِدَه تُو كَسِى، چَنْدِى كُو اَو خُودِيىٚ وِى يىٚ هَرِى نێزْ بَه ژِى. ژِ سُورَهيىٚ طُورْ ئَايَتَا ٢١ىٚ «اَوێنْ كُو بَاوَرِى ئَانِينَه و زُرِّيَّتَا وَانْ ژِى بِبَاوَرِى دَابَه پِىْ شُوٚپَا وَانْ، اَمِىٚ زُرِيَتَا وَانْ ژِى بِگَهِينِنَه وَانْ و اَمْ ژِ مُكَافَاتَا وَانْ ژِى تِشْتَكِى كِيمْ نَاكِنْ» ڤِىٚ رَوْشِىٚ دِتَكِزێنِىٚ.

# ٦٧. سُورَه یێ مُلْكْ

سُورَەیێ (مُلْكْ)، سی (٣٠) ئایەتە، لمَكِّیێ هَاتیە خَوارێ. سُورَه، نَاڤێ خوە ژ ئَایَتا پێشینْ گِرْتیَه كُو تِی دَه پَێڤَا مُلْكْ دَرْبَاسْ بُویَه كُو اَوْ بوَاتَیَا دَسْتْهِلاتِی و حُكمْرَانی یَه. ژ ڤی سُورَەیی رَه هِنَكْ نَاڤێنْ دِنْ ژی هَنَه: تَبَارَكَه، مُنْجیَه، مُجَادَلَه، مَانِعَه و وَاقیَه. دَرْ بَارێ ڤِی سُورَەیی دَه پِرْ حَدیثْ هَنَه، دِدِنْ زَانینْ كُو كَسێ هَرْ شَڤْ وِی بخُوینَه، خێرَكه مَزِنْ ژ خَوه رَه حَاصِلْ دِكَه.

بِنَاڤێ خُدَایێ كُو رَحْمَنَ رَحِیمَ

١. اَوْ خُدَایێ كُو خُودَانِی و فَرْمَانْدَارِی بِدَسْتێ وِی یَه چِقَاسْ پَاكْ و پِیرُوزَه. اَوْ لِسَرْ هَرْ تِشْتِی قَادِرَه.

٢. خُدێ مِرِنْ و ژِیَانْ ئَافِرَانْدِنْ دَا كُو وَه بِجَرِبینَه؛ كَا كَارْ و كِرْیَارێنْ كێ ژ وَه چێتِرَه. هَرْ اَوَه یێ عّزِیزْ یێ غَفُورْ.

٣. اَوْ خُدَایێ كُو حَفْتْ طَبَقْ ئَاسِیمَانْ دِ سَرْ هَڤْ رَه ئَاهَنْگَسَازْ چێكِرِنَه، تُو یێ دِ چێكِرِنَا خُدَا یێ رَحْمَنْ دَه تُو كێمَاسی و نَاكُوكیێ نَبینِی. ڤێجَه دَه بَرێ خَوه بِدێ، اَرێ مَا تُو كێمَاسِیكێ تِی دَه دِبینِی؟

٤. پَاشێ دِیسَا بَرێ خَوه بِدێ (كَا تُو عَیْبَكێ تِی دَه دِبینِی(؟ چَاڤێنْ تَه دِێ رَبَنْ و وَسْتیَایِی لِتَه ڤَگَرِنْ.

٥. بِرَاسْتِی مَه ئَاسِیمَانێ دِنْیَایێ بِستێرَانْ خَمِلانْدِیَه. مَه اَوْ (ستێرْ) ژ بُوْ رَجِمَانْدِنَا شَیْطَانَانْ كِرِنَه تێوَرْ و مَه ژ بُوْ وَانْ عَذَابێ بِپێتْ ئَامَادَه كِریَه.

٦. ژ بُوْ وَانێنْ كُو رَبّێ خَوه مَانْدَلْ دِكِنْ عَذَابێ دُوْژَهێ هَیَه. اَوْ چه پیسَوَارَه!

٧. گَاڤَا اَوْ (كَافِرْ) دِ جَهْنَمێ تێنْ وَرْكِرِنْ، دَنْگَكی بِهێرْسی كِرێتْ ژێ تێ و اَوْ دِ نَاڤْ خَوه دَه دِكَلَه.

٨. جَهَنَمْ ژِ هێرْسَا خَوه هِنْدِكْ دِمِينَه كُو خَوه بِخَوه و ژِ هَڤْ بِتَقَه! چه گَاڤَا مَلائِيكَتْ كۆمَكىَ ژِ كَافِرَانْ دِاڤێژِنىَ، زَبَانِيێنْ وِىَ ژِ وَانْ دِپرْسِنْ؛ اَرِىَ مَا ژِ بۆ وَه پێخَمْبَرْ نَهَاتِبُونْ (كُو ژِ عَذَابِىَ ڤِىَ رُۆژِىَ وَه بِتِرْسِينِنْ)؟

٩. دِ بَرْسِڤَا خَوه دَه، گُۆتِنْ: رَاسْتَه، بِرَاسْتِى پێخَمْبَرْ ژِ بۆ مَه هَاتِنْ، ڤێجَه مَه بَاوَرِى بِوَانْ نَئَانِى و مَه گُۆتْ: خُدِىَ تُو پێخَمْبَرْ نَشَانْدِنَه. هُونْ بَسْ دِ نَاڤْ ژِرِێدَرْكَتِنَكَه مَزِنْ دَه نَه!

١٠. گُۆتِنْ: اَگَرْ مَه گُهْ بِدَايَا پێخَمْبَرَانْ ئَانْ ژِى مَه فَهْمْ بِكِرَا ڤێگَا اَمْ نَدِبُونْ ژِ خَلْكِىَ دُۆژَهِىَ!

١١. ڤێجَه لِگُنَهێنْ خَوه مِكُرْ هَاتِنْ. نَاخَوه بِلا دُۆژَهِى بِمِرِنْ و ژِ دِلْۆڤَانِيَا خُدِىَ دُورْ بِنْ!

١٢. بِرَاسْتِى اَوێنْ كُو ژِ نَدِيتِى و نَبِينَايِى ڤَه ژِ خُدَايِىَ خَوه دِتِرْسِنْ، ژِ وَانْ رَه لێبُورِينْ و پَرُو يَكَه مَزِنْ هَيَه.

١٣. هُونْ دِخَوازِنْ گُوتِنَا خَوه بِدِزِى يَانْ ژِى اَشْكَرَا بِبێژِنْ، بِرَاسْتِى خُدِىَ بِيَا دِ دِلانْ دَه هَرْ دِزَانَه.

١٤. اَرِىَ مَا اَوِىَ كُو (تَڤْكِىَ عَالَمِىَ) ئَافِرَانْدِيَه (بِيَا نَپِنِى و دِيَارْ) نِزَانَه؟ دِگَلْ كُو هَرْ اَوَه يىَ لَطِيفْ يىَ خَبِيرْ.[1]

١٥. خُدِىَ يَه اَوِىَ كُو عَرْدْ ژِ بۆ وَه سَرْنَرْمْ (و هێسَانْ) كِرِيَه. ڤێجَه دِ نَاڤْ هَرْ ئَالِيێنْ وِىَ دَه بِگَرِنْ، ژِ رِزْقِىَ كُو خُدِىَ دَايَه وَه بِخونْ و ڤَگَرْ بَسْ بِبَالْ وِى ڤَه يَه.

١٦. اَرِىَ مَا هُونْ ژِ وِى خُدَايِىَ لِژُۆرْ اَوْلَه نَه كُو اَوْ دِ عَرْدِىَ دَه وَه نَبَه خَوارِىَ. هَا وَه دِيتْ كُو عَرْدْ دِلَرِزَه؟

١ لَطِيفْ: اَوِىَ كُو بِحَقِيقَتَا هَرْ تِشْتِى، بِهُورْ و گِرِىَ وِى زَانَا يَه.
خَبِيرْ: اَوِىَ كُو بِكِرِنێنْ بَنْدِيێنْ خَوه، يێنْ اَشْكَرَا و نَهێنِى ئَاگَاهْدَارَه.

١٧. اَرێ مَا هُونْ ژِ وِى خُدَايێ لِژُوْرْ پشتْرَاسْتِنْ كُو كَفِرْبَارَانَكێ بِسَرْ وَه دَه نَرژِينَه؟ ڤێجَه هُونێ بزَانِنْ كَا تِرْسَانْدِنَا مِنْ چَاوَانَه؟

١٨. بِرَاسْتِى يێنْ بَرِيَا ڤَانْ (پُوتپَرَسْتَانْ) ژِى بَاوَرِى بـ (پێخَمْبَرێنْ خَوه) نَئَانِينْ. ڤێجَه لِهَمْبَرِى اِنْكَارَا وَانْ (دَه بنێرَه) كَا عَذَابێ مِنْ چَاوَا بُوْ؟!

١٩. مَا اَوْ لِطَيْرَانْ نَانێرِنْ كُو دِ سَرْ وَانْ رَه دِفِرِنْ، پَرێنْ خَوه ڤَدكِنْ و دِگِرِنْ؟ ژِ خُدَايێ رَحْمٰنْ پێ ڤَه (تِشْتَكْ ) وَانْ (لِهَوَا) نَاگِرَه. بِرَاسْتِى اَوْ بِهَرْ تِشْتِى بِينَرَه.

٢٠. اَرێ مَا ژِ بِلِى خُدِێ، اَوْ كِى يَه كُو ژِ بُوْ وَه بِبَه لَشْكَرْ كُو ئَارِيكَارِيَا وَه بِكَه؟ بِرَاسْتِى كَافِرْ هَرْ دِ نَاڤْ خَاپَانْدِنَكَه اَشْكَرَا دَه نَه (شَيْطَانْ وَانْ دِخَاپِينَه و نَاهِێلَه اَوْ بَاوَرِى بِينِن.)

٢١. اَرێ مَا كُو خُدێ رِزْقێ خَوه لِسَرْ وَه بِبِرَه، مَا كِى دِكَارَه رِزقْ بِدَه وَه؟ نَخێرْ، بَلْكِى وَانْ خَوه دِ چَاڤْسُورِى و نَفْرَتێ دَه بَرْدَانَه و رِكْدَارِيێ دِكِنْ.

٢٢. اَرێ مَا كَسێ كُو لِسَرْ رُويێ خَوه بِمَشَه دُرِسْتِرَه يَانْ اَوْ كَسێ كُو لِسَرْ پِيَانْ دِ رِيكَه رَاسْتْ دَه دِمَشَه؟

٢٣. بِبێژَه: خُدێ يَه، اَوێ كُو هُونْ ژِ نُو ڤَه خُلِقَانْدِنَه و ژِ بُوْ وَه گُه، چَاڤْ و دِلْ چێكِرْنَه. هُونْ چِقَاسْ كِيمْ شُكرێ خُدێ دِكِنْ!

٢٤. بِبێژَه: خُدێ يَه، يێ كُو هُونْ دَانَه سَرْ عَرْدێ و تِى دَه بَلاڤْ كِرِنَه و هُونێ بَسْ بِبَالْ وِى ڤَه بێنَه جڤَانْدِنْ.

٢٥. اَوْ دِبێژِنْ: اَگَرْ هُونْ رَاسْتْ دِبێژِنْ، دَه كَا اَڤْ سُوْزْ (ئَا تُو مَه پێ دِتِرْسِينِى) كَنْگێ يَه؟

٢٦. بِبێژَه: بِرَاسْتِى زَانِينَا وێ لِجَمْ خُدێ يَه. اَزْ تِنێ هِشْيَارْكَرُ و ئَاگَاهْدِێرِمْ.

٢٧. اِێدِى دَمَا عَذَابْ و نَخوشِيێ نێزِى خَوه دِبِينِنْ، لِوَه يێ كَافِرْ و بێبَاوَرَانْ رَشْ دِبَه. مَلائِيكَتْ ژِ وَانْ رَه دِبێژِنْ: هَا اَڤَه، اَوْ عَذَابێ كُو وَه لِێ لَزْ دِكِرْ!

**٢٨.** بِبێژَه: اَگَرْ خُدِىَ مِنْ و کَسێنْ لِگَلْ مِنْ بِمِرِینَه، یَانْ ژِى لِمَه وَرَه رَحْمِىَ، مَه سَاغْ بِهێلَه، دَه ژِ مِنْ رَه بِبێژِنْ مَا کِى هَیَه کُو کَافِرَانْ ژِ عَذَابِىَ دِژْوَارْ رِزْگَارْ بِکَه؟

**٢٩.** بِبێژَه: اَوْ خُدَایِىَ رَحْمٰنَه (اَوِىَ کُو مِرُۆڤَانْ ژِ نَخوشِى و عَذَابِىَ رِزْگَارْ دِکَه). مَه بَاوَرِى پِىَ ئَانِى و مَه خَوه بَسْ سِپَارْتَه وِى. ڤێجه هُونِىَ دِ نێزْ دَه بِزَانِنْ کَا کِى یَه یِىَ دِ رِێشَاشِیکَه اَشْکَرَا دَه.

**٣٠.** بِبێژَه: کَا بَژِنْ: اَگَرْ ئَاڤَا وَه دِ عَرْدِىَ دَه هَرَه خوارْ، مَا کِى هَیَه کُو ئَاڤکَه هَرِكْ ژِ وَه رَه بِینَه؟



## ٦٨. سُورَه یِىَ قَلَمْ

سُورَهیِىَ (قَلَمْ)، پێنْجِى و دُو (٥٢) ئَایِتَه. لِمَکِّىَ نَازِلْ بُویَه و سُورَه نَاڤِىَ خَوه ژِ ئَایِتَا پێشِینْ گِرْتِیَه کُو تِى دَه پَیڤَا قَلَمْ دَرْبَاسْ بُویَه و بِوَاتَیَا پێنُوسْ و خَامَه یَه. نَاڤکِى دِنِىَ ڤِى سُورَهیِى ژِى نُو نَه.

**بِنَاڤِىَ خُدَایِىَ کُو رَحْمٰنَ رَحِیمَ**

١. نُونْ. بِقَلَمِىَ و بِیَا کُو رِێزَه رِێزْ تِىَ نِڤِیسِینْ صُوْنْدْ بَه.

٢. بِسَدَمَا کُو خُدِىَ قَنْجِى دَایَه تَه تُو دِینْ نِینِى.

٣. بێگُمَانْ ژِ بُوْ تَه پَرُویکَه بێقُتبُونْ هَیَه.

٤. بِرَاسْتِى تُو لِسَرْ رَوِشْتَکِى (اَخلَاقَکِى) مَزِنِى.

٥. دِ نێزِیكْ دَه (رَسُولِىَ مِنْ) تُو یِىَ بِبِینِى و اَوِىَ ژِى بِبِینِنْ..

٦. کَا کِى ژِ وَه دِینَه.

٧. بِرَاسْتِى خُدَایِىَ تَه بێهْتِرْ دِزَانَه بِیِىَ کُو رِىَ وِنْدَا کِرِیَه و اَوْ بێهْتِرْ دِزَانَه بِیِىَ کُو رَاسْتَرِىَ بُویَه.

٨. نَاخَوه بِگُوٚتِنَا دَرَوْکَرَانْ مَکَه!

٩. اَوْ دِخَوازِنْ کُو تُو بِنَرْمِی تَڤْبِگَرِی دَا کُو اَوْ ژِی لِبَارَا ته نَرْمْ تَڤبِگَرِنْ.

١٠. بِگُوٚتِنَا مِرُوڤێ زێدَه سُوٚنْدْکَارْ یێ رِسْوَا مَکَه،

١١. اَوێ دَڤْئَاڤێژێ عَیبْدَرێخْ و اَوێ سَبْکَرێ خَبَرْگُهێزْ.

١٢. اَوێ چِیکُوسێ خِێرْنَهخَوازێ تَعْدَهکَرێ پِرْ گُنَهْکَارْ...

١٣. اَوێ دِلْهِشْكْ و خَبَرْرَقْ، پِشْتِی وِێ ژِی کُو اَوْ بیژِی بَه و بِخَرَابییێ نَاڤْدَارْ بَه.

١٤. ژِ بَرْ کُو خُدَانْ مَالْ و زَارُوكْ بُوٚ (ژِ لَوْ دَرْبَارێ قُرْئَانێ دَه وِسَا بُوٚ)!

١٥. دَمَا ئَایتێنْ مَه ژێ رَه تێنْ خَونْدِنْ، دبێژَه: اَوْ چِیرُوكْ و چِیڤَانُوکێنْ پێشِییانَه!

١٦. اَمێ وِی لِسَرْ پُوزێ وِی بِکَشْکِشێنِنْ.

١٧. بِرَاسْتِی مَه خَلْکێ مَکّێ ژِی مِینَا خُدَانێ بَاخْچَه جَرِبَانْدِنْ؛ دَمَا صُوٚنْدْ خَوارِنْ کُو سِبَهێ زُو (هێ تُو کَسی نَدیتی) فێکِیێ خَوه بِقُرێفِنْ (دَا فَقِیرَانْ بێبَحْرْ بِهێلِنْ).

١٨. ژِ بُوٚ فَقِیرْ و بَلَنْگَازَانْ تِه پَارْ ڤَنَقَتَانْدِنْ.

١٩. ڤێجَه هێ اَوْ دِ خَوێ دَه، بِشَڤْ، بَلایَکَه مَزِنْ بِسَرْ بَخْچَیێ وَانْ دَه هَاتْ.

٢٠. اِیْدِی اَوْ بَخْچَه بُوٚ مِینَا رِژِیێ.

٢١. سَرێ سِبَهێ گَازِی هَڤْ کِرِنْ (دَا کُو هَرِنْ نَاڤْ بَاخْچێ خَوه).

٢٢. (گُوٚتِنْ) دَه هَایْدێ سِبَهێ زُو هَرِنْ اَگَرْ (بِرَاسْتِی) هُونْ دِخَوازِنْ فێکِیێنْ خَوه بِقُرێفِنْ!

٢٣. اَوْ، بَرْ بِرِیَا بَاخْچَه ڤَه چُونْ، بِدِزِی ژِ هَڤْ رَه دِگُوٚتِنْ:

٢٤. بِلا تُو فَقِیرْ و بَلَنْگَازْ بِوَه نَحِسِنْ و بِوَه رَه نَیێنْ نَاڤْ بَاخْچێ وَه!

٢٥. اَوْ سِبَهێ زُو بِرِێ کَتِنْ و ژِ وَانْ وَه یَه کُو اَوْ دێ بِگَهِیژِنْ ئَارْمَانْجَا خَوه.

٢٦. لێبَلێ گَاڤا وَانْ بَخْچَه (بِڤِێ رَوْشِێ) دیتْ، گۆتِنْ: مَه رِیَا خَوه شَاشْ کِرِیَه (اَڤْ نَه
بَخْچێ مَه یَه)!

٢٧. (گُوتِنْ): نَخێرْ، بَلْکی اَمْ مَحْرُومْ و بێپَارْ مَانْ.

٢٨. یێ ژ وَانْ تێگَهیشْترْ، گُوتْ: مَا مِنْ ژ وَه رَه نَگُوتْ: بێأَمْرِیَا خُدِێ مَکِنْ، دَه بِلا وَه
خُدَایێ خَوه پَاكْ بِدێرَا، وَه زَکَاتَا مَالِێ خَوه بِدَایَا دَا کُو اَڤْ نَهَاتَا سَرێ وَه.

٢٩. گُوتِنْ: خُدێیۆ! تُو ژ هَرْ کێمَاسِیێ پَاكْ و پَاقِژِیێ. بِرَاسْتِی اَمْ هَرْ سِتَمْکَارْ بُونْ.

٣٠. پَاشِێ بَرێ خَوه دَانَه هَڤْ، گَازِنْ ژ هَڤْ کِرِنْ و سُوجْ خِسْتِنْ ستُویێنْ هَڤْ.

٣١. گُوتِنْ: وَاخْ لِرَوْشَا مَه! بِرَاسْتِی اَمْ ژ رِیَا رَاسْتْ دَرْکَتِبُونْ.

٣٢. هێڤِی هَیَه کُو خُدَایێ مَه ژ بَدێلا بَاخْچِیێ مَه یکی چێتِرْ بِدَه مَه. بِرَاسْتِی اَمْ هێڤِیدَارێ
(کَرَمَا) رَبِّێ خَوه نَه.

٣٣. هَا وِسَا یَه عَذَابْدَایینا مَه. لێ بَلِێ، اَگَرْ بِزَانِنْ و تێبگَهِیژِنْ عَذَابِێ ئَاخِرَتِێ گَلَكْ
دژْوَارْترْ و مَزِنْترَه.

٣٤. بێگُمَانْ ژ بُو وَانێنْ کُو خَوه ژ بێحَقِیێ دپَارێزِنْ لِجَمْ خُدَایێ وَانْ بِهِشْتێنْ خَوشْ هَنَه.

٣٥. اَرێ مَا اَمِێ مُسِلْمَانْ و گُنَهْکَارَانْ وَکْهَڤْ بِگِرِنْ؟

٣٦. اَرێ چه لِوَه قَومِیَه؟ مَا هُونْ چَاوَا (بوَکْهَڤِیێ) حُکِمْ دِدِنْ؟

٣٧. یَانْ ژی دِ دَسْتْ وَه دَه کِتێبَكْ هَیَه کُو هُونْ دِ وِێ دَه دِخوینِنْ؟

٣٨. کُو بِرَاسْتِی ژی یَا هُونْ دِخَوازِنْ ژ بُو وَه تِی دَه یَه؟!

٣٩. یَانْ ژی مَا سُوزِێنْ وَه لِسَرْ مَه هَنَه کُو حَتَا رُوژَا قِیَامَتِێ یَا هُونْ حُکِمْ پِێ بِدِنْ دِێ
هَرْ ژ بُو وَه بَه؟!

٤٠. ژ وَانْ بِپِرْسَه: کَا کِی ژ وَانْ کَفیلِێ ڤِێ دُوژَا پُوچَه؟

٤١. يَانْ ژِى دِ ڤِىَ بِيرْ و بَاوَرِيىَ دَه هَڤْكَارِيْنْ وَانْ هَنَه، ڤِيْجَه اَگَرْ بِرَاسْتِى اَوْ رَاسْتْ دِبيْژِنْ بِلا گَازِى هَڤْكَارِيْنْ خَوه بِكِنْ!

٤٢. رُوْژَا كُو لِوَانْ دِبَه تَنْگَاسِى و زَحْمَتِى (كُو رُوْژَا قِيَامْتِىَ يَه)، دَاخَوازْ لِوَانْ تِىَ كِرِنْ كُو هَرِنْ سِجُودِىَ، لِيْبَلِىَ اَوْ نِكَارِنْ بِچِنْ سِجُودِىَ.

٤٣. چَاڤِيْنْ وَانْ بِتِرْسَه، زَلِيلِى وَانْ دِگِرَه. بِرَاسْتِى بَرِىَ دَاخَوازْ ژِ وَانْ دِهَاتَه كِرِنْ كُو بِچِنْ سِجُودِىَ (دِيسَا ژِى اَوْ نَچُونْ سِجُودِىَ)، دِگَلْ كُو اَوْ سَاغْلَمْ و رِحَتْ بُونْ ژِى.

٤٤. تُو مِنْ و كَسِىَ كُو بِڤِىَ قُرْئَانِىَ بَاوَرِى نَينِىَ ژِ هَڤْ رَه بِهِيْلَه. اَمِىَ دِ نيْزِيكْ دَه هِيْدِى هِيْدِى، بِبِيِى كُو اَوْ بِخَوه بِحِسِنْ بَرْ بِدُوْژَهِىَ ڤَه وَانْ بِكِيْشِمْ.

٤٥. اَزْ مُهْلَتِىَ دِدِمْ وَانْ. بِرَاسْتِى دَهْفَا مِنْ ئَا جَزَادَانِىَ پِرْ دِژْوَارَه!

٤٦. يَانْ ژِى تُو حَقَكِى ژِ وَانْ دِخَوازِى ڤِيْجَه اَوْ لِسَرْ وَانْ گِرَانَه؟

٤٧. يَانْ ژِى زَانِينَا نَپَنِيِىَ لِجَمْ وَانَه،ڤِيْجَه اَوْ دِنِڤِيسِنْ؟

٤٨. ڤِيْجَه تُو ژِ بُوحُكْمِىَ رَبِّىَ خَوه،خَوهرَاگِرَه , تُونَبَه وَكِى خُدَانِىَ مَاسِى(يونُسْپيْخَمْبَرْ) دَمَابِدَرْدُ و كُلْ گَازِى خُدَايِىَ خَوه كِرْ (دَاكُو وِى ژِ نَاڤَا مَاسِى رِزْگَارْ بِكَه)...

٤٩. اَگَرْ دِلُوْڤَانِيَا خُدَايِىَ وِى پِىَ رَه نْگِهِيشْتِبُويَا اَوِىَ لِچُولا رِپْ و رُوتْ و لُومَهكِرِى بِهَاتَا ئَاڤِيْتِنْ.

٥٠. بَلِىَ خُدَايِىَ وِى اَوْ بِژَارْتْ (وَحِى دَايِىَ و بَرْ بِدِلُوْڤَانِيَا خَوه خِسْتْ)، ڤِيْجَه اَوْ گَرَانْدْ ژِ مِرُوڤِيْنْ ڤَنْجِيكَارْ.

٥١. بِرَاسْتِى، هِنْدِكْ مَابُو كُو يِيْنْ كَافِرْ دَمَا لِقُرْئَانِىَ گُهْدَارِى دِكِنْ ژِ كَرْبُ و كِينَا خَوه تَه چَاڤِينُوْكِى بِكِنْ و تَه بِخِنْ عَرْدِىَ. دِبيْژِنْ: بِرَاسْتِى ژِى اَوْ دِينَه.

٥٢. حَالْ اَڤَه كُو قُرْئَانْ بِخَوه ژِ بُوْ مِرُوْڤَانْ ئَاگَاهْدَارِى يَه.

# ٦٩. سُورَه يِىَ حَاقَّه

سُورَەيِىَ (حَاقَّه)، پێنْجى و دُو (٥٢) ئَايَتَه. لِمَكَّىَ نَازِلْ بُويَه . سُورَه نَاڤِىَ خَوه ژ ئَايَتَا پێشِينْ گِرْتِيَه كُو تِى دَه پَێڤَا حَاقَّه هَاتِيَه و بِوَاتَيَا وِىَ قِيَامَتِىَ يَه كُو وَانْ حَقِيقَتێنْ هَاتِنَه مَانْدَلِكِرِنْ، دَرِتِينَه رَاسْتِىَ.

بِنَاڤِىَ خُدَايِىَ كُو رَحْمٰنَ رَحِيمَ

١. الحَاقَّه.[1]

٢. اَرِىَ مَا اَلْحَاقَّه چِى يَه؟

٣. مَا تُو ژِ كُو دِزَانِى كَا اَلْحَاقَّه چِى يَه؟

٤. سَمُودْ و عَادْ بِرُوْژَا قِيَامَتِىَ بَاوَرِى نَئَانِينْ.

٥. هَرْچِى سَمُودْ (قَوْمِىَ نَبِى صَالِحْ) بُونْ بِقِيرَكَه ژِ حَدِىَ دَرْ هَلَاكْ بُونْ.

٦. هَرْچِى عَادْ (قَومِىَ نَبِى هُودْ) بُونْ بِبَاهُوْزَكَه بِڤِيزَه ڤِيزْ و زێدَه سَارْ هَلَاكْ بُونْ.

٧. خُدِىَ اَوْ حَفْتْ شَڤْ و هَشْتْ رُوْژَانْ لِپَێْ هَڤْ بِسَرْ وَانْ دَه شَانْدْ. اَوْ دِ مَالێنْ خَوه دَه مِرِى و بێبِزَاڤْ مَانْ، هَرْ وَكِى اَوْ قُرْمِىَ دَارْخُرْمَيێنْ رِزِى بُونْ.

٨. ڤێجَه مَا تُو شُونْمَايِينَكِىَ ژِ وَانْ دِبِينِى؟

٩. فِرْعَونْ و يێنْ بَرِيَا وِى و خَلْكِىَ وَانْ وَلاتێنْ كُو هَاتِنَه سَرُو بِنْكِرِنْ ژِى، دَسْتْ بِگُنَهَانْ كِرِنْ.

١٠. هَرْ وِهَا وَانْ گُهْدَارِيَا پێخَمْبَرِىَ خَوه نَكِرْ، ڤێجَه خُدِىَ بِعَذَابَكِى تُنْدْ (دِژْوَارْ) اَوْ جَزَا كِرِنْ.

١١. بِرَاسْتِى گَاڤَا ئَاڤِىَ (هَرْ ئَالِى) دَا بَرْ خَوه و بِلِنْدْ بُوْ، مَه هُونْ دِ كَشْتِيِىَ دَه هِلْگِرْتِنْ...

[1] الحَاقَّه ، نَاڤَكْ ژِ نَاڤِىَ رُوْژَا قِيَامَتِىَ يَه، لَوْرَا دِ ڤِىَ رُوْژِىَ دَه پَێمَانَا بِپَادَاشْ و جِزَايِىَ مِسُوْگَرْ دِبَه-

١٢. دَا كُو اَمْ ڤِىَ يكِىَ ژِ وَه رَه بِكِنْ پَنْدُ و شِيرَتْ و دَا كُو گُهيَنْ تِيَگِهيشْتِى تِيَبِگِهيژِنْ.

١٣. اِيَدِى گَاڤَا كُو دِ صُورِىَ دَه يَكْ پِفْكِرِنَكْ بِىَ پِفْكِرِنْ..

١٤. عَرْدُ و چِيَا بِيَنْ رَاكِرِنْ و بجَارَكِىَ لِهَڤْ بِيَنْ خِسْتِنْ و هُورْ و هِيَرَا بِبِنْ.

١٥. هَا وِىَ رُوَژِىَ بِزَانَه كُو قِيَامْتْ رَابُو.

١٦. ئَاسِيمَانْ دِدَرِزَه، اِيَدِى وِىَ رُوَژِىَ ئَاسِيمَانْ سِسْتُ و خَاڤَه.

١٧. مَلائِيكَتْ لِدُوَرَا ئَاسْمِيَنِنْ. وِىَ رُوَژِىَ هَشْتْ مَلائِيكَتْ عَرْشِىَ خُدَايِىَ تَه دِ سَرْ مِرُوَڤَانْ رَه دِىَ هِلْگِرِنْ.

١٨. وِىَ رُوَژِىَ (ژِ بُوَ حَسَابْ) هُونِىَ بِيَنَه پِيَشْبَرِى خُدَايِىَ خَوه، تِشْتَكِى وَه يِى ڤَشَارْتِى نَامِينَه.

١٩. هَرْچِى يِىَ كُو دَفْتَرَا عَمَلِىَ خَوه بِدَسْتِىَ خَوه يِىَ رَاسْتِىَ وَرْگِرَه، (بِكِيَفْ) دبِيَژَه: كَرَمْ كِنْ؛ دَفْتَرَا مِنْ بِخُوينِنْ.

٢٠. بِرَاسْتِى مِنْ ژِ دِلْ زَنَانِيبُو كُو حَسَابِىَ رُوَژَا قِيَامَتِىَ لِپِيَشِيَا مِنَه.

٢١. ڤِيَجَه اَوْ دِ ژِيَانَكَه خَوهشْ دَه يَه.

٢٢. دِ بِهِشْتَكَه قَدِرْبِلِنْدُ و خُدَانْرُومَتْ دَه يَه.

٢٣. فِيَكِيىَ وِىَ نِيَزِكْ و بَرْدَسْتِنْ.

٢٤. (مَلائِيكَتْ ژِ وَانْ رَه دِبِيَژِنْ): بِسَدَمَا كَارْ و كِريَارِيَنْ كُو وَه دِ دِنْيَايِىَ دَه كِرِنْ بِخوُنْ، ڤَخوُنْ، ژِ وَه رَه نُوَشِيجَانْ بَه.

٢٥. هَرْچِى يِىَ كُو دَفْتَرَا عَمَلِىَ خَوه، بِدَسْتِىَ خَوه يِىَ چِپِىَ وَرْگِرَه، دِىَ بِبِيَژَه: خَوزِى اَڤْ دَفْتَرْ ژِ بُوَ مِنْ نَهَاتِبُويَا دَاينْ!

٢٦. هَمْ مِنْ نِزَانِبُويَا كَا حَسَابِىَ مِنْ چِى يَه!

٢٧. خَوزِی بِمِرِنِیٚ رَه هَرْ تِشْتْ بِدَاوِی بُویَا!

٢٨. مَالْ و مِلْکِیٚ مِنْ قَتْ فَیْدَه نَگِهَانْدَه مِنْ..

٢٩. دَسْتْهِلاتِیَا مِنْ ژِ مِنْ هَاتَه سِتَانْدِنْ.

٣٠. (تِیٚ گُوٚتِنْ): وِی بِگِرِنْ و بِزِنْجِیرَانْ (دَسْتِیٚنْ وِی بِسِتُوِییٚ وِی ڤَه) گِرِیٚ بِدِنْ..

٣١. پَاشِیٚ وِی بَاڤِیٚژِنْ نَاڤْ ئَاگِرِیٚ بِپِیٚتْ!

٣٢. پِشْتْرَه وِی بِزِنْجِیرَکَه حَفْتِیٚ گَازْ زِنْجِیرْپِیٚچْ بِکِنْ.

٣٣. بِرَاسْتِی وِی بَاوَرِی بِخُدَایِیٚ مَزِنْ نَدِئَانِی..

٣٤. لِسَرْ نَانْدَایِنْ و تِیٚرْکِرِنَا بَلَنْگَازَانْ تَشْوِیقْ نَدِکِرْ.

٣٥. اِیرُو لِڤِرْ، ژِیٚ رَه تُو هَڤَالْ و هُوگِرْ نِینِنْ.

٣٦. ژِ بِلِی خوِینْ و عَدَابِیٚ تُو خَوارِنْ ژِی تُنَه.

٣٧. ژِ گُنَهْکَارَانْ پِیٚ ڤَه کَسْ ڤِیٚ خَوارِنِیٚ نَخوه.

٣٨. صُوٚنْدْ بَه، بِتِشْتِیٚنْ کُو هُونْ دِبِینِنْ..

٣٩. بِتِشْتِیٚنْ کُو هُونْ نَابِینِنْ ژِی..

٤٠. بِیٚگُمَانْ اَڤْ (قُرْئَانْ)، گُوتِنَا قَاصِدَکِی پِرْ بِرُومَتَه.

٤١. اَڤْ، نَه گُوتِنَا شَاعِرَکِی یَه. هُونْ چِقَاسْ کِیٚمْ بَاوَرْ دِکِنْ!

٤٢. اَڤْ، نَه گُوتِنَا رِمِلْدَارَکِی یَه ژِی. هُونْ چِقَاسْ هِنْدِکِی دِفِکِرِنْ!

٤٣. اَڤْ، ژِ جَمْ پَرْوَرْدَگَارِیٚ عَالَمِیٚ ڤَه هَاتِیَه شَانْدِنْ.

٤٤. اَگَرْ وِی پِیٚخَمْبَرِی لِسَرْ (نَاڤِیٚ) مَه هِنْ گُوٚتِنْ لِیٚبَانِینَا..

**٤٥.** تَقَزْ مَه یِیَ اَوْ بِخُرْتْ بِهِنْگَاڤتَا..

**٤٦.** پِشْتْرَه مَه یِیَ دِلْرَهَا وِی بِقَتَانْدَا.

**٤٧.** ژِ وَه تُو کَسِی دِیَ نِکَارِیَا ژِ بُوِ وِی بَرَڤَانِی بِکِرَا.

**٤٨.** بِرَاسْتِی اَڤْ (قُرْئَانْ) ژِ بُوِ تَقْوَادَارَانْ بِیرْئَانِینْ و شِیرَتَه.

**٤٩.** اَمْ، تَقَزْ دِزَانِنْ کُو ژِ وَه هِنْ کَسْ پِیَ بَاوَرِی نَایینِنْ.

**٥٠.** بِیِگُمَانْ اَوْ ژِ بُوِ کَافِرَانْ حَسْرَتْ و پُوِشْمَانِی یَه.

**٥١.** بِرَاسْتِی ژِی اَڤْ قُرْئَانْ رَاسْتِی بِخَوه یَه.

**٥٢.** ڤِیِجَه تُو نَاڤِیَ رَبِّیَ خَوه یِیَ مَزِنْ پَاكْ و پَاڤِژْ بِدِیِرَه.

## ٧٠. سُورَه یِیَ مَعَارِجْ

سُورَه‌یِیَ(مَعَارِجْ) چِلْ و چَارْ (٤٤) ئَایِتَه. لِمَکِّیَ نَازِلْ بُویَه ، نَاڤِیَ خَوه ژِ ئَایِتَا ٣'اَمْ گِرْتِیَه کُو پَیْڤَا مَعَارِجْ تِی دَه دَرْبَاسْ بُویَه و بِوَاتَیَا بِلِنْدبُونْ و هِلْبُونَا بِبِرْ بِئَاسِیمَانَانْ ڤَه یَه.

**بِنَاڤِیَ خُدَایِیَ کُو رَحْمَنَ رَحِیمَ**

١. دَاخَوازْکَرَکِی دَاخَوازْ کِرْ (هَاتِنَا) عَذَابَکِی کُو اَوِیَ رُو بِدِیَ.

٢. اَوْ عَذَابْ ژِ بُوِ کَافِرَانَه. یِیَ وِی ژِ سَرْ وَانْ بِدَه ئَالِی تُنَه.

٣. اَوْ عَذَابِیَ اَوْ دِخَوازِنْ ژِ جَمْ خُدِیَ ڤَه یَه کُو اَوْ خُدَایِیَ مَقَامِیِنْ مَزِنْ و بِلِنْدَه.

٤. مَلَائِیکَتْ و جَبْرِیلْ دِ رُوِژَکِیَ دَه بِبَالِیَ ڤَه هِلْدِکِشِنْ کُو تَبَابَا وِیَ پِیِنْجِی هَزَارْ صَالَه.

٥. ڤِیِجَه تُو بِصَبْرَکَه رِنْدْ صَبْرِیَ بِکَه.

٦. بِرَاسْتِی کَافِرْ وِی (عَذَابِیَ وِیَ رُوِژِیَ) دُورْ دِبِینِنْ.

٧. اَمْ ژِى وِى نِێزِيكْ دِبِينِنْ.

٨. اَوْ رُوْژْ ئَاسِيمَانْ دِبَه وَكِى مَعْدَنَا حَلِيَايِى.

٩. چِيَا ژِى دِبِنْ مِينَا هِرِيَا ژَنْدِى.

١٠. تُو دُوْسْتْ لِحَالِىٰ تُو دُوْسْتِى نَاپِرْسَه.

١١. اَوْ دِىٰ نِيشَانِى هَڤْ بِێنَه دَايِينْ. كَسِىٰ گُنَهْكَارْ ژِ بَرْ عَذَابِىٰ رُوْژَا قِيَامَتِىٰ دِخوازَه كُو زَارُوْكِێنْ خَوه...

١٢. ژِنَا خَوه و بِرَايِىٰ خَوه...

١٣. عشِيرُ و مَالْبَاتَا كُو اَوْ هِمْبِێزْ دِكِرِنْ...

١٤. چِقَاسْ كَسِێنْ كُو لِسَرْ عَرْدِىٰ هَنَه ژِى تَڤْكَانْ گُوْرِى خَوه بِكَه، دَا كُو اَوْ رِزْگَارْ بِبَه.

١٥. نَخِێرْ، اَوْ نِكَارَه ڤِىٰ بِكَه؛ دُوْژَهْ ئَاگِرَكِى گُرْ و بِپِێتَه.

١٦. اَوْ چَرْمِىٰ سَرِيَانْ رَادِكَه.

١٧. اَوْ (دُوْژَهْ) گَازِى وِى كَسِى دِكَه كُو پِشْتَا خَوه دَايَه (اِيمَانِىٰ) و بَرِىٰ خَوه ژِىٰ دَايَه پَاشْ..

١٨. (سَرْوَتِىٰ) دِدَه سَرْ هَڤْ (زَكَاتِىٰ ژِىٰ نَادَه) و خَزِنْ دِكَه!

١٩. بِرَاسْتِى اِنْسَانْ لَزْگِينْ و چِكُوسْ هَاتِيَه ئَافِرَانْدِنْ..

٢٠. دَمَا نَبَاشِى بِسَرْ دَه تِىٰ (غَمْگِينْ دِبَه و) دِكَه فَرْيَادْ..

٢١. گَاڤَا كُو قَنْجِيَكْ بِسَرْ دَه بِىٰ دَسْتْگِرْتِى و چِكُوسْ دِبَه.

٢٢. ژِ بِلِى يێنْ نِمێژْكَرْ..

٢٣. اَوێنْ كُو نِمێژَا خَوه بَرْدَوَامِى دِكِنْ.

٢٤. اَوێنْ كُو دِ مَالێنْ وَانْ دَه پَارَكَه دِيَارْكِرِى هَيَه..

٢٥. ژِ بُوٚ پَارْسَكْ و بێپَارَانْ.

٢٦. اَوێنْ كُو بِرُوٚژَا جَزَادَانێ بَاوَرِى تينِنْ..

٢٧. اَوێنْ كُو ژِ عَذَابێ خُدَايێ خَوه دِترْسِنْ.

٢٨. بِرَاسْتِى عَذَابێ رَبِّێ وَانْ بێ اَوْلَه يَه...

٢٩. اَوێنْ كُو دَاوْپَاقژِنْ و نَامُوسَا خَوه دپَارێزِنْ.

٣٠. لێبَلێ نَه لِهَمْبَرْ ژِنْ و جَارِيێنْ خَوه. بِرَاسْتِى دَرْ بَارێ وَانْ دَه اَوْ بێگَازِنِنْ.

٣١. اِيْدِى كَسێ كُو ژِ بِلِى ڤَانْ بِخَوازَه كُو بِهِنَكێنْ دِنْ رَه (بێنِكَاحْ) رَازَه، ڤێجَه هَا اَوْ سِينُورْبِهێرْ هَرْ بِخَوه نَه.

٣٢. اَوێنْ كُو سِپَارَه و پێمَانێنْ خَوه بِجِهْ تينِنْ...

٣٣. اَوێنْ كُو شَاهدَيِيَا خَوه (بِرَاسْتُ و دُرِسْتِى) دِدِنْ...

٣٤. اَوێنْ كُو لِنِمێژَا خَوه مِقَاتَه نَه...

٣٥. هَا اَڤِنْ، يێنْ كُو دِ بِهِشْتَانْ دَه رُومَتَا وَانْ تێ گِرْتِنْ.

٣٦. ڤێجَه مَا چِه لِيێنْ كَافِرْ قَومِيَه كُو بِبَالْ تَه ڤَه لَزْ دِكِنْ و دِبَزِنْ (سِطُيێ خَوه بِئَالِيێ تَه ڤَه دِرِێژْ دِكِنْ دَا كُو لِتَه گُهْدَارِى بِكِنْ)؟!

٣٧. (پَاشێ) ژِ رَاسْتُ و چَپْ ڤَه بَلَاڤْ دِبِنْ(پِشْتَا خَوه دِدِنْ تَه و طِنَاظِێ خَوه دِكِنْ).

٣٨. مَا هَرْ يَكْ ژِ وَانْ لِهێڤِيێنَه كُو اَوْ بِچِنْ جَنَّتَا نَعِيمێ؟

٣٩. نَا، بِلا ڤێ هێڤِيێ نَكِنْ! بِرَاسْتِى اَوْ ژِى دِزَانِنْ كُو مَه اَوْ ژِ چِى ئَافِرَانْدِنَه.

٤٠. نَا؛ رَاسْتِى نَه وَكِى هێڤِيَا وَانَه! صُوٚنْدْ بِخُدَايێ رُوٚژْهِلاَتُ و رُوٚژَاڤَايَانْ، بِرَاسْتِى ژِى اَمْ كَارَانَه...

٤١. لِسَرْ ئَا كُو هِنَكَانْ ژِ وَانْ چِێترْ بِينِنْ شُونَا وَانْ و تُو كَسْ دِێ زُوْرَا مَه ژِى نَبَه.

٤٢. ڤێجَه ژِ وَانْ بِگَرَه، بِلا خَوه (دِ پُوچِيێ دَه) بَرْدِنْ و بِدِنْيَايَا خَوه ڤَه بِمِينِنْ حَتَا وِێ رُوْژِێ بِبِينِنْ ئَا كُو پێهَانَا (عَذَابِێ) وِێ ژِ وَانْ رَه هَاتِيَه دَايِنْ.

٤٣. اَوْ رُوْژَا كُو بِلَزْ ژِ گُورِسْتَانَانْ دَرْدِكَڤِنْ، بَرْ بِجِهِێ كُوْمْبُونِێ ڤَه دِچِنْ، تُو دِبێژِى قَىْ اَوْ بِبَالْ رێنِيشَانْدَرَكَه جِكَانْدِى ڤَه دِبَزِنْ.

٤٤. وِێ رُوْژِێ چَاڤێنْ وَانْ بِترْسِنْ و رِسْوَاتِى وَانْ دِگْرَه. هَا اَڤَه، اَوْ رُوْژَا كُو لِدِنْيَايِێ پِێ دِهَاتِنْ تِرْسَانْدِنْ.

## ٧١. سُورَه يِێ نُوحْ

سُورَهِيێ (نُوحْ)، بِيسْتُ و هَشْتْ (٢٨) ئَايَتَه و لِمَكِّێ نَازِلْ بُويَه . سُورَه نَاڤِێ خَوه ژِ ئَايَتَا پێشِينْ گِرْتِيَه كُو تِى دَه نَاڤِێ نُوحْ پێخَمْبَرْ (ع.س) دَرْبَاسْ بُويَه.

بِنَاڤِێ خُدَايِێ كُو رَحْمٰنَ رَحِيمَ

١. بێگُمَانْ مَه نُوحْ ژِ بُوْ گَلِێ وِى رَه شَانْدْ؛ (مَه ژِێ رَه گُوتْ:) بَرِيَا عَذَابَكِى جَانْسُوْژْ بِسَرْ وَانْ دَه بِێ تُو گَلِێ خَوه هِشْيَارْ بِكَه و وَانْ بِترْسِينَه.

٢. نُوحْ گُوتْ: هَىْ گَلِێ مِنْ! بِرَاسْتِى اَزْ ژِ بُوْ وَه هِشْيَارْكَرَكِى اَشْكَرَا مَه.

٣. كُو هُونْ عِبَادَتِێ خُدِێ بِكَنْ و هَاىْ ژِ فَرْمَانْ و قَدَخَيێنْ وِى هَبِنْ و بِگُوْتِنَا مِنْ بِكِنْ..

٤. خُدِێ ژِى دِێ لِگُنَهێنْ وَه بِبُورَه و حَتَا دَمَكَه نَاڤْلێكِرى دِێ ژِيَانَا وَه دِرێژْ بِكَه. بِرَاسْتِى ژِى گَاڤَا اَوْ دَمَا نَاڤْلێكِرى هَاتْ اَوْ نَايِێ بِپَاشْدَه خِسْتِنْ. اَگَرْ وَه بِزَانِيَا (وَه دِێ بِبَالْ اِيمَانْ و طَاعَتِێ ڤَه لَزْ بِكِرَا)!

٥. (نُوحْ) گُوتْ: خُدَايِێ مِنْ! بِرَاسْتِى بِشَڤْ و رُوْژْ مِنْ گَلِێ خَوه بِبَالْ اِيمَانِێ ڤَه گَازِى كِرْ.

٦. ڤێجه بَانگَا مِنْ تَنىَ اَوْ ژِ مِنْ زێدَه دُورْ كِرِنْ.

٧. بِرَاسْتِى ژِ بُوّ كُو تُو لِگُنَهێنْ وَانْ بِبُورِى، چِقَاسْ مِنْ گَازِى وَانْ كِرْ، وَانْ هَرْ تِلِيێنْ خَوه خِسْتِنَه گُهىَ خَوه، جِلِيێنْ خَوه لِسَرْ و چَاڤێنْ خَوه وَرْدَانْ و رِكْدَارِى كِرِنْ؛ بِقُرَّتِى و يُوزْبِلِنْدِى خَوه مَزِنْ دِيْرَانْ.

٨. پَاشىَ مِنْ بِاَشْكَرَا گَازِى وَانْ كِرْ.

٩. پِشْتْرَه، دِيسَا ژِى مِنْ بِاَشْكَرَا و بِدِزِى گَازِى وَانْ كِرْ.

١٠. مِنْ ژِ وَانْ رَه گُوّتْ: ژِ رَبِّىَ خَوه لِيْبُورِينىَ بِخَوازِنْ، بِرَاسْتِى اَوْ پِرْ عَفُوكَارَه.

١١. خُدِىَ، دِىَ ژِ عَوْرَانْ ژِ بُوّ وَه بَارَانىَ لِدُو هَڤْ بِبَارِينَه.

١٢. مَالْ و زَارُوكێنْ وَه پِرْ بِكَه، بَخْچَانْ بِدَه وَه و ژِ وَه رَه چَمَانْ بِهَرِكِينَه.

١٣. چِه لِوَه قَومِيَه كُو هُونْ قَدْرِىَ مَزِنَاهِيَا خُدِىَ نَاگِرِنْ؟

١٤. حَالْ اَڤَه كُو خُدِىَ هُونْ مَرْحَلَه بِمَرْحَلَه ئَافِرَانْدِنَه.

١٥. مَا هُونْ دَسْتْهِلاتِيَا خُدِىَ نَابِينِنْ كُو چَاوَا حَفْتْ طَبَقْ ئَاسِيمَانْ ئَافِرَانْدِنَه؟

١٦. خُدِىَ چَاوَا هِيڤْ دِ وَانْ دَه كِرِيَه رُوّنَاهِى و رُوّژْ ژِى كِرِيَه چِرَايَكَه رُوّنْكَرْ.

١٧. خُدَايىَ مَزِنْ هُونْ ژِ ئَاخىَ مِينَا گِيَايىَ، هێشِينْ كِرْ.

١٨. جَارَكَه دِنْ دِىَ وَه ڤَگَرِينىَ و دِيسَا (ژِ بُوّ مَحْشَرِىَ) دِىَ وَه ژِىَ دَرِينَه.

١٩. خُدِىَ عَرْدْ ژِ وَه رَه رَاخِسْتِيَه..

٢٠. دَا هُونْ كَارِبِنْ دِ عَرْدِىَ دَه رِيێنْ فِرَهْ بِگَرِنْ (و لِرِزْقِىَ خَوه بِگَرِنْ).

٢١. نُوحْ گُوّتْ: خُدَايىَ مِنْ! بِرَاسْتِى وَانْ گُهْدَارِيَا مِنْ نَكِرْ و دَانْ پَىْ (مَالْدَارێنْ خَوه) يێنْ كُو مَالْ و زَارُوكێنْ وَانْ ژِ بِلِى زَرَارِىَ تُو فَيْدَه نَدَايَه وَانْ.

٢٢. وَانْ حِيلَه و دَكێنْ مَزِنْ گِرێدَانْ.

**٢٣.** گُوٚتِنْ: زنْهَارْ، اِلٰهيٚنْ خوه تَرْكْ مَكنْ و دَقْ ژ وِدٌّ، سُوَاعُ، يغُوثُ، يعُوقُ و نَسرْ بَرْمَدِنْ!

**٢٤.** براسْتِى وَانْ پرْ كَسْ ژ رِىٚ دَرَانِينْ.(خُدَايىٚ مِنْ)! تُو ژِى رِيٚشَاشِيَا وَانْ سِتَمْكَارَانْ هَرْ زيٚدَه بكَه!

**٢٥.** اَوْ ژ بَرْ گُنَهيٚنْ خوه دِ طُوٚفَانِىٚ دَه خَنِقِينْ، ڤيٚجه پَاشِىٚ اَوْ كَتن اِيٚگرْ، اِيدى لِهَمْبَرى خُدىٚ ژ بُوٚ خوه تُو ئَاريكَارْ ژِى نَديتِنْ.

**٢٦.** نُوحْ گُوٚتْ: خُدَايىٚ مِنْ! لِسَرْ عَرْدِىٚ ژ كَافِرَانْ تُو كَسى مَهيٚلَه!

**٢٧.** براسْتِى اَگَرْ تُو وَانْ بهيٚلِى دِىٚ عَقْديٚنْ تَه ژ رِىٚ دَرينِنْ و دِىٚ تَنِىٚ مرُوڤيٚنْ نَه پَاكْ و نَانْكُوٚرْ بوَلِدينِنْ.

**٢٨.** خُدَايىٚ مِنْ! لمِنْ و دِىٚ و بَاڤيٚنْ مِنْ و لِكَسِىٚ كُو بِبَاوَرْمَنْدى بكَڤه خَانِيىٚ مِنْ و لِميٚريٚنْ بَاوَرْمَنْدْ و ژنِيٚنْ بَاوَرْمَنْدْ ببُورَه و تَنِىٚ هَلاكَا ظَالِمَانْ زيٚدَه بكَه.

## ٧٢. سُورَه يىٚ جنْ

سُورَه‌يىٚ (جنْ)، بيسْتُ و هَشْتْ (٢٨) ئَايَتَه. لمَكِّىٚ نَازِلْ بُويَه. سُورَه نَاڤِىٚ خوه ژ ئَايَتَا پيٚشينْ گرْتِيَه كُو تِى دَه پَيْڤَا جنْ دَرْبَاسْ بُويَه و بوَاتَيَا «يِيٚنْ پرْ ڤَشَارْتِى»يَه. سُورَه بَحْسَا وَانْ جنَانْ دكَه كُو هَاتنَه لقُرْئَانِىٚ گُهْدَارى كرنَه و وَانْ اِيمَانْ پِىٚ ئَانِيَه. هَرْ وهَا هَدَانْ و صَبرَا پيٚخَمْبَرْ ﷺئَانِيَه كُو جنْ ژِى بُونَه تَابِعيٚنْ وِى.

بنَاڤِىٚ خُدَايىٚ كُو رَحْمٰنَ رَحِيمَ

**١.** (يَا مُحَمَّدْ)! بِبيٚژَه: ژ بُوٚ مِنْ وَحِى هَاتْ كُو جِڤَاتَكْ ژ جنَانْ (لِقُرْئَانِىٚ) گُهْدَارى كرِنْ. ڤيٚجه (پِشْتِى كُو لِقَوْمِىٚ خوه ڤَگَريَانْ) گُوٚتِنْ: براسْتِى مَه لِقُرْئَانَكه بَالْكيٚش گُهْدَارِى كرْ..

٢. بِبَالْ رِيَا رَاسْتْ ڤَه رَاسْتَرِىٚ دِكَه. ڤێجَه مَه بَاوَرِى پێ ئَانِى و اَمْ تُو كَسِى ژِ خُدَايێ خَوه رَه نَاكِنْ هَڤْپِشْكُ و هَڤَالْ.

٣. بێگُمَانْ شَانِێ خُدِێ بِلِنْدُ و مَزِنَه و ژِ بُو خَوه تُو هَڤَالْ و زَارُوكْ نَگِرْتِنَه.

٤. بِرَاسْتِى رَوْشْ اَڤَه، بێهِشِێنْ مَه دَرْ بَارِێ خُدِێ دَه دَرَوِێنْ بِێ بِنْيَادْ لِێئَانِينْ.

٥. مَه حِزِرْ دِكِرْ كُو تُو اِنْسُ و جِنْ دَرْ بَارِێ خُدِێ دَه قَتْ بِدَرَوْ نَابێژِنْ.

٦. ژِ اِنْسَانَانْ هِنَكْ هَبُونْ كُو ژِ جِنَانْ پَارَاسْتِنْ دِخَوسْتِنْ. ڤێجَه جِنَانْ اَوْ زێدَەتِرْ ژِ رِێ دَرْخِسْتِنْ.

٧. وَانْ (جِنَانْ) حِزِرْ دِكِرْ چِوَا كُو وَه ژِى حِزِرْ دِكِرْ؛ كُو خُدِێ دِێ (پِشْتِى مِرِنِێ) تُو كَسِى سَاغْ نَكَه.

٨. بِرَاسْتِى مَه حَولْ دَا كُو اَمْ هَرِنْ ئَاسِيمَانَانْ (دَا كُو لِمَلائِيكَتَانْ گُهْدَارِى بِكِنْ). لِێبَلِێ مَه دِيتْ كُو ئَاسِيمَانْ ژِ زێرَڤَانِێنْ دِژْوَارْ و سْتێرِێنْ بِزُوتْئَاڤێژْ تِژَه بُونَه.

٩. حَالْ اَڤَه، (بَرِى شَانْدِنَا پێخَمْبَرْ) ژِ بُو مَه، لِئَاسِيمَانَانْ جِهِێ گُهْدَارِيێ هَبُو. لِێبَلِێ ڤێگَا كِى بِخَوازَه گُهْدَارِيێ بِكَه دِێ بِبِينَه ژِ سِتێرَانْ پێتَكِى لِبَرْڤَكَتِى لِبَرِێ سَكِنِيَه.

١٠. بِرَاسْتِى اَمْ (جِنْ) نِزَانِنْ كَا (اَڤْ رَوْشَا نُوبَدَارَانْ لِئَاسِمَانَانْ) ژِ بُو چِه يَه؛ مَا گَلُو خُدَايێ وَانْ خِرَابِيَا خَلْكِێ عَرْدِێ پێ خَوەسْتِيَه يَانْ خێرَا وَانْ؟

١١. هِنْ ژِ مَه هَنَه كُو صَالِحِنْ و هِنْ ژِ مَه هَنَه كُو نَه وِسَانِنْ، اَمْ خُدَانِێ گَلَكْ رِێكْ و رێبَازِنْ.

١٢. (اِێدِى) مَه يقِينْ فَهْمْ كِرْ كُو خُدِێ لِعَرْدِێ لِسَرْ مَه دَسْتْهِلاتْدَارَه و اَمْ نِكَارِنْ بِرَڤِێ وِى نَاچَارْ بِهِێلِنْ.

١٣. بِرَاسْتِى گَاڤَا مَه لِقُرْئَانِىَٰ گُهْدَارِى كِرْ، مَه يكْسَرْ بَاوَرِى پِىَٰ ئَانِى. ڤێجَه كِى بَاوَرِى بِرَبِّىَٰ خَوه بِينَه، بِلا نَترْسَه كُو خێرێنْ وِى كێمْ بِبِنْ ئَانْ ژِى گُنَهێنْ وِى زێدَه بِبِنْ.

١٤. هِنْ ژِ مَه مُسِلْمَانْ بُونْ و هِنْ ژِ مَه سِتَمْكَارِى كِرِنْ. ڤێجَه كِى كُو مُسِلْمَانْ بِبَه، هَا اَوْ يێنْ كُو بِسَرْ رِيَا حَقْ ڤَه بُونَه.

١٥. هَرْچِى يێنْ كُو ژِ رِيَا حَقْ دَرْكَتِنَه اَوْ ئَارْدُويِىَٰ دُوْژَهِىَٰ نَه.

١٦. اَگَرْ اَوْ (اێنْ كَافِرْ) لِسَرْ رِىَٰ رَاسْتَرِىَٰ بِبُونَا مَه يِىَٰ بَارَانَكْ پِرْ بِسَرْ وَانْ دَه بِبَارَانْدَا و رِزْقِىَٰ وَانْ بَرْفِرَهْ بِكِرَا...

١٧. دَا كُو اَمْ وَانْ تِى دَه بِجَرْبِينِنْ. كِى بَرِىَٰ خَوه ژِ كِتێبَا رَبِّىَٰ خَوه ڤَگَرِينَه، خُدَا دِىَٰ وِى بِخَه عَذَابَكِى دِژْوَارْ.

١٨. بێگُمَانْ مِزْگَفْتْ يێنْ خُدِىَٰ نَه. نَاخَوه دِگَلْ خُدِىَٰ ژِ تُو كَسِى رَه عِبَادَتْ و دُعَا نَكِنْ.

١٩. چِه دَمَا بَنْدَيِىَٰ خُدَا (مُحَمَّدْ) رَابُو كُو پَيَامَا خُدِىَٰ بَانْگْهِلْدێرَه، جِنْ لِهَاوِرْدُوْرَا وِى كُوْمْ بُونْ، هِنْدِكْ مَابُو كُو رَابِنْ سَرْ مِلێنْ هَڤْ (دَا لِقُرْئَانِىَٰ گُهْدَارِى بِكِنْ).

٢٠. بِبێژَه: اَزْ بَسْ عِبَادَتِىَٰ ژِ بُوْ خُدَايِىَٰ خَوه تَنِىَٰ دِكِمْ و اَزْ تُو كَسِى ژِىَٰ رَه نَاكِمْ هَڤْپِشْكْ.

٢١. بِبێژَه: بِرَاسْتِى اَزْ نَه دِكَارِمْ زِرَارْكِىَٰ بِدِمْ وَه نَه ژِى فَيْدَهيكِىَٰ.

٢٢. بِبێژَه: بِرَاسْتِى (اَگَرْ اَزْ گُهْدَارِيَا خُدِىَٰ نَكِمْ) تُو كَسْ نِكَارَه مِنْ لِهَمْبَرْ خُدِىَٰ بِپَارِێزَه و اَزْ ژِ وِى پِىَٰ ڤَه ئَاصِيگَهَكِىَٰ ژِى نَابِينِمْ (كُو خَوه تِى دَه بِپَارِێزِمْ).

٢٣. ژِ بِلِى كُو اَزْ پَيَامێنْ خُدِىَٰ رَاگِهينِمْ (اَزْ نِكَارِمْ تِشْتَكِى بِكِمْ).اِێدِى كِى گُهْدَارِيَا خُدِىَٰ و پێخَمْبَرِىَٰ وِى نَكَه، ڤێجَه بِرَاسْتِى ژِىَٰ رَه ئَاگِرِىَٰ دُوْژَهِىَٰ هَيَه و حَتَا بِحَتَايِىَٰ اَوْ دِىَٰ تِى دَه بِنْ.

٢٤. (اَوِىَٰ لِسَرْ يَا خَوه بِنْ) حَيَانِى اَوْ عَذَابِىَٰ كُو پێمَانَا وِى ژِ وَانْ رَه هَاتِيَه دَابِينْ دِيتِنْ،

ڤێجه (دمَا دِيتِنْ) دِیٛ اَوْ بزَانِنْ ژِ ئَالِيیٛ ئَارِيكَارِیٛ ڤه كَا كِی ڤَلْسْتِرْ و ژِ ئَالِيیٛ هَژْمَارِیٛ ڤه كِی كِێمْترَه.

٢٥. بِبێژَه: اَزْ (بِخوه) نزَانِمْ مَا گَلُو اَوْ عَذَابیٛ كُو پێمَانَا وِی ژِ وَه رَه هَاتِيَه دَاينْ نێزِكَه يَانْ ژِی خُدَايِیٛ مِنْ دِیٛ ژِ بُوْ وِی دَمَكَه دُورْ و دِرێژْ دَيْنَه.

٢٦. خُدِیٛ زَانَايِیٛ نَپِنِيیٛ يَه. اَوْ غَيبَا خَوه ژِ تُو كَسِی رَه اَشْكَرَا نَاكَه.

٢٧. لِێبَلِیٛ اَوْ پێخَمْبَرِیٛ كُو خُدِیٛ وِی بِڤِیٛ ژِ ڤِیٛ جُدَا يَه. بِرَاسْتِی خُدِیٛ لِپێشِيَا وِی و لِپِشْتْ وِی مَلائيكَتێنْ چَاڤْدێرْ دِشِينَه.

٢٨. دَا كُو بِڤِی ئَاوَايِی خُدِیٛ بِدَه زَانِينْ كُو وَانْ پَيَامێنْ خُدَايِیٛ خَوه رَاگِهَانْدِنَه. خُدِیٛ بِيَا لِجَمْ وَانْ دِزَانَه و هَرْ تِشْتْ يَكْ بِيكْ ژِمَارْتِيَه (و تُومَارْ كِرِيَه).

## ٧٣. سُورَه يِیٛ مُزَّمِّلْ

سُورَه‌يِیٛ (مُزَّمِّلْ)، بيسْتْ (٢٠) ئَايَتَه. ئَايَتێنْ ١٠، ١١، و ٢٠'اَمْ لِمَدِينَيِیٛ و يێنْ دِنْ تَڤْ لِمَكِّیٛ دَاكَتِنَه. سُورَه، نَاڤِیٛ خَوه ژِ ئَايَتَا پێشِينْ گِرْتِيَه كُو تِی دَه پِيڤَا مُزَّمِّلْ دَرْبَاسْ بُويَه و بِوَاتَيَا «يِیٛ كُو جِلْ لِخَوه وَرْدَايَه.

بِنَاڤِیٛ خُدَايِیٛ كُو رَحْمٰنَ رَحِيمَ

١. هَیْ يِیٛ كُو جِلْ لِخَوه وَرْدَايَه!

٢. ژِ بِلِی هِنْدِكِی ژِ شَڤِیٛ تُو رَابَه..

٣. نِيڤِیٛ وِیٛ، يَانْ ژِ نِيڤِیٛ وِیٛ كِێمْترْ..

٤. يَانْ ژِ نِيڤِیٛ وِیٛ زێدَترْ رَابَه نِمێژْ كَه و قُرْئَانِیٛ بِحِزْرُ و تَفَكُّرْ بِخُوِينَه.

٥. بِرَاسْتِی اَمِیٛ گُوْتِنَكَه گِرَانْ نَازِلِی سَرْ تَه بِكِنْ.

٦. بێگُمَانْ عِبَادَتیێ شَڤێ بَانْدُوْرَا وِی زێدَترَه و بێهْترْ مُوَافِقێ دِلَه و خَونْدِنَا تِی دَه دُرِسْترْ و مِكُوْمْ ترَه.

٧. برَاسْتِی برُوْژێ ژِ بُوْ تَه مَشْغُولِیَتَكَه دِرێژْ هَیَه.

٨. نَاڤێ رَبِّێ خَوه دِبیر بِینَه و خَوه ژِ بُوْ عِبَادَتیێ وِی ڤَالَا بِكَه.

٩. اَوْ هَمْ خُدَایێ رُوْژهِلَاتْ هَمْ ژِی یێ رُوْژئَاڤَا یَه. ژ وِی پێ ڤَه تُو اِلٰهْ نِینِنْ. نَاخَوه وِی ژِ خَوه رَه بِكَه وَكِیلْ و كَارْسِپێرْ.

١٠. لِهَمْبَرْ یَا دِبێژِنْ خَوه رَاگِرَه و بِخَوشْكَایِی دَڤْ ژِ وَانْ بَرْدَه.

١١. مِنْ و وَانْ بێ بَاوَرێنْ حَالْخَوشْ ژِ هَڤْ رَه بِهێلَه (اَزێ جزَا بِدِمْ وَانْ) و هِنَكی مُهْلَتێ بدَه وَانْ.

١٢. بێگُمَانْ لبَالْ مَه (ژِ وَانْ رَه) قَیْدُ و زِنْجِیرێنْ گِرَانْ، دُوْژَهَكَه سِنْجِرِی..

١٣. خَوارِنَكَه بِسترِی و عَذَابَكی دِژْوَارْ هَیَه.

١٤. رُوْژَا عَرْدُ و چِیَا دِهَژِنْ، چِیَا دِبێ بِبِنْ لُوْدِێنْ خِیزێ، بِهَرِكِنْ (و لِبَرْ بَایێ هَرِنْ).

١٥. برَاسْتِی چَاوَا كُو مَه ژِ فِرْعَوْنُ (و جڤَاتَا وِی) رَه پێخَمْبَرَكْ (مُوسَا) شَانْدِبُو، هَرْ وِسَا مَه ژِ بُوْ وَه ژِی پێخَمْبَرَكْ شَانْدِیَه كُو اَوێ لِسَرْ وَه بِبَه شَاهِدْ.

١٦. لێبَلێ فِرْعَوْنْ لِپێخَمْبَرْ گُهْدَارِی نَكِرْ و پێ بَاوَرِی نَئَانِی، ڤێجَه مَه ژِی بِهِنْگَاڤْتِنَكَه دِژْوَارْ و تُوژْ اَوْ هِنْگَاڤْتْ.

١٧. اَگَرْ هُونْ بَاوَرِی نِیینِنْ، هُونێ چَاوَا خَوه ژِ عَذَابێ رُوْژَكَه وِسَا بِپَارێزِنْ كُو زَارُوْكَانْ پِیرْ و كَالْ دِكَه؟

١٨. ئَاسِیمَانْ بِخَوه ژِی دێ ژِ (ترْسَا) وێ (رُوْژێ) بِبَه دُو شَقْ. پێمَانَا خُدێ هَرْ دێ وَرَه جِهْ.

١٩. بِرَاسْتِى اَڤَا هَا بيرْئَانِينْ و شِيرَەتَكَه، ڤِێجَه كِى بِخَوازَه دِىَ رِيكِىَ بِگِرَه كُو وِى بِگَهِينَه خُدَايِىَ وِى.

٢٠. (يَا مُحَمَّدْ)! بێگُمَانْ خُدَايِىَ تَه دِزَانَه كُو تُو ژِ سِێيَكَا شَڤِىَ نێزِى دُو پَارَانْ،(جَارِنَانْ) نِيڤِىَ وِىَ،(جَارِنَانْ ژِى) سِێيَكَا وِىَ رَادِبِى (نِمێژِىَ) و جِڤَاتَكْ ژِ وَانْ بَاوَرْمَنْدێنْ لِگَلْ تَه ژِى (رَادِبِنْ). خُدِىَ يَه يِىَ كُو شَڤْ و رُوٚژِىَ تَقْدِيرْ دِكَه. خُدِىَ زَانِيَه هُونْ نِكَارِنْ تَڤَكِىَ شَڤِىَ عِبَادَتِىَ بِكِنْ، ڤِێجَه لِسَرْ وَه سِڤِكْ كِرِيَه. اِێدِى ژِ قُرْئَانِىَ يَا كُو هُونْ بِكَارِنْ (وِىَ) بِخُوِينِنْ. خُدِىَ دِزَانَه كُو دِىَ ژِ نَاڤْ وَه نَخَوشْ چێبِنْ و يێنْ دِنْ ژِى دِىَ لِسَرْ عَرْدِىَ ژِ كَرَمَا خُدِىَ لِرِزْقِىَ خَوه بِگَرِنْ و هِنَكِى دِنْ ژِى دِىَ دِ رِيَا خُدِىَ دَه شَرْ بِكِنْ. نَاخَوه ژِ قُرْئَانِىَ يَا كُو هُونْ بِكَارِنْ بِخوِينِنْ، بَرْدَوَامِى نِمِێژْ بِكِنْ، زَكَاتَا مَالِىَ خَوه بِدِنْ و دِ رِيَا خُدِىَ دَه خێرَانْ بِكِنْ. هُونْ ژِ خێرِىَ چه لِپێشِيَا خَوه ژِ بُوٚ خَوه بِشِينِنْ ئَاخِرَتِىَ، هُونِىَ لِجَمْ خُدَايِىَ خَوه چێتِرْ و مَزِنْتِرِىَ وِىَ بِبِينِنْ. لێبُورِينَا خَوه ژِ خُدِىَ بِخَوازِنْ. بِرَاسْتِى خُدِىَ گُنَهْژێبِرْ و دِلُوٚڤَانَه.

## ٧٤. سُورَه يِىَ مُدَّثِّرْ

سُورَەيِىَ (مُدَّثِّرْ)، (٥٦)پێنْجِى و شَشْ ئَايَتَه. لِمَكِّىَ نَازِلْ بُويَه . سُورَه نَاڤِىَ خَوه ژِ ئَايَتَا پێشِينْ گِرْتِيَه كُو تِى دَه بێژِيَا مُدَّثِّرْ دَرْبَاسْ بُويَه و بِوَاتَيَا «يِىَ كُو جِلْ لِخَوه وَرْدَايَه/ جِلْ بِسَرْ خَوه دَه كِرِيَه.»

**بِنَاڤِىَ خُدَايِىَ كُو رَحْمَنَ رَحِيمَ**

١. هَىْ يِىَ كُو جِلْ لِخَوه وَرْدَايَه!

٢. رَابَه كَارِىَ خَوه بِكَه، اِێدِى هِشْيَارْ بِكَه.

٣. تِنِىَ خُدَايِىَ خَوه مَزِنْ بِدِێرَه.

٤. جِلِىَ خَوه پَاڤِژْ بِگِرَه.

٥.  ژِ پیسییێ خَوه دُورْ بِگِرَه.

٦.  بِنیتَا کُو زێدَهتِرْ بِێ شُونِێ، مِنَّتێ نَکَه.

٧  ڤێجَه ژِ بُوٚ خُدَایێ خَوه صَبْرِێ بِکێشَه.

٨.  گَاڤَا کُو دِ سُورێ دَه بِێ پِفکِرِنْ..

٩.  ڤێجَه هَا اَوْ رُوٚژْ، رُوٚژَکَه گِرَانْ و دِژْوَارَه.

١٠. اَوْ لِسَرْ کَافِرَانْ (ڤَتْ ژِی) نَه هێسَانَه.

١١. تُو مِنْ و وِی کَسێ کُو مِنْ اَوْ بِتَنێ (بِێ مَالْ و زَارُوکْ) ئَافِرَانْدِیَه، ژِ هَڤْ رَه بِهێلَه.

١٢. پَاشِی مِنْ مَالَکِی پِرْ دَایێ و مِنْ اَوْ کِرَه خُدَانْمِلْکْ..

١٣. مِنْ کُرْ دَانِێ کُو هَرْ تِمْ لِبَرْ وِی حَازِرْ بُونْ..

١٤. مِنْ نِعْمَتێنْ دِنْیَایێ ژێ رَه رَاخِسْتْ..

١٥. پِشْتِی ڤِێ هِێ ژِی هێڤِی دِکَه کُو اَزْ (نِعْمَتێنْ خَوه ژێ رَه) زێدَهتِرْ بِکِمْ.

١٦. نَخێرْ! بِرَاسْتِی اَوْ لِدِژِی ئَایِتێنْ مَه رِکْدَارَه.

١٧. اَزێ وِی دِ عَذَابَکِی دَه وَرْکِمْ کُو نَایێ تَحَمُلْکِرِنْ.

١٨. بِرَاسْتِی اَوْ فِکِرِی و پِیڤَا.

١٩. ڤێجَه خُدێکُشْتُو چِه فِکِرِی و چِه پِیڤَا!

٢٠. پَاشِێ خُدێکُشْتُو چَاوَا پِیڤَا!

٢١. پِشْتْرَه دِیسَا فِکِرِی..

٢٢. پَاشِێ لِوَه یِێ خَوه تِرْشْ و تَحْلْ کِرْ.

٢٣. پَاشِێ پِشْتَا خَوه دَا حَقِیێ و خَوه لِسَرِێ مَزِنْ کِرْ.

**٢٤.** اِيْدِى گُوتْ: اَڤْ (قُرْئَانْ) بَسْ سِيْرَكه كُو (ژِ سِيْرْبَازَانْ) هَاتِيَه ڤَگُهَاسْتِنْ.

**٢٥.** هَبَه نَبَه اَڤْ گُوتِنَا مِرُوڤَانَه.

**٢٦.** اَزێ وِى بَاڤِێژِمْ سَقَرێ (ئَاگِرێ سِنْجِرِى).

**٢٧.** مَا كِێ تَه فِێرْ كِرِيَه كَا سَقَرْ چِه يَه؟

**٢٨.** اَوْ (ژِ بَدَنِێ) نَه تِشْتَكِى دِهێلَه نَه ژِى بَرْدِدَه.

**٢٩.** اَوْ چَرْمِێ اِنْسِێنْ دِپَرِتِينَه (و دِسُوژَه).

**٣٠.** لِسَرْ سَقَرِێ نُوزْدَهْ (زَبَانِى نُوتِرْڤَانْ) هَنَه.

**٣١.** مَه وَظِيفَيَا كَارْ و بَارِێنْ دُوژَهِێ تَنِێ دَا مَلائيكَتَانْ و مَه هَژْمَارَا وَانْ (نُوتِرْڤَانَانْ) ژِى كِرَه جَرِبَانْدِنْ دَا كُو كِتَابِى (جِهُو و فِلَه) ژِ دِلْ بَاوَرْ بِكِنْ و دَا بَاوَرِيَا بَاوَرْمَنْدَانْ ژِى زِێدَهترْ بِبَه، دَا خُدَانْكِتِێبْ و بَاوَرْمَنْدْ (دِ هَژْمَارَا وَانْ دَه) نَكَڤِنْ گُمَانِێ و دَا اَوْ كَسِێنْ كُو دِ دِلِێنْ وَانْ دَه نَخوشِى (نِفَاق) هَيَه و يِێنْ كَافِرْ بِبِێژِنْ؛ مَقْصَدَا خُدِێ بِڤِێ هَژْمَارِێ چِه يَه؟ هَا وِسَا خُدِێ كِى بِخوازَه ژِ رِێ دِخَه و كِى ژِى بِخوازَه تِينَه رِيَا رَاسْتْ. ژِ وِى پِێ ڤَه كَسْ (بِهَژْمَارَا) لَشْكَرِێنْ وِى نِزَانَه. اَڤْ سَقَرْ (دُوژَه) ژِ بُو مِرُوڤَانْ تَنِێ شِيرَتْ و دَرْسَه.

**٣٢.** نَخِێرْ! صُونْدْ بِهِيڤِێ..

**٣٣.** صُونْدْ بِشَڤِێ گَاڤَا بِطَارِيتِيَا خوه ڤَه دِچَه..

**٣٤.** صُونْدْ بِسِپێدِێ گَاڤَا بِرُونَاهِيَا خوه ڤَه تِێ..

**٣٥.** بِرَاسْتِى اَڤْ جِهَنَمْ يَكْ ژِ بَلايِێنْ مَزِنَه.

**٣٦.** ژِ بُو اِنْسَانَانْ ئَاگَاهْدَارِى يَه.

**٣٧.** ژِ بُو كَسِێ كُو بِخوازَه بِپێشْ ڤَه هَرَه يَانْ ژِى لِپَاشْ بِمِينَه.

